# بەناوی خوای جوانکاری بونەوەر

**پێناسی کتێب**

ناوی کتێب : مێژووی تەبەری

بابەت :مێژوویی

بەرگی: یەکەم

**نوسینی: محمد بن جریر طبری**

**وەرگێرانی: زانەر محمد**

نەخشەسازی: چوارچرا

نۆبەتی چاپ :چاپی یەکەم سلێمانی ۲۰۱۰

چاپخانە : چوارچرا

دیزاینی بەرگ: هورێم عوسمان

تیراژ :۱۰۰۰ دانە

ژمارەی سپاردن (۲٤٥۸ ) ساڵی (۲۰۰۹) پێدراوە

## پێڕست

## بەناوی خواوەندی جوانکاری بوونەوەر

سوپاس بۆ خوا کەسەرەتایە پێش هەمو سەرەتاکان و کۆتاییە دوای هەموو کۆتاییەکان، بەتوانایە بۆ هەر کارێك، ئافرێنەری ئافرێنەرە بێ هاوتاکان، تاکی تاقانەی بێ وێنە، ئەوەی دوای هەموان دەمێنێتەوە، بێ کۆتاییە و بێ زەمان. گەورەیی و شکۆ و مەزنی و دەسەلأت و هێز تایبەتە بەخۆی، توانا و تاقانەیی ئەو بێ شەریکە و لەچارەسەر کردن بێ هاوکار و پشتیوانە. تاقانەی بێ منالّ و یار و هاوتایە، لەگوماندا ناگونجێت و لەشوێندا جێگە ناگرێت وبەچاو نابینرێت. کردەیە و شارەزا، سوپاسی دەکەم بۆ نێعمەتەکانی و سەری کوڕنوش دادەنەوێنم چوونکە پەرەستین تایبەتە بەو و چاوەڕوانی فراوانی بەخششەکانی دەکەم. لەوتار و ئاکار، بەدوای ڕەزامەندی ئەودا دەگەڕێم. شایەتی دەدەم کە خوای تاقانەی بێ شەریکە و محەممەد بەندەی شیاو و نێردراوی ئەمینی ئەوە کە پێغەمبەرایەتی تایبەت کرد بەو و بۆ وەحی هەڵیبژارد تا بانگەشەی پەرەستینی خواوەند بکات. پێغەمبەریش(د.خ) فەرمانی برد و هەوڵیدا و بەئامۆژیاری خەڵکەکەی خۆی، پەرەستشی خوای کرد تا گەیشتە یەقین و باوەڕ. لەبانگەوازەکەی کەمتەرخەمی نەکرد و سستی و لاوازی لەخۆی نیشاننەدا. پاکترین و باشترین سلأوات و سلأوی خوای لیَ بێت.

دواتر: خواوەندی کردگار، خەڵکەکەی خۆی بێ نیاز ئافڕاند. خەڵکانی ئافڕاند و پەرەستینی تایبەت کرد بەوان تا خوا بپەرەستن بۆ ئەوەی نیعمەتەکانیان بۆ زیاد و فراوان بکات بەهەمان شێوە کە دەفەرمێت:

(( و ما خلقت الجن و الانس الا لیبعدون، ما ارید منهم من رزق و ما ارید ان یطعمون. ان الله هو الرزاق ذو القوة المتین.

واتاکەی: پەریەکان و مرۆڤەکانم نەئافڕاند مەگەر بۆ ئەوەی پەرەستشم بکەن. لەوان ڕۆژیم ناوێت و ناخوازم خواردنم پیَ بدەن چوونکە خواوەند ڕۆژیدەر و خاوەن دەسەلأتێکی بەهێزە))، کە لەئافڕاندنی ئەوان مسقاڵێك دەسەلأتی زیاد ناکات و ئەگەر لەناویان ببات، مسقاڵێکی لیَ کەم نابێتەوە چوونکە گۆڕانکاری و

خەم ئەو ناگرێتەوە و رۆژ و شەوی سەڵتەنەتی ئەو کەم ناکاتەوە چوونکە ئافرێنەری زەمان و رۆژگارەکانە. گوێ و چاوی بەخەڵکان بەخشی و ئاوزی پێدان تا راستی و چەوتی و سوود و زیان بناسن. زەوی راخست تا بەرێگاکانیدا بڕۆن و ئاسمانی وەك تاقێك پاراست، بەهەمان شێوە کە دەفەرمێت: باران و رۆژی بەئەندازەی پێویست لێ باراند. شەوی کردە پۆشش و رۆژی کردە کاتی بەدەست هێنانی بژێوی، لەبەخششەکانی خۆی مانگە شەو و هەتاوی بەدوای یەکدا هێنا و تاریکایی شەوی لەناو برد و رووناکی رۆژی ئاشکرا کرد. خواوەندی پەروەردگار دەفەرمێت:

((و جعلنا الليل و النهار آيتين فمحونا آية اليل و جعلنا آية النهار ميصره لتتبغوا فضلا من ربكم و لتعلموا عدد السنين و الحساب و كل شيئى فصلنا تفصيلا.

واتاکەی: شەو و رۆژمان کردە دو هێما و نیشانەی شەومان بە تاریکی و نیشانەی رۆژمان بەروناکایی دیاری کرد تا داوای فراوانی لەپەروەردگاری خۆتان بکەن و ژمارەی ساڵەکان و کاتەکان بزانن و هەمو شتێکمان روون کردۆتەوە، روون کردنەوەیەی تەواو)).

بەم شێوەی کرد تا لەشەو و رۆژ و مانگ و ساڵەکان، کاتەکانی نوێژ و زەکات و حەج و رۆژوو و ئەرکە دینییەکان بزانن و کات و دین و ئەرکەکانی خۆیان بناسن بەهەمان شێوە کەدەفەرمێت:

((يسئلونك عن الاهلة قل هى مواقيت للناس و الحج.

واتاکەی: پرسیاری مانگە تازەکانت لێ دەکەن، بڵێ کاتەکانە بۆ خەڵك و حەج.))

دەفەرمێت: ((هو الذى جعل الشمس ضياء و القمر نوراو قدره منازل لتعلموا عدد السنين و الحساب ما خلق الله ذلك الا بالحق يفصل الايات لقوم يعلمون.

واتاکەی: خواوەندە هەتاوی کردە روناکایی و مانگی کردە درەوشانەوەیەك و شوێنەکانی بۆ دیاری کردن تا ژمارەی ساڵەکان و ژماردن فێر ببن، خوا بەراستی

ئەمانەی ئافراندو ئەم ئایانە بۆ ئەو کەسانەی دەخوانن بزانن. روون دەکەینەوە، بەراستی لەجیاوازی شەو و رۆژ و ئەو شتانەی خواوەند لەئاسمان و زەوییەکان ئافراندویەتی، وانەیە بۆ ئەو کەسانەی خواپەرەستی دەکەن)).

ئەمە نێعمەت و بەخششە بەخەڵکانی بەخشی و زۆر کەس سوپاسی نێعمەت و بەخششەکانی دەکەن و بەخششەکانی فراوان کرد بەهەمان شێوە کەپەروەردگار بەڵێنی داوە و دەفەرمێت:

((و اذ تأذن ربکم لئن شکرتم لازیدنکم و لئن کفرتم ان عذابی لشدید.

واتاکەی: کاتێك پەروەردگار رایگەیاند، ئەگەر سوپاس بکەن، بەخششەکانتان زیاد وئەگەر ناسوپاسی بکەن ئازابەکەی من ئێجگار سەختە)).

فراوانی دنیا و تەمری رۆژی پەسلانی پێکەوە بەخشی و بەخششی زۆر کەسی بۆ ئەو دینا هەڵگرت.

و خەڵکان زۆر ناسوپاسی بەخششەکان و حاشایان لەنێعمەتەکانی کرد و جگە لەخوایان پەرەستی. بەخشش و چاکەی خۆی لەوان گرتەوە و لەم جیهانە بەدبەختی کردە بەشیان و سزاکەیان بۆ ئەو دنیا هەڵگرت و نێعمەتەکانی رۆژگاری ژیانی بەزۆر لەکەسەکان بەخشی تا ببنە شیاوی سزاکانی رۆژی کۆتایی. لەو کردارانەی دەبنە هۆی تورەیی خواوەند، پەنا بۆ خوا دەبەین و لەو کارانەی رەزامەندی ئەوی بەدواوەیە، داوای سەرکەوتن و هاوکاری لێ دەکەین.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: لەم کتێبەدا بەسەرهاتی پاشا و پێغەمبەرەکان و خەلیفەکان دەکەم هەروەها ئەو کەسانەی سوپاسی بەخششەکانی خوایان کرد و فراوانی نێعمەتیان پێبرا و ئەو کەسانەی ناسوپاسیان کرد و لەرۆژەکانی ژیان بەئاسودەیی دەژیان. باسی سەرەتاکانی ئافراندن و رووداوەکانی ئەو رۆژگارە دەکەم کە تەمەن بۆ باس کردنیان بەسەندە ناکات و کتێبەکان ناتوانن هەمو بەسەرهاتەکان لەخۆیاندا جێگە بکەنەوە. سەرەتا و ئەنجامی رووداوەکان باس دەکەم و روونی دەکەمەوە کە ئایا پێش ئەوکەسانە چی بووە و دوای ئەوان چی دەبێت و دەڵێم جگە لەخواوەندی خاوەنی ئاسمانەکان و زەوییەکان و ئافرێنراوەکان، هیچ کەسێك سەرەتا و کۆتایی نییە. ئەم گێرانەوانە بەشێوەیەکی

کورتە نەك چڕوپڕ چوونکە مەبەستی ئێمە لەم کتێبەدا ئەوە نییە بەڵکو بەسەرهاتی پاشاکانی رابردوو و گێڕانەوەی رووداوەکان و سەردەمی پێغەمبەران و ئەندازەی تەمەنی ئەوان و بەسەرهاتی خەلیفەکان و سنوری فەرمانڕەوایەتی و روداوەکانی سەردەمی ئەوان مەبەستی ئێمەیە. بەدوای ئەوە ئاماژەدان بەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) و ناو و نازناو و ماوەی تەمەنیان و کاتی مردن و شوێنی مردنیان باس دەکەین، دواتر باسی شوێنکەوتەکان و کەسانی دیکە و گێڕانەوەکانیان دەکەم وئاشکرای دەکەم کەگێڕانەوەی چ کەسانێکم پەسەند کردووە و ئاماژەم بەکامانەداوە. باسی ئەوەم کردووە کەگێڕانەوەی ئەوانەی پەسەندم نەکردون، ئاماژەم پیێ نەداون. داوای یارمەتی لەخواوەند دەکەم و سلاْوات و سلاْو لەپێغەمبەرەکەی محەممەدی مستەفا بێت.

خوێنەری کتێبەکەی ئێمە دەزانێت ئەوەی لێرەدا باسی دەکەم پشت ئەستوور بەگێڕانەوەکانە نەك بەڵگە عەقڵانییەکان و بینینەکان، جگە لەبەشێکی، چوونکە هەواڵی رابردوان تەنیا لەرێگەی گێڕانەوە بەداهاتوان دەگات نەك بەڵگە و بۆچون. روداوەکانی تایبەت بەرابردوان کە لەکتێبەکەی ئێمەدا باسی لێوەکراوەو خوێنەر بەسەرسورهێنەری دەزانێت یا پەسەندی ناکات و بەراستی نەزانێت، گێڕانەوەی من نییە، بەڵکو منیش لەکەسانی دیکەوە بیستوومە بەهەمان شێوە کەئامـاژەم پێدا.

## وتار سەبارەت بەوەی زەمان چییە

زەمان کاژێرەکانی شەو و ڕۆژە، چ کورت بێت چ درێژ. عەرەب دەڵێت: لەزەمانی ئەمارەتی حەجاج هاتمە لای تۆ، یانی ئەو کاتەی حەجاج ئەمیر بوو.

وتار سەبارەت بەزەمان

لەسەرەتا تا ئەنجامەکەی

زاناکان لەمبارەوە بۆچوونیان جیاوازە. دەستەیەك وتوویانە: هەمو زەمانەکان حەوت هەزار ساڵە. لە کوڕی عەباس دەگێڕنەوە: دنیا یەکێك لەڕۆژەکانی پەسلانە و حەوت هەزار ساڵە. شەش هەزار و چەند ساڵێکی تێپەڕیوە و دوای چەند سەد ساڵێك کەس نامێنێت. کەسانێتر وتوویانە: هەموو زەمانەکان شەش هەزار ساڵە و ئەم وتەیان لە کوڕی کەعب گێڕاوتەوە. هەروەها لەوەهب دەگێڕنەوە: لەتەمەنی جیهان پێنج هەزار و شەشسەد ساڵی تێپەڕیوە و من شاکان وپێغەمبەرانی هەموو سەردەمەکان دەزانم. پێیان وت: هەموو جیهان چەندە؟ وتی: شەش هەزار ساڵ.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: وتەی ڕاست حەدیسی پێغەمبەرە(د.خ) کەفەرمووی: زەمانی ئێوە بەبەراوەرد لەگەڵ ڕابردوان هاوشێوەی دووری نێوان نوێژی ئێوارێیە لەگەڵ ڕۆژئاوا بوون. هەروەها لە پێغەمبەر(د.خ) دەگێڕنەوە کە ڕۆژێك لەگەڵ ئەصحابەکان قسەی دەکرد و خۆر لەئاوابوون نزیك ببویەوە. فەرمووی: (( سوێند بەخوا لەدنیای ئێوە بەبەراوەرد لەگەڵ پێشینان ئەوەندە ماوەتەوە کە کۆتایی ڕۆژ و ڕۆژ ئەوەندەی نەماوە تەواو بێت)).

لەئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: من وڕۆژی پەسلان بەم شێوەین، پەنجەی شایەتوومان و پەنجەی ناوەڕاستی نیشاندا. حەدیسە کە دەڵێن ماوەی ماوە تا ڕۆژی هەستانەوە بەئەندازەی پەنجەی شایەتوومان وپەنجەی ناوەڕاستە و هەروەها لەپێغەمبەر(د.خ) دەگێڕنەوە، فەرمووی: من لەکۆتاییەکانی ڕۆژی هەستانەوە هەڵبژێردرام و پێش ئەوە هاتم بەهەمان شێوە کە

ئەمە پێش ئەوەیە و پەنجەی شایەتومان و پەنجەی ناوەڕاستی نیشاندا کە لەتەنیشت یەکدان. چوونکە سەرەتایی رۆژ لەهەڵاتنی خۆر و کۆتاییەکەی ئاوابونی هەتاوە و حەدیسی پێغەمبەرە(د.خ) کەپاشماوەی جیهان هاوشێوەی پاشماوەی رۆژ لەنوێژی ئێواریّ تا خۆرئاوابوونە. حەدیسیکی دیکە کە پاشماوەی جیهان وەك جیاوازی پەنجەی شایەتوومان و پەنجەی ناوەڕاستە و کاتی نوێژی ئێواریّ ئەو دەمەیە کەسێبەری هەر شتێك دەبێت بەدووان و ئەمە بەخەمەلاّندن، یەك نیوەی حەوتەم رۆژە، کەمێك زیاتر یا کەمتر، و جیاوازی پەنجەی شایەتوومان و پەنجەی ناوەڕاست هاوشێوەی ئەوەیە.

هەروەها ئەمە حەدیسی پێغەمبەرە(د.خ) کەفەرمووی: خواوەند یەك نیوەی رۆژ لەم ئۆمەتە درێغ ناکات و مانای وتارەکەی پێغەمبەر(د.خ) لەیەك نیوەی رۆژ، هەزار ساڵە.

لەم دوگێڕانەوەیە کە لەکوڕی عەباس و کەعب، ئاماژەم پێدا، یەکەمیان لەراستیەوە نزیکترە کەدنیا رۆژێك لەرۆژەکانی کۆتاییە و حەوت هەزار ساڵە و چوونکە حەدیسی (صحیحی) پێغەمبەرە(د.خ) کەپاشماوەی جیهان نیوەی رۆژە و ئەم رۆژە هەزار ساڵە، روون دەبێتەوە کە تەمەنی جیهان تا کاتی وتەکەی پێغەمبەر(د.خ) شەش هەزار وپێنسەد ساڵ یا نزیك لەوە بووە، و خوا زاناترە.

ئەوەی سەبارەت بەزەمان لەسەرەتا تا ئەنجام ئاماژەمان پێدا لەهەموو گێڕانەوەکانی دیکە راستترە و باسی بەڵگە و بورهانەکانمان کرد. گێڕانەوەیەکی دیکە لە پێغەمبەر(د.خ) ئاماژەی پێدراوە کەئەگەر راست بێت پشت گوێی ناخەین کە فەرمووی: زەمان هەشتا ساڵە کەیەك رۆژی یەك لەسەر شەشی دنیایە و چوونکە رۆژی کۆتایی هەزار ساڵی دنیایە ویەك رۆژی یەك لەسەر شەشی تەمەنی دنیایە، بۆمان روون دەبێتەوە کە تەمەنی جیهان شەش رۆژ یانی شەش هەزار ساڵە.

بە گومانی یەهوودیەکان، بەپێی ئەو تەوراتەی لەبەر دەست ئەواندایە، لەسەرەتاوە تا کاتی کۆچ چوار هەزار و شەشسەد و چل و دو ساڵە کە بەباس کردنی رۆژی لەدایك بوون و مردنی کەسەکان و پێغەمبەران یەك یەك لەرۆژگاری

ئادەمەوە تا کاتی کۆچی پێغەمبەر(د.خ) بەچڕوپڕی ئاماژەیان پێداوە. بەخواستی خوا، ڕوونکردنەوەکانی ئەوان و زاناکانی ئەهلی کتێب و نەتەوەکانی خاوەن پێغەمبەر لەکاتی خۆیدا باس دەکەین.

بەڵام بەگومانی مەسیحیەکانی یۆنان وتاری یەهوودیەکان ناڕاستە و وتاری ڕاست سەبارەت بە تەمەنی زەمان لەکاتی ئافراندنی ئادەم تا کاتی کۆچی پێغەمبەر(د.خ) بەپێی تەوراتەکەی بەردەستیان، پێنج هەزار و نۆسەد و نەوەد و دو ساڵ و چەند مانگێکە و بە ئاماژەدان بە لەدایك بوون و مردنی پێغەمبەران و شاکان یەك لەدوای یەك لەڕۆژگاری ئادەم تا کۆچی پێغەمبەر(د.خ) وتارەکەی خۆیان پشتڕاست دەکەنەوە. بەگومانی ئەوان یەهوودیەکان ساڵەکانی مێژووی خۆیان کەم کردۆتەوە تا حاشا لە پێغەمبەرایەتی عیسا کوڕی مریەم بکەن چوونکە تایبەتمەندی و کاتی هەڵبژاردنی ئەو لەتەورات دیاری کراوە و دەڵێن هێشتا کاتی دەرکەوتنی عیسا لەتەوراتدا نەهاتوە و عیسا دەبێت لەو کاتەدا بێت و بەگومانی خۆیان چاوەڕوانی دەرکەوتنی عیسان. بەبۆچونی من ئەو کەسەی یەهوودیەکان چاوەڕوانی دەکەن کەتایبەتمەندیەکانی لەتەوراتدا ئاماژەی پێدراوە، دەجالە کە پێغەمبەر(د.خ) بۆ ئۆمەتەکەی خۆی وەسفی کردووە و فەرموویەتی زۆربەی شوێنکەوتەکانی جوولەکەن و ئەگەر عەبداللە کوڕی صەیاد بێت، لەنەتەوەی جوولەکەیە.

بەبۆچوونی ئاگرپەرستەکان ماوەی زەمان لەسەردەمی پاشایەتی کیومەرس تا کاتی کۆچی پێغەمبەر(د.خ) سێ هەزار و یەك سەد و سی و حەوت ساڵە و لەمبارەوە کیومەرس بەیەکەم کەس دەزانن و گومان دەکەن ئەو ئادەمە. زاناکان سەبارەت بەو بەجیاوازی قسەیان کردووە، دەستەیەك وتوویانە دوای ئەوەی بوو بەفەرمانڕەوایی حەوت هەرێم، ناوی ئادەمی پێبڕا، ئەو جامر کوڕی یافس کوڕی نووح بوو و خزمەتی نووحی پێغەمبەری کرد و نووح بۆ ڕێزگرتن لەخزمەتەکانی دۆعای کرد تا خواوەند تەمەنی درێژ وفەرمانڕەوایەتی پێببەخشێت و بەسەر دوژمناندا زاڵ و پاشایەتی بەردەوام لەناو مناڵەکانیدا بێت. خواوەند دۆعاکەی نووحی هێنایەدی و کیومەرس و مناڵەکانی پاشایەتیان پێبڕا. ئەو باوکی

ئێرانییەکان بوو و پاشایەتی لەدەست بنەماڵەکەیدا مایەوە تا ئەو کاتەی موسوڵمانەکان ڕۆشتنە ناو مەداین و پاشایەتی ئەوان لەناوروچوو و کەوتە دەست موسوڵمانان. ئاماژەیان بەگێڕانەوەی دیکە داوە کە بەخواستی خوا، لەکاتی گێڕانەوەی مێژوو و ئەندازەی تەمەنی پاشاکان و بارودۆخی وڵاتەکانیان، ئاماژەیان پێ دەدەین.

## وتار سەبارەت بەبەڵگەکانی دەرکەوتنی
## کات و زەمان و شەو و رۆژ

پێشتر ئاماژەمان پێدا کەزەمان ناوی کاژێرەکانی شەو و رۆژ و ئەندازەی سووڕانی هەتاو و مانگ لەئاسمانە بەهەمان شێوە کەخواوەند دەفەرمێت:

((و آیة لهم اللیل نسلخ منه النهار فاذا هم مظلمون. و الشمس تجری لمستقر لها ذلك تقدیر العزیز العلیم، و القمر قدرناه منازل حتی عاد کالعجرون القدیم. لا الشمس ینبغی لها ان تدرك القمر و لا اللیل سابق النهار و کل فی فلك یسبحون.

واتاکەی: شەویش بۆ ئەوان وانەیەکە کە رۆژی لێ جیا دەکەینەوە و ئەوسا بەرەو تاریکی دەڕۆن. و هەتاو کە لەپێگەکەی خۆیدا دەسورێت. ئەمە نەزمی خواوەندی بەتوانایە. و شوێنەکانمان بۆ مانگ دیاری کرد تاوەك لقی لاواز وشك ببێت. نە خۆر دەتوانێت بەمانگ بگاتەوە و نە شەو پێش رۆژ بکەوێت و هەرکام لەئاسمانێکدا دەسورێنەوە.))

کاتێك زەمان کاژێرەکانی شەو و رۆژ بێت و کاژێرەکانی شەو و رۆژ تێپەڕینی هەتاو و مانگ لەقۆناغەکانی ئاسماندا بێت، ئاشکرایە کە زەمان تازەیە و شەو و رۆژیش بەهەمان شێوە و ئافرێنەرەکەیان خواوەندی بەتوانایە کەهەمو ئافرێنراوەکانی ئافراند بەهەمان شێوە کەدەفەرمێت:

((و هو الذی خلق اللیل و النهار و الشمس و القمر کل فی فلك یسبحون.

واتاکەی: ئەوە کە شەو و رۆژی ئافراند لەگەڵ هەتاو و مانگ کەهەرکام لە فەلەکێکدا دەسورێنەوە.))

هەرکەس بزانێت دەرکەوتنی ئەوان لەئافراندنی خواوەندەوە بێت، جیاوازی شەو و رۆژ لای ئەو تاریك نابێت چوونکە یەکیان بەردەوام بەتاریکی و ڕەشایی بۆ خەڵکان دەردەکەوێت و یەکیان بەنوور و رووناکی و بەدوایی لەناوبردنی تاریکی شەو دێت کە رۆژە. بەمشێوە، هیچ کات یەك ناگرنەوە و بەدڵنیاییەوە دەبێت یەکیان پێش ئەوەی دیکە بێت و کاتێك یەکیان لەپێشەوە بێت بێ چەند و چوون

ئەویتریان دوای ئەوە. ئەمە بەڵگەیە بۆ ئەوەی هەردوکیان تازەن و ئافرێنراوی ئافرێنەر.

بەڵگەیەکی دیکە بۆ دەرکەوتنی شەو و رۆژ ئەوەیە کەهەر رۆژێك لەدوای رۆژێکی دیکە دێت کە پێشتر بوونی نەبووە و پێش رۆژێکیترە کەدوای ئەو دێت و ئاشکرایە ئەوەی نەبوو بێت و بێتە بوون، تازە و ئافرێنراوە و ئافرێنەرەێك هەیە و بەدی هێنەرێك.

بەڵگەیەکی دیکە ئەوەی رۆژەکان و شەوەکان ژمارەیان هەیە و هەرچی ژمارەی هەبێت، یا جووتە یا تاك، ئەگەر جووت بێت، سەرەتاکەی بەدوو دەست پێدەکات، کەواتە سەرەتایی هەیە. و ئەگەر تاك بێت، سەرەتاکەی یەکە. کەواتە سەرەتای هەیە و هەرچی سەرەتای هەبێت، بەناچاری دەبێت بەدیهێنەرێکی هەبێت کە ئافرێنەرە.

## وتار سەبارەت بەوەی ئایا ئافرێنەر پێش ئافراندنی زەمان و شەو و رۆژ هیچی دیکەی ئافراندبوو

وتمان زەمان کاژێرەکانی شەو و رۆژە و کاژێرەکان تێپەڕینی خۆر و مانگ لەقۆناغەکانی فەلەکە. کوڕی عەباس دەڵێت کەجوولەکەکان لەپێغەمبەر سەبارەت بەئافراندنی ئاسمانەکان و زەوی پرسیاریان کرد و فەرمووی: خواوەند زەوی لەرۆژی یەك شەممە و دوشەممە ئافراند و کێوەکانی لەرۆژی سێ شەممە، ئاو و دارەکان و شارەکان و ئاوەدانی و وێرانییەکانی لەرۆژی چوارشەممە و ئەم چوار رۆژەیە کە فەرمووی:

((ائنکم لتکفرون بالذی خلق الارض فی یومین و تجعلون له اندادا ذلك رب العالمین. و جعل فیها رواسی من فوقها و بارك فیها و قدرفیها اقواتها فی اربعة ایام سواء للسائلین.

واتاکەی: بڵێ: بۆ ئێوە بەو کەسەی زەوی لەدو رۆژدا ئافراند، کافر دەبن و هاوتای بۆ دادەنێن. ئەو پەروەردگاری جیهانیانە. لەچوار رۆژ لەنگەرەکانی لەسەر زەوی دروست کرد و بەرەکەتی خستە ناویان و خواردەمەنییەکانی دیاری کرد کە بۆ پرسیارکەران (چوار رۆژ) تەواوە.))

فەرمووی: ئاسمانی لەرۆژی پێنج شەممە ئافراند. لەرۆژی هەینی تا سێ کاژێر بۆ کۆتایی رۆژ ئەستێرەکان و هەتاو ومانگ وفریشتەکانی ئافراند و لەیەکەم کاژێر لەم سێ کاژێرە ئەجەلەکانی ئافراند کە کێ زیندوو ببێتەوە وکێ بمرێت، لەکاژێری دووەم زیانەکان و ئەوەی خەڵك سوودی لێ دەبینن و لەکاژێری سێیەم ئادەمی ئافراند و لەبەهەشتدا جێگەی کردەوە و فەرمانی بەئیبلیسدا کوڕنوشی بۆ ببات و لەدوایین کاژێر ئەوی لەبەهەشت دەکرد.

جولەکەکان وتیان: ئەی محەممەد دواتر چی روویدا؟

فەرمووی: ئەوسا لەسەر عەرش دانیشت.

وتیان: ئەگەر دەتوت، ئەوسا حەوایەوە، راست بوو.

پێغەمبەر(د.خ) تورە بوو کەئەم ئایە هاتەخوار:

((و لقد خلقنا السموات و الارض و ما بينهما فی سته ايام و ما مسنا من لغوب.فاصبر علی نا يقولون.

واتاكەی: ئێمە ئاسمانەكان و زەوی و ئەوەی لەناو ئەواندا جێگیرە، لەماوەی شەش ڕۆژدا ئافراندمان و هیلاكی بەئێمە نەبڕا و بۆ ئەوەی دەیڵێن، خۆڕاگر بە.))

ئەبو هورەیرە دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) دەستی منی گرت و فەرمووی: خواوەند خاكی لەڕۆژی شەممە ئافراند و داری لەڕۆژی دووشەممە و خراپەی لەڕۆژی سێ شەممە و نووری لەڕۆژی چوارشەممە و چوارپێكانی لەڕۆژی پێنج شەممە لەجیهاندا بلاو كردەوە و ئادەمی لەدوایین كاتەكانی ڕۆژی هەینی ئافراند و دوایین ئافراندنی ئەو لەدوایین كاژێرەكانی هەینی لەكاتەكانی ئێواری تا شەو بوو.))

كوڕی سەلام و ئەبو هورەیرە لەپێغەمبەر دەگێڕنەوە كەفەرمووی: دەزانم كە لەڕۆژی یەك شەممە لەچ كاژێرێك خواوەند ئافراندنی ئاسمانەكان و زەوی دەست پێكرد و لە چ كاژێرێكی هەینی كۆتایی پێ هێنا. دوایین كاژێری ڕۆژی هەینی بوو.

جوولەكەكان بە پێغەمبەریان وت: ڕۆژی یەك شەممە چییە؟

فەرمووی: خواوەند زەوی لەم ڕۆژەدا ئافراند و بلاوی كردەوە.

وتیان: و ڕۆژی دووشەممە؟

فەرمووی: ئادەمی ئافراند.

وتیان: سێ شەممە؟

فەرمووی: كێوەكان و ئاوی ئافراند و فلان و فلان. هەرچی خوا ویستی.

وتیان: چوارشەممە؟

فەرمووی: ڕۆژییەكانی ئافراند.

وتیان: پێنج شەممە؟

فەرمووی: ئاسمانەكانی ئافراند.

وتیان: هەینی؟

فەرمووی: خواوەند لەدو كاژێر شەو و ڕۆژی ئافراند.

وتیان: ئەی شەممە؟ و ئاماژەیان بەحەوانەوەی خواوەند کرد.

فەرمووی: خواوەند گەورەتر لەوەیە. خواوەندی کردگار ئەم ئایەی ڕەوانە کرد و فەرمووی:

(( و لقد خلقنا السموات و الارض و ما بینهما فی سته ایام و ما مسنا من لغوب.

واتاکەی: ئێمە ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی لەناو ئەواندایە، لەماوەی شەش ڕۆژدا ئافڕاندمان و هیلاکی بەئێمە نەبڕا)).

ئەم دو حەدیسە کە لەپێغەمبەرەوە گێڕامانەوە ئاشکرای کرد کە هەتاو و مانگ دوای زۆر لەئافرێنراوەکانی دیکە ئافرێنراون. حەدیسی کوڕی عەباس لە پێغەمبەر(د.خ) بەمشێوە بوو کەخواوەند هەتاو و مانگی لەڕۆژی هەینی ئافڕاند، کەواتە زەوی و ئاسمانەکان و ئافرێنراوەکانی دیکە جگە لەفریشتەکان و مرۆڤ پێش ئافڕاندنی مانگ و هەتاو ئافرێنراون یانی ئەو کاتەی هێشتا شەو و ڕۆژ لەئارادا نەبوو. چوونکە شەو و ڕۆژ ناوی کاژێرە ئاشکراکان لەسووڕانی هەتاو و مانگ لەئاسماندایە و لەبەر ئەوەی زەوی و ئافرێنراوەکانی دیکە ئافرێنرابوون و خۆر و مانگ هێشتا نە، ئاشکرایە هەموویان ئافڕێنرابوون و شەو و ڕۆژ هێشتا نە.

ئەبو هورەیرە لە پێغەمبەر(د.خ) دەگێڕێتەوە، فەرمووی: خواوەند نووری لەڕۆژی چوارشەممە ئافڕاند. و مەبەست لەنوور، هەتاوە.

ئەگەر کەسێك بڵێت: بەبۆچوونی تۆ، ڕۆژ ناوی کاتی هەڵاتنی خۆر تا ئاوابونییەتی و باوەڕت وابێت خواوەند هەتاو و مانگی چەندین ڕۆژ لەدوای ئافڕاندنی شتەکانی دیکە ئافڕاند، بەڵام کاتەکان بەڕۆژ ناو ببەیت کە پێش ئافڕاندنی هەتاو و مانگە، ئەگەر بەڵگەیەك بۆ ڕاستی ئەمە نەبێت، دژی یەکتر دەوەستنەوە.

دەڵێین: خواوەند ئەم کاتانەی بەڕۆژ ناو بردووە و منیش بەهەمان شێوە و ناو بردنی ئەوان بەڕۆژ لەکاتێکدا نە هەتاو بوو نە مانگ چوونکە وتاری خواوەندە کەفەرمووی: لەو کاتەدا ڕۆژییەکەیان بەیانی و شەو دەگات. لەو کاتەدا بەیانی و

شەو نییە چوونکە لەو دنیا شەو نییە هەروەها هەتاو ومانگیش بەهەمان شێوەکە دەفەرمێت:

(( و لا يزال الذين كفروا فى مرية منه حتى تأتيهم الساعة بغته عذاب يوم عقيم.

واتاکەی: ئەو کەسانەی کافرن بەردەوام بەگومانەوە دەژین تا رۆژی کۆتایی دەبینن یا ئازابی رۆژی عەقیم (نەزۆکی) بیانگرێتەوە.))

رۆژی هەستانەوەی بەنەزۆك ناو براوە چوونکە شەوی بەدواوە نییە. و ماوەی یەك هەزار ساڵ لەساڵەکانی دنیا کەهەر ساڵەی دوانزە مانگە و رۆژەکان بەپێی سووڕانی خۆر و مانگ دەردەکەون، بەرۆژ ناوی برد بەهەمان شێوە کە رۆژی دانیشتووان بەهەشت کە لەدنیا بەشەو و رۆژ ئەندازەیان دەگرت، بەبەیانی وئێواریێ ناوی برد و زاناکان بەمشێوەیە دەگێڕنەوە.

## ئاماژەدان بەگێڕانەوەی

رابردووان لەمبارەوە

لەموجاهید دەگێڕنەوە کەخواوەند فەرمانی کاری یەك هەزار ساڵ بەفریشتەکان دەدات وبۆ هەمیشە بەمشێوە دەبێت کەفەرمووی: رۆژێك کەئەندازەکەی یەك هەزار ساڵە.

هەروەها موجاهید دەڵێت:

رۆژ ئەوەیە فەرمانی کاری یەك هەزار ساڵە دەدات و دەڵێت بەمشێوە بێت و بەو شێوەی دەخوازێت بەرۆژ ناوی دەبات کەفەرمووی، یەك رۆژی پەروەردگاری تۆ هاوشێوەی هەزار ساڵی ئێوەیە .

ناوەرۆکی حەدیسی پێغەمبەر(د.خ) کەئافراندنی هەتاو و مانگ دوای ئافراندنی ئاسمانەکان و زەوییەکان و شتەکانی دیکە بوو، لەدەستەی گێڕانەوەی پێشینانە.

گێڕانەوەکان لەمبارەوە

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: خواوەند بەئاسمان و زەوی فەرمووی: بە ئارەزوومەندی یا بێزارییەوە وەرنە پێش. وتیان: گوێرایەڵ هاتین. یانی خواوەندی پەروەردگار بەئاسمانەکانی فەرموو: هەتاو و مانگ و ئەستێرەکانی من بکەنە بەخت و شانس. بەزەوی ووت: رووبارەکان دروست بکە و میوەکان بەرهەم بێنە. وتیان: فەرمان بەرین.

لەقتادە دەگێڕنەوە: خواوەند فەرمانی خۆی بۆ ئاسمانەکان ڕەوانە کرد و هەتاو و مانگ و ئەستێرە و نەزمی ئەوانی ئافراند.

ئەم حەدیسانە لەپێغەمبەر گێڕامانەوە لەگەڵ گێڕانەوەکانی دیکە ئاشکرای کرد کەخواوەند، ئاسمان و زەوییەکانی پێش زەمانەکان و ڕۆژەکان و شەوەکان و پێش هەتاو و مانگ ئافڕاند و خوا زاناترە.

## وتـار سەبـارەت بەوەی زەمان و شەو و ڕۆژ
## لەنـاو بچێت و جگە لەخواوەند هیچ شتێك نەمێنێتەوە.

بەڵگەی ڕاستی ئەم قسەیە وتاری خواوەندی گەورەیە:

((کل من علیها فان و یبقی وجه ربك ذوالجلال و الاکرام.

واتاکەی: ئەوەی لەسەر زەوی لەناو دەچێت. و زاتی پەروەردگار دەمێنێتەوە کە خاوەن شکۆ و ڕێزدارییە)). و هەروەها ئایەی خواوەند: ((لا اله الا هو کل شیئی هالك الاوجه،

واتاکەی: خوایەك جگە لەخواوەند نییە. هەمو شتێك جگە لەزاتی خواوەند لەناو دەچێت)). بەپێی وتاری خواوەند هەموو شتێك جگە لەخوا لەناو دەچێت و شەو و ڕۆژ و تاریکی و نووری بۆ بەرژەوەندی ئافراند بەهەمان شێوە کە فەرموویەتی لەناو دەچن و هەروەها فەرموویەتی: (( و کاتێك هەتاو تاریك دەبێت)) یانی کوێر دەبێت و نورەکەی نامێنێت و ئەمە لەکاتی ڕۆژی هەستانەوەیە. ئەم بابەتە پێویستی بەشی کردنەوە نییە چوونکە هەموو باوەڕداران لەشوێنکەوتەکانی تەورات و ئینجیل و ئیسلام و ئاگرپەرستەکان باوەڕیان پێیەتی و تەنیا دەستەیەك لە ناباوەڕان حاشا لەم ڕاستیە دەکەن کە ئێمە لەم کتێبەدا مەبەستمان دەرخستنی هەڵەکانی ئەوان نییە. ئەوانەی باوەڕیان وایە جیهان کۆتایی دێت وجگە لەخواوەند کەس نامێنێتەوە، باوەڕیان وایە کەخواوەند دوای لەناوبردن، زیندوویان دەکاتەوە و دوای مردن هەڵیاندەستێنێتەوە بەپێچەوانەی دەستەیەك لە ناباوەڕان کە حاشا لەحەشر و نەشر دەکەن.

## وتار سەبارەت بەوەی خواوەند کۆنە و پێش هەموو شتێك بووە و ئەو بەتوانایی خۆی هەمو شتەکانی ئافراندوە

بەڵگەی ئەم وتەیە، ئەوەی لەجیهاندا بەچاو ببینرێت، مادەیە یا پەیوەندیدار بەمادە، ئەوەی مادە بێت، یا جیایە یا پەیوەست، ئەوەی جیا بێت گوومانی یەکگرتنەوەی لێ دەکرێت و ئەوەی پەیوەست بێت گوومانی جیابونەوەی لێ دەکرێت. کاتێك یەکیان لەناو بچێت، ئەوەی دیکەیشیان لەناو دەچێت و کاتێك دو بەش پەیوەستی یەك ببن، ئاشکرایە کە یەکگرتنیان تازەیە و کاتێك جیاببنەوە، ئاشکرایە کە جیابوونەوە روویداوە. و چوونکە هەموو بوونەوەرەکانی جیهان لەمادە و پەیوەست بەمادەن، بەمشێوەن و ئەوەی نەمانبینیوە و لەرەگەزی بینراوەکانە، ئەگەر بەرێکەوت پەیوەستی یەك بووبن، بێ چەند و چوون رووداوە و ئەگەر یەکگرتوو بن. هێزێك ئەوانی کۆکردۆتەوە و ئەگەر جیا بن، جیاکەرەوەیەك ئەوانی جوێ کردۆتەوە. ئاشکرایە کە کۆکەرەوە و جوێ کەرەوە هاوشێوەی ئەو نییە و کۆبوونەوە و جوێ بوونەوە بێ خوا ڕەوا نییە و تەنیا خۆی کۆکەرەوەی شتە جۆراوجۆرەکانە کە هیچ کەسێك هاوشێوی ئەو نییە و بۆ هەموو شتێك بەتوانایە.

لەم وتانە بۆمان سەلمێنرا ئافرێنەر و بەدیهێنەری شتەکان پێش هەموو شتێك بووە و شەو و رۆژ و زەمان و کاژێرەکان ئافرێنراون و ئافرێنەری داهێنەری پێش ئەو زەمانە بووە کە شتەکان بئافرێنێت و بەناچار دەبێت پێش ئەوان بێت.

وتاری خواوەند:

(( افلا ينتظرون الى الابل كيف خلقت و الى السماء كيف رفعت والى الجبال كيف نصبت و الى الارض كيف سطحت،

واتاکەی: بۆ سەیری وشتر ناکەن تا بزانن بەچ شێوەیەك ئافرێنراوە و ئاسمانەکان بەچ شێوەیەك هەڵکراون. کێوەکان بەچ شێوەیەك جێگر و زەوییەکان بە چ شێوەیەك راخراون)). بۆ کەسێکی بیرمەند و وانەوەرگری تێگەیشتوو

بەڵگەیەکی ئاشکرایە کە ئافرێنەرێکی هەیە کەهاوشێوەی خۆی نییە. کێو و زەوی و وشتر کەخواوەند لەم ئایەدا ئاماژەی پێداون بەشێوەیەکە کە مرۆڤ دەتوانێت تیایدا بەرێگادا بڕوات، هەڵکەنێت و بتاشێت و وێران بکات بەڵام مرۆڤ ناتوانێت شتێکی هاوشێوەی ئەوان دروست بکات و هەرکەس توانایی بۆ ئەنجامدانی ئەم کارانە نەبێت، نە ئافرێنەری خۆیەتی نە ئافرێنراوی ئافرێنەری کەسێکی وەك خۆی بەڵکو ئافرێنەرەکەی خواوەندی کردگارە کە ئەوەی بخوازێت، دەیهێنێتە بوون چوونکە ئەو تاقانەی قەهھارە.

ئەگەر بڵێن: ئەگەری هەیە ئافرێنراوەکان، ئافرێنەری دوو خواوەند بن.

دەڵێین: ڕەوا نییە چوونکە چارەسەر راست و کەماڵی خیلقەت ئاشکار و ئەگەر ئافرێنەر دووان بێت یاسازگارن یا نەیار. ئەگەر سازگاربن. لەمانادا یەکێکن و ئەوەی باوەڕی بەدوو خواوەندی هەیە، یەکی کردووە بەدووان و ئەگەر نەیار بن، خیلقەت ناتەواو و چارەسەر ناڕاست لەبەر ئەوەی بەردەوام یەکێك لەم دووانە کارێك بەپێچەوانەی ئەوی دیکە ئەنجام دەدات، یەکیان زیندوو بکاتەوە و ئەوەی دیکە بمرێنێت و کاتێك یەکێك بئافرێنێت، ئەوی دیکە وێرانی بەبار بێنێت. وتاری خواوەند کە دەفەرمێت:

((لو کان فیهما آلهة الا الله لفسد تا فسبحان الله رب العرش عما یصفون،

واتاکەی: ئەگەر لەئاسمان و زەوی جگە لەخوای تاقانە، خواکانی دیکە دەبوون، لەناو دەچون.))

دەفەرمێت: ((ما اتخذالله من ولدوما کان معه من اله اذا لذهب کل اله بما خلق و لعلا بعضهم علی بعض. سبحان الله عما یصفون. عالم الغیب و الشهادة فتعالی عما یشرکون.

واتاکەی: خواوەند مناڵی نییە لەدایك بووی خوایەکی دیکە نییە وگەرنە هەر خوایەك ئافرێنراوەکانی خۆی دەبرد و دەستەیەك پێش کەسانی دیکە دەکەوتنەوە. خواوەندی تاقانە لەوەی وەسفی دەکات، پاکە. زانای غەیب و شایەتییەکانە. و لەوەی دەیکەنە شەریکی ئەو، گەورەترە)). ئەمە بەڵگەیەکی

کورت و ئاشکرایە بۆ بەتاڵ کردنەوەی وتاری ناباوەڕان و کافران چوونکە ئەگەر لەئاسمان و زەوییەکان جگە لەخوای تاقانە، خواکانی دیکە بوونیان دەبوو، بەسازگاری یا ناسازگاری کارەکانیان کۆتایی دەهات و گوومانی سازگاری، رەدکردنەوەی بیرۆکەی دووەمە و دڵنیا بوون لەتاقانەیی و ناوبردنی یەك خوا بەدووان. گومانی ناسازگاری کردنی ئەوان دەبێتە هۆی فێرۆیی و لەناوچونی ئاسمانەکان و زەوی چوونکە خواوەند دەفەرمێت ئەگەر لەئاسمان و زەویەکان دو خواوەند بوونیان دەبوو، فیرۆیی روی دەدا چوونکە کاتێك یەکیان شتێك بئافرێنێت، ئەوەی دیکەیان بە لەناوبردنی سەرقاڵ دەبێت چوونکە کرداری جیاوازەکان، جیاوازە. هاوشێوەی ئاگر کەگەرم و بەفر کە گەرم کراو بەئاگر سارد دەکاتەوە.

بەڵگەیەکی دیکە، ئەگەر بەو شێوە بێت کە کافرەکان دەڵێن دوو خوا ئەگەری هەیە بەتوانا یا ناتەوان بن. ئەگەر ناتەوان بێت، ناتوانێت خوا بێت و ئەگەر بەتوانا بێت، هەرکام لەبەرابەر ئەوەی دیکەیان ناتەوانە و لاواز و خواوەند هیچ کات نە اتەوانە و نەلاواز. ئەگەر لەبەرابەر ئەوی دیکەیان بەتوانابێت، کەواتە ئەوەی دیکەیان خوا نییە و خواوەند لە گومانی کافران بێ بەرییە.

بۆمان دەرکەوت کەخواوەند ئافرێنەری شتەکان، تاقانەیەکە پێش هەر شتێك بوونی هەبووە و دوای هەر شتێك بوونی دەبێت. کاتێك خوا بوو، کات و زەمان و شەو و رۆژ و تاریکی و نوور، جگە لەنووری خواوەند و ئاسمان و زەوی و هەتاو و مانگ و ئەستێرە نەبوو و هەر شتێك جگە لەو، ئافرێنراوە، خەڵکانی بێ یار و پشتیوان ئافراند و خواوەند قادری قاهرە.

لە باوکی هورەیرە دەگێڕنەوە: پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: دوای من لەهەموو شتێك دەپرسن تا ئەو جێگەی کەدەڵێن، خواوەند کە هەموو شتێکی ئافراندوە، ئەی ئافرێنەری خۆی کێیە؟

و لەگێڕانەوەیەکی دیکە ئەبو هورەیرە دەڵێت: کاتێك خەڵکان ئەم پرسە لەئێوە بپرسن، بڵێن خواوەند هەموو شتێکی ئافراند، خواوەند پێش هەموو شتێکە و دوای هەموو شتێك. و کاتێك سەلمێنرا کەخواوەند ئافرێنەر و

بەدیهێنەری شتەکانە و هیچ لەگەڵ ئەودا نەبووە. شتەکانی ئافراند و ڕێگە چارەی بۆ دانان و پێش ئافراندنی زەمان وکات و هەتاو و مانگ کە کات و کاژێرەکان و مێژوو. بەهۆی ئەوانەوە دەناسنەوە، ئافرێنراوەکانی دیکەی ئافراند.

ئێستا باسی ئەوە دەکەین کە یەکەم ئافرێنراو چی بوو.

## وتار سەبارەت بەسەرەتایی ئافراندن و ئافرێنراوی سەرەتا

دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: یەکەم ئافرێنراوی خواوەند پێنووس بوو کە پێی وت بنووسە و لەو ساتەدا ئەوەی دەبێت ببێت، نووسرا. لە کوڕی عەباس دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: خواوەند یەکەم جار پێنووسی ئافراند و وتی ئەوەی هەیە و نییە بنووسێت. گێڕانەوەی لەم چەشنە فراوانە.
کەسانی دیکە وتوویانە یەکەم ئافرێنراو نوور و تاریکیە.

## ئاماژەدان بەبێژەری ئەم وتارە

لە کوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە کەئافرێنراوی یەکەم نوور و تاریکی بو، خواوەند ئەوانی لەیەك جویَ کردەوە و تاریکی کردە شەوی تاریك و ڕەش و نووری کردە ڕۆژی ڕۆشن و ئاشکرا.
ئەبو جەعفەر دەڵێت: بەبۆچوونی من وتاری کوڕی عەباس ڕاستە بەپێی ئەو حەدیسانەی لە پێغەمبەر(د.خ) گێڕامانەوە کە فەرمووی ئافرێنراوی یەکەم پێنووسە.

## ئاماژەدان بەئافرێنراوی دوای پێنووس

خواوەندی بەتوانا دوای ئەوەی پێنووسی ئافراند و فەرمانی پێدا ئەوەی دەبێت ببێت، تارۆژی هەستانەوە بینووسێت، هەورێکی چڕی ئافراند. ئەمە ئەو

هەورەیە کە خواوەند لەقورئاندا ناوی دەبات و دەفەرمێت: ((ئایا چاوەڕوان نییە خواوەند لەسێبەری هەورێك بڕواتە لایان)). ئەمە پێش ئافراندنی عەرش بوو کە بەحەدیسی پێغەمبەر(د.خ) پشتڕاست کراوەتەوە. بێژەرەکەی دەڵێت، لەپێغەمبەرم پرسی، خواوەند پێش ئەوەی شتەکان بئافرێنێت، لەکوێدا بوو؟

فەرمووی:(( لەتاریکیدا بوو، ژێرەوەی هەوا و سەرەوەی هەوا بوو. دواتر عەرشی خۆی لەسەر ئاو ئافراند)). ئاماژەیان بەحەدیسێکی دیکەی لەمشێوە داوە.

هەروەها دەڵێت: دەستەیەك ڕۆشتنە لای پێغەمبەر(د.خ). لەگەڵ ئەوان قسەی دەکرد و ئەوان دەیانوت: ((زانیاریمان پێ ببەخشە)). پێغەمبەر لێیان ڕەنجا، ئەو دەستەیە ڕۆشتن و دەستەیەکی دیکە هاتن و وتیان: ((هاتووین سڵاو بۆ پێغەمبەر(د.خ) بنێرین و فیقهی دینی فێر ببین و لەسەرەتای ئافراندن بپرسین)).

فەرمووی: بەمژدەی بەهەشت کە ئەم کەسانەی پێش ئێوە پێی رازی نەبوون، رازی بن.

وتیان: رازین.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: (( تەنیا خواوەند بوو بێ ئەوەی هیچ شتێك و هیچ کەسێکی لەگەڵدا بێت، عەرشەکەی لەسەر ئاو و لە لەوحەکە، ئاماژەی پێدرابوو. دوای ئەو حەوت ئاسمانی ئافراند.))

ئەوسا یەکێك هاتە لای من و وتی: (( وشترەکەی تۆ ڕۆشت و من هاتمەدەر و تراوێلکە لەمپەر بوو، ئارەزووم دەکرد وشترەکەم بەجێدەهێشت.))

سەبارەت بەئافرێنراوی دوای تاریکی بۆچونەکان جیاوازە و دەستەیەك وتوویانە کە عەرشی ئافراند.

## ئاماژەدان بەبێژەری ئەم وتەیە

لە کوڕی عەباس دەگێڕنەوە کە خواوەند عەرشی پێش هەموو شتێك ئافراند و لەسەر عەرش جێگەی گرت و دەستەیەکی دیکە وتوویانە خواوەند ئاوی پێش عەرش ئافراند و دواتر عەرش و لەسەر ئاو جێگیری کرد.

## ئاماژەدان بەبێژەری ئەم قسەیە

لەدەستەیەك لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) دەگێڕنەوە کەعەرشی خواوەند لەسەر ئاو جێگیر و هێشتا جگە لەئافرێنراوەکانی پێش ئاو، هیچی دیکە نەئافرێنرا بوو. لەوەهب کوڕی مونبە دەگێڕنەوە کە پێش ئافراندنی ئاسمانەکان و زەوی، عەرش لەسەر ئاو بوو و کاتێك خواوەند ئیرادەی کرد و فەرمانی ئافراندنی ئاسمانەکان و زەوی دەرکرد، پر بەمشتێك لەکەف ئاوی هەڵگرت و مشتی کردەوە و هەڵمێك بەرز بوویەوە و لەو ڕۆژەدا حەوت ئاسمانی ئافراند و لەماوەی دو ڕۆژدا زەوی بڵاو کردەوە و لەڕۆژی حەوتەم لەئافراندن تەواو بوو.

دەڵێن پەروەردگار بەدوای پێنووس کورسی ئافراند و بەدوای کورسی عەرش. دوای ئەوە هەوا و تاریکییەکانی ئافراند. دواتر ئاو و عەرشی خۆی لەسەر ئاو جێگیر کرد.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: ئەمە ڕاستتر بەرچاو دەکەوێت کە خواوەند ئاوی پێش عەرش ئافراندبێت چوونکە لەحەدیسی پێغەمبەرەوە بۆمان دەرکەوت کە فەرموویەتی خواوەند پێش ئافراندنی خەڵکان لەتاریکیدا بوو کە ژێرەوەی هەوا و سەرەوەی هەوا بو، دواتر عەرشی خۆی لەسەر ئاو ئافراند. و کاتێك پێغەمبەر(د.خ) دەڵێت خواوەند عەرشی لەسەر ئاو ئافراند، ڕەوا نیصە عەرش لەسەر ئاو دروست بکرێت و ئاو پێش ئەوە یا لەگەڵ ئەودا نەئافرێنرا بێت و ئەگەر بەم شێوە بێت، یەکێك لەم دو حاڵەتەیە: یا ئاو پێش عەرش ئافرێنراوە و یا لەگەڵ ئەودا. ڕەوا نیصە عەرش پێش ئاو ئافرێنرابێت. لەمبارەوە لە پێغەمبەر(د.خ) حەدیسێك دەگێڕنەوە و وتوویانە کە لەکاتی ئافراندن، عەرش لەسەر ئاو و ئاو لەسەر هەوا بوو و ئەگەر بەم شێوە بێت، ئاو و هەوا پێش عەرش ئافرێنراون.

دەگێڕنەوە کە لە کوڕی عەباس سەبارەت بەوتاری خواوەند پرسیاریان کرد کەدەفەرمێت: ((عەرش لەسەر ئاو بو)) ئاو لەسەر چی بوو؟ وتی: لەسەر هەوا.

بەم ناوەرۆکە ئاماژەیان بەگێڕانەوەیەکی دیکە داوە.

دەڵێن: ئاسمانەکان و زەوی و هەمو بوونەوەرەکان و شتەکان لەناو دەریاکاندا بوو. ئەمە هەمان پەیکەرە و پەیکەر لەنێوان کورسیدا بوو.

ئاماژەدان بەبێژەری ئەم وتەیە:

لەوەهب دەگێڕنەوە کەباسی گەورەیی خوای دەکرد کە ئاسمانەکان و زەوی و دەریاکان لەم پەیکەرەدایە و پەیکەر لەناو کورسی و هەنگاوی خواوەند لەسەر کورسیەکە. کورسی هاوشێوەی پێپۆشی هەنگاوەکانی ئەوە.

پرسیان: پەیکەر چییە؟

وتی: شتێکە لەدەوروبەری ئاسمانەکان کەهاوشێوەی تەناف خێوەت، دەوری زەوی و دەریاکانی داوە.

هەروەها سەبارەت بەچۆنییەتی زەوییەکان پرسیاریان لێکرد؟

وتی: حەوت زەوی بڵاو کراوەتەوە هاوشێوەی دوورگەکان لەنێوان هەردو زەوییەك دەریایەکە و دەریا هەموو زەوییەکانی گرتۆتەوە و لەپشت دەریاوە پەیکەرە.

دەڵێن لەنێوان ئافراندنی پێنووس تا ئافراندنی شتەکانی دیکە هەزار ساڵە.

ئاماژەدان بەبێژەری ئەم وتەیە

لەزەمورە دەگێڕنەوە کە خواوەند پێنووسی ئافراند و بەپێنووس، هەمووی ئەو شتانەی مەبەستی کردبوو بیانئافرێنێت و یا ئەوانەی دەبێت ببن، نووسی و ئەم نوسراوە هەزار ساڵ پێش ئەوەی هیچ شتێك بێتە بوون، سوپاس و ستایشی خواوەندی کرد و کاتێك خواوەند ئیرادەی کرد ئاسمانەکان و زەوی بئافرێنێت، لەناو ئەو شتانەی ئافراندی شەش ڕۆژ بوو کە هەرکامیانی بەناوی ئەوی دیکەوە ناونا.

دەڵێن ناوی یەکێك لەم شەش ڕۆژە ئەبجەد و ناوی یەکی دیکە هوز و سێیەمی حەتی و چوارەمی کولمەن و پێنجەم سەعفص و شەشەمی قرشت بوو.

ئامارژەدان بەبێژەری ئەم وتەیە

لەزوحاك كوڕی موزاحیم دەگێڕنەوە كە خواوەند ئاسمانەكان و زەوی لەشەش ڕۆژدا ئافراند و هەر ڕۆژە ناوێكی بوو كە ئەبجەد و هوز و حەتی و كولمەن و سەعفص و قرشت بوون.

ئامارژەیان بەگێڕانەوەیەكی دیكەی هاوشێوە داوە.

بەڵام كەسانی دیكە وتوویانە خواوەند ڕۆژێكی ئافراند و ناوی نا یەك شەممە و ڕۆژی دووەمی ئافراند و ناوی نا دوو شەممە و ڕۆژی سێیەم و ناوی نا سێ شەممە و ڕۆژی چوارەمی ناونا چوارشەممە و ڕۆژی پێنجەمی ناونا پێنج شەممە.

ئامارژەدان بەبێژەری ئەم وتەیە

لە كوڕی عەباس دەگێڕنەوە كە خواوەند یەك ڕۆژی ئافراند و ناوی نا یەك شەممە و ڕۆژێكی دیكەی ئافراند و ناوی نا دووشەممە و ڕۆژی سێیەمی ئافراند و ناوی نا سێ شەممە و ڕۆژی چوارەم بە چوارشەممە و ڕۆژی پێنجەمی ئافراند و ناوی نا پێنج شەممە.

لەم دوو گێڕانەوەدا هیچ جیاوازیەك نییە و ڕەوایە ناوی ڕۆژەكان بەزمانی عەرەبی بەو شێوە بێت كە لە كوڕی عەباس دەگێڕنەوە و بە زمانەكانی دیكە بەو شێوە بێت كە زوحاك كوڕی موزاحیم ئامارژەی پێداوە.

هەروەها دەڵێن ڕۆژەكان حەوت ڕۆژە نەك شەش.

ئامارژەدان بە بێژەری ئەم وتەیە

لەوەهب كوڕی مونبە دەگێڕنەوە كە ڕۆژەكان حەوت بوون. ئەم دوو وتارە كە یەكیان لە زوحاكە و دەڵێت خواوەند شەش ڕۆژی ئافراند و ئەوی دیكەیان وەهب كەدەڵێت ڕۆژەكان حەوت بوو، ڕاستە و هیچ جیاوازییەكی نییە چوونكە مانای وتارەكەی زوحاك ئەوەیە ڕۆژەكانی ئافراندنی خواوەند لەسەرەتایی دەسپێكی

ئافڕاندنی ئاسمانەکان و زەوی و بوونەوەرەکان تا کاتی تەواو بوون شەش رۆژە بەهەمان شێوەکە خوا دەفەرمێت : ((ئەوە کەئاسمانەکان و زەوی لەماوەی شەش رۆژدا ئافراند و مانای وتارەکەی وەهب ئەوەیە کە ژمارەی رۆژەکان لەگەڵ هەینی حەوتە نەك شەش.

پێشینان سەبارەت بەرۆژی دەسپێکی ئافڕاندنی ئاسمانەکان و زەوی بۆچوونەکانیان جیاوازە، دەستەیەك دەڵێن رۆژی یەك شەممەیە.

ئاماژەدان بە بێژەری ئەم وتەیە

لە عەبدالله کوڕی سەلام دەگێڕنەوە کە خواوەند ئافڕاندنی دەست پێکرد و زەوی لەرۆژی یەك شەممە و دووشەممەدا ئافڕاند.

ئامارەیان بەگێڕانەوەیەکی دیکەی هاوشێوە داوە.

لەزوحاك لەلێکدانەوەی وتاری خواوەند کەدەفەرمێت:((ئەوە کەئاسمانەکان و زەوی لەماوەی شەش رۆژدا ئافڕاند)) دەگێڕنەوە کەشەش رۆژ لەرۆژەکانی رۆژی پەسلان بوو کەهەرکام هەزار ساڵ و ئافڕاندنی لەرۆژی یەکشەممە دەست پێکرد.

دەستەیەکی دیکە وتوویانە سەرەتایی ئافڕاندن لەرۆژی شەممە دەستی پێکرد.

ئامارەدان بە بێژەری ئەم وتەیە

محەممەد کوڕی ئیسحاق دەڵێت بەوتەی شوێنکەوتەکانی تەورات خواوەند لەرۆژی شەممە ئافڕاندنی دەست پێکرد. شوێنکەوتەکانی ئینجیل دەڵێن سەرەتایی ئافڕاندن لەرۆژی دوشەممەدا بوو وموسوڵمانەکان بەپێی حەدیسی پێغەمبەر(د.خ) دەڵێن خواوەند لەرۆژی شەممە ئافڕاندنی دەست پێکرد.

هەر دودەستەکە کە یەکیان سەرەتای ئافڕاندن بەرۆژی یەك شەممە دەزانێت و کەسانی دیکە کەسەرەتای ئافڕاندن بەرۆژی شەممە دەزانن، پشت بەوتاری پێغەمبەر(د.خ) دەبەستن. ئێمە ئامارەمان بەم دو گێڕانەوەیەدا و پێویستە لێرەدا

باسیان بکەین.

حەدیس سەبارەت بەوتاری ئەوانەی دەڵێن سەرەتای ئافراندن ڕۆژی یەك شەممەیە لەکوڕی عەباسە کەجولەکەکان هاتنە لای پێغەمبەر(د.خ) وسەبارەت بە ئافراندنی ئاسمانەکان و زەوی پرسیاریان کرد و وتی: خواوەند زەوی لەڕۆژی یەکشەممە و دووشەممە ئافراند.

حەدیس سەبارەت بەوتاری ئەوانەی دەڵێن سەرەتای ئافراندن ڕۆژی یەکشەممە بولەئەبو هورەیرەیە کەدەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) دەستی گرتم و فەرمووی: خواوەند خاکی لەڕۆژی یەکشەممە ئافراند.

وتاری یەکەم کەدەڵێت خواوەند ئافراندنی ئاسمانەکان و زەوی لەڕۆژی یەکشەممە دەست پێکرد، ڕاسترە چوونکە زانا پێشینەکان لەسەر ئەوە کۆکن.

وتاری کوڕی ئیسحاق لەسەر ئەو بنەمایە کە خواوەند لەئافراندنی هەمو شت و بوونەوەرەکان لەڕۆژی هەینی کۆتایی بوو کە ڕۆژی حەوتەمە و لەسەر عەرش دانیشت و ئەو ڕۆژەی کردە جەژنی موسوڵمانان. بەڵگەی گومانەکەی ئەو ئاشکراکەری هەڵەی ئەوە. چوونکە خواوەند لەچەند شوێنێك بەندەکانی خۆی ئاگادار کردۆتەوە کەئاسمانەکان و زەوی و بونەوەرەکانی لەماوەی شەش ڕۆژدا ئافراند و دەفەرمێت:

((الله الذی خلق السموات و الارض و ما بینهما فی ستة ایام ثم استوی علی العرش مالکم من دونه من ولی و لا شفیع افلا تتذکرون.

واتاکەی: خواوەندی تاقانەیە کەئاسمانەکان و زەوی وهەموو شتەکانی نێوانیانی لەماوەی شەش ڕۆژدا ئافراند. دواتر سەرقاڵی عەرش بوو. جگە لەو هاوڕێ و پشتیوانێکتان نییە. بۆ وانە وەرناگرن؟))

دوباره خواوەند دەفەرمێت:

((قل ائنكم لتكفرون بالذی خلق الارض فی يومين و تجعلون له اندادا ذلك رب العالمين. و جعل فيها رواسی من فوقها و بارك فيها و قدر فيها اقواتها فی اربعة ايام سواء للسائلين. ثم استوی ال السماء و هی دخان فقال لها و للارض ائتياطوعا

اوكرها قالتا اتينا طائعين. فقضاهن سبع سموات في يومين و اوحى.

((واتاكەی: بڵێ: بۆ ئێوە بەو كەسەی زەوی لەماوەی دوو ڕۆژدا ئافراند كافر دەبن و هاوتا و شەریك بۆ ئەو دادەنێن. ئەو، پەروەردگاری جیهانیانە. لەماوەی چوار ڕۆژی دیكە لەسەر زەوی لەنگەرەكانی دروست كرد و بەرەكەتەكانی تیا جێ كردەوە و خواردنەكانی دەستنیشان كرد. بۆ پرسكەران چوار ڕۆژ بەس و تەواوە. دواتر سەرقاڵی ئاسمان بوو كە هەڵمێك بوو و بە ئاسمان و زەوی وت بەئارەزوومەندی یا بێزارییەوە دەركەون. وتیان: بەئارەزوومەندییەوە دێین و لەماوەی دوو ڕۆژدا كردی بەحەوت ئاسمان و فەرمانی خۆی بۆ هەر ئاسمانێك ڕەوانە كرد.

زاناكان بۆچوونیان جیاواز نییە لەسەر ئەوەی ئەو دوو ڕۆژە ئامارژە پێدراوە لەوتاری خواوەند كە فەرمووی (( و لە ماوەی دو ڕۆژ حەوت ئاسمانی دروست كرد)) لەناو ئەو شەش ڕۆژەدایە كەپێشتر ئامارژەمان پێدا. لای موسوڵمانان ئاشكرایە كە خواوەند ئاسمانەكان و زەوی و هەموو بوونەوەرەكانی لەماوەی شەش ڕۆژدا ئافراند. چەندین حەدیسیان لە پێغەمبەر(د.خ) گێڕاوەتەوە كەدوایین ئافرێنراوی خواوەند ئادەمە كە ئافراندنی ئەو لەڕۆژی هەینی و ڕۆژی هەینی ڕۆژی تەواو بوونی ئافراندن و لەناو ئەو شەش ڕۆژەدایە كە خواوەند فەرمووی ئافراندنی لەماوەی ئەو شەش ڕۆژەدا كردووە و ئەگەر بەم شێوە نەبێت ئافراندن لەماوەی حەوت ڕۆژ كۆتایی پێهاتوە نەك شەش ڕۆژ و ئەمە بەپێچەوانەی وتاری خواوەندە.

بۆمان دەركەوت كەیەكەم ڕۆژی ئافراندن ڕۆژی یەكشەممەیە. چوونكە هەینی ڕۆژی كۆتایی و هەموو ڕۆژەكان شەش ڕۆژە بەهەمان شێوە كە خواوەند فەرموویەتی. حەدیسەكان لە پێغەمبەر(د.خ) و ئەصحابەكان دەگێڕنەوە كەتەواو بوونی ئافراندن لەڕۆژی هەینیدا بوو كە لەكاتی خۆیدا بەخواستی خوا ئامارژەی پێدەدەین.

## وتـار سەبارەت بەوەی لەهەرکام لەو شەش رۆژە ئاماژە پێدراوە لەکتێبەکەی خواوەند چ شتێك ئافرێنرا

زانا پێشینەکان لەمبارەوە بەجیاوازی قسەیان کردووە. لە عەبدالله کوڕی سەلام دەگێرنەوە کە وتی خواوەند ئافڕاندنی لەرۆژی یەکشەممە دەسپێکرد وزەوییەکانی لەرۆژی یەکشەممە ودوشەممە ئافڕاند و رۆژییەکان و کێوەکانی لەرۆژی سێ شەممە و چوار شەممە و ئاسمانەکانی لەرۆژی پێنجشەممە و هەینی ئافڕاند. لەدوایین کاژێرەکانی رۆژی هەینی لەئافڕاندن تەواو بوو و بەخێرایی ئادەمی ئافڕاند و رۆژی هەستانەوە لەم کاژێرەدا دەبێت.

لە ئەصحابەکانی پێغەمبەر(د.خ) دەگێڕنەوە کە خواوەند حەوت زەوی لەرۆژی یەکشەممە و دوشەممە ئافڕاند و کێوەکانی بۆ رێگرتن لەئەرد هەژێن لەسەر زەوی جێگیر و رۆژی خەڵکان و دارەکانی لە رۆژی سێشەممە و چوارشەممە ئافڕاند. دواتر دەستی بەئافڕاندنی ئاسمان کرد کە هەڵمێك بوو وئاسمانێکی لێ دروست کرد. ئەوسا لەرۆژی پێنجشەممە و هەینی قەڵشتی و حەوت ئاسمانی لێ دروست کرد.

لە کوڕی عەباس دەگێڕنەوە کە خواوەند زەوی لەرۆژی یەکشەممە و دوشەممە ئافڕاند.

بەپێی گێڕانەوەی ئەوان زەوی پێش ئاسمان ئافرێنرا چوونکە ئافڕاندنەکەی لەرۆژی یەکشەممە و دوشەممەدا بوو.

کەسانی دیکە وتویانە کە خواوەند زەوی لەگەڵ رۆژی کەسەکانی ئافڕاند بەلاّم بلاّوی نەکردووە. دواتر سەرقاڵی ئافڕاندنی ئاسمان بوو و دوای ئەوە زەوی بلاّو کردەوە.

ئامارژەدان بە بێژەری ئەم وتەیە

لە کوڕی عەباس دەگێڕنەوە خواوەند کە لەقورئاندا ئامارژەی بەئافراندنی زەوی پێش ئاسمان و لەشوێنیکی دیکەدا ئامارژەی بەئافراندنی ئاسمان پێش زەویداوە لەبەر ئەوەیە کە زەوی و رۆژی کەسەکانی پێش ئاسمان ئافراند بەڵام زەوی بڵاو نەکردووە. دوای ئەوەی لەئافراندنی ئاسمان تەواو بوو و بۆ حەوت ئاسمان دابەشی کرد، زەوی بڵاو کردەوە و وتاری خواوەند بەمشێوەیە کەزەوی دوای ئافراندنی ئاسمان بڵاو کردەوە.

هەروەها لە کوڕی عەباس دەگێڕنەوە وتاری خواوەند کەفەرمووی:((دوای ئەوە زەوی بڵاو کردووە. و ئاو و لەوەرگەی لەسەر زەوی دروست کرد و کێوەکانی جێگیر کرد، مەبەست ئەوەیە کەخواوەند ئاسمانەکان و زەوی ئافراند و لە ئافراندنی ئاسمان پێش ئافراندنی خەڵکان تەواو بوو. دواتر رۆژییەکانی لەسەر زەوی بڵاو کردەوە و زەوییەکانی جێگر کرد و مانای بڵاو کردنەوەی زەوی ئەمەیە کەرۆژی و ڕوەکەکانی زەوی تەنیا لەشەو و رۆژدا ئافرێنران و مەبەست لەوتاری خواوەند کەزەوی دوای ئەوە بڵاو کردەوە، ئەمەیە. مەگەر نەتبیست کەفەرمووی: ((ئاو و لەوەرگەی لەسەر زەوی دروست کرد)).

ئەبو جەعفەر دەڵێت: وتاری راست لای ئێمە گێڕانەوەی ئەو کەسانەیە کەوتوویانە خواوەند زەوی لەرۆژی یەکشەممەدا ئافراند و ئاسمانی لەرۆژی پێنجشەممە و ئەستێرەکان و خۆر و مانگی لەرۆژی هەینی. بەهۆی ئەو گێڕانەوەی لەکوڕی عەباس لەپێغەمبەر ئامارژەمان پێدا وبەپێی گێڕانەوەکەی کوڕی عەباس، ئەگەری هەیە خواوەند زەوی ئافراندبێت بەڵام بڵاوی نەکردبێتەوە ودواتر ئاسمانەکانی ئافراندبێت. دواتر زەوی بڵاو کردبێتەوە و زەوی و کێڵگەکانی بەدیهێنابێت و کێوەکانی جێگیر کردبێت. وتاری راست لای من ئەوەیە کە مانای بڵاو کردنەوە جیاوازە لەئافراندن چوونکە خواوەند دەفەرمێت:

(( أ انتم اشد خلقا ام السماء بناها. رفع سمكها فسواها. و اغطش ليلها و اخرج

ضحاها. و الارض بعد ذلك دحاها. اخرج منها مائها و مرعاها. و الجبال ارساها.

واتاکەی: ئافراندنی ئێوە دژوارترە یا ئاسمان کەخواوەند ئافرێنەریەتی. تاقی ئاسمانی بەرز کردۆتەوە و جێگیری کردووە. شەوەکەی تاریك و رۆژەکەی رووناك و دوای ئەوە زەوی بلاو کردۆتەوە. و ئاو و لەوەرگەی لێ بەدیهێناوە و کێوەکانی بەهێز کردووە)).

ئەگەر کەسێك بلێت دەستەیەك لەزاناکانی قورئان، وتاری خواوەند کەفەرموویەتی زەوی دوای ئەوە بلاو کردەوە، بەم مانایە کە زەوی لەگەڵ ئەودا بلاو کردۆتەوە و بەلگەی وتارەکەی تۆ چییە کەدەڵێی ئەمە بەمانای دوای ئەوەیە؟

دەڵێین کە مانای (بعد) لەزمانی عەرەبیدا ئەوەیە کەوتمان و بەمانای دژی (قبل) نە بەمانای (لەگەڵ). و جگە لەمە ڕەوا نییە.

دەستەیەك وتوویانە کەخواوەند دوهەزار ساڵ پێش ئافراندنی جیهان کەعبەی بەچوار روکن، لەسەر ئاو ئافراند. دواتر لەژێر کەعبە زەوی بلاو کردەوە.

ئاماژەدان بە بێژەری ئەم وتەیە

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە کەخواوەند دوو هەزار ساڵ پێش ئافراندنی جیهان ماڵی کەعبەی لەسەر چوار روکن لەسەر ئاو ئافراند و دواتر زەوی لەژێر کەعبە بلاو کردەوە.

لە عەبداللە کوڕی عومەریش دەگێڕنەوە کە خواوەند، کەعبەی دوو هەزار ساڵ پێش زەوی ئافراند و زەوی لەناو ئەودا بلاو کردەوە.

بەمپێیە، ئافراندنی زەوی پێش ئافراندنی ئاسمانەکان بووە وبلاو کردنەوەی زەوی، دابەش کردنی رۆژییەکان و کێڵگەکان و روەکەکان بوو کەدوای ئافراندنی ئاسمان روویدا. بەهەمان شێوە کە لەگێڕانەوەی کوڕی عەباس ئاماژەمان پێدا.

دەگێڕنەوە کەجولەکەکان ڕۆشتنە لای پێغەمبەر(د.خ) و وتیان: ئەی محەممەد پێمان بڵێ خوا لەشەش رۆژەکەدا چ بوونەوەرێکی ئافراند؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: زەوی لەرۆژی یەکشەممە و دووشەممە ئافراند و

کێوەکانی لەرۆژی سێ شەممە و شار و رۆژییەکان و روبار وئاوەدانی و وێرانییەکانی لەرۆژی چوارشەممە و ئاسمان و فریشتەکانی لەرۆژی پێنجشەممە ئافراند تا سێ کاژێر بۆ کۆتایی هاتنی رۆژی هەینی. و لەیەکەم کاژێری ماوە لەرۆژی هەینی، ئەجەلەکان و لەکاژێری دووەم زیانەکان و لەکاژێری سێیەم ئادەمی ئافراند.

وتیان: ئەگەر کۆتاییت بەقسەکەت دەهێنا، راستت دەوت.

پێغەمبەر(د.خ) لەمەبەستی جوولەکەکان تێگەیشت و تووڕە بوو و خواوەند ئەم ئایەی ناردەخوار کەئێمە هیلاك نەبوین وبۆ ئەوەی دەیڵێن، خۆڕاگر بە.

ئەگەر کەسێك بڵێت: ئەگەر بەمشێوەیە کەخواوەند زەوی پێش ئاسمانەکان ئافڕاند کەواتە مانای وتارەکەی کوڕی عەباس کە لەگێڕانەوەکەی دیکەدا هاتووە چییە کەدەڵێت: ((یەکەم شت کەخواوەند ئافڕاندی، پێنووس بوو کەپێی وت: بنوسە و پێنووس وتی: خواوەندا، چی بنووسم؟ وتی: قەدەر بنووسە. و پێنووس تا رۆژی هەستانەوە، هەمووی ئەوەی دەبێت ببێت. نووسی. دواتر خواوەند هەڵمی ئاوی بەرز کردەوە و ئاسمانەکانی لێ دروست کرد. دواتر ماسی ئافڕاند و زەوی لەسەر پشتی ئەو جێگیر کرد. ماسی شڵەژا و زەوی لەرزی و خواوەند بەکێوەکان بەهێزی کرد. چیتر لەمەودا کێوەکان بەردەوام شانازی بەسەر زەوییەوە دەکەن))

ئاماژەیان بەچەندین گێڕانەوەی دیکەی هاوشێوە داوە.

دەڵێین: بەپێی شرۆڤە کردن و لێکدانەوەی گێڕانەوەکان کە لە کوڕی عەباس و کەسانی دیکە دەیگێڕنەوە، وتارەکەی ئێمە راستە و گێڕانەوەی کوڕی عەباس دژی وتارەکەی ئێمە نییە.

ئەگەر بڵێن گێڕانەوەکان کەبەڵگەی راستی وتارە، چییە؟

دەڵێین: عەبداللە کوڕی مەسعود و دەستەیەك لەئەصحابەکانی پێغەمبەر(د.خ) سەبارەت بەم ئایەی خواوەند کەدەفەرمێت: وئەوە کەهەموو بونەوەکانی زەوی ئافڕاند. دواتر دەستی بەئافڕاندنی ئاسمان کرد و حەوت ئاسمانی دروست کرد، وتوویانە کەعەرشی خواوەند لەسەر ئاو بوو و هیچ بوونەوەرێك پێش ئاو

نەئافرێنرابوو و کاتێك خواوەند مەبەستی ئەوەی کرد بونەوەرەکان بئافرێنێت، لەئاو هەڵمێکی دەرهێنا کە لەسەر ئاو وەستا و بەئاسمان ناوی برد چوونکە ئاسمان بەمانای سەرەوەیە. دواتر ئاوی وشك کرد و کردی بەیەك زەوی. دواتر زەوی قەڵشت و بۆ حەوت زەوی دابەشی کرد و ئەمە لەرۆژی یەکشەممە و دوشەممە رویدا. و زەوی لەسەر پشتی ماسی ئافراند و ماسی هەمان (نون)ە کەخواوەند لەقورئان ئاماژەی پێداوە و دەفرمێت: (نون و القلم)

ماسی لەئاودا بوو و ئاو لەسەر پشتی بەردێك. بەرد لەسەر پشتی فریشتە و فریشتە لەسەر تاشەبەردێك و تاشەبەرد لەسەر با. ئەمە ئەو تاشە بەردەیە کەلوقمان فەرمووی نە لەزەویدایە و نە لەئاسمان. ماسی تەکانی خوارد و زەوی لەرییەوە و خواوەند کێوەکانی لەسەر زەوی داکوتی کەبەهێز بوو و کێوەکان بەردەوام شانازی بەسەر زەوییەوە دەکەن. وتاری خواوەندە کەدەفەرمێت:((لەسەر زەوی کێوەکانمان جێگیر کرد تا ئێوە نەلەرزێنێت)).

ئەبو جەعفەر دەڵێت: لەوتاری ئەوان کەخواوەند لەکاتی ئافراندنی ئاسمانەکان و زەوی لەئاو هەڵمێکی بەرز کردەوە کە بوو بەئاسمان و دوای ئەوە ئاوی وشك کرد و کردی بەیەك زەوی، بۆمان روون بویەوە کەخواوەند ئاسمانی پێش زەوی ئافراند بەڵام نەیکردە حەوت ئاسمان و دوای ئەوە زەوی ئافراند. ئەگەری هەیە خواوەند لەئاو هەڵمێکی بەرزکردبێتەوە تا ببێتە ئاسمان و ئاوی وشك کردبێت تا ببێتە زەوی ئەو ئاسمانە، بەڵام بڵاوی نەکردبێتەوە و رۆژیەکانی دیاری نەکردبێت و ئاو و کێڵگەکانی کشتوکاڵی بەدینەهێنابێت و سەرقاڵی ئافراندنی ئاسمان بوبێت کەهەمان هەڵمی سەر ئاوە و حەوت ئاسمانی لێ دروست کردبێت. دوای ئەوە زەوی قەڵشت بێت کەئاوی وشك کردوو بووە و بۆ حەوت زەوی دابەشی کردبێت و کێوەکانی لەسەر زەوی داکوتابێت. و بەمشێوەیە هەموو گێرانەوەکەی کوڕی عەباس راستە.

جیاوازی زاناکانمان سەبارەت بەئافرێنراوی رۆژی دوشەممە بەگێرانەوەی حەدیسی پێغەمبەر(د.خ) ئاماژەمان پێدا. ئاماژەمان بەئافرێنراوی رۆژی سێ شەممە و چوارشەممەدا. لێرەدا تەنیا ئەوەی ئاماژەمان پێ نەداوە ئەوەیە

کەوتاری راست لای ئێمە گێرانەوەی کوری مەسعود و دەستەیەك لەئەصحابەکانی پێغەمبەرە کەخواوەند کێوەکان و رۆژی و دارەکان و شتەکانی دیکەی لەرۆژی سێشەممە و چوارشەممە لەسەر زەوی ئافراند چوونکە لەکتێبەکەی خۆیدا دەفەرمێت:

((أانکم لتکفرون بالذی خلق الارض فی یومین و تجعلون له اندادا. ذلك رب العالمین. و جعل فیها رواسی من فوقها و بارك فیها و قدر فیها اقواتها فی اربعه ایام سواء للسائلین.

واتاکەی: بلێ بۆ ئێوە بەو کەسەی زەوی لەدو رۆژدا ئافراند، کافر دەبن و هاوتای بۆ دادەنێن. ئەو پەروەردگاری جیهانییانە. لەچوار رۆژەکەی دیکە لەسەر زەوی لەنگەرەکانی بەدیهێنا و بەرەکەتی خستە ناویان و خواردنییەکانی دەستنیشان کرد. کە بۆ پرسکەران چوار رۆژ تەواو و بەسندەیە.))

یانی هەر کەس بپرسێت، بەمشێوە بوو. دواتر ئاسمانی دروست کرد کەهەڵم بوو و ئەم هەڵمە لەهەناسەی ئاو و کردی بەیەك ئاسمان. دواتر قەڵشتی و حەوت ئاسمانی لێ دروست کرد و ئەمە لەرۆژی پێنج شەممە و هەینیدا روویدا.

لە عەبداللە کوری سەلام دەگێرنەوە کەخواوەند رۆژییەکان و کێوەکانی لەرۆژی سێشەممە و چوارشەممە ئافراند. لەکوری عەباس دەگێرنەوە کەخواوەند کێوەکانی لەرۆژی سێشەممە ئافراند لەبەر ئەمە خەڵکان رۆژی سێشەممە بەرۆژێکی گران و قورس دەزانن.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: وتاری راست لای ئێمە ئەوەیە لەپێغەمبەر گێرامانەوە کەفەرمووی: خواوەند لەرۆژی سێشەممە کێوەکانی ئافراند و لەرۆژی چوارشەممە دارەکان و ئاو و روبارەکان و وێرانی و ئاوەدانییەکانی ئافراند.

هەروەها لە پێغەمبەر(د.خ) دەگێرنەوە کە خواوەند کێوەکانی لەرۆژی یەکشەممە ئافراند و دارەکانی لەرۆژی دوشەممە و خراپەی لەرۆژی سێشەممە و رووناکی لەرۆژی چوارشەممە ئافراند. بەڵام حەدیسی پێشوو راسترە و زۆربەی پێشینیان پشتراستیان کردۆتەوە.

لەرۆژی پێنجشەممە خواوەند ئاسمانەکانی ئافراند کەیەك ئاسمان بوو و

کردی بەحەوت: لە کوڕی مەسعود و دەستەیەك لەئەصحابەی پێغەمبەر(د.خ) دەگێڕنەوە کەخواوەند دەستی بەدروست کردنی ئاسمان کرد کەهەڵم بوو و هەڵم لەهەناسەی ئاو و یەك ئاسمانی لێ بەدیهێنا. دواتر لەرۆژی پێنجشەممە و هەینی کردی بەحەوت ئاسمان و هەینی بۆیە بەو ناوە ناونرا چوونکە ئافرێنراوی ئاسمانەکان و زەوی کۆکردەوە و کاروباری هەر ئاسمانێکی ڕەوانە کرد. یانی ئافرێنراوەکانی هەر ئاسمانێکی لەفریشتە و کێوەکانی بەفر و بوونەوەرەکانی دیکە ئافراند و ئاسمانی دنیای بەئەستێرەکان رازاندەوە کەهۆکاری رازاندنەوە و ڕێگری لەشەیتانەکانە و کاتێك لەئافراندن تەواو بوو، لەسەر عەرش جێگەی گرت، بەهەمان شێوە کەدەفەرمێت، و ئاسمانەکان و زەوی لەماوەی شەش ڕۆژ ئافراند و هەروەها دەفەرمێت: ئاسمان و زەوی پەیوەستی یەك بوون و جیامان کردنەوە.

هەروەها لە کوڕی عەباس دەگێڕنەوە کەخواوەند روبارەکان و دارەکانی لەرۆژی چوارشەممە ئافراند و باڵندە و وەحشی و خزۆك و دڕندەی لەرۆژی پێنجشەممە و مرۆڤی لەرۆژی هەینی و لەرۆژی هەینی لە ئافراندنی بوونەوەرەکان و زیندەوەرەکان تەواو بوو.

ئەم گێڕانەوەیە کە ئاسمان و فریشتەکان و ئادەم لەرۆژی هەینی ئافرێنراون، راست دێتەبەرچاو چوونکە لەپێغەمبەر دەیگێڕنەوە کە لەرۆژی پێنجشەممە ئاسمانی ئافراند و لەرۆژی هەینی ئەستێرەکان و هەتاو و مانگ و فریشتەکان و سێ کاژێر بۆ کۆتایی هەینی مابوو کە کاژێری یەکەم ئەجەلی زیندووەکان و مردووەکانی ئافراند و کاژێری دوەم زیانەکان و کاژێری سێیەم مرۆڤی ئافراند و لەبەهەشت جێگەی کردەوە و فەرمانی بەئیبلیسدا کوڕنوشی بۆ ببات و لەکاژێری کۆتایی لەبەهەشت دەری کرد.

ئەبوهورەیرە لە پێغەمبەر(د.خ) دەگێڕێتەوە کەفەرمووی: چوارپێکانی لەرۆژی پێنجشەممە ئافراند و ئادەمی لەدوایین کاژێرەکانی هەینی چوونکە کۆتایی بونەوەرەکان و لەدوایین کاژێری هەینی لەنێوان ئێواری و شەو ئافرێنرا.

کاتێك خواوەند لەسەرەتایی ئافراندنی ئاسمانەکان و زەوی تا کاتی تەواو بوون لەئافراندن، هەموو بونەوەرکانی لەماوەی شەش ڕۆژدا ئافراند و هەرکام لەم

ڕۆژانە هەزار ساڵە چوونکە یەکێك لەڕۆژەکانی ئەو دنیا هەزار ساڵی ڕۆژگاری ئێمەیە. لەسەرەتایی ئافراندن تا ئافراندنی پێنووس کەهەمووی ئەوەی نووسی کە تا ڕۆژی کۆتایی دەبێت ببێت، هەزار ساڵ لەساڵەکانی دنیایی ئێمەیە. کەواتە تەواوی ماوە لەسەرەتای ئافراندن تا کۆتا هاتنی بەپێی ئەو بەڵگە و حەدیسانەی ئاماژەمان پێدا و حەدیسەکانی دیکە کە لەبەر زۆری لەم کتێبەدا باسمان نەکردن، حەوت هەزار ساڵ کەمێك زیاتر یا کەمتر بوو.

و ئەگەر بەمشێوەیە بێت و لە کۆتایی ئافراندن تا کاتی کۆتایی هاتنی دونیا بەهەمان شێوە کە باسمان کرد و بەڵگەمان هێنایەوە و دوبارە باسی دەکەین، حەوت هەزار ساڵ کەمێك زیاتر یا کەمتر بێت، کەواتە، تەمەنی ڕۆژگار لەسەرەتای ئافراندن تا کاتی کۆتایی هاتنی دنیا چواردەهەزار ساڵ لەساڵەکانی دنیایە و چواردە ڕۆژ لەڕۆژەکانی ئەو دنیا چوونکە حەوت ڕۆژ یانی حەوت هەزار ساڵی دنیا لەسەرەتای ئافراندن تا کۆتاییەکەی و ئافراندنی ئادەم بوو و حەوت ڕۆژەکەیتر یانی حەوت هەزار ساڵی دنیا لەکاتی کۆتایی هاتنی ئافراندن تا لەناوچوونی هەموو ئافرێنراوەکان و ڕۆژی هەستانەوە کەهەموو شتێك لەناو دەچێت جگە لەخواوەند و جگە لەو کەس نامێنێتەوە.

ئەگەر کەسێك بڵێت: بەڵگەی ئەوەچییە کەشەش ڕۆژی ماوەی ئافراندنی دنیا بەرابەرە لەگەڵ شەش هەزار ساڵ، لەکاتێکدا خواوەند دەفەرمێت زەوی و ئاسمانەکانی لەماوەی شەش ڕۆژ ئافراند نەك شەش هەزار ساڵ و مەبەستی خواوەند لەڕۆژەکان، ڕۆژی ئاساییە کە لەهەڵاتنی خۆر تا ئاوابوونییەتی وهەروەها مەبەستی پەروەردگار مرۆڤەکانە. ئێوە بەشێوەیەکی نەشیاو شیکردنەوە و لێکدانەوەتان بۆ ئەم وتەی خواوەند کردەوە کەفەرمووی زەوی و ئاسمانەکانمان لەماوەی شەش ڕۆژ ئافراند، و فەرمانی خواوەند کاریگەرتر لەوەیە گومان بکەین شەش ڕۆژی ماوەی ئافراندن، شەش هەزار ساڵی دنیا بووە چوونکە فەرمانەکانی بەشێوەیەکە دەڵێت دروست بە و دروست دەبێت وەك چۆن دەفەرمێت: فەرمانی ئێمە یەکێکە وەك پێڵو خستنە سەریەك.

دەڵێین: پێشتر باسمان کردووە کەزۆربەی بابەتەکانی ئەم کتێبە پشتی

بەگێڕانەوە و وتەکان و حەدیسەکانی پێغەمبەر(د.خ) بەستووە نەك بەڵگەی لۆژیکی و عەقڵانی چوونکە هەموو بەسەرهاتەکانی رابردوو و ئەو روداوانەی رویانداوە. ناتوانین بەشێوەیەکی لۆژیکی بەڵگەیان بۆ بهێنینەوە.

ئەگەر بڵێن: ئایا بۆ راستی ئەم قسانە هیچ حەدیسێکی راست هەیە؟

دەڵێین: هیچ کام لەپێشەواکانی دین پێچەوانەی ئەم وتانەیان نەهێناوەتە سەرزمان.

ئەگەر بڵێن: ئایا هیچ گێڕانەوەیەك لەوان لەمبارەوە بوونی هەیە؟

دەڵێین: بابەتەکە لای زانا پێشینەکان ناسراوتر لەوەیە پێویست بەگێڕانەوەی یەکێکیان بکات و گێڕانەوە دیارەکان بەناوی زۆر لەوانەوە بوونیان هەیە.

ئەگەر بڵێن: ئاماژە بەگێڕانەوەکانی ئەوان بدە.

دەڵێین: لە کوڕی عەباس دەگێڕنەوە کەخواوەند ئاسمانەکان و زەوی لەماوەی شەش رۆژ ئافراند کەهەر رۆژ هەزارساڵی ئێوەیە. هەروەها لەشرۆڤەکردنی وتاری خواوەند کەدەفەرمێت: رۆژێك بەئەندازەی شەش هەزار ساڵ لەساڵەکانی ئێوە، دەڵێت مەبەست ئەو رۆژانەیە کەئاسمانەکان و زەوی و بوونەوەرکانی تیا ئافرێنرا.

هەروەها لەزوحاك سەبارەت بەم وتەی خوای گەورە حەدیسیان گێڕاوەتەوە و لە کەعب ئەلاخبار دەگێڕنەوە کەخواوەند ئاسمانەکان و زەوی لەرۆژی یەك شەممە و دوشەممە و سێشەممە و چوارشەممە و پێنجشەممە ئافراند و لەرۆژی هەینی تەواو بوو و ئەندازەی هەر رۆژێك، هەزار ساڵ بوو. لەموجاهیدیش دەگێڕنەوە کەهەرکام لەشەش رۆژەکەی ئافراندن هەزار ساڵ لەساڵەکانی ئێمەیە.

ئەم وتەیە کەچۆن ئەگەری دەبێت شەش رۆژی ئافراندن بەرابەر بێت لەگەڵ شەش هەزار ساڵ لەکاتێکدا فەرمانەکانی خواوەند بەشێوەیەکە دەڵێت دروست بە و دروست دەبێت، پشت راست کردنەوەی گێڕانەوەیەکەی دیکەیە کە دەڵێت ئافراندن لەشەش رۆژ لەرۆژەکانی دنیا کۆتایی هات چوونکە فەرمانی خواوەند بەشێوەیەکە دەڵێت ببە و دەبێت و پێویست بەشەش رۆژی دنیا ناکات.

## وتار سەبارەت بەوەی شەو و رۆژکامیان پێشتر ئافرێنرا و سەرتای ئافراندنی هەتاو و مانگ کەکات و ساتە کانی پێ دەناسن

وتمان کەئافرێنراوی خواوەند پێش ئافراندنی کات و زەمان چی بوو و ئامارژەمان بەوەدا کە کات و زەمانەکان کاژێرەکانی شەو و رۆژە، یانی رێگەی هەتاو و مانگ لەئاسمان. ئێستا دەمانەوێت باسی ئەوە بکەین ئایا شەو پێشتر ئافرێنرا یا رۆژ؟ چوونکە لەمبارەوە بۆچوونی زاناکان جیاوازە.

دەستەیەك وتوویانە خواوەند شەوی پێش رۆژ ئافراند و بەڵگەیان بۆ وتارەکەی خۆیان هێناوەتەوە کەکاتێك هەتاو ئاوا دەبێت و رووناکی نەمێنێت، تاریکی شەو دەردەکەوێت کەواتە ئاشکرایە رۆژ دەبێتە شەو و ئەگەر رۆژ نەبێت، شەو بەهەمان شێوە دەمێنێتەوە و ئەمە بۆمان دەردەخات کەشەو پێشتر ئافرێنراوە و هەتاو دوای ئەو. ئەم وتەیە لە کوڕی عەباس دەگێڕنەوە کەلێیان پرسی ئایا شەو پێش رۆژ بوو؟ وتی مەگەر نازانن کاتێك ئاسمانەکان و زەوی پەیوەستی یەك بوون، جگە لەتاریکی هیچی دیکە نەبوو، کەواتە بزانن شەو پێش رۆژ ئافرێنرا.

لە کوڕی عەباس لەمبارەوە ئامارژەیان بەگێڕانەوەیەکی دیکە داوە.

دەستەیەکی دیکە وتوویانە رۆژ پێش شەو بوو و بەڵگەیان بۆ وتەکانی خۆیان هێناوەتەوە کەتەنیا خواوەند بوو و رۆژ و شەو لەئارادا نەبوو و جگە لەو هیچ شتێك نەبوو و هەمووی ئەوەی ئافراندی، بەنووری ئەو رۆشن و روناك بوویەوە.

ئامارژەدان بە بێژەری ئەم وتەیە

لەکوڕی مەسعود دەگێڕنەوە کەخواوەندی ئێوە شەو ورۆژی نییە و ئاسمانەکانی بەنووری خۆی روناك کردەوە و رۆژی ئێوە لای ئەو دەکاژێرە.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: وتاری یەکەم راستترە کەشەو پێش رۆژ ئافرێنرا چوونکە رۆژ لەنووری هەتاو سەرچاوە دەگرێت و خواوەند دوای بلاّو کردنەوەی زەوی هەتاوی ئافراند و بەهەمان شێوە کەدەفەرمێت:

((أانتم اشد خلقا ام السماء بناها. رفع سمكها فسواها. و اغطش ليلها و اخرج

ضحاها،

واتاکەی: ئافراندنی ئێوە دژوارترە یا ئاسمان کەخواوەند ئافراندی و سەقفەکەی بەرز و شەوەکەی تاریك و رۆژەکەی رووناك کردەوە.))

لەبەر ئەوەی هەتاو دوای دەرکەوتنی ئاسمان و تاریکی شەو ئافرێنراوە، ئاشکرایە کەپێش لەئافراندنی هەتاو وپێش ئەوەی خواوەند ئاسمان بەرز بکاتەوە، تاریك بوون، نەك رۆشن. و ئەوەی لەگەمەی شەو و رۆژ دەیبینین بەڵگەیەکی ئاشکرایە کە رۆژ هێرش دەکاتە سەر شەو و کاتی شەو کە هەتاو بوونی نییە و روناکی نادیارە، دنیا تاریك دەبێت و لێرەوە دەردەکەوێت کە رۆژ بەنووری خۆی هێرش دەکاتە سەر شەو و خوا زاناترە.

سەبارەت بەکاتی ئافراندنی شەو و رۆژ چەندین گێرانەوەیان لە پێغەمبەر(د.خ) گێڕاوەتەوە. کوڕی عەباس لە پێغەمبەر(د.خ) دەگێڕێتەوە کە فەرمووی سێ کاژێر بۆ کۆتایی هەینی مابوو کەخواوەند هەتاو و مانگ و ئەستێرەکان و فریشتەکانی ئافڕاند.

ئەبوهورەیرە لە پێغەمبەر(د.خ) دەگێڕێتەوە کەفەرمووی: خواوەندی نووری لەرۆژی چوارشەممە ئافڕاند.

خواوەند پێش ئافراندنی شەو و رۆژ چەندین ئافرێنراوی دیکەی ئافڕاند و دواتر هەتاو و مانگی لەبەرژەوەندی خەڵکان، کەخۆی باشتر دەزانێت، ئافڕاند و دواتر لەیەکی جیا کردنەوە و یەکیانی کرد بەهێمایی شەو و ئەوی دیکەیان بەهێمای رۆژ و هێمای شەوی سڕییەوە و هێمای رۆژی رووناك کرد.

لە پێغەمبەر(د.خ) سەبارەت بەجیاوازی شەو و رۆژ ئاماژەیان بەچەندین گێڕانەوە داوە کە بەشێك لەوان لەگەڵ گێڕانەوەی زاناکانی کۆن لێرەدا باس دەکەین:

ئەبوزەری غەفاری لە پێغەمبەر(د.خ) دەگێڕێتەوە کەرۆژێك دەستی پێغەمبەرم گرتبوو وبەرەو رۆژئاوا دەڕۆشتین، هەتاو بەرەو رۆژئاوا دەڕۆشت و بەهەمان شێوە سەیرمان دەکرد تا لەبەرچاو نەما.

وتم: ئەی پێغەمبەر(د.خ) هەتاو لەکوێ ئاوا دەبێت؟

وتی: لەئاسمان ئاوا دەبێت و لەئاسمانێکەوە بۆ ئاسمانێکی دیکە دەڕوات تا دەگاتە ئاسمانی حەوتەم و دەگاتە ژێر عەرش وکوڕنوش دەبات و فریشتە راسپێردراوەکانی کوڕنوش دەبەن. دواتر دەڵێت خواوەندا فەرمانم پێ دەدەیت لەکوێوە هەڵبێم؟ لەرۆژ ئاوا یا رۆژهەلآت؟

فەرمووی: مانای وتاری خواوەند کەهەتاو بەرێگەی خۆیدا دەڕوات (یانی لەژێر عەرش لەجووڵە دەکەوێت) و ئەمە چارەنوسی خواوەندی زانایە و بەس.

فەرمووی: دواتر جبرەئیل خاولییەك لەنووری عەرش بەئەندازەی کاژێرەکانی رۆژی درێژی هاوین یا رۆژی کورتی زستان یا رۆژی ناوەندی پاییز و بەهار دێنێت و هەتاو لەبەری دەکات بەهەمان شێوە کە ئێوە جل و بەرگ لەبەر دەکەن و بەوشێوەیە لەئاسماندا دەسورێتەوە و لەشوێنی هەلآتنییەوە. دەردەکەوێت.

فەرمووی و بەوشێوەیە دەبێت کە بەئەندازەی سێ شەو لەجووڵە بکەوێت و لەنوری عەرش لەبەر نەکات و فەرمانی پێبدرێت کە لەشوێنی ئاوابونەوە هەڵبێت و مانای وتاری خواوەند کەدەفەرمێت: کاتێك هەتاو تاریك دەبێت، ئەمەیە).

فەرمووی: مانگیش بەهەمان شێوە دەردەکەوێت و بەرەو ئاسۆی ئاسمان دەڕوات و ئاوا دەبێت و تا ئاسمانی حەوتەم بەرز دەبێتەوە و لەژێر عەرش لەجووڵە دەکەوێت و کوڕنوش دەبات و داوای فەرمان دەکات بەلآم جبرەئیل پۆششێك لەنووری کورسی دێنێت) و مانای وتارەکەی خواوەند ئەمەیە کەفەرمووی: هەتاوی کرد بەنوور و مانگی کرد بەروناکی.

ئەبوزەر دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) گەڕاینەوە و نوێژی ئێوارێمان خوێند.

ئەم گێڕانەوەیە ئەوەمان نیشان دەدات کەهۆکاری جیاوازی هەتاو و مانگ لەوێوە سەرچاوە دەگرێت کەنووری هەتاو لەپۆششێکە کە لەنووری عەرشەوە وەرگیراوە و روناکی مانگ لەپۆششێکە کە لەنووری کورسی وەرگیراوە.

بەلآم گێڕانەوەیەکی جیاوازی دیکە لە کوڕی عەباس لەئارادایە: عێکرەمە دەڵێت: رۆژێك لەگەڵ کوڕی عەباس دانیشتبووم کە پیاوێك هات و وتی ئەی کوڕی عەباس لەکەعب الاخبار سەبارەت بەهەتاو و مانگ وتەیەکی سەیرم بیست.

کوڕی عەباس کەپشتی دابوویەوە، هەستا و وتی: چیت بیستووە؟

وتی: کەعب گومان دەکات لەڕۆژی هەستانەوە هەتاو و مانگ وەك دوو گای بێدەست وپێ دەهێنن و دەیانخەنە ناو ئاگری جەهەننەم.

عێکرەمە دەڵێت: لێوەکانی کوڕی عەباس لەتوڕەییدا دەلەرزی و وتی: کەعب درۆ دەکات. کەعب درۆ دەکات. کەعب درۆ دەکات. ئەمە داستانێکی یەهوودییە کەدەیەوێت لەئیسلامدا جێگەی بۆ بکاتەوە. خوا گەورەتر و بەخشندەتر لەوەیە لەبەرابەر پەرەستینی خۆی ئازاب ببەخشێت مەگەر وتاری پەروەردگارت نەبیستووە کە فەرمووی:((هەتاو و مانگی دەستەمۆ و ملکەچی ئێوە کرد کەبەردەوام بەرێگادا دەڕۆن)) یانی بەردەوام پەرەستینی خواوەند ئەنجام دەدەن. کەواتە چۆن دو ئافرێنراو کەبەدرێژایی کاتەکانی خۆیان پەرەستینی خواوەند ئەنجام دەدەن، ئازاب دەدرێن. خوا ئەم جولەکەیە بکوژێت و رووی ڕەش بکات چوونکە درۆ بۆ دوئافرێنراوی ملکەچی خوا هەڵدەبەستێت. ئەوسا بەردەوام لەبەرخۆیەوە قسەی دەکرد و چیلەکەیەکی لەسەر زەوی هەڵگرت و بەردەاوم لەزەوی دەچەقاند. ماوەیەك بەمشێوەیە تێپەڕی، ئەوسا سەری بەرز کردەوە، چیلکەکەی فرێدا و وتی: دەتانەوێت ئەوەی سەبارەت بەهەتاو و مانگ و سەرەتای ئافراندن و کۆتایی ئەوان کە لەپێغەمبەر بیستوومە، بۆ ئێوەی بگێڕمەوە؟

وتمان: خوا لێت خۆش بێت.

وتی: پرسیاری ئەوەیان لە پێغەمبەر(د.خ) کرد و فەرمووی خواوەند کاتێك هەموو ئافرێنراوەکانی ئافراند و جگە لەئادەم هیچ نەمایەوە، دوو هەتاوی لەنووری عەرش ئافراند و ئەوەیان کەدەیزانی وەك هەتاو دەمێنێتەوە بەئەندازەی گەورەیی دنیا لەرۆژهەلاتەوە تا رۆژئاوا ئافراندی وئەوەیان کەدەیزانی تاریکی دەبەخشێت و دەبێتە مانگ، لەهەتاو بچوکتر بوو بەلام هەردوکیان بچوك بەرچاو دەکەون چوونکە ئاسمان زۆر گەورەیە ولەزەوییەوە دوورە.

وتی: ئەگەر دوهەتاوەکەی بەهەمان شێوەی ئافراندنی سەرەتا دەهێشتەوە، شەو و رۆژ لەیەك جیا نەدەکرانەوە و کرێکار نەیدەزانی تا کەی کار بکات و کەی کرێکەی وەربگرێت و کەسی بەرۆژو نەیدەزانی تا کەی بەرۆژو بێت و ژن

نەیدەزانی چ کاتێك تووشی سوڕی مانگانە دەبێت و موسوڵمانان نەیاندەزانی کاتێك حەج چ کاتێك دەبێت و قەرزار نەیدەزانی چ کاتێك کاتی دانەوەی قەرزەکەیەتی و خەڵك نەیاندەزانی چ کاتێك بۆ بەدەستهێنانی بژێوی کار بکەن و چ کات بحەوێنەوە. خواوەند دڵسۆز و مێهرەبانی بەندەکانی خۆیەتی و جبرەئیلی ڕەوانە کرد کە بۆ سێ جار باڵی خۆی بەسەر مانگدا راوەشاند (لەو کاتەدا هەتاو) و نووڕەکەی سڕایەوە و روناکی مایەوە. ئەمە وتاری خواوەندە کەفەرمووی: ((شەو و رۆژمان کردە دو هێما و نیشانەی شەومان کردە تاریکی و نیشانەی رۆژمان کردە روناکی)).

وتی: ئەم ڕەشاییە کەوەك هێڵەکان لەسەر مانگ دەیبینن، نیشانەی لەبەرچاو نەمانە. دواتر خواوەند بۆ هەتاو چەرخێکی لەنووری عەرش دروست کرد کەسێسەد و شەست دەسگرەی بوو و سێسەد و شەست فریشتەی لەئاسمانی دنیا بۆ هەتاو و ئەو چەرخە دەستنیشان کرد کەهەر فریشتەیەك دەسگرەیەکی گرت و بۆ مانگ و چەرخەکەی سێسەد و شەست فریشتەی لەفریشتەکانی ئاسمانی دنیا دەستنیشان کرد کەهەر فریشتەیەك دەسگرەیەکی گرتبو.

دواتر وتی: ((خواوەندی گەورە بۆ هەتاو و مانگ رۆژهەڵات و رۆژئاوایی ئافراند بەئەندازەی دوو بەرابەری زەمین و کەنارەی ئاسمان لەرۆژئاوا، سەد سەرچاوەی لەگەڵ گڵی ڕەش ئافراند)) مانای وتاری خواوەند کەفەرمووی: ((و هەتاوی بینی کە لەسەرچاوەیەکی قوڕاویدا ڕۆچوو)) ئەمەیە یانی گڵی ڕەش و سەد سەرچاوەی هاوشێوەی لەرۆژهەڵات ئافراند لەگڵی ڕەش کەوەك قازانێك بەردەوام دەکوڵێت و هەر رۆژ و هەر شەو، شوێنی ئاوابوون و شوێنی هەڵاتنی تازەی هەیە و دووری نێوان شوێنی هەڵاتن و شوێنی ئاوابوون لەهاویندا زیاتر لەوەرزەکانی دیکەیە و رۆژ درێژ دەبێتەوە و لەزستان دووری نێوانیان کەمترە و رۆژ کورت دەبێتەوە و مانای وتارەکەی خواوەند ئەمەیە کەفەرمووی: ((پەروەردگاری دو رۆژهەڵاتە و پەروەردگاری دوو رۆژئاوا)) یانی رۆژهەڵاتی ئەولا و رۆژهەڵاتی ئەملا و رۆژئاوای ئەولا و رۆژئاوای ئەملا و لەنێوان ئەوان رۆژهەڵاتەکان و رۆژئاواکانی جێگیر کرد و کۆی کردنەوە و فەرمووی

پەروەردگاری ڕۆژهەڵاتەکانە و پەروەردگاری ڕۆژئاواکان کەبەئەندازەی ژمارەی سەرچاوەکانە.

وتی: خواوەند پێش ئاسمان دەریایەکی ئافراند بەئەندازەی سێ فەرسەخ کەشەپۆلی تاریکە و لەهەوادا وەستاوە و بەفەرمانی خواوەند دڵۆپێکی لێ نارژێت. هەموو دەریاکان لەشوێنی خۆیان ناجووڵێن بەڵام ئەم دەریایە ڕەوانە بەخێرایی تیر. ڕێگەکەی لەهەوا لەنێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا وەك تەناف کێشراوە و هەتاو و مانگ و (خنس، خۆنس)لەپانتاییەکانی ئەم دەریایە ڕەوانن و مانای وتاری خواوەند ئەمەیە کەفەرمووی: ((هەرکام لەگەردونێکدا دەسوڕێنەوە)). و گەردوون سووڕانی چەرخ لەدەریادایە. سوێند بەو خوایەی گیانی محەممەد لەدەستی ئەودایە ئەگەر هەتاو لەم دەریایەوە هەڵدەهات، هەموو شتەکان تەنانەت بەرد و تاشەبەردەکانی دەسووتاند و ئەگەر مانگ هەڵدەهات هەموو خەڵکان جگە لەپێغەمبەران و پیاوچاکان شەیدای دەبوون و لەجێگەی خواوەند دەیانپەرەستی.

کوڕی عەباس دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالب وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، دایك و باوکم قوربانی تۆبن ، ئاماژەت بەرێگەی خۆنس و مانگ و هەتاودا، خۆنس چییە کەخواوەند لەقورئاندا بەخۆنس سوێندی خواردوە؟

وتی: ئەی عەلی، خۆنس پێنج ئەستێرەکەیە، بەرجیس و زوحەل و عەتارد و بەهرام و زوهرە و ئەم پێنج ئەستێرەیە وەك هەتاو و مانگ هەڵدێن و دەسوڕێنەوە بەڵام ئەستێرەکانی دیکە بەئاسمانەوە هەڵاوسراون بەهەمان شێوەکە کە قەندیل لەمزگەوتا هەڵدەواسن.

دواتر پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەگەر دەتانەوێت بزانن، سووڕانی گەردون هەندێ کات لەملا و هەندێ کات لەولا ببینن چوونکە سووڕانی ئاسمان و سوڕانی ئەستێرەکان جگە لەم پێنج ئەستێرەیە بەمشێوەیە کەدەیبینن و تارۆژی کۆتایی لەترسی قیامەت و ئازابەکانی بەخێرایی ئاش دەسوڕێت و دەپارێتەوە و مانای وتارەکەی خواوەند بەمشێوەیە کەفەرمووی:

((یوم تمور السماء مورا. و تسیر الجبال سیرا. فویل یومئذ للمکذبین،

واتاکەی: ڕۆژێك کەئاسمان بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر دەسوڕێتەوە و

کێوەکان بەشێوەیەکی ترسێنەر، ئەو ڕۆژە هاوار لەکافرەکان و بێ باوەڕان.))

وتی کاتێك هەتاو هەڵبێت، بەچەرخەکەی خۆی لەیەکێك لەم سەرچاوانەوە هەڵدێت و سێسەد و شەست فریشتەی لەگەڵدایە کەباڵەکانیان کردۆتەوە و بەدەم پاڕانەوە و زیکری خواوەند، چەرخەکە سازگار لەگەڵ کاتەکانی شەو و ڕۆژ و بەئەندازەی کاژێرەکانی شەو یارۆژە جیاوازەکان دەسوڕێنن و کاتێك خواوەند مەبەستی ئەوە بکات هەتاو یا مانگ گرفتار بکات و مۆجیزەیەك نیشانی بەندەکانی بدات و سەرکۆنەیان بکات تا لەگوناحەکان خۆیان بەدوور بگرن و پەرەستینی خواوەند ئەنجام بدەن، خۆر لەچەرخەکە دوردەکەوێتەوە و لەدەریایی قووڵی تاریکیدا ڕۆدەچێت و کاتێك خوامەبەستی ئەوە بکات، مۆجیزەکەی گەورەتر و ترس مرۆڤەکان و بەندەکانی زیاتر، تەواوی هەتاو لەبەرچاودا نامێنێت و ڕۆژ تاریك دەبێت وئەستێرەکان دەردەکەون. ئەمە ئەوپەڕی خۆرگیرانە وئەگەر مەبەستی ئەوە بکات مۆجیزەیەکی بچوکتر نیشانی بەندەکانی بدات نیوە یا یەك لەسەر سێی هەتاو دەکەوێتە ئاو و ئەوەی دیکەی لەچەرخەکەدا دەمێنێتەوە تا خۆرگیران کەمتر بێت و هۆکاری کەسەری هەتاو و مانگ و ترساندنی بەندەکان وسەرکۆنە کردنی ئەوان بێت. لەم کاتەدا فریشتەکان دەبنە دودەستە، دەستەیەکیان بەرەو هەتاو دەڕۆن و بۆ لای چەرخەکە رایدەکێشن و دەستەیەکی دیکە دەڕۆنە لای چەرخەکە و بەدەم پاڕانەوە و زیکری خواوەند لەگەردوون بەرەو هەتاوی دەبەن، سازگار لەگەڵ شەو و ڕۆژ و بەئەندازەی کاژێرەکانی شەو وڕۆژ یا کاژێرەکانی ڕۆژ سازگار لەگەڵ هاوین و زستان یا بەهار و پاییز تا درێژی ڕۆژ زیاتر نەبێت چوونکە خواوەند ئەم هێز و زانستەی بەئاوەکان داوە. دەبینن کە هەتاو و مانگ دوای گیران هێدی هێدی لەناو دەریای قووڵ دێنەدەر و کاتێك بەتەواوی دێنەدەر، فریشتەکان کۆدەبنەوە و هەڵیان دەگرن و دەیانخەنە سەرچەرخەکە و لەهێزی خوایی سوپاسی خواوەند دەکەن و دەسگرەکانی چەرخەکە دەگرن و بەدەم پاڕانەوە وزیکر و تەلیلە لەگەردوون تا ڕۆژئاوا رایدەکێشن و کاتێك دەگەنە ڕۆژئاوا، دەیخەنە ناو سەرچاوەکە و لەئاسۆوە ئاسمان دەکەوێتە ناو سەرچاوەکە.

دوای ئەوە پێغەمبەر(د.خ)فەرمووی:((ئافراندنی خواوەند سەرسوڕهێنەرە و ئەوەی نەیئافراندوە، سەرسوڕهێنەرتر. ئەمە قسەی جبرەئیلە کە بەسارەی وت: ((مەگەر لەکارەکانی خواوەند سەرت سوڕماوە.)). خواوەند دو شاری ئافراندووە یەکێ لەڕۆژهەلاّت و یەکیان لەرۆژئاوا. دانیشتووان ئەو شارەی لەرۆژهەلاّتە لەپاشماوەکانی نەتەوەی عادن و لەوەچەی ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و دانیشتووان شارەکەی رۆژئاوا لەنەتەوەی سەموودن لەوەچەی ئەو کەسانەی باوەڕیان بەسالّحی پێغەمبەر هێنا. ناوی شاری رۆژهەلاّت بەسریانی مرقیسیا و بەعەرەبی جابلقایە وناوی شاری رۆژئاوا بەسریانی برجیسا و بەعەرەبی جابرسە. هەرشارەو دەهەزار دەروازەی هەیە کەدووری هەر دەروازەیەك یەك فەرسەخە و لەسەر هەر دەروازەیەك، رۆژی دەهەزار کەس ئێشك دەگرن و تا رۆژی هەستانەوە جاریکی دیکە سەرەیان ناگاتەوە. سوێند بەو خوایەی گیانی محەممەد لەدەستی ئەودایە، ئەگەر زۆری ئەو نەتەوە و دەنگەدەنگی ئەوان نەدەبوو، هەموو دنیا دەنگی هەتاویان لەکاتی هەلاّتن و ئاوابوندا دەبیست . پێش ئەوان سێ نەتەوە هەیە بەناوەکانی مونسك و تافیل و تاریس و پێشتر لەوان یاجوج و ماجوج. ئەو شەوەی لەمسجد الحرامەوە بەرەو مسجد الاقصی ڕۆشتم، جبرەئیل منی بۆ ئەو شارانە برد و پێشنیاری پەرەستینی خواوەندم بەیاجوج و ماجوج کرد بەلاّم رازی نەبوون. دوای ئەوان منی بۆ لای خەلّکی ئەو دو شارە برد و پێشنیاری پەرەستینی خواوەندم پێکردن، کەرازی بوون و باوەڕیان هێنا. چاکەکانیان لەگەلّ چاکەکانی ئێوە دەبن و خراپەکانیان لەگەلّ خراپەکانتان. دواتر منی بردە لای سێ نەتەوەکەی دیکە کەپێشنیاری خواپەرەستیم پێکردن بەلاّم حاشایان لەبوونی خواوەند کرد وپێغەمبەرەکانیان بەدرۆزن لەقەلّەمدا. ئەوان لەگەلّ یاجوج و ماجوج و گوناحکارەکانی دیکە لەجەهەننەمدا دەبن.

وتی:(( کاتێك هەتاو ئاوا دەبێت، بەخێرایی فڕین، فریشتەکان لەئاسمانێکەوە بۆ ئاسمانێکی دیکەی دەبەن تا دەگاتە ئاسمانی حەوتەم و دەگاتە ژێر عەرش، کوڕنوش دەبات و فریشتەکان هاوڕێ لەگەلّ ئەو، کوڕنوش دەبەن. دوای ئەوە ئاسمان بەئاسمان دەیهێننە خوار تا دەگاتە ئەم ئاسمانە کە لەکاتی بەرەبەیاندایە

و کاتێك لەیەکێك لەسەرچاوەکاندا رۆدەچێت، کاتی رووناکی بەیانییە و کاتێك روودەکاتە ئەم ئاسمانە، کاتی رووناکی رۆژە)).

فەرمووی: خواوەند لەنزیکی رۆژهەڵات پەردەیەکی لەتاریکی بەسەر دەریایی حەوتەمدا کێشاوە بەئەندازەی شەوەکان کە لەسەرەتای ئافراندنەوە تا کۆتایی دنیا بونییان هەیە ولەکاتی ئاوابوونی هەتاو فریشتەی پاسەوانی شەو دێت و بەشێك لەتاریکی ئەو پەردەیە هەڵدەگرێت و بەرەو پێشوازی رۆژئاوا دەڕوات و لەنێوان پەنجەکانییەوە تاریکی بڵاو دەکاتەوە و چاودێری شەفەق(سووری هەتاو لەکاتی ئاوابوون) دەکات وکاتێك شەفەق دیار نامێنێت، تاریکی و باڵەکانی خۆی بڵاو دەکاتەوە کەدەوراندەوری زەوی و ئەم لاولای ئاسمان دەگرێتەوە و لەهەوا تا هەر شوێنێك مەبەست بکات، دەگات و تاریکی شەو بەباڵەکانی خۆی بۆ پێشەوە دەبات و بەردەوام زیکری خواوەند وێردی سەرزمانییەتی. کاتێك بەیانی لەرۆژهەڵاتەوە هەڵبێت، فریشتە باڵەکانی خۆی کۆدەکاتەوە و تاریکی بەدەست لەیەکەوە دەئاڵێنێت و بەدەستێك دەیگرێت بەهەمان شێوە کە لەکاتی هەڵگرتن لەپەردەی رۆژهەڵات هەڵیگرتبوو و لەنزیك رۆژئاوا دەگاتە دەریایی حەوتەم کەتاریکی شەو لەوێدایە و کاتێك پەردە لەرۆژهەڵات دەڕواتە رۆژئاوا، فوو دەکەن بەنەفخی سوورا و جیهان کۆتایی دێت.

فەرمووی روناکی رۆژ لەرۆژهەڵاتەوەیە و تاریکی شەو لەم پەردەیە و هەتاو و مانگ بەردەوام لەشوێنی هەڵاتن بۆ شوێنی ئاوابوون ولەوێوە بۆ ئاسمانی حەوتەم و دەڕۆنە ژێر عەرش، تا ئەو کاتەی خواوەند بۆ تۆبەی بەندەکانی دەستنیشانی کردووە و گوناحەکان لەدنیادان فراوان دەبن و چاکە نامێنێت و کەس پێشنیاری چاکەکاری ناکات و خراپە بڵاو دەبێتەوە و کەس رێگری لێ ناکات و کاتێك دنیا بۆ ئەم شێوەیە بگۆڕێت، هەتاو بۆ ماوەی شەوێك لەژێر عەرشدا دەمێنێتەوە و بەردەوام کوڕنوش دەبات و داوای فەرمان دەکات تا شوێنی هەڵاتنی بۆ دیاری بکرێت بەڵام وەڵامی دەست ناکەوێت. هەتاو بۆ ماوەی سێ شەو و مانگ بۆ ماوەی دو شەو دەمێننەوە و کەس نازانێت درێژی ئەو شەوە چەندە جگە لەنوێژخوێنانی سەرزەوی، کە لەهەر شارێکدا دەستەیەکی کەمی موسوڵمان ژیان

بەسەر دەبەن،((ریسوا لای خەڵکان و زەمانی خۆیان.)) هەرکامیان لەو شەوەدا بەئەندازەی شەوەکانی دیکە دەخەوێت و هەڵدەستێت و دەستنوێژ دەگرێت و دەڕواتە نوێژگە. هاوشێوەی شەوەکانی دیکە نوێژ دەخوێنێت و دەڕواتەدەر، بەڵام بەیانی نابینێت و سەری سوڕدەمێنێت. گومانی خراپە دەکات و دەڵێت یا نوێژەکەی خۆم کورت کردۆتەوە یا زوو لەخەو هەستاوم، ئەگەری هەیە خوێندنەوەم تەواو نەبوبێت.

فەرمووی: ((دوبارە دەڕۆن و نوێژ دەخوێنن، بەهەمان شێوە کەلەشەوی دوەم دەیکەن. دەڕۆنەدەر بەڵام روناکی نابینن و زیاتر سەریانسوڕدەمێنێت. دەترسن و گومانی خراپە دەکەن و دەڵێن ئەگەری هەیە کەمتەرخەمانە نوێژمان خوێندبێت یا نوێژەکەی خۆمان کورت کردبێتەوە. جارێکی دیکە دەگەڕێنەوە و لەڕووداوەکانی ئەو شەوە ترساون. دوبارە نوێژ دەخوێنن بەهەمان شێوە کە لەشەوی سێیەم ئەو کارە دەکەن و دەڕۆنەدەر. شەو بەهەمان شێوە بەردەوامە و ئەستێرەکان لەشوێنی خۆیاندان. لەترسی شەو دەترسێن و هەڵدێن. ئەوان یەکتر بانگ دەکەن چوونکە ئاشناو ناسیاوی یەکترن. نوێژخوێنانی هەر شارێك لەمزگەوتی شارەکەدا کۆدەبنەوە و پاشماوەی شەو بەگریان و پاڕانەوە لەخواوەند بەسەر دەبەن. نائاگاکان بەهەمان شێوە لەنائاگایی خۆیاندا دەمێننەوە و کاتێك ئەندازەی سێ شەو بۆ هەتاو و دو شەو بۆ مانگ بەو شێوەیە بەردەوام بێت، جبرەئیل دێت و دەڵێت: فەرمانی پەروەردگارە و بڕۆنە شوێنی ئاوابوونی خۆتان، لێرە بڕۆن چوونکە لای ئێمە نوور و روناکیتان نییە.

فەرمووی: ((بەشێوەیەك دەگرین کەدانیشتووان حەوت ئاسمان لەژێر و دانیشتووان خێوەتی عەرش و هەڵگرانی عەرش لەسەرەوە دەنگیان دەبیستن و لەگریانی مانگ و هەتاو و لەترسی مەرگ و رۆژی هەستانەوە بەکوڵ دەگرین. خەڵکان چاوەڕانی هەڵاتن و ئاوابوونی مانگ و هەتاو دەکەن، بەڵام لەپشت ئاسۆوە لەرۆژئاوا دێنە دەر هاوشێوەی دو قەلەڕەشی کوێر. هەتاو بێ نوور و مانگ بێ رووناکی، وەك هەڵگری گیرانێك (خۆرگیران یا مانگ گیران) کەپێش ئەوە هەڵیانگرتبوو. خەڵکانی دنیا هاواردەکەن و دایك لەمناڵەکانی بێ ئاگا دەبێت و

هاورێیان گرنگی بەیەك نادەن و هەرکەس بیر لەخۆی دەکاتەوە، خواپەرستان و چاکەکاران لەگریانی خۆیان سوودیان پێ دەبڕێت و بەخواپەرەستی بۆیان دەنوسرێت و خراپەکار و بێ باوەڕان لەگریانی خۆیان هیچیان دەستناکەوێت جگە لەزیان.))

فەرمووی: ((هەتاو و مانگ هاوشێوەی وشترەکان بەردەوام بۆ سەرەوە دەڕۆن وپێش یەك دەکەون. کاتێك دەگەنە نیوەی ئاسمان، جبرەئیل دێت و دوبارە دەیانباتەوە بۆ رۆژئاوا و لەرۆژئاوای سەرچاوەکان نوقیمان دەکات، یا لەدەرگای تۆبەوە ئاوا دەبن.))

عومەر کوڕی خەتاب وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ). من و بنەماڵەکەم قوربانی تۆبین، درگای تۆبە چییە؟

فەرمووی: ئەی عومەر، خواوەند دەرگای تۆبەی لەپشت رۆژئاواوە دروست کردووە کەدو نیوەیە لەزێری گەوهەرنیشان بەدەرگا و خشڵ و جەواهیر. لەهەر نیوەیەك تا نیوەکەی دیکە چل ساڵ رێگەیە بۆ سوارێکی تیژپێ و ئەم درگایە لەکاتی ئافراندنەوە تا بەرەبەیانی ئەو شەوە و هەڵاتنی مانگ و هەتاو لەرۆژئاوا کراوەیە و هەرکەس لەبەندەکانی خواوەند لەرۆژگاری ئادەم تا ئەو شەوە بەدڵ تۆبە بکات، تۆبەکە لەو دەرگاوە دەڕواتەدەر و بەرەو لای خواوەند ملی رێگە دەگرێتەبەر.

مەعاز کوڕی جەبەل وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، دایك و باوکم قوربانی تۆبن، تۆبە بەدڵ چۆنە؟

فەرمووی: بەشێوەیەکە کە گوناحکار لەگوناحەکەی هەست بەپەشیمانی و داوای بەخشین لەخواوەند بکات و جارێکی دیکە ئەو گوناحە نەکات بەهەمان شێوە کەشیر بۆمەمك ناگەرێتەوە.

فەرمووی: ئەوسا جبرەئیل ئەو دو نیوە پەیوەستی یەك دەکات کەجووت دەبن وەك بڵێی هیچ کات کەلێنێك لەنێوان ئەواندا بوونی نەبووە و کاتێك دەرگای تۆبە دابخرێت، چیتر خواوەند بەتۆبەی کەس رازی نابێت و کرداری چاکە تەنیا بەچاکەکارانی پێشوو هەژمار دەکرێت. مانای وتارەکەی خواوەند ئەمەیە

کەفەرمووی:

(( يوم يأتي بعض آيات ربك لاينفع نفسا ايمانها لم تكن آمنت من قبل او كسبت في ايمانها خيراً،

واتاکەی: ڕۆژێك کەدەستەیەك لەنیشانەکانی پەروەردگار دەگەن، ئەو کەسەی پێشتر باوەڕی نەهێناوە یا لەکاتی باوەڕداری کارێکی چاکەی ئەنجام نەداوە، باوەڕەکەی هیچ سوودێکی پیٚ ناگەیەنێت))

ئەبی کوڕی کەعب وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، دایك و باوکم قوربانی تۆبن، دوای ئەوە مانگ و هەتاو چییان بەسەردێت، خەڵکانی دنیا چی؟

فەرمووی: ئەی ئەبی، دوای ئەوە مانگ و هەتاو نوور دەپۆشن و هاوشێوەی پێشوو لەسەر خەڵکان هەڵدێن. خەڵك کەنیشانەکانی ترسی خواوەندیان بینیبێت، پێداگری بۆ چاکەکاری لەدنیا دەکەن، جۆگەکان هەڵدەبەستن، دارەکان دەڕوێنن، بیناکان بەرز دەکەنەوە و دنیا بەشێوەیەك دەبێت کە ئەگەر کەسێك ئەسپێك بێنێت، لەو ساتەوەی هەتاو لەڕۆژئاواوە هەڵدێت، تا ئەو کاتەی فوو دەکەن بەنەفخی سوورا، کەس سواری نابێت.

حوزەیفەی یەمان وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، خۆم و بنەماڵەکەم قوربانی تۆ بین، خەڵکان لەکاتی فوو کردن بەنەفخی سووڕا حاڵیان چۆنە؟

فەرمووی: ئەی حوزەیفە، سوێند بەو خوایەی گیانی محەممەد لەدەستی ئەودایە، ڕۆژی کۆتایی دەگات و فوو دەکەن بەنەفخی سوورا. خەڵکانێك دەبن حەوزێکیان دروست کردووە بەڵام لێی ناخۆنەوە، ڕۆژی کۆتایی دەگات و قوماشێك لەنێوان دوکەسدایە، نەدەیپێچنەوە نەمامڵەی دەکەن، ڕۆژی کۆتایی دەگات و کەسانێك دەبن، پارو بۆ دەمیان دەبەن، بەڵام نایخۆن، ڕۆژی کۆتایی دەگات و کەسانێك دەبن، شیریان هەڵگرتوە، بەڵام نایخۆنەوە. دواتر پێغەمبەر(د.خ) ئەم ئایەی خوێندەوە: (( و لەناکاو دێت و ئەوان نازانن)). فەرمووی: و کاتێك فوو دەکەن بەنەفخی سوورا و ڕۆژی کۆتایی بگات و خوا بەهەشتی و جەهەننەمی جیابکاتەوە، بەڵام هێشتا نەڕۆشتبێتن، خواوەند مانگ و هەتاو بانگ دەکات. دەیانهێنن بەڵام ڕەشن و بێ نوور و نیگەران و شڵەژاو و

لەترسی ڕۆژی پەسلاّن و ترسی خواوەند دەلەرزن و کاتێك دەگەنە نزیکی عەرش، کوڕنوش دەبەن و دەڵێن: ((خوایە پەرەستینی ئێمە و هەوڵی ئێمە بۆ پەرەستینی خۆت دەزانی کە لەرۆژگاری دنیا بەردەوام گوێرایەڵی فەرمانەکانی تۆبوین، سزامان مەدە لەبەر ئەوەی ناباوەڕان ئێمەیان پەرەستی. ئێمە بانگەشەی پەرەستینی خۆمان بۆ کەس نەکرد و لەپەرەستینی تۆ بیَ ئاگا نەبووین. خواوەند لەوەلاّمدا دەفەرمێت: (( ڕاستتان وت، بڕیارمداوە دووبارە لەسەرەتاوە دەست پێبکەمەوە و ئێوە بۆ هەمان شێوەی کەبوون، بگۆڕم، بۆ چۆنییەتی سەرەتای خۆتان بگۆڕێن)).

دەڵێن: ئەی پەروەردەگار، ئێمەت لەچی ئافراند؟

دەڵێت: ((ئێوەم لەنووری عەرشەکەی خۆم ئافراند، ببنەوە بەنووری عەڕش.))

فەرمووی: بروسەکەیەکی لێدێتەدەر کەچاوەکان زەق دەکات و لەگەڵ نوری عەرش تێکەڵ دەبێت و مانای وتارەکەی خواوەند ئەمەیە کەفەرمووی: لەسەرەتاوە دەست پێدەکات و دووبارەی دەکاتەوە)).

عێکرەمە دەڵێت: من و ئەو کەسانەی ئەم حەدیسەمان بیست، هەستاین و ڕۆشتینە لای کەعب و تورەیی کوڕی عەباسمان لەقسەکەی ئەو،باس کرد بەو حەدیسەی لە پێغەمبەر(د.خ) ئاماژەمان پێدا. کەعب لەگەڵ ئێمە هەستا و ڕۆشتینە لای کوڕی عەباس و وتی: بیستومە لەقسەکەی من تووڕە بویت، داوای لێبوردن دەکەم، سەرچاوەی قسەکەی من کتێبێکی کۆنە کە لەدەستی خەڵکدایە و نەمزانی جولەکەکان دەسکاریان کردووە و سەرچاوەی قسەکەی تۆ لەکتێبێکە کەتازە لەلایەن خواوەندەوە نێردراوە و تایبەتە بەسەروەری پێغەمبەرەکان و باشترینی نێردراوەکان. دەخوازم حەدیسەکەم بۆ باس بکەیت تا بەبیری بسپێرم و چیتر ئەو حەدیسە بگێڕمەوە.

عێکرەمە دەڵێت: کوڕی عەباس حەدیسەکەی بۆ گێڕایەوە و من بەش بەبەش لەزەینی خۆمدا بەراوەردم کرد، هیچی پیَ زیاد نەکرد و هیچی لیَ کەم نەکردەوە. هیچ وتەیەکی پێش نەخست و هیچ وتەیەکی دوانەخست و لێرەوە خۆشەویستی من بۆ کوڕی عەباس زیادی کرد.

هەروەها یەکێك لەگێڕانەوە جیاوازەکان گێڕانەوەی کوڕی کەوایە کە بەعەلی کوڕی ئەبی تالبی وت: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەم پەڵەی سەر مانگ چییە؟

وتی: مەگەر قورئان ناخوێنیت کەدەفەرمێت، نیشانەکانی شەومان لەبەرچاو ون کرد، ئەمە لەبەرچاو بردنی مانگە.

گێڕانەوەیەکی دیکە هەیە لە عەلی کوڕی ئەبی تالب: هەر پرسێکتان هەیە، لەمنی بپرسن. کوڕی کەوا وتی: ئەم پەڵە ڕەشە لەسەر مانگ چییە؟

وتی: خوا بتکوژێت، بۆ سەبارەت بەکاری دین و دنیا پرسیارت نەکرد. ئەوسا وتی: ئەمە لەبەچاو ون کردنی شەوە.

ئاماژەیان بەچەندین گێڕانەوەی هاوشێوەیتر داوە.

قتادە سەبارەت بەوتاری خواوەند کەدەفەرمێت شەو و ڕۆژمان کردە دو نیشانە و نیشانەی شەومان لەبەرچاو ون کرد، دەڵێت: ئێمە هەمیشە دەمانوت لەبەرچاو ون کردنی نیشانەی شەو ئەو پەڵە ڕەشانەی سەر مانگە و ئاشکاری نیشانەی ڕۆژ یانی هەتاو، نورانیتر و گەورەتر لەمانگە.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: وتاری راست لای من ئەوەیە کەخواوەند هەتاو و مانگی کردە دو نیشانە و نیشانەی ڕۆژ یانی هەتاوی ئاشکرا کرد کە بەهاوکاری ئەو دەتوانین ببینین و نیشانەی شەو یانی مانگی بەتاریکی و ڕەشایی لەبەرچاو ون کرد و ئەگەری هەیە خواوەند دو هەتاوی لەنووری عەرشی خۆی ئافڕاندبێت، دواتر نووری مانگی بەڕەشی شەو لەبەرچاو ون کردبێت بەهەمان شێوە کەکەسانێك ئەم بۆچوونەیان باس کردووە و ئامارژەمان بەو گێڕانەوانەدا و هۆکاری جیاوازی ئەمان ئەوەیە. نووری هەتاو لەپۆششی نووری عەرشە و روناکی مانگ روناکی کورسیە. ئەگەر بەڵگەی ئەو دو گێڕانەوەی باسمان کرد، راست دەبوو، ئێمەیش پشتراستمان دەکردەوە، بەڵام سەبارەت بەراستی بەڵگەکان بۆچوونەکان جیاوازن و ناوەرۆکەکەی سەبارەت بەهۆکاری جیاوازی مانگ و هەتاو سەلمێنراو نییە بەڵام بەدڵنیاییەوە دەزانین خواوەند لەبەر بەرژەوەندی بەندەکانی خۆی، نووری ئەوانی جیاواز کرد، یەکیان نووڕانی و ڕۆشن ئەوی دیکەیان کەم نووڕ و نارۆشن.

ئەم وتارەمان سەبارەت بەمانگ و هەتاو باس کرد چوونکە مەبەستی ئێمە لەم

کتێبەدا باس کردنی بەسەرهاتی ڕووداوەکانی دەورانەکان و میژووی پاشاکان و پێغەمبەران و نێردراوانە و میژوو و زەمان بە شەو و ڕۆژ دیاری دەکەن کەبەرهەمی سووڕانی هەتاو و مانگ لەگەردوونە. لەبەر ئەوەی دەمانەوێت میژووی شا ستەمکار و یاخییەکان و ناباوەڕان بەخواوەند یا پاشا ملکەچ و گوێرایەڵەکان و سەردەمی پێغەمبەران و نێردراوان باس بکەین، باسی هەتاو و مانگمان کرد چوونکە ناسینی کاژێرەکان شەو و ڕۆژ پەیوەستە بەوان. هەنووکە باسی یەکەم کەس دەکەین کەخواوەند پاشایەتی و نیعمەتی پێبەخشی و کوفرانی نیعمەتی کرد و حاشای لەخوایەتی خواوەند ویاخیگەری کردەپیشە و خواوەند نیعمەتەکانی خۆی لێ سەندەوە و ریسوای کرد و بەدوای ئەو باسی شوێنکەوتەکانی ئەو دەکەین کەگیرۆدەی ئازاب و ئەشکەنجەی خوایی بوون. هەروەها باسی پاشا گوێرایەڵەکان دەکەین کەکردارەکانیان پەسەندکراو بوو لەگەڵ میژووی پێغەمبەرەکان ونێردراوان بەخواستی خوا ئاماژەیان پێدەدەین.

## سەرەتا و سالاری ستەمکاران ئیبلیس بوو

خواوەند، چاکەکاری و شەرەف و گەورەیی پێبەخشی لەگەڵ پاشایەتی ئاسمان و زەوی. ئیبلیس لەخەزێنەدارانی بەهەشت بوو، بەڵام دژایەتی خواوەندی کرد و بانگەشەی خوایەتی بەرز کردەوە و پێشنیاری پەرەستینی خۆی بەژێردەستەکانی کرد. خواوەند ئەوی کردە شەیتانێکی رەجمکراو، کردارەکانی گۆڕی و نیعمەتەکانی لێسەندەوە و لەئاسمانەکان دووری خستەوە. جێگەی ئیبلیس و شوێنکەوتەکانی ئەوی کردە جەهەننەم.

ئێستا کورتەیەك لەگێڕانەوە کۆنەکان سەبارەت بەگەورەیی و مەزنی کەخواوەند پێش یاخیبوون و بانگەشەی خوایەتی بەئیبلیسی بەخشیبوو، لەگەڵ باس کردنی ڕووداوەکانی ڕۆژگاری سەڵتەنەت و پاشایەتی ئەو تا کاتی دوورخرانەوەی لەگەڵ هۆکارەکان بەخواستی خوا باس دەکەین.

## گێڕانەوەکان سەبارەت بەوەی ئیبلیس، پاشایەتی ئاسمان و زەوی لەدەستدابو

کوڕی عەباس دەڵێت: ئیبلیس لەئەشراف مەلاییکە بوو، هۆزێکی بڕواپێکراو وخەزێنەداری بەهەشت و سوڵتانی ئاسمانەکانی دنیا و سوڵتانی زەوی بوو.

هەروەها لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە کەهۆزێك لەفریشتەکانی جن(جنۆکە) بوون و ئیبلیس یەکێك بوو لەوان و نێوانی ئاسمان و زەوی سنوری فەرمانڕەوایەتی ئەو بوو.

لەکوڕی مەسعود دەگێڕنەوە کە ئیبلیس پاشایەتی ئاسمانی لەدەستدا بوو، لەهۆزێك لەمەلاییکەکان کە بەجن (جنۆکە) ناویان دەبردن. بۆیە بەم ناوە، ناویان دەبردن چوونکە خەزێنەداری بەهەشت بوون. ئیبلیس هەم پاشا بوو هەم خەزێنەدار.

هەروەها لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە کەئیبلیس لەفریشتەکان بوو ونێوان ئاسمان وزەوی سنووری فەرمانڕەوایەتی ئەو. یاخیگەری کردەپیشە و خواوەند روخساری ئەوی بۆ شەیتانێکی رەجمکراو گۆڕی.

## گێڕانەوەکان سەبارەت بەوەی دوژمنی خواوەند، ڕێزی نیعمەتەکانی پەروەردگاری نەگرت و لەخۆبایی و بانگەشەی خوایەتی کرد

لەکوڕی جەریح دەگێڕنەوە کەهیچ کام لەفریشتەکان جگە لەئیبلیس بانگەشەی خوایەتی نەکرد.

لەقتادە دەگێڕنەوە کە ئەم وتاری خواوەند کەدەفەرمێت:

((و من یقل منهم انی آله من دونه فذلك نجزیه جهنم کذلك نجزی الظالمین،

واتاکەی: هەرکەس لەوان بڵێت من خوایەك جگە لەخوام، بۆ ئەم وتە، بەجەهەننەم سزای دەدەین و ستەمگەران بەمشێوەیە سزا دەدەین)) تایبەتە بەئیبلیسی دوژمنی خوا چوونکە ناڕەوای هێنایە سەرزمان. خواوەند، مەلعوون و دووری خستەوە و فەرمووی: بەمشێوەیە جەهەننەم دەکەینە سزای ئەو و ستەمگەران بەمشێوەیە سزا دەدەین.

## وتار سەبارەت بەو رووداوانەی لەسەردەمی پاشایەتی ئیبلیس روویاندا هۆکاری مردنی ئەو

یەکێك لەرووداوەکانی رۆژگاری ئەوەبوو کەملکەچی فەرمانەکانی خواوەند بوو. لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە کەئیبلیس لەهۆزێك لەفریشتەکان بوو کەپێیان دەوتن جن، لەئاگر ئافرێنرابوون، ئیبلیس ناوی حارس و یەکێك بوو لەخەزێنەدارەکانی بەهەشت. هەموو فریشتەکان جگە لەم هۆزە لەنوور ئافرێنرا بوون و ئەو (جن)انانەی لەقورئاندا ناویان هاتووە لەبڵێسەی ئاگر ئافرێنراون. مرۆڤ لەگڵ ئافرێنرا. یەکەم دانیشتووان سەرزەوی جنۆکەکان بوون کەخراپەکاریان کردە پیشە و خوێنیان ڕشت و یەکتریان کوشتار کرد و خواوەند، ئیبلیسی هاورێ لەگەڵ سوپایەك لەفریشتەکان ڕەوانە کرد کەشەڕیان لەگەڵ کردن و جنۆکەکانی بۆ دورگەکانی دەریا و دەوروبەری کێوەکان دوورخستەوە. ئیبلیس کاتێك ئەم کارەی کرد، لەخۆبایی بوو و وتی، کارێکم کرد پێش من کەس نەیکرد. خواوەند هەستی بەنهێنییەکەی دڵی کرد بەڵام فریشتەکانی هاورێی ئاگادار نەبوون.

لەرەبیعە کوڕی ئەنس دەگێڕنەوە کەخواوەند فریشتەکانی لەرۆژی چوارشەممە ئافراند و جنۆکەی لەرۆژی پێنجشەممە و مرۆڤی لەرۆژی هەینی. نەتەوەیەك لەجنۆکەکان کافربوون و فریشتەکان لەسەرزەوی شەڕیان لەگەڵ کردن و بەمشێوەیە لەسەرزەوی خوێنرێژی و خراپەکاری بڵاو بوویەوە.

## وتار سەبارەت بەهۆکاری لەخۆبایی بوونی دوژمنی خواو هۆکاری گەردنکێشی ئەو لەگەڵ خوا

بۆچوون و گێرانەوەکان لەمبارەوە جیاوازن. گێرانەوەیەکمان لەکوڕی عەباس باس کرد کەکاتێك شەڕی جنۆکە خراپەکار و خوێنرێژەکانی کرد و لەناوی بردن، لەخۆبایی بوو و گومانی کرد لەزانست و لەپێشیەکان لەکەسانیتر لەپێشترە.

گێڕانەوەی دوەمیش لەکوڕی عەباسە کەدەڵێت ئیبلیس شا و بەڕێوبەری ئاسمان و چارەسەری نێوان ئاسمان و زەوی لەدەستی ئەودا بوو. ئیبلیس خەزێنەداری بەهەشت و کەسێکی هەوڵدەر بۆ پەرستش کردنی خواوەند بوو، بەلام لەخۆبایی و گومانی کرد لەپێشتر لەهەموانە و رێگەی گەردنکێشی و یاخیگەری بەرابەر بەخوای گرتەبەر.

لەکوڕی عەباس و کوڕی مەسعود دەگێڕنەوە کەکاتێك خواوەند لەئافراندن تەواو بوو، لەسەر عەرش جێگەی گرت و ئیبلیسی کردە پاشای ئاسمانەکان. ئەو لەدەستەی ئەو فریشتانە بوو کەبەجن (جنۆکە) ناویان دەبردن چوونکە خەزێنەدارانی بەهەشت بوون. ئیبلیس هەم پاشا بوو هەم خەزێنەدار. لەخۆبایی بوو و بەخۆی وت خواوەند بۆیە ئەم پاشایەتیەی بەمن بەخشی چوونکە لەپێشتر و گەورەتر لەکەسانی دیکەم.

هەروەها لەحیماد دەگێڕنەوە کاتێك لەخۆبایی بوون لەدڵی ئیبلیسدا جێگەی گرت، گومانی کرد کەلەفریشتەکان لەپێشتر و گەورەترە. خواوەند بەمەی زانی و بەفریشتەکانی فەرموو: لەسەر زەوی خەلیفەیەك (جێگرێ) بۆخۆم دەستنیشان دەکەم.

هەروەها لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: ئیبلیس لەفریشتەکان و ناوی عەزازیلە. نیشتەجێی سەرزەوی و فریشتەکانی سەرزەوی بەجن ناودەبران.

لەسەعید کوڕی موسەییب دەگێڕنەوە کەئیبلیس سالاری فریشتەکانی ئاسمانی دنیا بوو.

گێڕانەوەی سێیەم کە لەکوڕی عەباسی دەگێڕنەوە کەئیبلیس پاشماوەی

ئافرێنراوێکی دیکەی خواوەند بوو کەنافەرمانی خوایان کرد.

## وتار سەبارەت بەگێڕانەوەی عەبدالله کوڕی عەباس

عێکرەمە لەکوڕی عەباس دەگێڕێتەوە کەخواوەند ئافرێنراوێکی ئافڕاند و فەرمووی: کوڕنوش بۆ ئادەم ببن. وتیان: نایبەین. خواوەند ئاگرێکی نارد و ئەوانی سوتاند، دواتر بوونەوەرێکی دیکەی ئافڕاند و وتی: من مرۆڤێك لەگڵ دروست دەکەم و دەبێت کوڕنوش بۆ ئادەم ببەن. دەڵێت: رازی نەبوون و حاشایان کرد و خواوەند ئاگرێکی ڕەوانە کرد و ئەوانیشی سووتاند. دواتر ئەم دەستەی ئافڕاند و فەرمووی: ئایا کوڕنوش بۆ ئادەم نابەن؟ وتیان: دەیبەین. بەڵام ئیبلیس حاشای کرد و کوڕنوشی نەبرد.

دەستەیەکی دیکە وتوویانە هۆکاری لەناوچوونی ئیبلس ئەوە بوو کەئەو لەپاشماوەی جنۆکەکانی سەرزەوی بوو کەخوێنیان ڕشت و خراپەیان کردەپیشە و لەپەرەستینی پەروەدگار دوورکەوتنەوە و فریشتەکان بۆ شەڕ روبەرویان بوونەوە.

### ئاماژەدان بە بێژەری ئەم وتەیە

لەشەهر کوڕی حەوەشب سەبارەت بەم وتارەی خواوەند کەئیبلیس لەجن بوو، دەگێڕنەوە کە ئیبلیس لەدەستەی ئەو جنۆکانە بوو کەفریشتەکان لەناویان بردن. ئیبلیس لەلایەن فریشتەکانەوە ئەسیرکرا و بۆ ئاسمانیان برد.

لەسەعد کوڕی مەسعود دەگێڕنەوە کەوتی: فریشتەکان لەگەڵ جنۆکەکان شەڕیان کرد و ئیبلیسی کەم تەمەن ئەسیر کرا. لەگەڵ فریشتەکان بوو و پەرەستینی خوای ئەنجام دەدا و کاتێك فەرمانیان پێدرا کوڕنوش بۆ ئادەم ببەن، فریشتەکان رازی بوون بەڵام ئیبلیس نا و مانای وتارەکەی خواوەند ئەمەیە کەفەرمووی: ئیبلیس لەجنۆکەبوو.

راستترین وتە لای من ئەوەیە کەشوێنکەوتەی وتاری خواوەند بین کەدەفەرمێت: ((کاتێك بەفریشتەکانمان وت کوڕنوش بۆ ئادەم ببەن. کوڕنوشیان برد جگە لەئیبلیس کە لەجنۆکەکان بوو و سەرپێچی فەرمانی پەروەردگاری کرد.)) ئەگەری هەیە هۆکاری نافەرمانی ئیبلیس لەبەر ئەوە بووبێت چوونکە جنۆکە بوو و ئەگەری هەیە لەبەر غرور و لەخۆبایی بوون کوڕنوشی بۆ ئادەم نەبردبێت چوونکە بەردەوام خواپەرەستی دەکرد و کەسێکی زانا و پاشایەتی ئاسمان و زەوی پێبڕابوو و ئەگەری هەیە هۆکاری کوڕنوش نەبردن بابەتی دیکە بێت بەلاّم ئاماژەیان بەگێڕانەوەی دیکە نەداوە و لەمبارەوە جیاوازییەکان فراوانن بەهەمان شێوە کەئاماژەمان پێدا.

دەڵێن هۆکاری ریسوا بوونی ئەوە بوو کەپێش ئادەم، جنۆکەکان دانیشتووانی سەرزەوی بوون و خواوەند ئیبلیسی کردە داوەری ئەوان و بۆ ماوەی هەزار ساڵ داوەری لەنێوان ئەواندا کرد و بە(حەکەم) ناوی دەرکرد. خواوەند ئەم ناوەی پێبەخشی، وەحی بۆ نارد و لەبەر ئەمە ئیبلیس لەخۆی بایی بوو و لەنێوان جنۆکەکان دوژمنایەتی و دوبەرەکی دروست کرد کەبۆماوەی هەزار ساڵ لەسەر زەوی شەڕی یەکیان کرد بەشێوەیەك ئەسپەکانیان لەخوێندا نوقم بوون و مانای وتاری خواوەند کەفەرمووی: ((مەگەر لەئافراندنی یەکەم هیلاك بوین؟) بەڵکو ئەوان لەپۆششی ئافرێنراوی تازەدان) و وتاری فریشتەکان کەئایا کەسێك لەسەر زەوی دەکەیتە جێگری خۆت کەخوێنرێژی دەکاتە پیشە، ئەمەیە. خواوەند ئاگرێکی ڕەوانە کرد و ئەوانی سووتاند و کاتێك ئیبلیس ئازابی نەتەوەکەی خۆی بینی، ڕۆشتە ئاسمانی سەرەوە و لەگەڵ فریشتەکان مایەوە و بۆ پەرەستینی خواوەند هەوڵی دەدا تا ئەو کاتەی خواوەند ئادەمی ئافڕاند و ئیبلیس یاخیگەری کردە پیشە.

## لەرووداوەکانی سەردەمی پاشایەتی ئیبلیس ئافراندنی ئادەم، باوکی مرۆڤەکان بوو

کاتێك خواوەند ئیرادەی کرد فریشتەکان لە لەخۆبایی بوونی ئیبلیس ئاگادار بکاتەوە لەبەر ئەوەی ئەوان نەیانزانیبوو. خواوەند مەبەستی ئەوەی کرد نهێنییەکەی ئاشکرا بکات چوونکە سەردەمی ریسوابوونی و لەدەستدانی پاشایەتیەکەی هاتبوو، خواوەند بەفریشتەکانی فەرموو: ((لەسەر زەوی خەلیفەیەك بۆ خۆم دروست دەکەم)) ئەوان وەلآمیان دایەوە: ئایا کەسێك لەسەرزەوی جێگیر دەکەیت کەخراپە و خوێنرێژی بکاتە پیشە؟

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە کەفریشتەکان بۆیە ئەم قسەیان هێنایە سەرزمان چوونکە ئاگاداری کاروباری جنۆکەکانی سەرزەوی بوون و بەخواوەندیان وت: کەسێك لەسەر زەوی جێگیر دەکەیت تا هاوشێوەی جنۆکەکان بێت کەخوێنیان ڕشت و خراپەیان کردە پیشە لەکاتێکدا ئێمە بەپەرەستینی تۆ سەرقاڵین.

پەروەدگار وەلآمی دانەوە: ((ئەوەی من دەیزانم ئێوە نایزانن))مەبەستی لەخۆبایی بوون و غروری ئیبلیس و مەبەستی ئەو بۆ نافەرمانی کردن بوو تا ئاشکرای بکات و فریشتەکان بەچاوی خۆیان بیبینن.

سەبارەت بەم بابەتە گێڕانەوەکان فراوانن کەبەشێك لەوانمان لەکتێبی (جامع البيان عن تأويل آية القرآن) باس کردەوە و پەسەند نییە ئەم کتێبە بەباس کردنی ئەوان درێژ بکەینەوە.

کاتێك خواوەند مەبەستی ئافراندنی ئادەمی کرد، فەرمانیدا تا خاك لەسەر زەوی هەڵبگرن. لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە کەپەروەدگار فەرمانیدا تا خاکی ئادەمیان لەسەرزەوی هەڵگرت و ئەوی لەقوڕی لکێنەری بۆنخۆش ئافراند کە لەگڵی بۆگەن وەرگیرابوو و گڵی بۆگەن لەخاك و خواوەند ئادەمی بەدەستی خۆی لەگڵ ئافراند.

لەکوڕی مەسعود و دەستەیەك لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) دەگێڕنەوە

کەخواوەند جبرەئیلی ڕەوانە کرد تا گڵ لەسەر زەوی بێنێت و زەوی وتی: پەنا بۆ خوا دەبەم لەوەی من ریسوا یا لەمن کەم بکەیتەوە. جبرەئیل گەڕایەوە و هیچی هەڵنەگرت و وتی: خوایە پەنای بۆ تۆ برد و من لێی خۆش بووم. خواوەند میکائیلی ڕەوانە کرد و زەوی قسەکەی دوبارە کردەوە و میکائیل گەڕایەوە. خواوەند فریشتەی مەرگی ڕەوانە کرد و زەوی پەنای بۆ خوا برد بەلاّم فریشتەی مەرگ وتی:منیش پەنا بۆ خوادەبەم لەوەی بگەڕێمەوە و فەرمانەکەی ئەوم ئەنجام نەدابێت. خاکی لەسەر زەوی هەڵگرت و تێکەڵی کرد. لەیەك شوێن هەڵینەگرت و لەخاکی سوور و ڕەش و سپی هەڵگرت و لەبەر ئەمە ڕەنگی منداڵەکانی ئادەم جیاوازە. خاکەکەی بردە ئاسمان و تەڕیان کرد و قوڕیان لێ دروست کرد و لێیگەڕان تا گۆڕا و بۆنی گرت و مانای وتارەکەی خواوەند لەگڵی بۆگەن ئەمەیە.

هەروەها لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە کەخواوەند ئیبلیسی ڕەوانە کرد کە لەخۆڵی سوێر و شیرینی زەوی هەڵگرت و ئادەمی لێ ئافراند و بەئادەم ناوی دەرکرد کە لەئەدیەمی زەویەوە سەرچاوەی گرتووە. لەبەر ئەمە ئیبلیس وتی: من کوڕنوش بۆ کەسێك ببەم کە لەگەڵ ئافرێنراوە؟

لەسەعید کوڕی جوبەیر دەگێڕنەوە کەبۆیە بەئادەم ناوی برا چوونکە لەئەدیەمی زەوی ئافرێنرا.

لەعەلی کوڕی ئەبی تالب دەگێڕنەوە کەئادەم لەئەدیەمی زەوی ئافرێنرا کەچاك و خراپ بوو و لەبەر ئەمە منداڵەکانی ئادەم چاك و خراپن.

لەئەبو موسا ئەشعەری دەگێڕنەوە کەپێغەمبەر فەرمووی: خواوەند ئادەمی لەمشتێك گڵ ئافراند کە لەسەر هەموو زەوی هەڵیگرت و منداڵەکانی ئادەم هاوشێوەی زەوین، سوور و ڕەش و سپی و نەرم و درشت و چاك و خراپ. خاکیان تەڕ کرد تا بوو بەگڵ و لێی گەڕان تا بۆنی گرت و وشك بوویەوە بەهەمان شێوە کەخواوەند فەرمووی مرۆڤمان لەسواڵەتێك لەگڵی بۆگەن ئافراند.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە کە خواوەند ئادەمی لەسێ شت ئافراند لەگڵی وشك و گڵی بۆگەن و گڵی لکێنەر.

دەڵێن خواوەند کاتێك گڵی ئادەمی تێکەڵ کرد، چل ڕۆژ و بەوتەیەك چل ساڵ

جەستەکەی لەسەر زەوی بوو.

ئاماژەدان بە بێژەری ئەم وتەیە

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە کەخواوەند فەرمانیدا گڵی ئادەمیان هەڵگرت و ئادەمی لەگڵی لکێنەری بۆگەن، ئافراند. ئادەمی بەدەستی خۆی و چل رۆژ جەستەکەی لەسەر زەوی بوو. ئیبلیس دەهات و بەقاچی خۆی لێیدەدا کەدەنگی دەدایەوە و مانای وتاری خواوەند کەفەرمووی: ((لەگڵی وشکی دەنگدار)ئەمەیە، یانی شتێکی ناوبەتاڵ کەپڕ نییە. شەیتان دەڕۆشتە ناودەمی ئادەم و لەکۆتاییەکەیەوە دەهاتەدەر و لەکۆتاییەکەیەوە دەڕۆشتە ناو و لەدەمییەوە دەهاتەدەر و دەیوت: تۆیان بۆدەنگدانەوە دروست نەکردووە، بۆ مەبەستێك تۆیان ئافراندووە. ئەگەر بەسەرتۆدا زاڵ ببم، لەناوت دەبەم و ئەگەر تۆ بەسەر مندا زاڵ بکەن، فەرمانبەریت ناکەم.

لەکوڕی مەسعود و دەستەیەك لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) دەگێڕنەوە کەخواوەند بەفریشتەکانی فەرموو: من مرۆڤێك لەگەڵ دروست دەکەم و کاتێك تەواو بووم و لەرۆحی خۆم پێبەخشی، کوڕنوشی بۆ ببەن. خواوەند ئادەمی بەدەستی خۆی ئافراند تا ئیبلیس لەگەڵ ئەو بەرابەری نەکات و ئەگەر بەرابەری کرد، بڵێت لەگەڵ کەسێك بەرابەری دەکەیت کەبەدەستی خۆم ئافراندوومە. ئەوی لەشێوەی مرۆڤدا دروست کرد و چل ساڵ جەستەکەی گڵ بوو، فریشتەکان لای ئادەم تێدەپەڕین و لەبینینی دەترسان و ئیبلیس زیاتر لەهەمویان. کاتێك لای ئەو تێدەپەڕی و لێیدەدا و جەستەکەی وەك سواڵەت دەنگی دەدایەوە، دەیوت، ئەمەیان بۆ مەبەستێکی تایبەت دروست کردووە. لەدەمیەوە دەڕۆشتەدەر و لەقونییەوە دەهاتەدەر. بەفریشتەکانی وت: لەمە مەترسن چوونکە خواکەتان ناوپڕە و ئەمە ناوبەتاڵ و ئەگەر بەسەر ئەودا زاڵ ببەم، لەناوی دەبەم.

لەسەلمانی فارسی دەگێڕنەوە کەخواوەند ئادەمی ئافراند و پێش لەبەخشینی رۆحی خۆی، بۆماوەی چل رۆژ سەیری کرد. گڵ وەك سواڵەت وشك بوویەوە و بەفریشتەکانی فەرموو: کاتێك رۆحی خۆم پێبەخشی، کوڕنوشی بۆ ببەن.

لەرابردوان دەگێڕنەوە: ڕۆح لەسەرەوە هاتە ناو جەستەی ئادەم.

ئامارژەدان بە بێژەری ئەم وتەیە

لەکوڕی مەسعود و دەستەیەك لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) دەگێڕنەوە: کاتێك ڕۆحیان بەئادەم بەخشی و گەیشتە سەری، پژمی و فریشتەکان سوپاسی خوایان کرد، ئەویش سوپاسی خوای کرد و خواوەند فەرمووی: ((خوا ڕەحمەتت پێ ببەخشێت)). کاتێك ڕۆح گەیشتە چاوەکانی، سەیری میوەکانی بەهەشتی کرد و کاتێك گەیشتە سینەی، ئارەزوی خواردنی کرد و پێش ئەوەی ڕۆح بەقاچەکانی بگات، بەپەلە بەرەو میوەکانی بەهەشت رایکرد و هەموو فریشتەکان کوڕنوشیان برد جگە ئیبلیس کەهاوڕێیەتی ئەوانی نەکرد و حاشای کرد و کافر بوو. خواوەند پێی وت: بۆ کوڕنوشت نەبرد؟

وتی: من لەو باشترم. من بۆ مرۆڤی دروستکراو لەگڵ کوڕنوش نابەم.

خواوەند فەرمووی: لەبەرچاوم ونبە، چوونکە بەهەشت جێگەی خۆپەسەندی نییە.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: کاتێك خواوەند لەرۆحی خۆی بەئادەمی بەخشی، ڕۆح لەسەرەوە ڕۆشتە ناوجەستەی و کاتێك بەجەستەی دەگەیشت، دەبوو بەگۆشت و خوێن و کاتێك گەیشتە سکی، خۆی بینی و لەجوانی خۆی سەریسوڕما و مەبەستی هەستانی کرد بەڵام نەیتوانی. مانای وتاری خواوەند کە((مرۆڤیان لەخێرایی ئافراندوە)) ئەمەیە. کاتێك ڕۆح بەتەواوی جەستەی گەیشت، پژمی و بەئیلهامی خواوەند سوپاسی خواوەندی کرد و خواوەند فەرمووی: کوڕنوش بۆ ئادەم ببەن. فریشتەکان کوڕنوشیان برد جگە ئیبلیس کەحاشای کرد و خۆپەسندی لەخۆی نیشاندا چوونکە لەخۆی بایی ببوو، وتی: کوڕنوش نابەم، من لەو باشترم، بەتەمەن گەورەتر و لەئافراندندا بەهێزترم، منت لەئاگر دروست کرد و ئەوت لەگڵ و ئاگر لەگڵ بەهێزترە. کاتێك ئیبلیس کوڕنوشی نەبرد، خوا لەسزای ئەم گوناحەی لەخێر بێ بەشی کرد و بوو بەشەیتانی ڕەجیم.

لەئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: کاتێك رۆحیان بەئادەم بەخشی، پژمی و سوپاسی خوای کرد و خواوەند فەرمانی پێدا کە بۆلای فریشتەکان برۆ و بڵێ: ((سڵاو لەئێوە بێت)). ئادەم ڕۆشت و سڵاوی لەفریشتەکان کرد وئەوانیش وتیان: ((سڵاو و رەحمەتی خوا لەتۆ بێت)). ئادەم بۆلای خواوەند گەڕایەوە کەپێی وت: ((ئەمە سڵاوی تۆ و منداڵەکانی تۆیە تا بەیەکی بڵێن)).

دواتر خواوەند ناوەکانی فێری ئادەم کرد وزانا کۆنەکان سەبارەت بەو ناوانەی خواوەند ئادەمی فێرکرد، بۆچون و گێڕانەوەکانیان جیاوازە، دەستەیەك وتوویانە ناوی هەموو شتەکان بوو.

ئاماژەدان بە بێژەری ئەم وتەیە

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە کەخواوەند هەموو ناوەکانی فێری ئادەم کرد یانی هەموو ئەو ناوەی خەڵکان دەیزانن وەك ناوی مرۆڤ و ئاژەڵ و زەوی و دەشت و دەریا و کێو و کەر و هتد. هەروەها لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە کەهەمو ناوەکانی فێری ئادەم کرد تەنانەت ئەوناوانەی وتنیان شیاو نییە ((مەبەست شەرمی ژن و پیاو و هتد)

لەموجاهید دەگێڕنەوە کەخواوەند ناوی هەمو ئافرێنراوەکانی خۆی فێری ئادەم کرد.

سەعید کوڕی جوبەیر دەڵێت: ناوی هەموو شتەکانی فێری ئادەم کرد تەنانەت ناوی وشتر و مانگا و بزن.

لەقتادە دەگێڕنەوە کەخواوەند ناوی هەموو شتەکانی فێری ئادەم کرد، یانی وتی: ئەمە کێوە و ئەمە دەریایە و ئەمە فلانە و ئەمە فیسار. دواتر شتەکانی نیشانی فریشتەکاندا و وتی: ئەگەر راست دەکەن ناوی ئەم شتانە بەمن بڵێن.

دەستەیەك وتوویانە ناوە تایبەتەکانی فێری ئادەم کرد کەناوی فریشتەکان بوو.

ئامارژەدان بە بێژەری ئەم وتەیە

لەرەبیع دەگێڕنەوە کە، ئەم وتارەی خواوەند کەفەرمووی: ((هەموو ناوەکانی فێری ئادەم کرد)) مەبەست ناوی فریشتەکانە. دەستەیەکی دیکە وتوویانە ناوە تایبەتەکان کەئادەم فێریان بوو ناوی نەوە و نەبیرەکانی بوو.

ئامارژەدان بە بێژەری ئەم وتەیە

لەکوڕی زەید دەگێڕنەوە سەبارەت بەم وتارەی خواوەند کەفەرمووی: ((هەموو ناوەکانی فێری ئادەم کرد)) دەڵێت مەبەست ناوی هەموو نەوە و نەبیرەکانی بوو.

کاتێك خواوەند ناوەکانی فێری ئادەم کرد، خاوەنی ناوەکانی نیشانی فریشتەکاندا و وتی: ئەگەر راست دەکەن ناوی ئەمانە بەمن بڵێن. بۆیە ئەم قسەی وت چوونکە فریشتەکان سەبارەت بەئافراندنی ئادەم وتبوویان: لەزەوی خراپە دەکاتە پیشە و خوێن درێژێت. خواوەند دەیفەرموو: ئێوە کەشتە ئاشکرا و بینراوەکان نازانن، لەنەبینراوەکان چی دەزانن. ئەم وتارەیان لەپێشینان گێڕاوەتەوە.

ئامارژەدان بە بێژەری ئەم وتەیە

لەکوڕی مەسعود دەگێڕنەوە کەخواوەند فەرمووی: ئەگەر راست دەکەن کەمناڵەکانی ئادەم لەسەر زەوی خراپە دەکەنە پیشە و خوێن دەرێژن، ناوی ئەم شتانە بەمن بڵێن.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە کەخواوەند فەرمووی: ئەگەر راست دەکەن و دەزانن بۆ لەسەرزەوی جێگرم بۆخۆم داناوە، ناوی ئەم شتانە بەمن بڵێن.

دەڵێن: کاتێك خواوەند بەئافراندنی ئادەم سەرقاڵ بوو، فریشتەکان وتیان: خواهەرچی پێخۆشە، بیافرێنێت، چوونکە ئێمە زاناترین و لای خوا ئازیزتر. و

کاتێك ئادەمی ئافڕاند و ناوی شتەکانی فێر کرد، شتەکانی نیشانی فریشتەکاندا و وتی: ئەگەر راست دەکەن کەخوا هەرچی دروست بکات، لەو زاناتر و ئازیزترن، ناوی ئەم شتانە بەمن بڵێن.

ئامارژەدان بە بێژەری ئەم وتەیە

لەقتادە دەگێڕنەوە: کاتێك خواوەند سەبارەت بەئافڕاندنی ئادەم لەگەڵ فریشتەکان راوێژی کرد، وتیان: کەسێك لەسەرزەوی دروست دەکەیت خراپەکاری دەکاتەپیشە و خوێن درێژێت. چوونکە دەیانزانی هیچ شتێك لای خوا لەخراپەکاری و خوێنڕشتن خراپتر نییە، بەلاَم خواوەند فەرمووی: ئەوەی من دەیزانم، ئێوە نایزانن. تەنیا خوا دەیزانی کەجێگرەکانی لەسەرزەوی پێغەمبەران و نێردراوان و خواپەرەست و بەهەشتیەکان دەبن.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە کەکاتێك خواوەند سەرقاڵی ئافڕاندنی ئادەم بوو، فریشتەکان وتیان: بۆ کەسانێکی زاناتر و ئازیزتر لەئێمە دروست ناکات. ئافڕاندنی ئادەم تاقی کردنەوەی ئەوان بوو چوونکە هەموو ئافرێنراوەکان رووبەرووی تاقی کردنەوە دەبنەوە هاوشێوەی ئاسمان و زەوی کەتاقی کردنەوەی ئەوان پەرەستین بوو کەخواوەند فەرمووی: فەرمانبرداڕ یا بەبێزارییەوە وەرن. وتیان: فەرمانبردار دێین.

لەقتادە و حەسەن دەگێڕنەوە کەکاتێك خواوەند بەفریشتەکانی وت خەلیفەیەك لەسەر زەوی دروست دەکەم و بۆچوونی خۆیان وت و شتێکیان زانی و شتێکیان نەزانی، وتیان: کەسێك لەزەوی دروست دەکەیت، خراپەکاری دەکاتە پیشە وخوێن درێژێت. چوونکە فریشتەکان دەیانزانی لای خواوەند هیچ گوناحێك گەورەتر لەخوێن ڕشتن نییە و کاتێك خواوەند ئافڕاندنی ئادەمی دەستپێکرد، فریشتەکان بەیەکیان وت: خوا هەرچی پێخۆشە بادروستی بکات، چوونکە لەئێمە زاناتر و ئازیزتر نابێت. کاتێك ئادەمی ئافڕاند و لەرۆحی خۆی پێبەخشی، وتی کوڕنوشی بۆ ببەن. ئادەمی پێش ئەوان خست لەسزای ئەو قسەیان کردبوویان. فریشتەکان وتیان: باشتر لەو نەبین، لەو زاناترین چوونکە پێش ئەو ئافرێنراوین و

نەتەوەکانی ئێمە پێش ئەو ئافرێنراون. کاتێك شانازیان بەزانستەکەی خۆیانەوە کرد، گیرۆدەی تاقیکردنەوە بوون. خواوەند ناوەکانی فێری ئادەم کرد و شتەکانی نیشانی فریشتەکاندا و فەرمووی: ئەگەر راست دەکەن و دەڵێن لەهەر شتێك کەبیافرێنم، زاناترن، ناوی ئەم شتانەم پێ بڵێن. فریشتەکان تۆبەیان کرد و هەر باوەڕدارێك تۆبە دەکات و وتیان:

((سبحانك لاعلم لنا الا ما علمتنا انك انت العليم الحكيم، قال: يا آدم انبئهم باسمائهم، فلما انبئهم باسمائهم قال الم اقل لكم انی اعلم غيب السموات و الارض و اعلم ما تبدون و کا کنتم تکتمون،

واتاکەی: پاکی تۆ دێنینە سەرزمان، جگە لەو زانستەی فێرت کردوین، هیچ نازانین چوونکە زانای فرەزان تۆیت. وتی: ئەی ئادەم. ئەوان لەناوی شتەکان ئاگادار بکەرەوە و کاتێك ناوی شتەکانی بەوان وت، وتی: مەگەر نەموت من نهێنی ئاسمانەکان و زەوی دەزانم و ئەوەی ئاشکرای دەکەن و ئەوەی بەنهێنی دەیهێڵنەوە، لای من شاراوە نییە.))

ئەو ناوانەی خواوەند فێری ئادەمی کرد ناوی هەموو شتەکان بوو وەك ئەسپ و ئێستر و وشتر و جنۆکە و وەحش و هەرشتێکی بەناوی خۆیەوە ناونا و دەستەدەستە ناوی بردن. دواتر بەفریشتەکانی وت: مەگەر بەئێوەم نەوت لەنهێنی ئاسمانەکان و زەوی ئاگادارم و ئەوەی ئاشکرای دەکەن و ئەوەی بەنهێنی دەیهێڵنەوە، لای من شاراوە نییە. ئەوەی ئاشکرایان کرد، ئەو قسەیە بوو کەوتبوویان نەوەکانی ئادەم لەسەر زەوی خراپەکاری و خوێن ڕشتن دەکەنە پیشە. ئەوەی بەنهێنی هێشتیانەوە، ئەو قسەیە بوو کەبەیەکیان وت کەئێمە لەئادەم باشتر و زاناترین.

کاتێك لەخۆبایی بوون و نافەرمانی ئیبلیس بۆ فریشتەکان ئاشکرا و خواوەند ئەوی دوور خستەوە و ئیبلیس لەسەر نافەرمانی پێداگری کرد، خواوەند، لەبەهەشت دەری کرد و پاشایەتی ئاسمانەکان و زەوی و خەزێنەداری بەهەشتی لێ سەندەوە و فەرمووی: ((لەبەهەشت بڕۆ چوونکە دەرکراویت و تا ڕۆژی پەسلان نەحلەت لەتۆ بێت)) ئیبلیس هێشتا لەسەر ئاسمان بوو و بۆ زەوی

نەهاتبووە خوار.

خواوەند ئادەمی لەبەهەشت جێگە کردەوە کەبەتەنیا پیاسەی تیا دەکرد و هاوسەری نەبوو تا ئارامی پێ بگرێت. چەند ساتێك خەوت و کاتێك هەستا، ژنێکی بینی کەلەسەر سەری دانیشتووە. خواوەند ئەو ژنەی لەپەراسووی ئادەمەوە ئافراند. لێی پرسی: کێیت؟

وتی: ژنێکم.

وتی: بۆ چ مەبەستێك ئافرێنراویت؟

وتی: تا بەمن ئارام بگریت.

فریشتەکان کەبەشێك لەزانستی ئادەمیان پێبڕابوو، وتیان: ئەی ئادەم ناوی چییە؟ وتی: حەوا.

وتیان: بۆ حەوا.

وتیان: لەبەر ئەوەی لەزیندوویێك ئافرێنرا.

خواوەند فەرمووی: ئەی ئادەم، تۆ و هاوسەرەکەت لەبەهەشت جێگیر بن و هەرچی دڵتان دەیخوازێت، لێی بخۆن.

لەکوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە: کاتێك خواوەند سزای بەئیبلیس بەخشی و ناوەکانی فێری ئادەم کرد، بەوتەی شوێنکەوتەکانی تەورات و زاناکانی دیکە، ئادەمی خەواند، پەراسوێکی لای چەپی هەڵگرت و شوێنەکەی بەگۆشت پڕ کردەوە. ئادەم بەهەمان شێوە لەخەودا بوو کەخواوەند حەوای لەپەراسووی ئەو ئافراند و بوو بەژن تا ئادەم بەو ئارام بگرێت. کاتێك ئادەم لەخەو هەستا، ئەوی لەتەنیشت خۆی بینی و بەهەمان شێوە کەوتوویانە و خوا زاناترە، وتی: (گۆشت و خوێن و هاوسەرم) بەو ئارامی گرت. کاتێك خواوەند هاوسەرێکی پێبەخشی و ئارامی پێگرت، وتی: ئەی ئادەم، تۆ و هاوسەرەکەت لەبەهەشت جێگیر بن و بەخۆشی لەمیوەکانی بخۆن تەنیا لەو دارە نزیك مەکەونەوە چوونکە دەچنە ریزی ستەمکاران.

لەموجاهید دەگێڕنەوە کەخواوەند حەوای لەپەراسووی ئادەم ئافراند و کاتێك هەستا، پێی وت: (بەنبتی پێم دەڵێن، مرئە) یانی ژن.

## وتار سەبارەت بەوەی خواوەند باوکی ئێمە یانی ئادەمی تاقی کردەوە

کاتێك خواوەند ئادەم و هاوسەرەکەی لەبەهەشت جێگە کردەوە. بەمەبەستی تاقی کردنەوە و بۆ ئەوەی قەزای خواوەند سەبارەت بەخۆی ونەوەکانی دیاری بکرێت، فەرمووی: لەمیوەکانی بەهەشت بخۆن جگە لەبەری ئەو دارە کەفەرمانیدا لێی نەخۆن. شەیتان دەستی بەهەڵخراندنی ئەوان کرد تا ئەوەی لەمیوەی داری یاساغکراویان خوارد و نافەرمانی خوایان کرد. بەمشێوەیە شەرمیان دەرکەوت کەپێشتر شاراوە بوو.

لەکوڕی مەسعود و دەستەیەك لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) دەگێڕنەوە کە شەیتان دەیویست بڕواتە ناو بەهەشت. بەڵام پاسەوانەکانی بەهەشت ڕێگریان لێدەکرد. شەیتان ڕۆشتە لای مار و لەو کاتەدا مار لەدەستەی چوارپێکان بوو وەك وشتر. زیاد لەرادە جوان بوو. شەیتان داوای لەمار کرد تا بڕواتە ناو دەمی و بەم شێوەیە بڕواتە بەهەشت. مار لای پاسەوانەکانی بەهەشت تێپەڕی و ئەوان نەیانزانی. چوونکە خواوەند بەوە شێوەیە بڕیاری دابوو. ئیبلیس لەناو دەمی مارەوە قسەی دەکرد، بەڵام ئادەم گرنگی پێنەدەدا، هاتەدەر و وتی: ئەی ئادەم دەخوازیت، داری نەمری و پاشایەتی بێ کۆتاییت نیشان بدەم؟ یانی دارێکت نیشان بدەم کەئەگەر لەبەرەکەی بخۆیت، دەبیتە فریشتەیەك هاوشێوەی فریشتەیەك و هەردووکتان نەمر دەبن. سوێندی خوارد کەچاکەخوازی ئەوانە. دەیویست بەمشێوەیە شەرمی ئەوان ئاشکرا بکات و جلەکانیان فڕێبدات چوونکە بەخوێندنەوەی کتێبی فریشتەکان دەیزانی کەشەرمیان هەیە و ئادەم نەیدەزانی و جلەکانیان لەنینۆك بوو. ئادەم نەیدەویست لەو دارە بخوات، بەڵام حەوا ڕۆشتە پێش و لێی خوارد و بەئادەمی وت: بیخۆ، من خواردم و هیچ زیانێکم بەرنەکەوت. کاتێك ئادەم خواردی، شەرمیان دەرکەوت و مەبەستی ئەویان کرد خۆیان بەگەڵا و بەرگەکانی بەهەشت داپۆشن.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە کەدوژمنی خوا، ئیبلیس داوای لەهەموو

خزۆکەکانی سەرزەوی کرد تا یەکیان بیباتە ناو بەهەشت بۆ ئەوەی لەگەڵ ئادەم و هاوسەرەکەی قسە بکات. هیچیان رازی نەبوون. بەماری وت: ئەگەر من ببەیتە ناو بەهەشت، لەبەرابەر مرۆڤەکان پارێزگاریت لێدەکەم و لەپەنای مندا دەبیت. مار ئەوی لەنێوان دودیانی خۆی هەڵگرت و ڕۆشتە ناو بەهەشت. شەیتان لەناو دەمی مارەوە قسەی لەگەڵ ئەوان دەکرد. مار داپۆشراو و لەسەرچوار دەست و پێ بەرێدا دەڕۆشت. خواوەند ئەوی رووت کردەوە بەشێوەیەك لەسەر سکی بخزێت. کوری عەباس دەڵێت: لەهەر شوێنێك مارتان بینی، بیکوژن و پشتیوانی دوژمنی خوا تێکبشکێنن.

لەوەهب کوری مونبە دەگێڕنەوە: کاتێك خواوەند ئادەم و هاوسەرەکەی لەبەهەشت جێگە کردەوە و وتی لەمیوەی ئەو دارە مەخۆن، لقەکانی داری یاساغکراو لەیەك ئاڵابوون. فریشتەکان لەو میوەیان دەخوارد و ئەو میوە بوو کەخواوەند رێگەی خواردنی لەئادەم و حەوا گرت. کاتێك ئیبلیس مەبەستی ئەوەی کرد بۆ گوناح ناچاریان بکات، ڕۆشتە ناو دەمی مار و مار خاوەنی چواردەست و پێ و هاوشێوەی قووچێکی بەهێز بوو. کاتێك مار ڕۆشتە ناو بەهەشت، ئیبلیس لەدەمی هاتەدەر و لەمیوەی داری یاساغکراوی هەڵگرت و بردی بۆ حەوا و وتی: بڕوانە میوەی ئەم دارە چەندە بۆنخۆش و بەتامە و خۆشڕەنگە. حەوا لێی خوارد و ئادەمیش بەهەمان شێوە. بەم شێوەیە شەرمیان دەرکەوت و ئادەم پەنای بۆ دڵی دارەکە برد و خواوەند بانگی کرد: لەکوێیت؟

وتی: خواوەندا، لێرەم.

فەرمووی: بۆ نایێیتەدەر؟

وتی: خواوەندا، لەتۆ شەرم دەکەم.

خواوەند فەرمووی: بەنەحلەت بێت، ئەو زەویەی لێی ئافرێنرایت. دارەکەیشی نەحلەت کرد و میوەکەی بوو بەچقڵ.

دەڵێت پێش ئەوە لەبەهەشت و زەمین دارێکی چاکتر لەتەڵح و سەدر بوونی نەبوو و خواوەند فەرمووی: ((ئەی حەوا، لەبەر ئەوەی بەندەکەی منت فریودا، بەبێزارییەوە دووگیان دەبێت ولەکاتی منداڵ بوون بەردەوام هەڕەشەی مەرگت

لەسەر دەبێت.)) بەماری فەرموو: ((تۆ کەئیبلیسی مەلعون هاتە ناو سکت و بەندەکەی منی فریودا، مەلعون دەبیت و قاچەکانت دەبێتە سکی تۆ و ڕۆژێت لەسەر خاك دەبێت، دوژمنی منالەکانی ئادەم دەبیت و ئەوانیش دوژمنی تۆ دەبن، لەهەر شوێنێك یەکیان ببینی، پاژنەیان دەگەزیت و لەهەر شوێنێك تۆ ببینن، سەرت پان دەکەنەوە)).

بەوەهبیان وت: فریشتەکان خۆهیچ ناخۆن. وتی: خواوەند هەرچی بخوازێت، دەیکات.

لەمحەممەد کوڕی قەیس دەگێڕنەوە کەخواوەند بەئادەم و حەوای فەرموو لەمیوەی یەك دار نەخۆن و لەدارەکانی دیکە، هەرچەندەیان دەوێت بەخۆشی هەڵبگرن و بیخۆن. شەیتان هات و ڕۆشتە سکی مار و لەگەڵ حەوا قسەی کرد ئادەمی هەڵخراند و وتی: ((خوا ڕێگەی خواردنی میوەی ئەم دارەی لێگرتن لەترسی ئەوەی نەکا ببنە فریشتە و هیچ کات نەمرن)) سوێندی خوارد کەچاکەخوازی ئەوانە. حەوا لەمیوەی دارەکەی لێکردەوە و دارەکە خوێناوی بوو. پۆششەکەی جەستەی ئەوان هەڵوەری و مەبەستی ئەوەیان کرد لەگەڵاکانی بەهەشت جل و بەرگ بۆ خۆیان ئامادە بکەن. خواوەند پێی وتن مەگەر ڕێگری خواردنی بەری ئەو دارەم لێنەکردن و نەموت شەیتان دوژمنی ئێوەیە، بۆ لەو میوەی یاساغم کردبوو، خواردتان؟

ئادەم وتی: خواوەندا، حەوا دەرخواردنی منیدا.

خواوەند بەحەوای وت: بۆ دەرخواردتدا؟

وتی: مار فەرمانی ئەو کارەی پێکردم.

بەماری وت: بۆ فەرمانی ئەو کارەت پێدا؟

وتی: ئیبلیس فەرمانی پێدام.

وتی: ئیبلیس مەلعون و بەنەحلەت کراوبێت و تۆ ئەی حەوا کەدارەکەت خوێناوی کرد، هەموو مانگێك خوێناوی دەبیت. تۆ ئەی مار، قاچت لێ دەسێنمەوە و لەسەر سك دەخزێیت، هەرکەسێك بتبینێت بەبەرد سەرت پان دەکاتەوە، دابەزن و دوژمنی یەکتر بن.

ئاماژەیان بەگێڕانەوەیەکی دیکەداوە کە شەیتان وەک چوارپێیەک ڕۆشتە ناو بەهەشت. دەڵێن وشتر بوو کە قاچەکانی هەڵوەری و بوو بەمار.

لەباوکی عالیە دەگێڕنەوە کەشەیتان پێش حەوا ڕۆشت و وتی: ڕێگری هیچ شتێکیان لێکردون؟

وتی: بەڵێ، لەم دارە.

وتی: بۆیە ڕێگەی خواردنی میوەی ئەم دارەیان لێگرتن لەترسی ئەوەی نەبنە فریشتە.

حەوا سەرەتا خواردی و بەئادەمی وت تا ئەویش بخوات. ئەو دارە بوو هەرکەسێک لەمیوەکەی دەخوارد، با لەسکیدا لوولی دەخوارد و ئەمە لەبەهەشتا ڕەوا نەبوو. ئادەم لەبەهەشت دەرکرا.

لەدەستەیەک لەشارەزایانی حەدیس دەگێڕنەوە کاتێک ئادەم نیعمەت و شادی بەهەشتی بینی، وتی چی دەبوو ئەگەر هیچ کات نەدەمردین. شەیتان ئەم قسەی بیست و لەڕێگەی نەمرییەوە فریویدا.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: بیستم کەسەرەتای فریوەکەی ئەو ئەمە بوو بەردەوام دەیناڵاند و کاتێک ناڵاندنی ئەویان بیست، خۆیان داشارد و وتیان: هۆکاری ناڵاندنی تۆ چییە؟

وتی: بۆ ئێوە دەگریم چوونکە دەمرن و ئەم خۆشی و نیعمەتانە بەجێدێڵن. ئەم وتەیە کاریگەی لەسەر دڵی ئەوان دانا. دواتر هات و هانیدان و وتی: ئەی ئادەم دەتەوێت داری نەمری و پاشایەتیت نیشان بدەم کەهیچ کات لەناوناچێت؟ خوا ڕێگەی خواردنی میوەی ئەم دارەی لێگرتن لەترسی ئەوەی نەکا هیچ کات نەمرن. یانی ئەگەر لەنیعمەتەکانی بەهەشت نەبنە فریشتە، هیچ کات نامرن. خواوەند دەفەرمێت: ((فریویدان.))

لەکوڕی وەهب دەگێڕنەوە کەشەیتان حەوای هەڵخراند و بردییە لای دارەکە و جوانییەکانی دارەکەی نیشاندا. دواتر ئادەم بۆ نیازی خۆی ئەوی بانگ کرد، وتی: مەگەر ناکرێت بۆ ئێرە بێیت. کاتێک هات، وتی: مەگەر ناکرێت لەم دارە بخۆیت.

دەڵێت: لێیان خوارد و شەرمیان دەرکەوت و ئادەم بەرووتی لەبەهەشتا دەڕۆشت. خواوەند بانگی کرد: ئادەم لەمن رادەکەیت؟

وتی: ئەی خواوەندا، نا بەڵام شەرم لەتۆ دەکەم.

وتی: ئادەم، لەکوێوە فریودرایت؟

وتی: ئەی خواوەند، لەحەوا.

وتی: دەبێت هەموو مانگێك گیرۆدەی خوێنبەربوونی بکەم بەهەمان شێوە کەئەم دارەی خوێناوی کرد. ئەوم وەك کەسێکی بیرمەند ئافراند بەڵام ئاوزی لێ دەستێنمەوە. بڕیار بوو بەئاسانی منالی ببێت، بەڵام بەدژواری و بەئازارەوە منالی دەبێت.

کوڕی زەید دەڵێت: ئەگەر هەڵەکەی حەوا نەدەبوو. ژنانی ئەم دنیایە گیرۆدەی خوێنبەربوون نەدەبوون. ئاوزیان دەبوو و بەئاسانی دووگیان و منالیان دەهێنایە دنیا.

لەسەعید کوڕی موسەییب دەگێڕنەوە کەسوێندی دەخوارد ئادەم لەکاتی خواردنی میوەی بەهەشت ئاوزی لەدەستی خۆیدا نەبوو، حەوا شەرابی دەرخواردداو کاتێك سەرخۆش بوو، بۆلای دارەکەی برد و کاتێك ئەو گوناحەیان کرد، خواوەند ئەوانی لەبەهەشت دەرکرد و نیعمەت وشادی لەوان سەندەوە و هاوڕێ لەگەڵ دو دوژمنەکەی خۆیان یانی ئیبلیس و مار بۆ سەر زەوی دابەزین. خواوەند فەرمووی، بڕۆنە سەرزەوی و دوژمنی یەکتر بن.

## وتار سەبارەت بەوەی ئادەم چەندە لەبەهەشتا مایەوە، کەی ئافرێنرا و کاتی دابەزینی لەبەهەشت کەی بوو

چەندین گێڕانەوەی دوبارە لەپێغەمبەر لەبەردەستایە کەدەفەرمێت خواوەند لەرۆژی هەینی ئادەمی ئافراند و لەرۆژی هەینی ئەوی لەبەهەشت دەرکرد و لەرۆژی هەینی بەتۆبەکەی ئەو رازی و لەرۆژی هەینی گیانی لیٚ سەندەوە.

ئاماژەدان بەگێڕانەوەکان لە پێغەمبەر(د.خ) لەمبارەوە

سەعد کوڕی عبادە لە پێغەمبەر(د.خ) دەگێڕێتەوە کەفەرمووی: هەینی حەوت تایبەتمەندی هەیە: ئادەم لەهەینی ئافرێنرا، لەهەینی بۆ زەوی دابەزی و لەرۆژی هەینی مرد.

لەکاژێرێکی ئەم رۆژەدا، بەندەکان داوای هەرچی لەخواوەند بکەن ئەگەر گوناح یا لەبارخستنی منالٚ نەبێت، پێیان دەبەخشرێت. رۆژی پەسلاٚن لەرۆژی هەینیدایە و فریشتە و کێو و زەوی و با لەرۆژی هەینی دەترسن..

باوکی لەبابەی ئەنساری لە پێغەمبەر(د.خ) دەگێڕێتەوە کەفەرمووی: هەینی سەروەری رۆژەکانە و لەرۆژی جەژنی رەمەزان و قوربان لای خواوەند ئازیزترە و پێنج تایبەتمەندی هەیە.

گێڕانەوەکانی دیکە هاوشێوەی حەدیسەکەی سەعد کوڕی عبادەن بەم جیاوازییەوە کەفریشتە و کێو و زەوی و با دەترسن لەوەی رۆژی پەسلاٚن لە رۆژی هەینیدا بێت.

لەئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: باشترین رۆژ بۆ هەلاٚتنی هەتاو، هەینییە، ئادەمیان لەرۆژی هەینی ئافراند، رۆژی هەینی بردیان بۆ بەهەشت و رۆی هەینی دەریان کرد.

هەروەها ئەبو هورەیرە دەڵێت، پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: هیچ رۆژێك هاوشێوەی هەینی نییە چوونکە ئادەم لەرۆژی هەینی ئافرێنرا و لەرۆژی هەینی لەبەهەشت دەکرا و لەرۆژی هەینی بۆ بەهەشت گەڕایەوە.

ئامارژەیان بەچەندین گێرانەوەی دیکە داوە.

## وتار سەبارەت بەوەی لەرۆژی هەینی ئادەم لەچ کاژێرێك ئافرێنرا و چ کاتێك بۆ زەوی دابەزی

عەبداللە کوری سەلام سەبارەت بەحەدیسەکەی پێغەمبەر(د.خ) کەفەرموو بووی: کاژێرێك لەرۆژی هەییندا هەیە کەبەندەکان داوای هەرچی لەخوا بکەن، پێیان دەبەخشرێت، دەڵێت، دەزانم چ کاژێرێکە، دوایین کاژێری رۆژە کەئادەمی تیا ئافرێنرا و خواوەند فەرمووی: مرۆڤ بەخێرایی ئافرێنرا.

هەروەها لەموجاهید لەمبارەوە دەگێرنەوە سەبارەت بەوتارەکەی خواوەند کەمرۆڤیان بەخێرایی ئافراندوە، وتوویەتی:ئەو ئادەم بوو، دوای هەموو شتەکانی دیکە ئافرێنرا و کاتێك رۆح بەچاو و زمان و سەری گەیشت و هێشتا بەخوارەوەی جەستەی نەگەیشتبوو، وتی: خواوەندا، پێش ئاوابوونی هەتاو، کۆتایی بەئافراندنی من بێنە.

کوری وەهب سەبارەت بەم ئایە دەڵێت: ئادەمیان لەدوایین کاژێری رۆژ ئافراند و ئافراندنی ئەو بەخێرایی و پەلەپەل بوو.

دەستەیەك گومان دەکەن کە دوو کاژێر و بەوتەیەك سێ کاژێر لەرۆژی هەینی تێپەری کەخواوەند ئادەم و حەوای لەبەهەشتا جێگە کردەوە و حەوت کاژێر لەرۆژ تێپەریبوو کەئەوانی لەبەهەشت دەرکرد. بەم شێوەیە ماوەی مانەوەیان لەبەهەشت پێنج کاژێر وبەوتەیەك سێ کاژێر بوو.

دەستەیەکیش وتوویانە: نۆ یا دە کاژێر لەرۆژی هەینی تێپەریبوو کەئادەم لەبەهەشت دەرکرا.

ئامارژەدان بە بێژەری ئەم وتەیە

لەباوکی عالیە دەگێرنەوە کەئادەم لەکاژێری نۆیەم یا دەیەمی رۆژی هەینی پێنجی نیسان لەبەهەشت دەرکرا. ئەگەر مەبەستی بێژەر ئەوە بێت کەخواوەند دوای دو کاژێر لەرۆژی هەینی ئادەم و حەوای لەبەهەشتا جێگە کردەوە، وتارەکەی راستە

چوونکە لەپێشینان دەگێڕنەوە کەئادەم لەدوایین کاژێری ڕۆژی شەشەمی ئافراندن کەهەر ڕۆژی بەرابەر بوو لەگەڵ هەزار ساڵ، ئافرێنرا و ئاشکرایە کاژێرێکی ئەو ڕۆژە هەشتا و سێ ساڵ لەساڵەکانی ئێمەیە. وتمان کاتێك گڵی ئادەمیان گرتەوە، چل ساڵ بەو شێوەیە مایەوە تا ڕۆح کرایە بەری و بێ چەند و چوون ئەم ساڵە بەرابەر لەگەڵ چڵ ساڵی ئێمە بوو و لەو کاتەوە کە ڕۆحیان پێبەخشی تا ئەو کاتەی لەبەهەشتا نیشتەجێ کرا و بۆ زەوی دابەزێنرا، سێ وپێنج ساڵ لەساڵەکانی ئێمەی خایاند. ئەگەر مەبەستی بێژەر ئەوە بێت کەدوای دو کاژێر لەڕۆژی هەینی لەڕۆژە هەزار ساڵەکان لەبەهەشتا نیشتەجێ بوو، ناراستی وتووە. چوونکە هەموو بێژەرانی حەدیس وتوویانە لەکۆتایی ڕۆژی هەینی پێش ئاوابوونی هەتاو ڕۆحیان بەئادەم بەخشی و هەروەها چەندین حەدیسیان لەپێغەمبەر(د.خ) گێڕاوەتەوە کەخواوەند لەهەمان ڕۆژ لەبەهەشتا نیشتەجێی کرد و لەهەمان ڕۆژ بۆ سەر زەوی دایبەزاند. ئاشکرایە دوایین کاژێری ڕۆژ لەڕۆژە هەزار ساڵەکانی ئەو دنیا بەرابەر لەگەڵ هەشتا و سێ ساڵ و چوار مانگ لەساڵەکانی ئێمەیە، کەواتە ئادەم لەکاژێری دوانزەی ڕۆژی هەینی هەزار ساڵە ئافرێنرا و سەد ساڵ لەساڵەکانی ئێمە جەستەی بێ گیانی ئەو لەسەر زەوی بوو و دوای ئەوە ڕۆحیان پێ بەخشی. ئەگەر مانەوەی ئەو لەئاسمان و نیشتەجێ بوونی لەبەهەشت تا کاتی گوناح و دابەزین چل و سێ ساڵ و چوار مانگ لەساڵەکانی ئێمە بێت، دەبێتە کاژێری یەك ڕۆژی ئافراندن.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە کەئادەم لەنێوان نوێژی نیمەڕۆ و نوێژی عەسر لەبەهەشت دەرکرا و بۆ زەوی دابەزێنرا و یەك نیمەڕۆژ لەڕۆژەکانی ئەو دنیا لەبەهەشتا نیشتەجێ بوو کەبەرابەرە لەگەڵ پێنسەد ساڵ. ئەم وتەیە بەپێچەوانەی حەدیسەکانی پێغەمبەر(د.خ) و وتەی زانا پێشینەکانە.

## وتار سەبارەت بەو شوێنەی ئادەم و حەوا لێی دابەزێنران

خواوەند ئادەم و حەوای پێش ئاوابوونی ڕۆژی ئافراندنی ئەو کەهەینی بوو، بۆ سەر زەوی دابەزاند و بەهەمان شێوە کەزاناکان باسی دەکەن، لەهیند دابەزێنرا.

لەقتادە دەگێڕنەوە کەخواوەند ئادەمی لەهیند دابەزاند. هەروەها لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە کەخواوەند، ئادەمی لەسارایەکی سەرزەمینی هیند دابەزاند.

لەعەلی کوڕی ئەبی تالیب دەگێڕنەوە کە بۆنخۆشترینی سەرزەمینەکان، هیندە چوونکە خواوەند ئادەمی لەوێ دابەزاند و دارەکانی بۆنی بەهەشتیان گرت.

هەروەها لەکوڕی عەباسی دەگێڕنەوە کەئادەم لەهیند دابەزی و حەوا لەجەدە. ئادەم بەدوایدا گەڕا تا یەکیانگرت و حوا لێی نزیك بوویەوە و ئەو شوێنەیان بە(موزدەلیفە) ناوبرد و شوێنێ یەکتر ناسینیان بە عەرەفات. ئەو شوێنەی لێی کۆبوونەوە بە(جەمع) ناوی دەرکرد. ئادەم لەهیند لەسەر کێوێك دابەزی کەناوی بوزە.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: بەپێی وتەی باوەڕداران بەتەورات ئادەم لەهیند لەسەر کێوێك دابەزی بەناوی واسم لەنزیك دۆڵێك بەناوی بەهیل لەنێوان دەهیخ و مەندەل کە دو ویلایەتی هیندە. دەڵێن حەوا لەسەرزەمینی جەدە دابەزێنرا.

دەستەیەکی دیکە وتوویانە: ئادەم لەسەرەندیب لەسەر کێوێك بەناوی بوز دابەزی و حەوا لەجەدە لەسەرزەمینی مەککە و ئیبلیس لەمیسان و مار لەئیصفەهان. وتوویانە مار لەسارا دابەزێنرا و ئیبلیس لەکەنارەکانی دەریای ئوبلە. ناتوانین بەڵگەیەکی بەهێز بۆ ئەمە بێنینەوە.

لەمبارەوە جگە لەوەی سەبارەت بەدابەزاندنی ئادەم لەسەرزەمینی هیند کەحەدیس بێژەکانی ئیسلام و باوەڕداران بەتەورات پشتراستیان کردۆتەوە، زانیارییەکی ئەوتۆمان لەبەر دەستا نییە.

دەڵێن لوتکەی ئەو کێوەی ئادەم لەسەری دابەزی، لەهەموو لوتکەکانی دیکە

لەئاسمان نزیکترە. کاتێك ئادەم لەوێ جێگەی گرت، قاچی لەسەر کێوەکە و سەری لەئاسمان بوو و دەنگی دۆعا و پاڕانەوەی فریشتەکانی دەبیست کەعادەتی پێگرتبوو. فریشتەکان لێی دەترسان و لەبەر ئەمە بەرزی بالآی کەمی کرد.

## ئاماژەدان بە بێژەری ئەم وتەیە

عەتا کوڕی ئەبی رەباح دەڵێت کەخواوەند ئادەمی لەبەهەشت دەرکرد و قاچەکانی لەسەر زەوی و سەری لەئاسمان بوو و دۆعا و پاڕانەوەی دانیشتووان ئاسمانی دەبیست و عادەتی پێگرتبوو. فریشتەکان لەترسی ئەو لەدۆعا و پاڕانەوەکانی خۆیان سکالآیان لای خوا کرد. بالآی ئەوی کورت کردەوە و کاتێك چیتر دەنگی ئاسمانی نەبیست، ترسا و لەدۆعا و نوێژەکانی خۆی لای خوا سکالآی کرد و مەبەستی ڕۆشتن بۆ مەککەی کرد. شوێنی هەر هەنگاوێکی بوو بەئاوەدانی و هەر هەنگاوێکی ئەو سارایەك بوو تا گەیشتە مەککە. خواوەند لەجیاتی کەعبە یاقووتێکی لەبەهەشتەوە ڕەوانە کرد و ئادەم بەردەوام بەدەوریدا دەسوڕایەوە تا خواوەند تۆفانی نارد و یاقووتەکە گەڕایەوە بۆ ئاسمان تا ئەو کاتەی خواوەند ئیبراهیمی راسپارد و ماڵی خوای دروست کرد. خواوەند دەفەرمێت: ((و اذ بو أنا لابراهيم مکان البيت).

واتاکەی: و کاتێك ئیبراهیممان لەشوێنی ئەم ماڵەدا جێگە کردەوە.))

لەقتادە دەگێڕنەوە کەخواوەند کەعبەی بۆ ئادەم دروست کرد چوونکە سەری لەئاسمان و قاچەکانی لەسەرزەوی بوو و فریشتەکان لێی دەترسان و بەم شێوەیە بالآی بۆ شەست گەز کەمی کرد. خەمبار بوو چوونکە چیتر دەنگی دۆعا و پاڕانەوەی فریشتەکانی نەدەبیست. لای خواوەند سکالآی کرد کەفەرمووی: ئەی ئادەم، من ماڵێکم بۆ تۆ دابەزاند تا بەدەوری ئەودا بسوڕێیتەوە بەهەمان شێوە کەبەدەوری عەرشەکەی مندا دەسوڕێنەوە، لەوێ نوێژ دەکەیت بەهەمان شێوە کەلێرە نوێژ دەکەن. ئادەم بەرەو ماڵەکە بەرێکەوت و هەنگاوی هەڵگرت. نێوان هەر هەنگاوێکی سارایەك بوو، ساراکان مانەوە تا ئادەم گەیشتە ماڵەکە و

بەدەوریدا سوڕایەوە و دوایَ ئەو، پێغەمبەرانی دیکە ئەو کارەیان دوبارە کردەوە.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە کاتێك خواوەند باڵای ئادەمی بۆ شەست گەز کەم کردەوە، ئادەم بەردەوام دەیوت: خواوەندا، من لەماڵەکەی تۆ و لە تەنیشت خۆت بووم، بەئاسوودەی دەمخوارد و لەهەر شوێنێك دەمویست. نیشتەجیَ دەبووم. منت لەسەر ئەم کێوە پیرۆزە دابەزاند و دەنگی فریشتەکانم دەبیست و ئەوانم دەبینی بەدەوری عەرشەکەی تۆدا دەسوڕێنەوە و بۆنی بەهەشتم دەکرد بەڵام باڵای منت بۆ شەست گەز کورت کردەوە و چیتر نەمتوانی دەنگ و روخساری فریشتەکان ببینم و بۆنی بەهەشت ناکەم.

خواوەند وەڵامی دایەوە: هۆکاری ئەوەی کردم، گوناحەکەی تۆبوو.

کاتێك خواوەند رووتی ئادەم و حەوای بینی، فەرمووی مەڕێك لەو هەشت جووت مەڕەی لەبەهەشتەوە هێنابوویان، سەر بڕن. ئادەم مەڕێکی گرت و سەری بڕی و خورییەکەیان هەڵگرت و شییان کردەوە و لەگەڵ حەوا ڕستیان. ئادەم بۆ خۆی عابایەك و حەوا کراسێك و لەچکێکی دروست کرد و لەبەریان کرد. خواوەند وەحی بەئادەم کرد کەمن لەبەرابەر عەرشەکەم حەرەمێکم هەیە، برۆ لەویَ ماڵێك دروست بکە و بڕۆرە ناوی بەهەمان شێوە کەفریشتەکان لەدەروی عەرشەکەی مندان. من لەویَ دۆعای تۆ و مناڵە باوەڕدارەکانت دەهێنمەدی.

ئادەم وتی: خواوەندا، چۆن ئەم کارە بکەم لەکاتێکدا هێزی ئەو کارەم نییە وچۆنییەتییەکەی نازانم.

خواوەند فریشتەیەکی نارد و ئەوی بردە مەککە. ئادەم لای هەر باخ و بێستانێکی خۆش کەتێدەپەڕی، بەفریشتەی دەوت: لێرە بمێنینەوە. فریشتە دەیوت: چاوەریَ بکە. تا ئەوەی گەیشتنە مەککە. لەهەر شوێنێك دابەزی، بوو بەئاوەدانی و لەهەر شوێنێك تێپەڕی، بوو بەسارا و بیابان. ماڵەکەی دروست کرد لەکێوی توڕی سینا و توری زەیتونَ و لوبنان و جودی. پایەکانی لەکێوەی حەرا دروست کرد و کاتێك لەتەواو کردنی بیناکە ئاسوودە بوو، فریشتە ئەوی بەرەو عەرەفات برد و هەموو ریَ و رەسمەکانی حەج کردنی فێر کرد. دواتر ئەوی بەرەو مەککە برد و بۆ سەرزەمینی هیند گەڕایەوە و لەسەر کێوی بوز گیانی ئەسپەردە

کرد.

لەکوڕی عومەر دەگێڕنەوە کەکاتێك ئادەم لەسەرزەمینی هیند بوو، خواوەند وەحی پێکرد تا زیارەتیماڵەکە بکات. ئەو لەهیندەوە بەمەبەستی حەج بەرێکەوت. هەنگاوی خستە هەر شوێنێك، بوو بەئاوەدانی و دووری نێوان دوو هەنگاوەکەی بوو بەسارا تا گەیشتە کەعبە و بەدەوریدا سوڕایەوە و ڕێ و ڕەسمی حەجی بەجێهێنا. ئەوسا مەبەستی گەڕانەوە بۆ هیندی کرد و کاتێك گەیشتە عەرەفات، فریشتەکان ئەویان بینی و وتیان: پیرۆز بێت حەج کردنت. ئادەم شانازی بەخۆیەوە کرد و کاتێك فریشتەکان ئەمەیان بینی، وتیان: ئەی ئادەم، دو هەزار ساڵ پێش ئافراندنی تۆ، ئێمە بەدەوری ئەم ماڵەدا دەسوڕاینەوە. ئابەم شەرمەزار بوو.

دەڵێن: کاتێك ئادەم بۆ سەرزەوی دابەزی، تاجێکی لەدارەکانی بەهەشت لەسەردا بوو و کاتێك گەیشتە سەرزەوی، تاجەکە وشکی کرد و گەڵاکانی هەڵوەری. بەم شێوەیە جۆرەکانی بۆنی خۆش ڕووان.

دەستەیەك وتوویانە، لەگەڵاکانی بەهەشتیان کردبوە پۆششی خۆیان و کاتێك ئەو گەڵایانە وشکیان کرد، بۆنی خۆش لەسەر زەوی بڵاو بوویەوە و خوا زاناترە.

دەستەیەکی دیکە وتوویانە کاتێك ئادەم زانی خواوەند ئەو لەبەهەشت دەردەکات، لای هەر دارێك کەتێپەڕی، لقێکی لێکردەوە و کاتێك گەیشتە سەرزەوی، ئەم لقانەی پێبوو کەگەڵاکانی وشکیان کرد و هەڵوەڕین و بۆنی خۆش لەسەر زەوی بڵاو بوویەوە.

ئاماژەدان بە بێژەری ئەم وتەیە

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە، کاتێك ئادەم لەبەهەشت دەهاتەدەر، لای هەر شتێك کەتێپەڕی، شتێکی هەڵگرت. بەفریشتەکان وترا، ڕێگەی پێبدەن تاچی دەخوازێت، هەڵیبگرێت. لەسەرزەمینی هیند دابەزی و ئەم بۆنە خۆشە کەلەهیندەوە دەیهێنن، لەو شتانەوەیە کەئادەم لەگەڵ خۆی لەبەهەشت هێنابووی.

## وتار سەبارەت بەوەی کاتێك ئادەم لەبەهەشت دابەزی، تاجێکی لەدارەکانی بەهەشت لەسەردا بوو

لەباوکی عالیە دەگێڕنەوە، کاتێك ئادەم لەبەهەشت دەرکرا، گۆچانێکی لەدارەکانی بەهەشت پێبوو و تاجێك لەدارەکانی بەهەشت لەسەریدا. لەسەرزەمینی هیند دابەزی و سەرچاوەی هەموو بۆنەخۆشەکان لەهیند، ئەمەیە.

هەروەها لەکوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە، کاتێك ئادەم لەسەر کێوەکەی هیند دابەزی، شتێکی لەگەڵاکانی بەهەشت پێبوو کە بەکێوەکەدا بڵاوی کردەوە و سەرچاوەی بۆنی خۆش و ئەو میوانەی تەنیا لەهیندا دەست دەکەون، ئەمەیە.

دەستەیەکیش وتویانە خواوەند لەمیوەکانی بەهەشتی پێبەخشی و میوەکانی ئێمە لەو میوانەیە.

### ئاماژەدان بە بێژەری ئەم وتەیە

لەئەشعەری دەگێڕنەوە کەوتی: کاتێك خواوەند ئادەمی لەبەهەشت دەرکرد، لەمیوەکانی بەهەشتی پێ بەخشی و پیشەکانی فێر کرد و ئەم میوانەی ئێوە لەمیوەکانی بەهەشتە بەم جیاوازییە کەمیوەکانی ئەم دنیا گۆڕانیان بەسەردا دێت، بەڵام میوەکانی بەهەشت نا.

**وتار سەبارەت بەوەی سەرچاوەی هەموو بۆنە خۆشەکان لەوێوەیە کەئادەم بۆنی خۆشی خۆی بەدارەکانی ئەویٚ داوە.**

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە کەئادەم بۆنی بەهەشتی لەگەڵ خۆی بۆ سەرزەوی هێنا و دۆڵەکان بۆنی بەهەشتیان گرت و هەموو شتەکان بۆن خۆش بوون. حجر الاسودی (بەردی ڕەش) لەگەڵ خۆی هێنا کە لەبەفر سپیتر بوو، داردەستەکەی موسا کە لەمەورد بوو چوونکە بالآی موسا دە زەراع بوو( زەراع پێوانەیەکە- دەستی مرۆڤ لەهەنیشکەوە تا سەرپەنجە) هەروەها کەندر و سەدری لەگەڵ خۆی هێنا. دوای ئەوە سندان و چەکوشی بۆ هاتەخوار. کاتێك ئادەم لەسەر کێوەکە دابەزی، شیشێکی ئاسنی بینی کە لەسەر کێوەکە ڕوا بوو و وتی ئەمە لەمەیە و دارە وشك و کۆنەکانی بەچەکوشەکەی دەشکاند.

دواتر خستیە ئاگرەوە کەتوایەوە و یەکەم شت کەدروستی کرد، کێرد بوو کەکاری پێدەکرد. ئەوسا تەنورێکی دروست کرد کەوەك میرات بۆ نوح مایەوە. ئەم تەنوورە ئەوەیە لەکاتی تۆفانەکەی نوح ئاوی لیٚ هەڵدەقولآ. کاتێك ئادەم دابەزی، سەری لەئاسمان دەسوو، لەبەر ئەمە مووی سەری هەڵوەری و بەم شێوەیە تاسی بۆ منالەکانی وەك میراتی بەجێهێشت.

ئاژەڵی سارا لەدرێژایی بالآی ئەو بێزار و وەحشی بوون. ئادەم لەسەر کێوەکە بوو و دەنگی فریشتەکانی دەبیست و بۆنی بەهەشتی دەکرد. دوای ئەوە بالآی بۆ شەست زەراع کۆتایی هات و بەمشێوە بوو تا مرد. هیچ کام لەمناڵەکانی ئادەم جگە لەیوسف، وەك ئەو جوان نەبوون.

دەڵێن، ئەو میوانەی خواوەند لەکاتی دابەزین بەئادەمی بەخشی، سی جۆر بوو، دە جۆری توێکڵ دار و دە بیٚ توێکڵ و بیٚ ناوك و دەجۆریان ناوکدار. میوە توێکڵ دارەکان گوێز، بایەم و پستە و فندق و خەشخاش و بەڕو و شابەڕو و هەنار و مۆز بوو. میوە ناوك دارەکان، قەیسی و نارگیل و سنجو وگێلاس و

خورما و کەنار و عەناب و گۆییژ و کەندر بوو. میوە بێ ناوکەکان سێو و هەرمێ و ترێ و توو و هەنجیر ئەترەج و خەیار و کاڵك بوو.

دەڵێن، لەو شتانەی ئادەم لەگەڵ خۆی لەبەهەشتەوە هێنای، کیسەیەك گەنم بوو و بەوتەیەك جبرەئیل گەنمی هێنا. کاتێك ئادەم برسی بوو، داوای خواردنی لەخواوەند کرد. خواوەند بەجبرەئیل حەوت دنکە گەنمی نارد و خستیە دەستی ئادەم. ئادەم بەجبرەئیلی وت، ئەمە چییە؟ وتی: ئەمە ئەوەیە کەتۆی لەبەهەشت دەرکرد. کێشی هەر دنکە گەنمێك سەد هەزار و هەشسەد درەم بوو.

ئادەم وتی: چی لێ بکەم؟

وتی: لەزەویدا بیچێنە. ئەو کارەی کرد و خواوەند دەسبەجێ رواندی و چاندن بوبە شێوازی منداڵەکانی.

پێی وت تا دروێنەی بکات و وتی و ئادەم خەرمانی کرد و بەدەست گێرە و دواتر شەنی کرد. ئەوسا دوو بەردی خستە بەردەم کەیەکیانی خستە سەر ئەوی دیکەیان و گەنمەکەی کردە ئارد. جبرەئیل پێی وت و ئاردەکەی کرد بەهەویر. دواتر وتی بەئاگر بیبرژێنێت. جبرەئیل بەرد و ئاسنی هێنا و لەیەکی سوو تا ئاگر دروست بوو. ئادەم یەکەم کەس بوو بەئاگر نانی کرد.

ئەم گێرانەوەیە پێچەوانەی ئەو وتارانەیە کە لەزانا کۆنەکانی ئۆمەتی پێغەمبەر(د.خ) گێراویانەتەوە.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە کەئەو دارەی خواوەند ڕێگەی خواردنی میوەکەی لەئادەم و حەوا گرت، گەنم بوو و کاتێك لێیان خوارد، شەرمیان دەرکەوت. شەرمی ئەوان بەنینۆکیان داپۆشرا بوو. مەبەستی ئەوەیان کرد بەگەڵاکانی بەهەشت خۆیان داپۆشن کەگەڵای هەنجیر بوو. گەڵاکانیان بەیەکەوە لکاند. ئادەم لەبەهەشتا رایدەکرد و دارێك بەر سەری کەوت و خواوەند وتی ئەی ئادەم، لەمن رادەکەیت؟

وتی: نە، بەڵام شەرم لەتۆ دەکەم.

وتی: مەگەر ئەم بەهەشتە کە بەتۆم بەخشی و خواردنی میوەکانیم بۆ رەوا کردی، لەبەرابەر خواردنی ئەوەی ڕێگریم لێکرد، بەس نەبوو؟

وتی: بۆنا ئەی پەروەردگار، بەڵام سوێند بەگەورەیی تۆ نەمزانی کەس دەتوانێت سوێندی درۆ بەتۆ بخوات. ئەم ئاماژەیە بۆ وتارەکەی خواوەند کەفەرمووی: و سوێندی بۆ ئەوان خوارد کەچاکەخوازی ئێوەم.

خواوەند فەرمووی: سوێند بەگەورەییم تۆ بۆ زەوی ڕەوانە دەکەم تا بەدژواری ژیان ببەیتەسەر.

دەڵێت: ئەوی بۆ زەوی دابەزاند. لەبەهەشت بەئاسوودەیی دەیانخوارد، بەڵام لەسەر زەوی خواردن ئاسان نەبوو. پیشەی ئاسن فێر بوو، زەوی کێڵا و کشتوکاڵی کرد، ئاوی دا و کاتێك گەنم و جۆ زەرد بوون، دروێنەی کرد، بەبای کرد و هاڕی و کردی بەهەویر و نانی کرد و خواردی.

لەسەعید دەگێڕنەوە کەگایەکی سوور بۆ ئادەم دابەزێنرا کەزەوی پێ دەکێڵا و ئارەقی لەروخساری دەسڕی و ئەمە مانای وتارەکەی خواوەندە کەفەرمووی: ئێوە لەبەهەشت دەرناکەن مەگەر ئەوەی بەدبەخت ببن. بەدبەختی ئادەم ئەمە بوو.

وتاری ئەوان ڕاستتر دێتە بەرچاو و زیاتر لەگەڵ وتاری کتێبەکەی خواوەند سازگارە، چوونکە کاتێك خواوەند بەئادەم و حەوای وت فەرمان لەدوژمنەکەی خۆتان مەبەن، بەئادەمی وت:

(( یا آدم ان هذا عدولك و لزوجك فلا یخرجنکما من الجنة فتشتقی. ان لك الا تجوع فیها و لا تعری. و انك لاتظمؤ فیها و لاتضحی.

واتاکەی: ئەی ئادەم، ئەمە دوژمنی تۆ و هاوسەری تۆیە، ئێوە لەم بەهەشتە دەرنەکات چوونکە بەدبەخت دەبن. تۆ ئەم نیعمەتەت پێبڕاوە کە لەبەهەشت نەبرسی دەبیت نە ڕووت.))

ئاشکرایە بەدبەختی سەرچاوە گرتوو لەفەرمانبەری کردنی شەیتان ڕەنج و بەدەست هێنانی خواردن و پۆشاك و کۆکردنەوە لەزەوی کێڵان و چاندن و ئاودان و کارە ڕەنجهێنەرەکانی دیکەیە. ئەگەر جبرەئیل بۆ خواردنی ئەو شتێکی هێنابوو، تەنیا تۆوەکەی بەس بوو و شتەکانی دیکەی نەدەویست. دژواری بەڵێن پێدراوی خواوەند کەسەرچاوەکەی فەرمانبەری کردن لەشەیتان و توڕەیی ڕەحمان بوو، نەدەهاتەدی. کەواتە ڕاستی ئەوەیە کە لەکوڕی عەباس و کەسانی

دیکە ئامارژەمان پێدا و خوا زاناترە.

دەڵێن: ئادەم سندان و پلاییز و چەکوشی لەگەڵ خۆی هێنا.

ئامارژەدان بە بێژەری ئەم وتەیە

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە کەسێ شت لەگەڵ ئادەم هاتەخوار: سندان و پلاییز و چەکوش. دواتر خواوەند ئادەمی لەسەر بەرزایی کێوەکە بۆ داوێنی کێوەکە برد و هەموو زەوی بەهەموو جن و چوارپێکان و وەحش و باڵندە و شتەکانی دیکەی بەئادەمی بەخشی. کاتێك ئادەم لەکێوەکە هاتەخوار و چیتر گوێی لەدەنگی دانیشتووانی ئاسمان نەبوو و بەربلاّوی و فراوانی زەوی بینی و جگە لەخۆی کەسیکی دیکەی لەسەر زەوی نەبینی، ترسا و وتی: خوایە، جگە لەمن کەس لەسەر زەوی نییە تا تۆ بپەرەستێت.

وەلاّمی خواوەند لەگێڕانەوەیەکی دیکەیە کە لەوەهبی دەگێڕنەوە و دەڵێت: کاتێك ئادەم لەسەر زەوی دابەزی و پانتایی و بەربلاّویەکەی بینی و جگە لەخۆی کەسی دیکەی نەبینی، وتی: خوایە لەسەر زەوییەکەی تۆ جگە لەمن کەس نییە تا پەرەستینی تۆ بکات.

خواوەند فەرمووی: لەمناڵەکانی تۆ کەسانێك لەسەر زەوی نیشتەجێ دەکەم کەپەرەستینی من دەکەن و ناوی من وێردی سەرزمانیانە. ماڵەکان لەسەر زەوی دروست دەکەم تا خەڵکان لەوێدا لەمن بپاڕێنەوە و یەکێك لەم ماڵانە تایبەت دەکەم بەخۆم و بەماڵی خۆم ناوی دەبەم و گەورەیی خۆمی لەسەر دادەنێم. بەلاّم لەهەموو شتێك و لەگەڵ هەموو شتێکدا دەبم و ماڵەکەم دەکەم بەحەرەمێکی ئەمان، هەرکەس لەدەوروبەر وسەر و ژێریدا بێت، ڕێزدارە و هەرکەس بۆ ڕێزگرتن لەمن ڕێزی ماڵەکەم بگرێت، بۆ ڕێزی من شیاو دەبێت و هەرکەس خەڵکەکەی بترسێنێت، ڕێزی منی نەگرتووە و دراوسێیتی منی شکاندوە. ماڵەکە دەکەم بەیەکەم ماڵی پیرۆز کە لەناو دۆڵی مەککەدا بینا کراوە و خواپەرستەکان لەهەر دۆڵێکەوە ڕووی تێدەکەن و دەپاڕێنەوە. هەرکەس بەرەو ئەو ماڵە بێت و جگە

لەپەرەستین و رەزامەندی من مەبەستی دیکەی نەبێت، میوان و زیارەتکەری منە و خانەخوێ دەبێت رێز لەمیوانەکەی خۆی بگرێت و نیازەکانی بەدی بێنێت. ئەی ئادەم، لەبەر ئەوەی کەزیندوویت، ماڵەکە ئاوەدان دەکەیتەوە. ئۆمەتەکان و نەتەوە و وەچەکان و پێغەمبەرانی دوای تۆ، یەك لەدوای یەك بۆ ئاوەدان کردنەوە قۆڵ هەڵدەماڵن.

دواتر فەرمانی بەئادەمدا بەرەو بیت الحرام بڕوات و بەدەوریدا بسوڕێتەوە بەهەمان شێوە کەفریشتەکانی بینیبوو بەدەروی عەرشدا دەسوڕێنەوە. بیت الحرام کە بۆئادەم ڕەوانە کرابوو، یاقووتێك یا مرواری بوو.

لەکوڕی ئەبان دەگێڕنەوە: ئەو ماڵەی ڕەوانە کرا، یاقووت یا مرواری بوو و کاتێك خواوەند نەتەوەی نوحی بەتۆفانەکە خنکاند، ماڵەکەی بۆ ئاسمان بردەوە بەلاّم بناغەکەی مایەوە. دواتر شوێنەکەی نیشانی ئیبراهیمدا کە سەر لەنوێ نۆژەنی کردەوە.

دەڵێن: ئادەم بۆگوناحەکەی خۆی بەکوڵ دەگریا و پەشیمانی دەربڕی و داوای لەخواوەند کرد بەتۆبەکەی رازی بێت و گوناحەکەی ببەخشێت. پاشماوەی ئەم گێڕانەوەیە لەگێڕانەوەیەکی دیکەدایە کە لەکوڕی عەباس دەیگێڕنەوە و دەڵێت: ئادەم بەخواوەندی وت: پەروەدرگارا، مەگەر منت بەدەستی خۆت نەئافڕاند؟

فەرمووی: بۆنا.

وتی: پەروەردگارا، مەگەر لەرۆحی خۆت بەمن نەبەخشی؟

فەرمووی: بۆنا.

وتی: پەروەردگارا، مەگەر لەبەهەشتی خۆت جێگەت نەکردمەوە؟

فەرمووی: بۆنا.

وتی: پەروەردگارا، مەگەر رەحمەتی تۆ بەسەر توڕەیی تۆدا زاڵ نییە؟

فەرمووی: بۆنا.

وتی: ئەگەر تۆبە بکەم و پەشیمانی خۆم دەربڕم، من بۆ بەهەشت دەگەرێنیتەوە؟

وتی: بەڵێ.

کوڕی عەباس دەڵێت: مەبەست لەوتارەکەی خواوەند کەفەرمووی: وئادەم لەخواوەندی خۆی، وشەکان فێر بوو و بەتۆبەکەی رازی بووین.)) ئەمەیە.

لەحەسەن دەگێڕنەوە کەئادەم و حەوا ئەم وشانەیان هێنایە سەرزمان کە لەقورئانیشدا ئاماژەی پێدراوە: پەروەردگارا، ئێمە ستەممان لەخۆمان کرد، ئەگەر ئێمە نەبەخشیت و بەزەییت بەئێمەدا نەیێتەوە، لەزیانکاران دەبین.

هەروەها لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە کەکاتێك ئادەم لەبەهەشت دابەزی، حجر الاسودی لەگەڵ خۆی هێنا کە لەبەفر سپیتر بوو. ئادەم و حەوا دوسەد ساڵ بۆ نیعمەتەکانی بەهەشت گریان و چل ڕۆژ نەخواردیان و نەخواردیانەوە. دواتر دەستیان بەخواردن و خواردنەوە کرد و لەو کاتەدا لەسەر کێوی بوز بوون کەئادەم لەوێ دابەزی و یەك سەد ساڵ لەحەوا نزیك نەکەوتەوە.

باوکی یەحیا دەڵێت هاورێ لەگەڵ موجاهید لەمسجد الحرام دانیشتبووین و بەمنی وت: ئەمە دەبینیت؟

وتم: بەردی ڕەش؟

وتی: تۆ بەمشێوە گومان دەکەیت.

وتم: مەگەر بەرد نییە؟

وتی: سوێند بەخوا کوڕی عەباس پێی وتم ئەوە یاقوتێکی سپی بوو کە ئادەم لەبەهەشتەوە هێنای و فرمێسکی خۆی پێ دەسڕی. فرمێسکی ئادەم لەکاتی هاتنەدەرەوەی لەبەهەشت تا کاتی گەڕانەوەی بۆ بەهەشت بۆ ماوەی دو هەزار ساڵ وشکی نەکرد.

وتی: ئەی بۆ ڕەنگەکەی ڕەش بوو؟

وتی: لەرۆژگاری جاهلیت(نەزانی) ئەو ژنانەی لەسووڕی مانگانەدا بوون، دەستیان لێ دەدا.

ئادەم مەبەستی ڕۆشتن بەرەو بیت الحرامی کرد و بەدەوریدا سووڕایەوە و ڕێ ورەسمەکانی بەجێهێنا. لەعەرەفات حەوای بینی و لەگەڵ ئەو بۆ هیند گەڕایەوە. شەو و ڕۆژیان لەئەشکەوت بەسەر دەبرد و خواوەند فریشتەیەکی نارد تا فێریان بکات چۆن خۆیان دابپۆشن. دەڵێن پۆششی ئەوان لەپێستی بزن و مەڕ و ئاژەڵە

دڕندەکان بوو.

دواتر خواوەند لەعەرەفە دەستی لەپشتی ئادەمدا و نەوە و نەبیرەکانی ئەوی هێنایە دنیا کەوەك مێرووله لەدنیادا بلاّو بوونەوە. پەیمانی لیّ وەرگرتن و ئەوانی کردە شایەتی خۆی و فەرمووی: مەگەر پەروەردگاری ئێوە نیم؟

وتیان: بۆنا؟

وتاری خوایە کە دەفەرمێت:

(و اذ اخذ ربك من بنی آدم من ظهورهم ذریتهم و اشهدم علی انفسهم الست بربکم قالو بلی،

واتاکەی: کاتێك پەروەردگاری تۆ لەمناڵەکانی ئادەم لەپشتی ئەوان نەژادی ئەوانی دروست کرد و ئەوانی کردە شایەتی خۆیان کەمەگەر من پەروەردگاری ئێوە نیم؟ وتیان: بۆنا)

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە کەخواوەند ئادەمی دابەزاند و لەعەرەفە دەستی لەپشتی ئەودا و هەموو ئەو کەسانەی تا رۆژی کۆتایی دەیهێنایە دنیا، هێنایە دنیا، ئەوسا فەرمووی: مەگەر من پەروەردگاری ئێوە نیم؟

وتیان: بۆنا.

دواتر پێنووس، هەمووی ئەوەی نووسی کەتا رۆژی کۆتایی دەبێت، رووبدات.

هەروەها لەو دەگێڕنەوە کەکاتێك خواوەند ئادەمی ئافڕاند، وەچەی ئەوەی وەك مێرووله لەپشتییەوە دەرهێنا و لەسەر دوو دەستی داینا. بەکەسانی سەر دەستی راستی فەرموو: ((بڕۆنە بەهەشت)) و بەکەسانیتری فەرموو: ((بڕۆنە جەهەننەم و من ترسم نییە.))

وتیان: بۆ. دەستەیەك بەدڵ وتیان و دەستەیەك لەرووی خۆپارێزییەوە.

## وتار سەبارەت بەرووداوەکانی دەورانی ئادەم دوای هاتنەدەرەوەی لەبەهەشت

یەکەم رووداو ئەوە بوو کەقابیل کوڕی ئادەم براکەی خۆی هابیلی کوشت. زاناکانی شارەزای حەدیس سەبارەت بە ناوی قابیل بۆچوونیان جیاوازە. دەستەیەك وتوویانە ئەو قین کوڕی ئادەمە و دەستەیەك دەڵێن قایین کوڕی ئادەم و دەستەیەك دەڵێن قاین و دەستەیەك دەڵێن قابیل. هەروەها سەبارەت بەکوشتنی هابیل بۆچونەکانیان جیاوازە.

لەکوڕی مەسعود و دەستەیەك لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) دەگێڕنەوە، هەر کوڕێك کەبۆ ئادەم دەهاتە دنیا، کچێکی لەگەڵدا بوو. کوڕی ئەم سکە لەگەڵ کچی سکێکی دیکە پەیوەندی هاوسەرگیری دەبەست تا ئەوەی دو کوڕ هاتنە دنیا بەناوی هابیل و قابیل. قابیل وەرزێر بوو و هابیل ئاژەڵدار. قابیل گەورەتر و خوشکێکی بوو جوانتر لەخوشکی هابیل. هابیل دەیویست لەگەڵ خوشکەکەی قابیل پەیوەندی هاوسەری گیری ببەستێت بەڵام ئەو رازی نەبوو و وتی خوشکی منە و لەگەڵ من هاتۆتە دنیا و لەخوشکەکەی تۆ جوانترە و دەبێت بەمن بگات. باوك فەرمووی بیکاتە هاوسەری هابیل بەڵام رازی نەبوو. هەردووکیان قوربانیان بۆ خوا بەرز کردەوە تا ئاشکرا ببێت کام یەك بۆهاوسەری کچەکە شیاوترن. لەو کاتەدا ئادەم ئامادە نەبوو و ڕۆشتبوو بۆ مەککە تا زیارەتی ماڵی خوا بکات.

خواوەند بەئادەمی فەرموو: دەزانی من لەزەوی ماڵێکم هەیە؟

وتی: ئەی خوایە، نا

فەرمووی: ماڵی من لەمەککەیە، بڕۆ بۆ ئەوێ.

ئادەم بەئاسمانی ووت: چاودێری کوڕەکانی من بکە. ئاسمان رازی نەبوو. بەزەوی وت و رازی نەبوو. بەکێوەکانی وت و رازی نەبوون. بەقابیلی وت. وەڵامی دایەوە: بڕۆ و کاتێك دەگەڕێیتەوە، منداڵەکانی خۆت بەشێوەیەك دەبینیت کەرەزامەندی تۆی بەدواوە دێت.

کاتێك ئادەم ڕۆشت، قوربانیان بەرز کردەوە.

قابیل شانازی بەسەر هابیلەوە کرد و وتی: من بۆ ئەو شیاوترم، ئەو خوشکی منە و من لەتۆ گەورەتر و جێگری باوکمم.

کاتێك قوربانیان بەرز کردەوە، هابیل بەرخێکی قەڵەوی هێنا بوو و قابیل دەسکەیەك گەنم و چڵێکی گەورەی تیا بوو و لەیەکی سوو و خواردی. ئاگر هات و قوربانییەکەی هابیلی سوتاند و قوربانییەکەی قابیل مایەوە. قابیل توڕەبوو و وتی: تۆ دەکوژم تا نەبیتە هاوسەری خوشکەکەم.

هابیل وتی: خوا قوربانی لەخۆپارێزان وەردەگرێت، ئەگەر دەستدرێژی بکەیتە سەرمن بەمەبەستی کوشتنم، من ئەو کارە ناکەم بۆ کوشتنی تۆ. بەلام قابیل مەبەستی کوشتنی براکەی کرد و بەدوای هابیلدا دەگەڕا تا بیکوژێت. هابیل بۆ لووتکەی کێوەکان هەلات و ڕۆژێك مەڕومالاتەکەی لەکێوێکدا دەلەوەڕاند. قابیل لەکاتی خەو لێی نزیك کەوتەوە و بەردێکی هەلگرت و سەری ئەوی شکاند کەمرد. ئەوی لەسەر زەوی بەجێهێشت و نەیدەزانی چۆن دفنی بکات. خواوەند دوو قەلەرەشی ڕەوانە وشەڕیان لەگەڵ یەك کرد و یەکیان ئەوی دیکەی کوشت و گۆڕێکی هەلکەند و خۆلی کردە سەر و کاتێك قابیل ئەمەی بینی، وتی، هاوار لەمن نەمتوانی وەك ئەم قەلەڕەشە بم و جەستەی براکەم بەخاك بسپێرم.

خواوەند فەرموویەتی: خواوەند قەلەڕەشێکی ڕەوانە کرد کەزەوی هەلکەند و نیشانیدا چۆن جەستەی براکەی لەژێر خاکدا دفن بکات.

دواتر ئادەم گەڕایەوە و زانی کەکوڕەکەی براکەی خۆی کوشتووە.

خواوەند فەرمووی: ئەو ستەمگەر و نەزان بوو. یانی قابیل کەئەمانەتی ئادەمی لەئەستۆ گرت، بەلام منالەکانی نەپاراست.

دەستەیەکی دیکە بەمشێوە دەلێن کەئادەم لەهەر سکێك لەحەوا کچ و کوڕێکی دەبوو و کچەکەی دەدا بەکوڕی سکەکەی دیکە.

عەبدالله کوڕی عوسمان دەلێت: لەگەڵ سەعید کوڕی جوبەیر سەرقاڵ بووین و ئەو پشتی بە بازووی من بەستبوو، کاتێك لەمالی سەموورەی خوری فرۆش نزیك کەوتینەوە، وەستا و ئەم وتارەی لەکوڕی عەباس گێڕایەوە: ڕەوا نەبوو ژن ببێتە هاوسەری برا دوانەکەی خۆی و دەبوا یەکێك لەبراکانی دیکەی ئەو بکاتە

هاوسەر. ژنێکی جوان هاتە دنیا و ژنێکی ناشیرین و برای ژنە ناشیرینەکە وتی: تۆ خوشکەکەت دەکەیتە هاوسەری من و من خوشکەکەم دەکەمە هاوسەری تۆ.

وتی: من بۆ خوشکەکەم شیاوترم.

قوربانیان هێنا و لەخاوەنی مەڕەکە وەرگیرا و قوربانی کەسی وەرزێر وەرنەگیرا. مەڕەکە بەهەمان شێوە لای خواوەند مایەوە تا ئەوی کردە قوربانی ئیسحاق و لەسەر ئەم بەردە لایماڵی سەمووڕەی خوری فرش کەلای راستی تۆیە، قوربانی کرا.

کوڕی ئیسحاق لەدەستەیەك لەزاناکانی ئەهلی کتێب دەگێڕێتەوە کەئادەم لەبەهەشت پێش ئەنجامدانی گوناحەکە، لەحەوا نزیك کەوتەوە کەبەقین و خوشکەکەی دووگیان بوو، تووشی خوێنبەربوون نەبوو و لەکاتی منداڵ بوون ئازاری پێنەبڕا و خوێن نەبینرا چوونکە بەهەشت پاك و خاوێنە. کاتێك لەدارەکەیان خوارد و گوناحەکەیان ئەنجامدا و بۆ زەوی دابەزین و ئارامیان گرت، ئادەم لەحەوا نزیك کەوتەوە کەبەهابیل و خوشکەکەی دووگیان بوو، مژدی دەکرد و لەکاتی منداڵ بوون ئازاری زۆری پێبڕا و خوێن بینرا. حەوا بەو شێوەی باسی دەکەن لەهەموو سکێك کوڕێك و کچێکی دەهێنایە دنیا و بۆ ئادەم چڵ منداڵی کوڕ و کچی هێنایە دنیا بەبیست سك. پیاو لەگەڵ هەر کام لەخوشکەکانی خۆی دەیتوانی پەیوەندی هاوسەری گیری ببەستێت جگە لەدوانەکەی خۆی، چوونکە بۆ ئەو حەلاڵ نەبوو و ژنانی ئەو رۆژگارە هەموویان خوشکیان بوون و دایکان حەوا.

هەروەها کوڕی ئیسحاق لەزاناکانی ئەهلی کتێب دەگێڕێتەوە کە ئادەم بەقینی(منداڵەکەی خۆی) فەرموو کەدوانەکەی خۆی بکاتە هاوسەری هابیل و بەهابیلی فەرموو خوشکە دوانەکەی خۆی بکاتە هاوسەری قابیل. هابیل رازی بوو بەلاّم قین نا و خوشکەکەی هابیلی نەویست وخوشەکەی خۆی بەهابیل نەدا و وتی: ئێمە لەبەهەشت لەدایك بووین و ئەمانە لەسەر زەوی. من بۆ خوشکەکەی خۆم شیاوترم.

دەستەیەك لەزاناکانی ئەهلی کتێب وتویانە خوشکەکەی قین زیاد لەرادە جوان

بوو و نەیویست بیکاتە هاوسەری براکەی و مەبەستی ئەوەی کرد بیکاتە هاوسەری خۆی. تەنیا خوا دەزانێت چۆن بوو.

باوك وتی خوشکەکەی بۆ ئەو حەلاڵ نییە و قین بەمە رازوی نەبوو و باوك وتی کوڕم قوربانی بێنە و هابیلیش بەهەمان شێوە، خوا بەقوربانی هەر کەسێك رازی بێت، ئەو بۆ کچەکە شیاوترە. قین وەرزێر بوو و هابیل ئاژەڵدار. قین گەنمی هێنا و هابیل بەرخێك و بەوتەی دەستەیەك مانگایەك. خواوەند ئاگرێکی سپی ڕەوانە کرد کەقوربانی هابیلی خوارد و قوربانی قینی هێشتەوە. خواوەند بەمشێوەیە ڕەزامەندی خۆی لەسەر قوربانییەکە نیشان دەدا. کاتێك خواوەند بەقوربانییەکەی هابیل رازی بوو و خوشەکەی قین دەبوە هاوسەری، قین توڕە و شەیتان بەسەریدا زاڵ بوو. شوێن براکەی خۆی کەوت و کوشتی. خواوەند داستانی ئەوانی لەقوڕئان بۆ محەممەد باس کردووە و دەفەرمێت: (هەواڵی دو کوڕەکەی ئادەم بۆ ئەوان (ئەهلی کتێب) بخوێنەرەوە ئەو کاتەی قوربانیان هێنا و لەیەکیان وەرگیرا و هتد...)

دەڵێت: کاتێك ئەوی کوشت، سەریسوڕما و نەیزانی چۆن جەستەکەی بشارێتەوە و خواوەند قەلەڕەشەیەکی ڕەوانە کرد کە زەوی هەڵکەند و نیشانیدا چۆن جەستەی براکەی دفن بکات. ئەو بەپێی داستانەکەی قوڕئان وتی: ((هاوار لەمن نەمتوانی هاوشێوەی ئەم قەلەڕەشە بم و جەستەی براکەی خۆم دابشارم.)) تا ئەویٚ کەدەڵێت: ((و دوای ئەوان زۆر لەوان لەسەر زەوی ستەمکاران بوون))

دەڵێت: بەگومانی ئەهلی تەورات کاتێك قین هابیلی برای خۆی کوشت، خواوەند پێی فەرموو: براکەت هابیل لەکوێیە؟

وتی: نازانم، من پاسەوانی ئەو نەبووم.

خواوەند فەرمووی: خوێنی براکەت لەزەوییەوە هاوار دەکات، ئەو زەوییەی دەمی کردەوە و خوێنی براکەی تۆی قووتدا، بەنەحلەتت دەکات. کاتێك لەسەر زەوی کار دەکەیت، هیچ بەرهەمێکێت پیٚ نابەخشێت و لەسەر زەوی بەردەوام ترسا و سەرگەردان دەبیت.

قین وتی: گوناحەکەی من گەورەتر لەوەیە بمبەخشیت و من لەم سەرزەمینە و

لەخۆت دوردەخەیتەوە و بەردەوام لەسەر زەوی ترساو و سەرگەردان دەبم و هەرکەس بمبینێت، دەمکوژێت.

خواوەند فەرمووی: بەمشێوە نابێت کەهەر کەس کەسێك بکوژێت، لەجیاتی کەسێك حەوت سزا نابینێت بەلاّم هەرکەس قین بکوژێت، حەوت سزا دەدرێت. خواوەند قینی کردبوە هێمایەك و نەیدەویست هەرکەس بیبینێت، بیکوژێت و قین لای خاوەند لەرۆژهەلاّتی بەهەشتی عەدەن ڕۆشت.

دەستەیەکی دیکە وتویانە هۆکاری کوشتنەکە ئەوە بوو کەخواوەند فەرمووی قوربانی بێنن و قوربانی یەکیان وەرگیرا و لەویترنا. ئەو کەسەی قوربانییەکەی وەرنەگیرا، براکەی خۆی کوشت.

ئاماژەدان بە بێژەری ئەم وتەیە

لەعەبدالله کوڕی عومەر دەگێڕنەوە کەدوو کوڕەکەی ئادەم قوربانیان هێنا و لەیەکیان وەرگیرا و لەویتریان نا. یەکیان وەرزێر و ئەویتریان ئاژەلّدار. فەرمانیان پێدرا قوربانییەکانی خۆیان بێنن. ئاژەلّدار باشترین و قەلّەوترین مەڕی خۆی بەدلّخواز هەلّگرت و وەرزێر خراپترین بەرهەمی خۆی و نابەدلّ. خواوەند بەقوربانی ئاژەلّدار رازی و قوربانی وەرزێری وەرنەگرت و داستانەکە بەوە کۆتایی هات کە لەقورئاندا باسی کراوە.

دەلّێت کوژراو بەهێزتر لەبکوژ بوو بەلاّم نەیویست دەستدرێژی بکاتە سەر براکەی.

دەستەیەکی دیکە وتارەکەی کوڕی عەباسیان دوبارە کردۆتەوە کەدەلّێت: بەشێوەیەك بوو کەهیچ نیازەمەندێك نەبوو تا خێری پیّ بکەن بەلّکو قوربانیان دەبرد. رۆژێك دو کوڕەکەی ئادەم پێکەوە بوون و وتیان: (باشترە قوربانی ببەین)) و کاتێك کەسێك قوربانی دەبرد و خواوەند لێی رازی دەبوو، ئاگرێکی دەنارد کەقوربانییەکەی دەخوارد و ئەگەر رازی نەدەبوو، ئاگرەکە دەکوژایەوە. قوربانیان برد، یەکیان ئاژەلّدار بوو و ئەوی دیکەیان وەرزێر. ئاژەلّدار باشترین و قەلّەوترین

مەڕی خۆی برد و ئەوی دیکەیان بەرهەمی کشتوکاڵی خۆی. ئاگر هات و مەڕەکەی خوارد و بەرهەمی کشتوکاڵییەکەی بەجێهێشت. کوڕی ئادەم بەبراکەی وت: تۆ دەڕۆیتە ناو خەڵك و دەزانن کەقوربانیت هێنا و لەتۆ وەرگیرا و قور‌بانییەکەی من وەرنەگیرا. سوێند بەخوا نابێت خەڵك تۆ لەمن بەباشتر بزانن. تۆ دەکوژم. براکەی وتی: گوناحی من نییە، خوا قوربانی لەخواپەرستان وەردەگرێت.

دەستەیەکی دیکە وتویانە بەسەرهاتی ئەم دوپیاوە و قوربانی لەسەردەمی ئادەم نەبوو. ئەم دوپیاوە لەبەنی ئیسرائیل بوون و وتوویانە یەکەم کەس کە لەسەر زەوی مرد، ئادەم بوو. پێش ئەو کەس نەمرد.

ئاماژەدان بە بێژەری ئەم وتەیە

لەحەسەن دەگێڕنەوە کە ئەو دوپیاوە لەقورئاندا ناویان هاتووە و خواوەند سەبارەت بەوان فەرمووی: ((بەسەرهاتی دوکوڕەکەی ئادەم بەراستی بۆ ئەوان بخوێنەرەوە)) لەبەنی ئیسرائیل بوون کوڕەکانی ئادەم خۆی نەبوون. چوونکە قوربانی لەناو منداڵەکانی ئیسرائیلدا بوو و ئادەم یەکەم کەسە کەمرد.

دەستەیەکی دیکە وتوویانە ئادەم یەك سەد ساڵ دوای هاتنە خوار لەبەهەشت لەگەڵ حەوا نزیکی کرد کەقابیل و خوشکە دوانەکەی هێنایە دنیا و دوای ئەوە هابیل و خوشکەکەی (قولیما) بەیەك سك هێنایە دنیا. کاتێك گەورە بوون، ئادەم مەبەستی ئەوەی کرد خوشکەکەی قابیل بکاتە هاوسەری هابیل. قابیل رازی نەبوو لەبەر ئەمە قوربانیان هێنا کەخواوەند بەقوربانییەکەی هابیل رازی و قوربانییەکەی لەقابیل وەرنەگرت. قابیل رژدی بەبراکەی برد و ئەوی لەسەر گەردنەی حەرا کوشت و دەستی خوشکەکەی یانی قولیمای کرد و لەکێوەکە هاتەخوار و بۆ سەرزەمینی عەدەن رایکرد کە لەوڵاتی یەمەنە.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە کاتێك قابیل براکەی خۆی هابیلی کوشت، دەستی خوشکەکەی گرت و لەکێوی بوز هاتەخوار. ئادەم بەقابیلی وت: برۆ چوونکە بەردەوام ترسا دەبێت و لەلایەن هیچ کەسێکەوە ئەمانت پێ نابەخشرێت.

بەشێوەیەك بوو هەر كەسێك لەمناڵەكانی كەلای ئەو تێپەڕی دەكرد، بەردێكی تێ دەگرت. كوڕێكی قابیل كەكوێر بوو، هاوڕێ لەگەڵ كوڕەكەی خۆی لای ئەو تێپەڕی كرد وكوڕ بەباوكە كوێرەكەی خۆی وت: ئەمە باوكی تۆ قابیلە. كوێرەكە بەردێكی لەباوكیدا و كوشتی و كوڕەكە پێی وت: باوە گیان. باوكی خۆت كوشت. مشتێكی لەكوڕەكەیدا و ئەویشی كوشت و وتی: هاوار لەمن، باوكم بەبەرد كوشت و كوڕەكەم بەمشت.

لەتەورات باسی كراوە كەهابیل سی ساڵە بوو كاتێك كوژرا و قابیل تەمەنی بیست و پێنج ساڵ بوو كاتێك براكەی خۆی كوشت.

وتاری ڕاست لای من ئەوەیە كەمناڵی ئادەم كەخواوەند فەرمووی براكەی خۆی كوشت، مناڵی ئادەم خۆیەتی چوونكە بەڵگە لەبەردەستایە كەبەمشێوەیەو لەعەبدالله دەگێڕنەوە كەپێغەمبەر(د.خ) فەرمووی، هەركەس بەستەم بكوژرێت، شتێك لەگوناحەكەی لەئەستۆی یەكەم مناڵەكەی ئادەمە چوونكە یەكەم جار ڕەسمی كوشتنی هێنایە كایەوە. ئاماژەیان بەگێڕانەوەیەكی دیكە لەپێغەمبەر بەم ناوەرۆكە داوە. ئەم گێڕانەوەیە ئەوەمان نیشان دەدات كەئەو دو كەسە كەبەسەرهاتیان لەقورئاندا باسی لێوەكراوە، كوڕەكانی ئادەم خۆی بوون چوونكە گومانی تیانییە ئەگەر بەهەمان شێوە كەحەسەن ئاماژەی پێداوە لەمناڵەكانی ئیسرائیل دەبوون، ئەوەی براكەی خۆی كوشت، یەكەم كەس نەدەبوو كەڕەسمی كوشتنی هێنابێتە كایەوە لەبەر ئەوەی پێش مناڵەكانی ئیسرائیل كوشتن لەناو مناڵەكانی ئادەم لەئارادا بووە.

ئەگەر بڵێن: چ بەڵگەیەكتان هەیە بۆ ئەوەی بڵێن كوڕی ئادەم بوون و لەمناڵەكانی ئیسرائیل نەبوون؟

دەڵێم: زانایان و شارەزایانی حەدیسی ئۆمەتەكەی ئێمە لەمبارەوە بۆچوونەكانیان جیاواز نییە كەواتە وتەی ئەو كەسەی دەڵێت لەمناڵەكانی ئیسرائیل بوون، ناڕاستە.

دەڵێن كاتێك قابیل هابیلی برای كوشت، ئادەم بۆی گریا.

لەعەلی كوڕی ئەبی تالب دەگێڕنەوە كەكاتێك كوڕی ئادەم براكەی خۆی

کوشت، ئادەم بۆی گریا و شێعرێکی بەعەرەبی وت، بەم ناوەرۆکە: سەرزەمین و خەڵکەکانی گۆڕان و ڕەنگی زەوی ڕەش و قێزەون بوو. تامەکان و رەنگەکان گۆڕان و فراوانی لەسەر زەوی کۆچی کرد.

و بەشێعرێکی عەرەبی بەم ناوەرۆکە وەڵامی درایەوە: باوکی هابیل! هەردووك کوژران و زیندوویش وەك مردوو سەری بڕاوە و لەو خراپەی کردی، بەردەوام دەترسێت و هاوار دەکات.

دەڵێن: حەوا لەئادەم سەد و بیست سکی کرد کەیەکەمیان قابیل و خوشکەکەی بوون و دواییینیان عەبدولمەغیس و خوشکەکەی دایکی ئەلمەغیس بوو. کوڕی ئیسحاق بەهەمان شێوە کەپێشتر ئامارەمان پێدا، وتوویەتی کەهەموو منداڵەکانی حەوا لەئادەم چل کچ و کوڕ بوون بەبیست سك و دەڵێت ناوی دەستەیەکیان بەئێمە گەیشتووە و ناوی دەستەیەکیان نازانین.

هەروەها لەکوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە کەناوی بیست و پێنج پیاو و چوار ژن لەمنداڵەکانی ئادەم بەئێمە گەیشتووە و لەوان قین و خوشکەکەی، هابیل و لیوزا، ئەشوس و کچی ئادەم و خوشکەکەی، شیس و خوشکە دوانەکەی و حەرورە و خوشکەکەی کە لەتەمەنی سەد و سی ساڵیدا هاتن، ئەیاز کوڕی ئادەم و خوشکە دووانەکەی، بالغ کوڕی ئادەم و خوشکەکەی، ئەساسی کوڕی ئادەم و خوشکەکەی، تۆبە کوڕی ئادەم و خوشکەکەی، بەنان کوڕی ئادەم و خوشکەکەی، شەبونە کوڕی ئادەم و خوشکەکەی، حەیان کوڕی ئادەم و خوشکەکەی، زەرابیس کوڕی ئادەم و خوشکەکەی، هەدەر کوڕی ئادەم و خوشکەکەی، یەحود کوڕی ئادەم و خوشکەکەی، سەندل کوڕی ئادەم و خوشکەکەی و بارق کوڕی ئادەم و خوشکەکەی. هەموو کوڕەکانی ئادەم خوشکێکی دوانەیان هەبوو.

زۆربەی زانا و شارەزایانی فارسی گومان دەکەن کیومەرس هەمان ئادەمە و دەستەیەکیان وتوویانە کەئەو کوڕی ئادەم و حەوایە و دەستەیەکیان سەبارەت بەو ئامارەیان بەبابەتی ئەوتۆداوە کەئامارەدان پێیان دەبێتە هۆی درێژدادڕی لەم کتێبەدا و بۆیە چاوپۆشیمان لێکرد چوونکە مەبەستی ئێمە لەم کتێبەدا گێڕانەوەی بەسەرهاتی پاشاکان و ڕۆژگاری ئەوانە و جیاوازی کەسەکان سەبارەت

بەباو وباپیرانی پاشاکانی خۆیان مەبەستی ئەم کتێبە نییە و ئەگەر لەمبارەوە سووکە ئاماژەیەك بەبابەتەکە بکەین، بۆ ئەوەیە ئەو کەسەی کەنایناسن، بیناسێنین. بابەتی جیاوازی نەژادی ئەوان، بابەتی کتێبەکەی ئێمە نییە.

دەستەیەك لەزاناکانی دیکە( ئەوانەی فارسی نین) هاوشێوەی فارسەکان کیومەرس بەئادەم دەزانن. سەبارەت بەناوی ئەو لەگەڵ زانا فارسەکان هاوڕا بەڵام سەبارەت بە تایبەتمەندی و حاڵی ئەو بۆچوونیان جیاوازە و دەڵێن کیومەرس کەفارسەکان بەئادەمی دەزانن، عامر کوڕی یافس کوڕی نوحە و پیاوێکی بەتەمەن و سالاری نەتەوەکەی خۆی و لەکێوی دونباوەند لەکێوەکانی تەبەرستان ڕۆژهەڵات نیشتەجێ و پاشایەتی ئەو ناوچە و فارسی لەژێر دەستا بوو. هێزی کیومەرس زیادی کرد و بەکوڕەکانی خۆی وت تا دەست بەسەر بابلدا بگرن وبۆ ماوەیەك پاشایەتی هەموو ناوچەکانیان لەژێر دەستا بوو. کیومەرس پارێزگاری لەهەموو سەرزەمینەکەی خۆی کرد و بناغەی شار و دیوارەکانی داڕشت و سیلاحی کۆکردەوە و ئەسپی دەستەمۆ کرد. لەکۆتاییەکانی تەمەن ستەمگەری کردە پیشە و ناوی ئادەمی لەخۆی نا و وتی هەرکەس بەم ناوە بانگم نەکات، دەیکوژم. سی ژنی کردە هاوسەری خۆی و منداڵەکانی بەمشێوەیە فراوان بوون و ماری کوڕەکەی و ماریانەی کچی لەکۆتاییەکانی تەمەنی ئەو هاتنەدنیا. زۆری ئەوان خۆش ئەویست و لەپێشی پێ بەخشین. لەبەر ئەمە پاشاکان لەمنداڵەکانی ئەمانن و پاشایەتی ئەو فراوان و گەورە بوو.

لێرەدا ئاماژەمان بە بەسەرهاتی کیومەرسدا لەبەر ئەوەی زانای نەتەوەکان کۆکن لەسەر ئەوەی کەکیومەرس باوکی فارسەکانە بەڵام کۆك نین کەئەو ئادەم بووبێت یا نە. بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا پاشایەتی خۆی و منداڵەکانی لەسەرزەمین و کوێستانەکانی ڕۆژهەڵات بەردەوام بوو تا ڕۆژگاری عوسمان کوڕی عەفان کەیەزدگێرد کوڕی شەهریار (لەنەوەکانی ئەو) لەمەرو کوژرا.

مێژوویساڵەکانی رابردووی جیهان لەڕووی ژیانی پاشاکانیان ئاسانتر و روونتر لەپاشایەتی نەتەوەکانی دیکەیە چوونکە لەو نەتەوانەی بۆ ئادەم دەگەڕێنەوە، جگە لەوان نەتەوەیەکی دیکە لەئارادا نەبووە کەپاشایەتیان بەردەوام

و پەیوەست بووبێت و پاشایان هەبێت تا ئەوان لەدەوری یەك کۆبکاتەوە و لەبەرابەر دوژمنان پشتیوانیان لێ بکات و بەسەر شەڕکەراندا زاڵ بێت و ستەمگەر لەستەملێکراو دور بخاتەوە و بۆ کار کردن ناچار و ببێتە هۆی شکۆ و مەزنیان. لەبەر ئەمە مێژوو لەرووی ژیانی پاشاکانی ئەوان ڕاستتر و روونترە.

ئێمە ماوەی تەمەنی ئادەم و تەمەنی منداڵەکانی ئەومان ئاماژە پێدا کەپێغەمبەری و پاشایەتیان پێبڕا، بەپێچەوانەی وتاری فارسەکان کەگومان دەکەن ئەو کیومەرسە، و بەپێی وتاری ئەوانەی کەکیومەرس بەباوکی فارسەکان دەزانن. هۆکاری جیاوازی و ناسازگاری هەردوکیان باس دەکەین بەخواستی خوا. بەسەرهاتەکان تا دەورانی ئێستا درێژە پێدەدەین.

ئێستا بەروونکردنەوەی هەڵەی ئەو کەسانە سەرقاڵ دەبین کەگومانیان کرد ئادەم یەکەم کەس بوو کەلەسەر زەوی مرد و داستانی قورئان کەفەرمووی: بەسەرهاتی دوو کوڕەکەی ئادەم بۆ ئەوان بخوێنەرەوە. بۆ کوڕەکانی ئادەم خۆی ناگێڕنەوە.

سەموورە کوڕی جەندەب لەپێغەمبەر دەگێڕێتەوە: منداڵەکانی حەوا بەزیندووی نەدەمانەوە. حەوا نەزری کرد ئەگەر منداڵێکی بمێنێتەوە ناوی دەنێت عەبد حارس. منداڵێکی بەزیندو مایەوە و ناوی نا عەبد حارس و ئەمە بەپێشنیاری شەیتان بوو.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: حەوا منداڵی بۆ ئادەم دەهێنایە دنیا و بەناوی وەك عەبداللە و عوبەیداللە و ناوی هاوشێوە ناوی دەنان بەڵام دەمردن. ئیبلیس ڕۆشتە لای حەوا و ئادەم و وتی: ئەگەر ناوی منداڵەکانتان بگۆڕن، بەزیندووی دەمێننەوە. حەوا کوڕێکی هێنایەدنیا و ناویان نا عەبد حارس. وتاری خواوەند لەمبارەوەیە کەفەرمووی: (( ئەوە کە ئێوەی لەیەك کەس ئافراند)) تا ئەو جێگەی دەفەرمێت: (( و بۆ خواوەند لەوەی پێی بەخشیبوون، شەریکیان دانا...)) تا کۆتایی ئایەکە.

لەسەعید کوڕی جوبەیر دەگێڕنەوە: لەروونکردنەوەی ئەم ئایەی قورئان کەخواوەند دەفەرمێت: (( و کاتێك خواوەند سەنگین بوو، لەپەروەردگاری خۆیان

دەپارێنەوە)) تا ئەو جێگەی دەفەرمێت: ((خوا لەوەی دەیکەنە شەریکی، لەپێشتر و گەورەترە)) وتی: کاتێك حەوا بەیەکەم منالی خۆی دوگیان بوو، پێش ئەوەی منالەکەی ببێت، ئیبلیس هاتە لای و وتی: ئەی حەوا ئەوەی چییە لەسکتایە؟

وتی: نازانم

وتی: لەکوێوە دێتەدەر، لەلوت یا چاو یا گوێچکە؟

وتی: نازانم؟.

وتی: ئەگەر تەندروست بێتەدەر، فەرمانبەری فەرمانەکانی من دەکەیت؟

وتی: بەڵێ.

وتی: ناوی بنێ عەبد الحارس. ئیبلیس خۆی ناوی حارس بوو.

حەوا وتی: رازیم. دوای ئەوە بەئادەمی وت: یەکێك هاتە خەوی من و ئەمە و ئەوەی پێ وتم.

ئادەم وتی: ئەوە شەیتانە، لێی بترسە چوونکە ئەو دوژمنەیە ئێمەی لەبەهەشت دەرکرد.

دووبارە ئیبلیس هاتە لای حەوا و هەمان قسەی دوبارە کردەوە و حەوا رازی بوو و کاتێك منالەکەی هێنایە دنیا و خواوەند منالەکەی ئەوی بەتەندروستی هێنایە دنیا، ناوینا عەبدالحارس و مانای وتارەکەی خواوەند ئەمەیە کەفەرمووی: ((بۆ خواوەند لەوەی پێیبەخشیبون، شەریکیان دانا)) تا ئەو جێگەی کەدەفەرمێت: ((خواوەند لەوەی دەیکەنە شەریکی، گەورەتر و لەپێشترە.))

لەگێڕانەوەیەکی دیکەدا هاتووە: لەسەعید کوڕی جوبەیریان پرسی: ((ئادەم بێ باوەڕ بوو)).

وتی: ((پەنا بۆ خوا دەبەم لەوەی گومان بکەم ئادەم بێ باوەڕ بووبێت. بەڵام کاتێك حەوا لەکاتی منال بوون نزیك کەوتەوە، ئیبلیس ڕۆشتە لای و وتی: ئەمە لەکوێوە دێتەدەر، لەلوت یا چاو یاگوێچکەت. ئەوی بێ هیوا کرد و دواتر وتی: ئەگەر تەندروست لەدایك ببێت. بەم گێڕانەوەیان زیاد کردەوە کە ((ئەگەر زیانت لێ نەدات و نەتکوژێت، گوێ لەفەرمانەکانی من دەگریت؟))

وتی: بەڵێ.

وتی: ناوی بنێ عەبد الحارس. حەوا ئەو کارەی کرد و ئیبلیسی لەناو نانی منداڵەکەی کردە شەریک.

لەسەدی دەگێڕنەو کەحەوا کوڕێکی هێنایە دنیا و ئیبلیس ڕۆشتە لای ئەوان و وتی: ئەو وەك بەندەی من ناو بنێن و گەرنە دەیکوژم.

ئادەم وتی: یەکجار گوێڕایەڵی فەرمانەکانی تۆم کرد و لەبەهەشت دەرکرام. گوێی لەقسەکانی شەیتان نەگرت و ناوی منداڵەکەی نا عەبدولرەحمان. شەیتان بەسەریدا زاڵ بوو و کوشتی و حەوا جارێکی دیکە دووگیان بوو و کاتێك منداڵەکەی هێنایە دنیا، ئیبلیس وتی: وەك بەندەی من ناوی بنێ، وەگەرنە دەیکوژم.

ئادەم پێی وت:جارێك گوێم لەفەرمانی تۆگرت و لەبەهەشت دەرکرام. گوێی لەقسەکانی نەگرت و ناوی منداڵەکەی نا ساڵح و ئیبلیس ئەویشی کوشت و کاتێك منداڵی سێیەم هات، ئیبلیس بەوانی وت: ئێستا کەناتوانن ببنە ڕکەبەری من، ناوی بنێن عەبدئەلحارس چوونکە ناوی ئیبلیس حارس و لەبەر ئەوەی بەهۆی سەرسوڕمانەوە، کاروبارەکانی لەدەستدا نەما، بەئیبلیس ناوی دەرکرد و مانای وتارەکەی خواوەند کەدەفەرمێت: بۆ خواوەند لەوەی پێی بەخشیبوون، شەریکیان دانا. ئەمەیە.

ئەم کەسانەی ئاماژەم بەگێڕانەوەکانی ئەواندا و وتوویانە پێش مەرگی ئادەم و حەوا چەند منداڵێکیان مرد و زۆر کەسی دیکە کەئاماژەم بەوتەکانیان نەدا، پێچەوانەی وتارەکەی حەسەن بوون کەدەڵێت ئادەم یەکەم کەس بوو کە لەسەر زەوی مرد.

خواوەند پاشایەتی زەوی و سەڵتەنەتی زەوی بەئادەم بەخشی لەگەڵ پێغەمبەرایەتی و ئەوی کردە نێردراوی منداڵەکانی خۆی و بیست و یەك صەحیفەی بۆ ناردە خوار و ئادەم هەموویانی بەخەتی خۆی نووسی کەجبرەئیل فێری کردبوو.

ئەبوزەری غەفاری دەڵێت: ڕۆشتمە مزگەوت و پێغەمبەر(د.خ) بەتەنیا دانیشتبوو، لەنزیك ئەو دانیشتم، فەرمووی: ئەی ئەبوزەر پێویستە درووود و سڵاو

بۆ مزگەوت بنێرین کەبریتیە لەدو رکعەت نوێژ، هەستە و نوێژ بکە.

کاتێك نوێژم کرد، دانیشتم و وتم: ئەی پێغەمبەر(د.خ). فەرمانی نوێژت بەمندا، بەلاّم نوێژ چییە؟

وتی: کەم تا زۆر نوێژی خێرە.

ئەبوزەر لەگەڵ گێڕانەوەیەکی دوور و درێژ دەڵێت: پرسیم، ئەی پێغەمبەر(د.خ)، ژمارەی پێغەمبەران چەندە؟

فەرمووی: یەکسەد و بیست و چوار هەزار.

وتم: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، لەناو ئەمان چەند کەسیان نێردراو بوون؟

فەرمووی: سێسەد و سیانزە کەس کەدەستەیەکی چاکەکار بوون.

وتم: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، یەکەمیان کێ بوو؟

فەرمووی: ئادەم.

وتم: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، ئادەم پێغەمبەری نێردراو بوو؟

فەرمووی: بەڵێ، خواوەند ئەوی بەدەستی خۆی ئافراند و لەرۆحی خۆی پێبەخشی و لەگەڵ ئەو قسەی کرد.

هەروەها لەئەبوزەر دەگێڕنەوە کە لەپێغەمبەرم پرسی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، ئادەم پێغەمبەر بوو؟

فەرمووی: بەڵێ، پێغەمبەر بوو و خواوەند رووبەروو قسەی لەگەڵ کرد.

دەڵێن لەو شتانەی خواوەند بۆ ئادەمی رەوانە کرد، رێز گرتنی مردار و خوێن و گۆشتی بەراز و پیتەکانی ئالفابێت بوو کە لەبیست و یەك وەرەقەدا بوو.

## وتار سەبارەت بەهاتنەدنیایشیس لەحەوا

کاتێك سەد و سی ساڵ لەتەمەنی ئادەم تێپەڕی و ئەمە پەنجا ساڵ دوای کوژرانی هابیل بەدەستی قابیلە، حەوا شیسی هێنایە دنیا. ئەهلی تەورات دەڵێن: شیس تەنیا و بێ دوانە هاتە دنیا و مانای شیس لای ئەوان هبە الله یە، یانی لەجێگەی هابیل هاتۆتە دنیا.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە:حەوا بۆ ئادەم شیس و خوشکەکەی حزورای هێنایە دنیا و ناویان نا هبە الله کە لەهابیلەوە وەرگیراوە. کاتێك لەدایك بوو، جبرەئیل بەئادەمی وت: ئەمە هبە الله-یە، لەجێگەی هابیل کە بەعەرەبی شس و بەسریانی شات و بەعیبری شیس. ئادەم وەسیەتی خۆی لای ئەو کرد و کاتێك شیس هاتە دنیا، تەمەنی ئادەم سەد وسی ساڵ بوو.

لەمحەممەد کوڕی ئیسحاق دەگێڕینەوە: کاتێك زەمانی مەرگی ئادەم گەیشت، بەهەمان شێوە کەوتوویانە و خوا زاناترە، داوای کوڕەکەی خۆی شیسی کرد و لای ئەو وەسیەتی کرد و کاژێرەکانی شەو و ڕۆژ و دۆعا و پاڕانەوەی خەڵکانی لەم کاژێرانەدا فێر کرد کە لەهەر کاژێرێك دەبێت دەستەیەك لەخەڵکان پەرەستینی خواوەند ئەنجام بدەن، پێی وت: کوڕم، لەسەر زەوی تۆفانێك دروست دەبێت کە بۆ ماوەی حەوت ساڵ بەردەوامە. وەسیەتەکەی خۆی نووسی و شیس بەهەمان شێوە کەوتوویانە: جێگری ئادەم بوو و دوای مردنی ئادەم، سەروەری بەشیس گەیشت و خواوەند بەهەمان شێوە کە لەپێغەمبەر دەگێڕنەوە، پەنجا صەحیفەی بۆ ڕەوانە کرد.

ئەبوزەری غەفاری دەڵێت: لەپێغەمبەرم پرسی: خواوەند چەند کتێبی ڕەوانە کرد؟

فەرمووی: یەکسەد و چوار کتێب و پەنجا صەحیفەی بۆ شیس نارد.

ئێستا نەژادی هەموو منداڵەکانی ئادەم بۆ شیس دەگەڕێتەوە چوونکە نەوەی

هەموو منداڵەکانی ئادەم جگە لەشیس لەناوچووە و کەس لەوان نەماوەتەوە. بەمشێوەیە هەموو منداڵەکانی ئادەم، منداڵەکانی شیسن.

فارسەکان دەڵێن کیومەرس، ئادەمە. دەڵێن: کوڕێکی بوو بەناوی مەشی کە لەگەڵ میشانی خوشکی پەیوەندی هاوسەرگیری بەست و سیامەکی کوڕمیشا و سیامی کچ مشا هاتنەدنیا و لەسیامەکی کوڕی مەشا کوڕی کیومەرس، ئەفرواك و دیس و براست و ئەجرەب و ئەوراش هاتنە دنیا کەکوڕەکانی سیامەك بوون و ئەفری و دزی و بەری و ئەوراشی کچەکانی سیامەك و دایکی هەموویان سیامی کچی مەشی بوو کەخوشکی باوکیانە. دەڵێن هەموو زەمین حەوت هەرێمە و سەرزەمینی بابل و وشکانی و دەریا کەخەڵکان پێی دەگەن. یەك هەرێمە و خەڵکەکەی منداڵەکانی ئەفرواك کوڕی سیامەك و منداڵی منداڵەکانی ئەون. شەش هەرێمەکەی دیکە لەدەریا و وشکای کەناتوانین پێیان بگەین، خەڵکەکەی لەوەچەی کوڕان و کچانی دیکەی سیامەکەن. ئەفرواك کوڕی سیامەك لەئەفری کچی سیامەك، هوشەنگی پاشای هێنایە دنیا کەبوو بەجێگری کیومەرسی باوەگەوریێ و یەکەم کەسە پاشایەتی حەوت هەرێمەکەی گرتەدەست. بەخواستی خوا لەکاتی خۆیدا ئاماژەی پێدەدەین.

دەستەیەك گومان دەکەن: ئەوشهەنگ کوڕی ئادەم و زادەی حەوایە، بەڵام هوشامی کەلبی بەهەمان شێوە کەلێی دەگێڕنەوە، دەڵێت: (( بیستوومە و خوا زاناترە، یەکەم کەس پاشایەتی حەوت هەرێمەکەی گرتەدەست، ئەوشهەنگ کوڕی عامر، کوڕی شالخ کوڕی ئەرفەخشز کوڕی سام کوڕی نوح بوو.))

دەڵێت: فارسەکان گومان دەکەن ئەو دوسەد ساڵ دوای مردنی ئادەم بوو. وەك چۆن بیستوومانە ئەم پاشایە دوسەد ساڵ دوای مردنی نوح هاتۆتە سەرکار و فارسەکان دەڵێن دوای دوسەد ساڵ لەمردنی ئادەم هاتە سەر کار.

ئەم وتارەی هوشامی کەلبی سەلمێنراو نییە چوونکە ئەوشەنگ پاشا لەناو زانایان و شارەزایانی نەوەکانی فارسی، لەحەجاج کوڕی یوسف لای موسوڵمانان ناسراوترە وهەر نەتەوەیەك باوکان و نەژادەکانی خۆی باشتر لەکەسانی دیکە دەناسێت و لەگفتوگۆ کردن سەبارەت بەوان، پێویستە پشت بەزانیارییەکانی

خۆیان ببەستین.

دەستەیەك لەڕەچەڵەك ناسانی فارسی گومان دەکەن ئەوشهەنگ پاشا هەمان مەهلائیلە و سیامەك هەمان ئەنوش باوکی قینانە و مەشا هەمان شیس باوکی ئەنوش و کیومەرس هەمان ئادەمە. ئەگەر بەمشێوە بێت. بێ چەند و چوون ئەوشهەنگ لەسەردەمی ئادەم پیاوێك بووە، چوونکە بەهەمان شێوە کە لەکتێبی کۆندا هاتووە تەمەنی ئادەم سێسەد و پەنجا و نۆسالێ بوو کەمەهلائیل، ئەردینە کچی براکیل کوڕی مەحویل کوڕی خنوح کوڕی قین، کوڕی ئادەم هاتە دنیا ولەکاتی مەرگی ئادەم تەمەنی شەشسەد و نەوەد و پێنج سالێ بوو چوونکە لەپێغەمبەر دەگێڕنەوە: تەمەنی ئادەم یەك هەزار ساڵە.

زاناکانی فارسی گومان دەکەن ماوەی پاشایەتی ئەوشهەنگ چل ساڵی خایاند و ئەگەر بەمشێوە بێت، دوور نییە پاشایەتی ئەو دوسەد ساڵ ساڵ دوای مردنی ئادەم دەستی پێکردبێت.

## وتار سەبارەت بەمەرگی ئادەم

سەبارەت بەتەمەنی ئادەم و ئەوەی لەکاتی مردن تەمەنی چەندە بوو، جیاوازی هەیە:

لەئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە: پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: خواوەند ئادەمی بەدەستی خۆی ئافراند و لەرۆحی خۆی پێبەخشی و فەرمانی بەفریشتەکاندا کوڕنوشی بۆ ببەن، ئادەم پژمی و سوپاسی خوای بەجێهێنا. خواوەند فەرمووی: خوا رەحمت پێ بکات، بڕۆ لای فریشتەکان و سڵاویان لێ بکە. ئادەم ڕۆشت و وتی: ((السلام علیکم)) و فریشتەکان وتیان: (و علیك و رحمە الله). دواتر بۆ لای خواوەند گەڕایەوە و خواوەند پێی فەرموو: ((ئەمە سڵاوی تۆ و منداڵەکانی تۆیە و لەیەکی دەکەن)) ئەوسا هەردو دەستی ئەوی گرت و فەرمووی: ((بیگرە و هەڵبژێرە)) ئادەم وتی: پەروەردگارا، دەستی راستم هەڵبژارد چوونکە هەردو دەستی ئەو راستە. خواوەند دەستی راستی خۆی کردەوە و روخساری ئادەم و هەموو منداڵەکانی ئەوی تیا بوو، ئەجەلی هەر کەسێك لای روخساری دیاری کرا بوو، تەمەنی ئادەم هەزار ساڵ و روخساری دەستەیەك نوورانی بوو.

ئادەم وتی: خواوەندا، ئەو نوورانییانە کێن؟

خواوەند فەرمووی: ئەوان پێغەمبەران و نێردراوانن کە بۆ لای بەندەکانم ڕەوانەیان دەکەم.

لەناو ئەوان یەکیان لەهەموویان نوورانیتر بوو و ساڵەکانی تەمەنی لەچڵ تێنەدەپەڕی. ئادەم وتی: تەمەنی تەنیا ئەوەندەیە؟ ئەوسا وتی: شەست ساڵ لەتەمەنی من بخە سەر تەمەنی ئەو.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: کاتێك خواوەند ئادەمی بۆ بەهەشت برد و ئەوسا بۆ سەرزەوی دووری خستەوە، ڕۆژەکانی خۆی دەبژاردو کاتێك فریشتەی مدرگ هات گیانی بستێنێت، ئادەم وتی:

ئەی فریشتەی مەرگ، پەلەت کرد.

فریشتەی مەرگ وتی: نا، پەلەم نەکرد.

ئادەم وتی: شەست ساڵ لەتەمەنی من ماوە.

فریشتەی مەرگ وتی: هیچ لەتەمەنی تۆ نەماوەتەوە، تۆ داوات لەپەروەردگار کرد، ئەم شەست ساڵە بەکوڕەکەت ببەخشێت.

ئادەم وتی: داوام نەکرد.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئادەم لەبیری کرد و بەمشێوەیە منداڵەکانی ئەو لەبیر دەکەن، ئادەم حاشای کرد، بەمشێوەیە منداڵەکانی ئەو حاشا دەکەن، لەو کاتەوە خواوەند نوسراوی کردە بەڵگە و شایەت.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: کاتێك ئایەی (دین) هاتەخوار، پێغەمبەر(د.خ) سێ جار فەرمووی: یەکەم کەسێك حاشای لەراستیەکان کرد، ئادەم بوو، کاتێك خواوەند ئەوی ئافراند، دەستی لەپشتی ئەودا و هەموو منداڵەکانی تا رۆژی پەسڵان نیشاندا. ئادەم لەناو ئەوان کەسێکی بینی کەئێجگار جوان بوو.

وتی: ئەی پەروەردگار، ئەمە کام پێغەمبەرەیە؟

فەرمووی: ئەمە داوودە.

وتی: تەمەنی چەندە؟

فەرمووی: شەست ساڵ.

وتی: پەروەردگار، تەمەنی ئەو زیاد بکە.

فەرمووی: نا، مەگەر ئەوەی تۆ لەتەمەنی خۆتی پێببەخشیت.

تەمەنی ئادەم هەزار ساڵ و چل ساڵی بەداوود بەخشی. خواوەند لەمبارەوە بەڵگەیەکی نووسی و فریشتەکانی کردە شایەت و کاتێك سەردەمی مەرگی ئادەم گەیشت، فریشتەکان هاتن گیانی بگرن، وتی: چل ساڵ لەتەمەنی من ماوەتەوە.

وتیان: ئەو چل ساڵەت بەکوڕەکەت داوود بەخشی.

وتی: نەمکردووە و نەمبەخشیوە.

خواوەند نوسراوەکەی ڕەوانە کرد و فریشتەکان شایەتیاندا. دواتر خواوەند هەزار ساڵ تەمەنی بەئادەم بەخشی و تەمەنی داوودی بۆ سەد ساڵ درێژ کردەوە.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە، کاتێك خواوەند ئادەمی ئافراند، دەستی لەپشتی

ئەودا و هەموو منالّەکانی هاوشێوەی مێروولە نیشاندا. ئەوانی هێنایە قسە و شایەتیان بۆ خۆیاندا، روخساری دەستەیەکی نوورانی کرد بەئادەمی فەرموو: ئەمانە منالّەکانی تۆن، پەیمانیان لێوەردەگرم کەپەروەردگاری ئەوانم بۆ ئەوەی شەریکم بۆ دانەنێن و رۆژی ئەوان لەئەستۆی مندایە.

ئادەم وتی: ئەم کەسە نوورانییە کێیە؟

خواوەند فەرمووی: داوودە.

وتی: ئەی خوایە، چەند سالّ تەمەنت بۆ دیاری کردووە؟

فەرمووی: شەست سالّ.

وتی: چەند سالّ تەمەنت بۆ من دیاری کردووە؟

فەرمووی: هەزار سالّ، تەمەنی هەر کەسێکم دیاری کردووە.

وتی: پەروەردگارا، تەمەنی زیاد بکە.

فەرمووی: ئەم کتێبە دیاریکراوە، ئەگەر دەخوازیت لەتەمەنی خۆتی پێ ببەخشە.

وتی: (دەبەخشم) و فەرمانی پێنووس سەبارەت بەهەموو منالّەکانی ئادەم دەرکرا. بۆ داوود چل سالّ لەتەمەنی ئادەم نوسرا و تەمەنی بوو بەسەد سالّ. کاتێك ئادەم نۆسەد و شەست سالّی لەسالّەکانی تەمەنی بەسەر برد، فریشتەی مەرگ هات و کاتێك ئادەم ئەوی بینی، وتی: بۆ چ مەبەستێك هاتوویت؟

وتی: تەمەنت کۆتایی هات.

وتی: نۆسەد و شەست سالّ ژیاوم و هێشتا چل سالّ لەتەمەنم ماوەتەوە.

کاتێك ئەم قسەی هێنایە سەرزمان، فریشتە پێی وت: خواوەند ئەم فەرمانەی پێداوم.

وتی: بۆ لای پەروەردگار بگەرێرەوە و لێی بپرسە.

فریشتە بۆ لای خواوەند گەڕایەوە و خواوەند فەرمووی: چی بوو؟

فریشتە وتی: گەڕامەوە لەبەر ئەوەی رێز و خۆشەویستی تۆ بۆ ئەو دەزانم.

خواوەند فەرمووی: بگەڕێرەوە و پێی بڵێ کەچل سالّ لەتەمەنی خۆی بەداوود بەخشیوە.

دەڵێن ئادەم یانزە ڕۆژ پێش مردن نەخۆش کەوت و وەسیەتی لای شیسی کوڕی کرد، وەسیەتی نووسی و بەشیسی سپارد و ڕایسپارد تا لەقابیل و منداڵەکانی قابیل بیشارێتەوە، چوونکە قابیل هابیلی کوشت لەبەر ئەوەی ئادەم [illegible] و فرەزانی خۆی تایبەت کرد بەو. شیس و منداڵەکانی زانیارییەکانی خۆیان بەنهێنی هێشتە و قابیل و منداڵەکانی هیچ زانیارییەکیان پێنەبڕا تا کەڵکی لێوەربگرن.

بەگومانی ئەهلی تەورات تەمەنی ئادەم نۆسەد و سی ساڵ بوو.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە کەتەمەنی ئادەم نۆسەد و سی و شەش ساڵ بوو.

پێشتر ئاماژەمان بەگێڕانەوەکان لەپێغەمبەر و پێشیناندا و وتمان کەتەمەنی ئادەم هەزار ساڵ بوو و دوای ئەوەی کەچل ساڵ لەتەمەنی خۆی بەداوود بەخشی، خواوەند، هەزار ساڵ تەمەنی پێ بەخشی، ئەگەری هەیە ئەوەی لەتەمەنی ئادەم بەداوود بەخشرا، لەتەوراتدا نەخرابێتە سەرتەمەنی ئادەم و لەبەر ئەمە وتوویانە تەمەنی ئادەم نۆسەد و سی ساڵە.

ئەگەر کەسێك بڵێت: ئەگەر بەمشێوە بێت کەئادەم لەتەمەنی خۆی چل ساڵی بەداوود بەخشی، دەبێت لەتەوراتدا تەمەنی ئەو بەنۆسەد و شەست ساڵ دیاری کرابێت بۆ ئەوەی لەگەڵ وتەکانی پێغەمبەر(د.خ) و زاناکان یەکبگرێتەوە.

دەڵێین: ئەبوهورەیرە دەڵێت ئادەم شەست ساڵی تەمەنی خۆی بەداوود بەخشی ئەگەر بەمشێوەیە بێت، ئەوەی لەتەوراتدا باسی لێوەکراوە، لەگەڵ حەدیسەکانی پێغەمبەر(د.خ) و وتاری زانا کۆنەکان یەکدەگرێتەوە.

لەکوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە، کاتێك ئادەم وەسیەتی خۆی نووسی و مرد، فریشتەکان کۆبوونەوە چوونکە ئەو ((صفی الرحمان)) بوو. فریشتەکان و شیس ئەویان لەڕۆژهەڵاتی بەهەشت لەنزیك گوندێک کەیەکەم گوندی زەوی بوو، بەخاك سپارد. هەتاو و مانگ بۆ ماوەی حەوت شەو ورۆژ گیران. کاتێك فریشتەکان لەدەوری کۆبوونەوە، وەسیەت نامەکەیان خستە سەر پەیژەیەك، هەروەها ئەو شاخەیان پەیوەست کرد کەئادەم لەگەڵ خۆی لەبەهەشتەوە هێنابووی.

یەحیا کوڕی عیباد لەباوکی خۆی دەگێڕێتەوە، کاتێك ئادەم مرد، خواوەند

ئەوی بەکفنەوە لەبەهەشتا زیندوو کردەوە، ئەوسا فریشتەکان بەخاکیان سپارد.

حەسەن لەپێغەمبەر دەگێڕێتەوە، کاتێك ئادەم مرد، فریشتەکان ئەویان بەئاوی تایبەت شۆرد و لەگۆڕەکەی ئەو درزێکیان دروست کرد کەبووە نەریتی منداڵەکانی ئادەم.

ئەبی کوڕی کەعب لە پێغەمبەر(د.خ) دەگێڕێتەوە کەئادەم هاوشێوەی دارخورمایەکی بەرز بوو، شەست زەراع بەرزی باڵای بوو، تووکن و شەرمی داپۆشرابوو و کاتێك گوناحی ئەنجامدا، لەبەهەشتا رایدەکرد، بەردارێك کەوت و ئەوی گرت و خواوەند بانگی کرد: ئەی ئادەم، ئایا لەمن رادەکەیت؟

وتی: نا، بەڵام شەرمت لێ دەکەم لەبەر ئەو گوناحەی ئەنجاممدا.

خواوەند ئەوی بۆ زەمین دابەزاند و کاتێك سەردەمی مەرگی گەیشت، کفنی ئەوی لەبەهەشتەوە نارد.

کاتێك حەوا، فریشتەکانی بینی، ڕۆشت تا لەگەڵ ئەوان بڕواتە لای حەوا، ئادەم وتی: من لەگەڵ نێردراوەکانی خواکەم بەتەنیا جێبێڵە چوونکە هەرچیم بینی، لەتۆ بینیم و هەر ئازارێکم چێشت، لەتۆ چێشتم.

کاتێك مرد، ئەویان بەسەدر و ئاوی تایبەت شۆرد و بەیەك کفن، کفینان کرد و لەگۆڕەکەی ئەو درزێکیان دروست کرد و بەخاکیان سپارد و وتیان: دوای ئادەم، نەریتی منداڵەکانی بەمشێوەیە دەبێت.

لەئەبی کوڕی کەعب دەگێڕنەوە کەپێغەمبەر فەرمووی: ئادەم پیاوێکی باڵابەرز بوو هاوشێوەی دارخورمایەکی بڵند.

هەروەها لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە کاتێك ئادەم مرد، شیس بەجبرەئیلی وت: سڵاو بۆ ئادەم بنێرە.

جبرەئیل وتی: تۆ بڕۆ پێش و سڵاو بۆ باوکت بنێرە لەگەڵ سی تەکبیر، کەپێنج تەکبیر نوێژە و بیست و پێنج تەکبیر، وەسف کردنی ئادەمە.

سەبارەت بەشوێنی گۆڕی ئادەم بیروراکان جیاوازن، پێشتر ئامارژەمان بەوتەی کوڕی ئیسحاقدا. کەسانێتر وتوویانە لەمەککە لەئەشکەوتی ئەبو قەبیس کەبەناوی ئەشکەوتی گەنج بەناوبانگە، بەخاك سپێردرا. لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە کاتێك

نوح لەکەشتیەکە هاتەدەر، ئادەمی لەبیت المقدس بەخاک سپارد.

مردنی ئەو لەرۆژی هەینیدا بوو و گێڕانەوەکانمان لەمبارەوە پێشتر باس کرد و دوبارە کردنەوەیان پەسەند نییە.

کوڕی عەباس دەگێڕنەوە کەئادەم لەسەر کێوی بوز مرد، یانی ئەو کێوەی لێی دابەزی.

دەڵێن: حەوا ساڵێك دوای ئادەم ژیا و مرد و لەگەڵ هاوسەرەکەی لەو ئەشکەوتەی باسمان کرد، بەخاك سپێردرا. گۆڕی ئەوان لەناو ئەشکەوتەکەدا بوو تا تۆفانەکەی نوح. نوح ئەوانی خستە ناو تابوتێك و لەگەڵ خۆی بردییە ناو کەشتییەکە و کاتێك زەوی وشکی کرد، دوبارە ئەوانی بۆ شوێنەکەی خۆیان بردەوە. وەك دەڵێن حەوا رستی و چنی و هەویری کرد و نانی برژاند، هەموو کارەکانی تایبەت بەژنانی ئەنجامدا.

ئێستاکە لەگێڕانەوەی بەسەرهاتی ئادەم و ئیبلیس و ئەوەی خواوەند کردیە چارەنوسی ئیبلیس کە تارۆژی دیاریکراو. مۆڵەتی پێبەخشی و ئەوەی بەئادەمی بەخشی و دوای گەڕانەوە لەگوناح ئەوی بەخشی و لەگومڕایی رزگاری کرد، تەواو بوین، دەگەڕێنەوە سەر باس کردنی داستانی قابیل ومناڵەکانی ئەو و گێڕانەوەکان تایبەت بەشیس و مناڵەکانی ئەو. هەروەها باسی ئەو کەسانە دەکەین کە ڕێگەی ئادەم یا ئیبلیسیان گرتەبەر و لەگەڵ ئەو کارانەی خواوەند لەگەڵ ئەواندا کردی، بەخواستی خوا.

یەکێك لەهەواڵەکانی تایبەت بەشیس ئەوەیە کەدوای مەرگی ئادەم، بوو بەجێگری ئەو. ئامارەمان بەو صەحیفانەدا کەخواوەند بۆ ئەوی ڕەوانە کرد.

دەڵێن ئەو لەمەککە نیشتەجێ بوو، بەردەوام حەج و عەمرەی دەکرد و ئەو صەحیفانەی خواوەند بۆی ڕەوانە کرد، هاوریێ لەگەڵ ئەوانەی باوکی، بەکاری دەبرد و کەعبەی بەبەرد و گڵ دروست کرد.

بەڵام بەوتەی زانا کۆنەکان، ئەو گومەزەی خواوەند لەشوێنی کەعبە بۆ ئادەمی دانابوو، تا سەردەمی تۆفان، لەو شوێنەدا مایەوە و لەکاتی تۆفان خواوەند گەڕاندییەوە بۆ ئاسمان.

دەڵێن کاتێك شیس نەخۆش کەوت، وەسیەتی لای ئەنوشی کوڕی کرد و مرد و لەتەنیشت دایك و باوکی لەئەشکەوتی ئەبو قەبیس بەخاك سپێردرا. شیس لەدوای دوسەد و سی وسیٚ ساڵ لەژیانی ئادەم چاوی بەدنیا هەڵهێنا و لەتەمەنی نۆسەد و دوانزە ساڵیدا مرد. بەوتەی شوێنکەوتەکانی تەورات، تەمەنی سێسەد و پێنج ساڵ بوو کەئەنوش چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

بەڵام بەوتەی کوڕی ئیسحاق شیس کوڕی ئادەم خوشکەکەی خۆی حزورە کچی ئادەمی کردە هاوسەری خۆی و یانش کوڕی شیس و نەعمە کچی شیس بۆ ئەوان لەدایك بوون. کاتێك ئەوان چاویان بەدنیا هەڵهێنا، سەد و پەنجا ساڵ لەتەمەنی شیس تێپەڕیبوو و دوای لەدایك بونی یانش بۆ ماوەی هەشسەد و حەوت ساڵ ژیا.

ئەنوش دوای مەرگی باوکی، دەستی بەسیاسەت و چارەسەری کاروبارەکانی تایبەت بەمسکێنەکان کرد. بەهەمان شێوە کەوتوویانە ئەو درێژەی بەشێوازی باوکیدا و گۆڕانکاری تیا دروست نەکرد. تەمەنی ئەنوش بەپێی شوێنکەوتەکانی تەورات نۆسەد و پەنجا ساڵە.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: شیس جگە لەئەنوش چەندین منالی دیکە هەبوو بەڵام وەسیەتی لای ئەنوش کرد. ئەنوش لەخوشکەکەی خۆی نەعمە کچی شیس، قینانی هێنایە دنیا. لەکاتی هاتنەدنیای ئەو، تەمەنی نەوەد ساڵ و سێسەد و بیست و پێنج ساڵ لەتەمەنی ئادەم تێپەڕی کردبوو.

بەڵام بەوتەی کوڕی ئیسحاق، یانش خوشکەکەی خۆی نەعمەی کردە هاوسەر و قینانی هێنایە دنیا. یانش لەکاتی لەدایك بونی ئەو تەمەنی نەوەد ساڵ و دوای لەدایك بوونی قینان هەشسەد و پانزە ساڵ ژیا. قینان لەتەمەنی حەفتا ساڵی دینە کچی براکیل کوڕی مەحویل کوڕی خنوح کوڕی قین کوڕی ئادەمی کردە هاوسەری خۆی و مەهلائیل کوڕی قینانی هێنایە دنیا و قینان دوای لەدایك بوونی ئەو هەشتسەد و چل ساڵ ژیا. تەمەنی ئەو نۆسەد و دە ساڵ درێژەی کێشا.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە، ئەنوش جگە لەقینان، چەندین منالی دیکەی هەبوو، بەڵام لای قینان وەسیەتی کرد. قینان مەهلائیل و چەندین منالی دیکەی

هەبوو، بەڵام وەسیەتی لای مەهەلائیل کرد. مەهلائیلی یەردی هێنایە دنیا لەگەڵ چەندین منالّی دیکە بەڵام لای یەرد وەسیەتی کرد. یەرد. خنوخی هێنایە دنیا کەئیدریسی پێغەمبەرە هاوریێ لەگەڵ چەندین منالّی دیکە بەڵام وەسیەتی لای خنوخ کرد. خنوخ متەوەشلخی هێنایە دنیا لەگەڵ منالّەکانی دنیا بەڵام وەسیەتی لای متەوەشلخ کرد.

شوێنکەوتەکانی کتێب دەڵێن لەتەوراتدا هاتووە لەکاتی لەدایك بوونی مەهلائیل تەمەنی ئادەم سێسەد و نەوەد و پێنج ساڵ و قینان حەفتا ساڵە و مەهلائیل کوڕی قینان شەست وپێنج ساڵ بوو. بەوتەی کوڕی ئیسحاق سەمعەن پووری خۆی و کچی براکیل کوڕی مەحویل کوڕی خنوخ کوڕی قین کوڕی ئادەمی کردە هاوسەری خۆی و یەرد کوڕی مەهلائیلی هێنایە دنیا و مەهلائیل دوای لەدایك بوونی یەرد سێسەد و سی ساڵ ژیا و چەندین کوڕ و کچی دیکەی هێنایە دنیا. تەمەنی مەهلائیل هەشسەد و نەوەد و پێنج ساڵ درێژەی کێشا.

بەڵام لەتەوراتدا هاتووە کاتێك یەرد کوڕی مەهلائیل هاتە دنیا، چوارسەد و شەست ساڵ لەتەمەنی ئادەم تێپەڕیبوو. یەرد درێژەی بەشێوازی باوکیدا بەڵام لەسەردەمی ئەو روداوەکان رویاندا.

## وتار سەبارەت بەو روداوانەی لەسەردەمی منداڵەکانی ئادەم لەشیس تا یەرد رویاندا

دەڵێن: کاتێك قابیل هابیلی کوشت و لەترسی باوکی بەرەو یەمەن رایکرد، ئیبلیس ڕۆشتە لای و وتی: بۆیە خواوەند بەقوربانییەکەی هابیل رازی بوو چوونکە خزمەتکاری ئاگر و ئاگری دەپەرەستی، تۆیش ئاگرێك داگیرسێنە تا تایبەت بەتۆ و منداڵەکاتی تۆ بێت. قابیل ئاتەشکەدەیەکی بینا کرد. یەکەم کەس بوو ئاگری داگیرساند و پەرەستشی کرد.

لەکوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە: قین خوشکەکەی خۆی، ئاشورت کچی ئادەمی کردە هاوسەر و کوڕ و کچێکی هێنایە دنیا، خنوخ کوڕی قین و عەدەن کچی قین، خنوخ کوڕی قین، عەدەن کچی قین و خوشکەکەی خۆی کردە هاوسەر و سێ کوڕ و کچێکی هێنایە دنیا: یەمرد کوڕی خەنوخ و مەحویل کوڕی خەنوخ و ئەنوشیل کوڕی خەنوخ و مەولیس کچی خەنوخ. ئەنوشیل کوڕی خەنوخ مەولیسی کردە هاوسەر و کوڕێکی بۆ هاتەدنیا بەناوی لامك. لامك دوژنی کردە هاوسەر یەکیان بەناوی عەدا و ئەوی دیکەیان صەلاً. لەعەدا تولین کوڕی لامك چاوی بەدنیا هەڵهێناو یەکەم کەس بوو لەخێوەتا نیشتەجێ بوو و سامانی کۆکردەوە. لەعەدا توبیش چاوی بەدنیا هەڵهێنا و کوڕێکی بۆ هاتەدنیا بەناوی توبلقین کە یەکەم کەس بوو دەستی بەئاسن و مس گەیشت و منداڵەکانی ئەو ستەمکاران و فیرعەونەکان بوون. جەستەیان گەورە و بەهەمان شێوە کەوتویانە بالأی هەرکامیان سی زەراع بووە. دەڵێت: منداڵەکانی قین لەناوچوون و کەس لەوان نەمایەوە و نەژادیان فەوتا، مەگەر شیس کوڕی ئادەم کەتا ئێستا ڕەچەڵەك و نەژادی خەڵکان بۆ ئەو دەگەڕێتەووە نەك بۆ ئادەم چوونکە نەژاد و ڕەچەڵەکی منداڵەکانی ئادەم بۆ شیس دەگەڕێتەوە و لەبراکانی کەسیان نەماوەتەوە.شوێنکەوتەکانی تەورات دەڵێن، قین ئەشوتی کردە هاوسەر و خنوخی هێنایە دنیا و خنوخ عیرد و عیرد مەحویلی هێنایە دنیا ومەحویل ئەبو شیل و ئەبوشیل لامك و لامك عەدا و صەلای

کردە هاوسەر و ئەو منداڵانەیان هێنایە دنیا کەئامارژەمان پێدا و خوا زاناترە. کوڕی ئیسحاق لەبەسەرهاتی قابیل و منداڵەکانی جگە لەوەی ئامارژەمان پێدا، باسی هیچی دیکەی نەکردووە. بەڵام، یەکێك لەشوێنکەوتەکانی تەورات وتوویەتی ئەو کەسەی لەمنداڵەکانی قابیل ساز و تاری هەڵگرت و لەرۆژگاری مەهلائیل کوڕی قینان تەپڵ و چەنگ و تەنبور و عودی ژەنی ومنداڵەکانی قابیل لەرابواردن و خۆشگوزەرانیدا نووقم بوون، پیاوێك بوو بەناوی تووباڵ. ئەم هەواڵە بەگوێی منداڵەکانی شیس گەیشت کە لەکوێستانەکان ژیانیان بەسەر دەبرد و یەکسەد کەس لەوان بەپێچەوانەی پێشنیارەکانی باوکیان مەبەستی ڕۆشتن بۆ لای منداڵەکانی قینیان کرد. ئەم هەواڵە بەیەرد گەیشت و ئامۆژگاری و ڕێگری لێکردن بەڵام ئەوان زیاتر پێداگریان کرد و ڕۆشتنە لای منداڵەکانی قابیل و شەیدای کار و چۆنییەتی ژیانی ئەوان بوون. کاتێك مەبەستی گەڕانەوەیان کرد، بەهۆی نفرینی باوکیانەوە نەیانتوانی و کاتێك دڕەنگیان کرد، دڵ ڕەشەکانی کوێستان گومانیان کرد ئەوان بەدڵخواز ماونەتەوە، لەبەر ئەمە لەکێوەکە هاتنەخوار و ساز و تاریان بینی و شەیدایی بون. ژنان لەنەتەوەی قابیل پێشوازیان لێکردن و لەگەڵ یەك جووت بوون و بەم شێوەیە لەستەمکاریدا ڕۆچون و زینا و شەرابخۆری بڵاو بوویەوە. ئەبوجەعفەر دەڵێت: ئەم وتەیە لەراستیەوە دوور نییە و دەستەیەك لەزاناکانی ئیسلام ئامارژەیان پێداوە، بەڵام باسیان نەکردووە لەرۆژگاری پاشایەتی کێ ڕوویدا تەنیا وتوویانە لەرۆژگاری نێوان نوح و ئادەم ئەم ڕووداوە هاتۆتە کایەوە.

ئامارژەدان بەبێژەری ئەم داستانانە

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: ئەم ئایەی خوێندەوە: وەك ڕۆژگاری جاهلیەتی کۆن خۆتان مەرازێننەوە، وتی: ((لەنێوان نوح و ئیدریس هەزار ساڵ بوو و دودەستە لەمنداڵەکانی ئادەم، یەکیان نیشتەجێی دەشت و ئەوی دیکەیان نیشتەجێی کێو. پیاوانی کێو جوان روخسار بوون و ژنەکانیان ناشیرین، ژنانی

دەشت جوان بوون و پیاوەکانیان ناشیرین. ئیبلیس هاوشێوەی پیاوێك ڕۆشتە لای یەکێك لەژنەکانی دەشت و خزمەتی ئەوی دەکرد. دواتر ئیبلیس شتێکی هاوشێوەی شمشاڵی شوانەکان هەڵگرت و ئاهەنگێکی لێدەرکرد کەخەڵك هاوشێوەی ئەوەیان نەبیستبوو. ئەم هەواڵە لەدەوروبەر بڵاو بویەوە و خەڵك ڕوویان لەوێ کرد. جەژنێکیان گرت و هەموو ساڵێك لەوێ کۆدەبوونەوە و ژنان بۆ پیاوان خۆیان دەڕازاندەوە. پیاوەکان بۆ ئەوان دەهاتنە خوار. یەکێك لەپیاوەکانی کێو لەکاتی جەژن هات و جوانی ژنەکانی بینی، گەڕایەوە بۆ لای کەسەکانی خۆی ولەوەی بینیبووی ئاگاداری کردنەوە. ئەوانیش لەکێوەکە هاتنە خوار و ڕۆشتنە لای ژنەکان و بەمشێوەیە زینا هاتە ئاراوە.)) مانای وتارەکەی خواوەند ئەمەیە کەدەفەرمێت: ((هاوشێوەی ڕۆژگاری کۆن خۆتان مەرازێننەوە)).

لەحەکەم دەگێڕنەوە سەبارەت بەئایەی ((وەك ڕۆژگاری کۆن خۆتان مەرازێننەوە)) وتوویەتی، لەنێوان ئادەم و نوح هەشسەد ساڵە و ژنەکان زیاد لەرادە ناشیرین و پیاوەکان جوان روخسار بوون. ژن پیاوەکانی لەخۆی نزیك دەکردەوە و ئەم ئایە هاتەخوار: هاوشێوەی ڕۆژگاری کۆن خۆتان مەرازێننەوە.

هەروەها لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: پێش ئەوەی ئادەم بمرێت، منداڵەکانی ئەو و منداڵی منداڵەکانی ئادەم لەکێوی بوز، ژمارەیان گەیشتبووە چل هەزار. ئادەم زینا و شەرابخۆری و خراپەکاری لەناو ئەواندا بینی و پێشنیاری کرد منداڵەکانی شیس لەگەڵ منداڵەکانی قین پەیوەندی هاوسەرگیری نەبەستن. منداڵەکانی شیس ئادەمیان کردە ناو ئەشکەوتێك و پاسەوانیان بۆ دانا و ڕێگەیان نەدا کەس لەئادەم نزیك بکەوێتەوە، ئەوکەسانەی دەڕۆشتنە لای و لەخوا بۆیان دەپاڕایەوە، منداڵەکانی شیس بوون. ڕۆژێك سەد کەس لەکوڕەکانی شیس وتیان بابڕۆین و بزانین کوڕە مامەکانمان چی دەکەن. مەبەستیان منداڵەکانی قین بوو.

ئەم سەد کەسە لای ژنە جوان روخسارەکانی منداڵەکانی قابیل دابەزین. ژنان دەوری پیاوەکانیان گرت و بۆ ماوەیەکی زۆر مانەوە. سەد کەسی دیکە وتیان بابڕۆین بزانین براکانمان چییان بەسەر هات. ئەوانیش لەکێوەکە هاتنە خوار و لەلایەن ژنانەوە دەورەدران. منداڵەکانی شیس هەموویان لەکێوەکە هاتنەخوار و

گوناح دەستی پێکرد و لەگەڵ یەك جووت بوون وخەوتن. بەمشێوەیە منداڵەکانی قابیل زیادیان کرد و دەستیان بەسەر هەموو زەمیندا گرت. ئەو کەسانە بوون لەرۆژگاری نوح لەتۆفانەکەدا خنکان.

وتاری رەچەڵەك ناسە فارسەکانمان سەبارەت بەمەهلائیل کوڕی قینان ئاماژە پێدا. وتوویانە: ئەو، ئەوشهەنگە کەپاشایەتی حەوت هەرێمەکەی دەکرد و ئاماژەمان بەوتەی ڕەچەڵەك ناسەکانی عەرەبیش کرد کەدژی بۆچوونی فارسەکانە. ئەگەر وتاری فارسەکان راست بێت، لەکوڕی سائیبی کەلبی دەگێڕنەوە: ئەوشهەنگ یەکەم کەسە داری بڕی و بینای دروست کرد و هەروەها یەکەم کەسە کانەکانی دەرهێنا و خەڵکی بۆ ئەم کارە ناچار کرد. فەرمانی بەخەڵکی رۆژگاری خۆیدا مزگەوتیان هەبێت و بناغەی دوشاری داڕشت، یەکیان بابل لەسوادی کوفە و ئەوی دیکەیان شوش. پاشایەتی ئەو چلساڵی خایاند.

کەسانیتر وتوویانە ئەو یەکەم کەسە لەپاشایەتی خۆی ئاسنی دەرهێنا و کەرەستەکانی لێ دروست کرد، ئاوی بردە ناو ماڵەکان وفەرمانی کشت و کاڵ و دروێنە و سەرقاڵ بوون بەکاری، دەرکرد و فەرمووی ئاژەڵە دڕەندەکان بکوژن و لەپێستی ئەوان جل و بەرگ و راخەڕ دروست بکەن. مانگا و بەراز و ئاژەڵە وەحشیەکان بکوژن و گۆشتەکەیان بخۆن. پاشایەتییەکەی ماوەی چل ساڵ درێژەی کێشا، شاری رەی دروست کرد. ئەم شارە یەکەم شارە دوای شاری نشینگەی کیومەرس لەدونباوەندی تەبەرستان، بناغەی دارێژرا.

فارسەکان دەڵێن ئەوشهەنگ وەك پاشا لەدایك بوو، چاکەکار و چارەسەری کێشەی مسکێنەکانی دەزانی.

دەڵێن: یەکەم کەس بوو فەرمان و سنورەکانی دیاری کرد و نازناوی (پیشداد، ئەوەی یەکەم کەس دادپەروەری کردە پیشە) لێرەوە پێبڕا. یانی یەکەم کەس بوو بەدادپەروەری فەرمانڕەوایی خەڵکی کرد، پیش لەفارسی بەمانای یەکەم و داد بەمانای دادپەروەری. ڕۆشتە هیند و بەویلایەتەکاندا گەڕا و کاتێك کاروبارەکانی سەقامگیر و پاشایەتی پێگەیشت، تاجی لەسەر کرد و وتارێکی خوێندەوە و وتی: پاشایەتی لەباوەگەورێیی، یانی کیومەرس، بۆ بەجێماوە و هەرکەسێك

سەرپێچی بکات( لەجنۆکە و خەڵك) سزای دەدات.

وتوویانە، ئەو، ئیبلیس و سوپاکەی تێکشکاند و رێگەی تێکەڵاوی لەخەڵکانی لێگرتن. نوسراوێکی لەسەر قەڵغانێکی سپی نووسی و پەیمانی لێوەرگرتن کەدژایەتی هیچ مرۆڤێك نەکەن و هەرشەی لێکردن. سەرپێچیکەرانی ئەوانی لەگەڵ دەستەیەك لەدێوەزمەکان کوشتار ولەترسی ئەو بۆ بیابان وکێوەکان رایانکرد. ئەو پاشایەتی هەموو هەرێمەکانی دەکرد.لەمەرگی کیومەرس تا لەدایك بوونی ئەوشهەنگ، دوسەد و بیست و سێ ساڵە. وتوویانە کەئیبلیس و سوپاکەی لەمەرگی ئەو شادمانیان کرد، چوونکە دوای مەرگی ئەو هاتنە ناو شوێنی نیشتەجێ بونی مناڵەکانی ئادەم و لەکێو و دۆڵەکان هاتنەخوار.

ئێستا دەگەڕێنەوە سەر باسی یەرد. دەستەیەك دەڵێن ئەو یاردە و مەهلائیل ئەوی لەپوری سەمعەن کچی براکیل کوڕی مەحویل کوڕی خنوخ کوڕی قین هێنایە دنیا. لەدایك بوونی ئەو لەدوای چوارسەد و شەست ساڵ لەتەمەنی ئادەم روویدا. ئەو جێگری باوکی ولەو میراتەی مەهائیل لەباوکی بۆی بەجێما بوو، بوو بەجێگری. مەهلائیل لەکاتی لەدایك بوونی یارد بەهەمان شێوە کەوتوویانە، شەست و پێنج ساڵ تەمەنی بوو و دوای مەرگی باوکی شێوازی باوك و باوەگەورێکانی گرتەبەر. بەوتەی کوڕی ئیسحاق سەد و شەست و دو ساڵ تەمەنی بوو کەرەکیا کچی درمسیل کوڕی مەحویل کوڕی خنوخ کوڕی قین کوڕی ئادەمی کردە هاوسەری خۆی و ئەخنوخ کوڕی یەردی هێنایە دنیا. ئەخنوخ هەمان ئیدریسی پێغەمبەرە و بەگومانی کوڕی ئیسحاق یەکەم کەس لەمناڵەکانی ئادەم بوو پلەی پێغەمبەری پێبڕا و بەپێنووس، خەتی نووسی.

یارد لەدوای لەدایك بوونی ئەخنوخ هەشتسەد ساڵ ژیا و کوڕ و کچەکانی هێنایە دنیا. تەمەنی ئەو نۆسەد و شەست و دوو ساڵ بوو.

یەکێك لەشوێنکەوتەکانی تەورات دەڵێت: ئەخنوخ کوڕی یارد بوو. ئەو ئیدریسی پێغەمبەرە و لەتەمەنی ئادەم شەشسەد و بیست و دو ساڵ تێپەڕی کردبوو کەخواوەند پێغەمبەری پێبەخشی و سی صەحیفەی بۆ رەوانە کرد. دوای ئادەم یەکەم کەس بوو خەتی نووسی و جل وبەرگی بڕی و دووری و یەکەم کەس

بوو ئەسیری لەمناڵەکانی قابیل گرت و ئەوانی کردە بەندە. ئەو بوو بەجێگری هەموو ئەو کارانەی باوکی لەلایەن باوباپیرانی لەئەستۆی گرتبوو. کارەکانی ئەو لەسەردەمی ژیانی ئادەم روویاندا. دەڵێن ئەخنوخ تەمەنی سێسەد و هەشت ساڵ بوو کەئادەم کۆچی دوایی کرد.

دەڵێت: خنوخ لەنەتەوەکەی خۆی پاڕایەوە و ئامۆژگاری کردن و داوای پەرەستین و گوێرایەڵی وتەکانی خواوەندو بۆ دژایەتی کردنی شەیتان هانیدان و ڕتی تێکەڵ بەمناڵەکانی قابیل نەبن بەڵام رازی نەبوون و دەستە دەستە لەمناڵەکانی شیس تێکەڵ بەمناڵەکانی قابیل بوون.

دەڵێت: لەتەوراتدا باسی کراوە: خواوەند لەتەمەنی سێسەد و شەست و پێنج ساڵی. ئیدریسی بۆ ئاسمان برد. لەم کاتەدا تەمەنی باوکی پێنسەد و بیست و حەوت ساڵ بوو. باوکی دوای ڕۆشتنی ئیدریس بۆ ئاسمان چوارسەد و سی و پێنج ساڵی دیکە ژیا و هەموو ساڵەکانی تەمەنی یارد نۆسەد و شەست و دوو ساڵ بوو. دوسەد و شەست و دوو ساڵ تەمەنی بوو کەئەخنوخی هێنایە دنیا.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە کە لەڕۆژگاری یارد بت دروست کرا و کەسانێکیان لەباوەڕداران کوشت.

ئەبوزەری غەفاری دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) بەمنی فەرموو: ئەی ئەبوزەر چوار کەس لە پێغەمبەرەکان سریانی بوون. ئادەم و شیس و نوح و خنوخ. خنوخ یەکەم کەس بوو بەپێنووس خەتی نووسی و خواوەند سی صەحیفەی بۆ ڕەوانە کرد.

دەستەیەك گومان دەکەن خواوەند خنوخی وەك پێغەمبەر بۆ هەموو خەڵکی سەرزەمین ڕەوانە کردبوو و هەموو زانستی پێشینیانی فێر کرد. خواوەند سی صەحیفەی بۆ ڕەوانە کرد بەهەمان شێوە کە لەقورئاندا دەفەرمێت: ((ئەمە لەصەحیفە کۆنەکاندایە. صەحیفەکانی ئیبراهیم و موسا)). مەبەست لەصەحیفە کۆنەکان صەحیفەکانی ماڵی برهبە الله کوڕی ئادەم و ئیدریسە.

دەستەیەك وتوویانە پاشایەتی بیوراسب لەڕۆژگاری ئیدریسدا بوو. شتێك لەوتەکانی ئادەمی پێگەیشت و جادووی لێ دروست کرد و سەرقاڵی کاری

جادووگەری بوو. کاتێك شتێکی لەسنوورەکەی خۆی دەویست یا حەزی لەچوارپێ یا ژنێك دەکرد، فووی دەکرد بە(نەی)یەکی زێڕین و هەرچی دەویست، لەبەردەمیدا دەردەکەوت. لەبەر ئەمە جوولەکەکان نەی دەژەنن.

بەڵام فارسەکان دەڵێن دوای مەرگی ئەوشهەنگ، تەهمورس کوڕی ویونگهان کوڕی حناندان کوڕی خەنادار کوڕی ئوشهەنگ بەپاشایەتی گەیشت. سەبارەت بەڕەچەڵەکی تەهمورس بۆچوونیان جیاوازە. دەستەیەك بەمشێوەیە ئاماژە بەڕەچەڵەکی دەدەن. دەستەیەك لەڕەچەڵەك ناسانی فارسی وتوویانە ئەو تەهمورس کوڕی ئەیوەنگهان کوڕی ئەنکەهد کوڕی ئەسکەهد کوڕی ئوشهەنگە.

هوشام کوڕی محەممەدی کەلبی بەهەمان شێوە کەشوێنکەوتەکانی هەواڵ لەو دەگێڕنەوە، دەڵێت: یەکەم شای بابل تەهمورسەو بیستوومە خواوەند هێزێکی ئەوتۆی پێبەخشی کەئیبلیس و شەیتانەکان ملکەچی بوون. ئەو خواپەرەست و بۆ ماوەی چل ساڵ پاشایەتی کرد.

بەڵام فارسەکان گومان دەکەن تەهمورس پاشایەتی هەموو هەرێمەکانی دەکرد، تاجی کردەسەر وئەو رۆژەی بوو بەپاشا وتی: ئێمە بەهاوکاری خواوەند ، یاخییە ستەمکارەکان لەخەڵکان دووردەکەینەوە.

ئەو پاشایەکی شیاو و بەمیهرەبانی لەگەڵ ژێردەستەکان هەڵس و کەوتی دەکرد. بناغەی شاپووری فارسی داڕشت و لەوێ نیشتەجێ بوو. بەویلایەتەکاندا گەڕا و لەگەڵ ئیبلیسدا شەڕی کرد. لەسەرزەمینە دوور و نزیکەکان شوێنی دەکەوت و ترسی خستە دڵی ئیبلیس و شوێنکەوتەکانی کەهەڵاتن و بڵاوەیان لێکرد. یەکەم کەس بوو لەخوری و موو پۆشش و راخەری دروست کرد و یەکەم کەس بوو لەئێستر وکەر و ئەسپ بۆ رازاندنەوەی کەژاوەی پاشایەتی کەڵکی وەرگرت، یەکەم کەس بوو سەگەکانی بۆ چاودێری کردنی مەڕومالأت و پاراستنیان لەئاژەڵە دڕندەکان و ڕاو کردن راسپارد.، بەفارسی شتی نووسی و لەیەکەم ساڵی پاشایەتی ئەو بوداسپ دەرکەوت و پێشنیاری ئایینی صائیبیەکانی پێکرد.

ئێستا دەگەڕێینەوە سەر بەسەرهاتی خنوخ کەهەمان ئیدریسە. بەوتەی کوڕی

ئیسحاق ئەخنوخ کوڕی یەرد، هەدانە وبەوتەیەك ئەدانە کچی باویل کوڕی مەحویل کوڕی خنوخ کوڕی قین کوڕی ئادەمی کردە هاوسەری خۆی و لەم کاتەدا شەست و پێنج ساڵ تەمەنی بوو. متەوەشلخ کوڕی خنوخی هێنایە دنیا و دوای لەدایك بوونی ئەو سێسەد ساڵی دیکە ژیا و چەندین کوڕ و کچی دیکەی هێنایە دنیا. هەموو ساڵەکانی تەمەنی ئەخنوخ سێسەد و شەست و پێنج ساڵ بوو.

بەڵام بەوتەی شوێنکەوتەکانی تەورات خنوخ دوای شەشسەد و هەشتا و حەوت ساڵ لەتەمەنی ئادەم چاوی بەدنیا هەڵهێنا و ئەوی لەکاری خوادا کردە جێگری خۆی و پێش ئەوەی بۆ ئاسمان بڕوات، لەگەڵ ئەو و بنەماڵەکەی خۆی وەسیەتی کرد و هەواڵیدا کەخواوەند مناڵەکانی قایین و ئەو کەسانەی تێکەڵی ئەوان دەکەن، سزا دەدات و ڕێگەی هاتوچۆ کردنی ئەوانی لێگرتن.

دەڵێن ئەخنوخ یەکەم کەس بوو لەسەر ئەسپ دانیشت چوونکە بەشێوازی باوکی لەڕێگەی خوادا شەڕی کرد و لەڕۆژگاری خۆی سەرقاڵی پەرەستینی خواوەند بەشێوەی باوکانی خۆی بوو. تەمەنی ئەخنوخ سێسەد و شەست و پێنج ساڵ و شەست وپێنج ساڵە بوو کەمتەوەشلخ هاتە دنیا. دواتر بەهەمان شێوە کەکوڕی ئیسحاق دەڵێت، متوەشلخ کوڕی ئەخنوخ، عەربا کچی عزرائیل کوڕی ئەبوشیل کوڕی ئەخنوخ کوڕی قین کوڕی ئادەمی کردە هاوسەر و لەم کاتەدا تەمەنی سەد ساڵ بوو و لەمەك کوڕی متوەشلخی هێنایە دنیا و دوای لەدایك بوونی ئەو حەوتسەد ساڵی دیکە ژیا و چەندین کوڕ و کچی هێنایە دنیا. هەموو ساڵەکانی تەمەنی متەوەشلخ نۆسەد و حەوت ساڵ بوو.

لەمەك کوڕی متوەشلخ کوڕی ئەخنوخ، قینوس کچی براکیل کوڕی مەحویل، کوڕی خنوخ کوڕی قین کوڕی ئادەمی کردە هاوسەری خۆی و لەم کاتەدا سەد و هەشتا وحەوت ساڵ تەمەنی بوو و نوحی هێنایە دنیا و دوای لەدایك بوونی نوح، لەمەك پێنسەد و نەوەد و پێنج ساڵی دیکە ژیا. هەموو ساڵەکانی تەمەنی حەوتسەد و هەشتا ساڵ درێژەی کێشا.

نوح کوڕی لەمەك، عەمرورە کچی براکیل کوڕی مەحویل کوڕی ئەخنوخ کوڕی قین کوڕی ئادەمی کردە هاوسەری خۆی و لەم کاتەدا پێنسەد ساڵ تەمەنی بوو.

نوح سام و حام و یافسی هێنایە دنیا.

شوێنکەوتەکانی تەورات وتوویانە هەشسەد و حەفتا و چوار ساڵ لەتەمەنی ئادەم تێپەڕیبوو کەمتوەشلخ لەمەکی هێنایە دنیا. ئەو لە پەرەستینی خواوەند درێژەی بەشێوازی باوکانی دا و کاتێ مەرگی متوەشلخ نزیك کەوتەوە، لەمەکی کردە جێگری خۆی و پێشنیارەکانی باوکانی بەکوڕەکەی خۆی کرد.

دەڵێن لەمەك بەردەوام ئامۆژگاری نەتەوەکەی خۆی دەکرد و ڕێگەی ڕۆشتن بۆ لای منالەکانی قابیلی لێدەگرتن، بەڵام گوێیان لێ نەگرت و هەموو ئەوکەسانەی نیشتەجێی کێوەکە بوون، بۆ لای منالەکانی قاین هاتنە خوار. دەڵێت متوەشلخ جگە لە لەمەك کوڕێکی دیکە هەبوو بەناوی صابی و صائیبیەکان ناوی خۆیان لەو وەرگرتووە. متوەشلخ نۆسەد و شەست ساڵ ژیا و سەد و هەشتا ساڵ لەتەمەنی تێپەڕیبوو کە لەمەك چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

سەد و بیست و شەش ساڵ دوای مردنی ئادەم، لەمەك نوحی هێنایە دنیا لەدایك بوونی ئەو دوای هەزار و پەنجا و شەش ساڵ لەدەرکرانی ئادەم لەبەهەشت بوو. کاتێك نوح باڵغ بوو، لەمەك پێی وت: ((دەزانی، لێرە جگە لەئێمە کەس نەماوەتەوە، مەترسە و شوێن نەتەوەی خراپەکار مەکەوە)) نوح لەخواوەند پاڕایەوە و ئامۆژگاری نەتەوەکەی خۆی کرد، بەڵام ریسوایان کرد. خواوەند وەحی بۆ نوح ڕەوانە کرد: مۆڵەتم پێداون. تۆیش خۆراگری بکەرە پیشە، ئەگەری هەیە بگەڕێنەوە و تۆبە بکەن. بەڵام کاتی دیاریکراو کۆتایی هات و ئەوان تۆبەیان نەکرد.

دەستەیەکی دیکە وتوویانە نوح هاوڕۆژگاری بیوراسبە و نەتەوەکەی بتەکانیان دەپەرەستی. نوح بۆ ماوەی نۆسەد و پەنجا ساڵ پێشنیاری خواپەرەستی پێکردن بەڵام وەچە دوای وەچە لایەنگریان لەکفر و بێباوەڕی دەکرد تا ئەوەی خواوەند سزای خۆی ڕەوانە کرد و لەناوی بردن.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە کەمتەوەشلخ، لەمەك و چەندین کوڕی دیکەی هەبوو بەڵام وەسیەتی لای ئەو کرد. لەمەك نوحی هێنایە دنیا ولەکاتی لەدایك بونی نوح، لەمەك هەشتا و دو ساڵە بوو. لەرۆژگاری ئەودا کەس ڕێگری

لەخراپەکاری نەدەگرت. خواوەند، نوحی بۆ ئامۆژگاری کردنی ئەوان ڕەوانە کرد و لەم کاتەدا تەمەنی نوح چوارسەد و هەشتا ساڵ بوو و بۆ ماوەی سەد و بیست ساڵ ئەوانی بۆ خواپەرەستی هاندا. ئەوسا خواوەند فەرمانی دروست کردنی کەشتی پێدا و لەتەمەنی شەشسەد ساڵی سوار کەشتی بوو و ئەوانەی دەبوا بخنکێن، خنکان. نوح دوای کەشتی سێسەد و پەنجا ساڵی دیکە ژیا.

زانا فارسەکان وتوویانە دوای تەهمورس جەم شید بەپاشایەتی گەیشت و مانای شید لای ئەوان تیشکە ((ڕوناکی، تیرۆژ)) و لەبەر جوانییەکەی بەم ناوە بانگیان کردووە.

جەم کوڕی یونکهاون و برای تەهمورسە. دەڵێن ئەو پاشایەتی حەوت هەرێمەکە و فەرمانڕەوایی هەموو جنۆکە و مرۆڤەکانی دەکرد، تاجی خستە سەر و کاتێك لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت، وتی: خواوەند مەزنی و گەورەیی پێبەخشین و فەرمانی پێدایین لەبەرژەوەندی ژێردەستەکان تێبکۆشین.

ئەو پیشەسازی و شمشێر و سیلاحی داهێنا و پیشەسازی هەوریشم و ڕستنییەکانی دیکەی فێری خەڵکان کرد و فەرمانیدا تا جل و بەرگ بدوورن و ڕەنگی بکەن و زین و کۆپان دروست و بەهاوکاری ئەوان چوارپێکان دەستەمۆ و ڕام بکەن.

دەستەیەکی دیکە وتوویانە ئەو دوای شەشسەد و شانزە ساڵ و شەش مانگ لەپاشایەتی، لەبەرچاو ون بوو و بۆ ماوەی یەك ساڵ دیار نەما.

لەساڵی یەکەم تا پەنجایەمی پاشایەتی دەیووت تا شمشێر و زرێ و خودە و چەکی دیکە ئامادە وکەرەستەی ئاسنگران لەئاسن دروست بکەن.

لەساڵ پەنجا تا ساڵی سەدی پاشایەتی وتی هەوریشم و کەتان و پەموو و ڕستنییەکانی دیکە برێسن و ڕەنگی بکەن و بیبڕن و بیپۆشن.

لەساڵی سەد تا سەد و پەنجای پاشایەتی خەڵکی بۆ چوار چین دابەش کرد: چینی شەڕکەران، چینی فەقیهەکان و چینی دەبیران و پیشەگەران و وەرزێران و چینێکی دیکەی بۆ خزمەتی خۆی دیاری کرد و وتی هەرکام لەچینەکان سەرقاڵی کاروباری خۆیان بن.

لەساڵی سەد و پەنجا تا ساڵی دووسەدی پاشایەتی خۆی، شەڕی لەگەڵ شەیتان و جنۆکەکان کرد و دەستەیەکی زۆری لەوان کوشت و ریسوایی کردن بەشێوەیەك هەموویان بەفەرمانەکانی رازی بوون.

لەساڵی دوسەد و پەنجا تا ساڵی سێسەد لەپاشایەتی خۆی، شەیتانەکانی بۆ بەردتاشین و مەرمەڕ تاشین و گەچکاری ناچار کرد و فەرمانیدا بەگەچ و بەرد و گڵ، بینا و گەرماو دروست بکەن، ئاهەکیان دروست کرد و لەدەریا و کێو و کانەکان و بیابان هەموو شتە سوودمەندەکان و زێر و زیو و ئەو کانانەی بۆ توانەوە شیاو بوون لەگەڵ جەواهیر و بۆنی خۆش و مادە بۆنخۆشکەرەکانیان هێنا. فەرمانی بۆ ئەنجامدانی ئەم کارانە دەرکردبوو.

دواتر فەرمانیدا چەرخێکی لەئاوێنە بۆ دروست بکەن و شەیتانەکانی لەناویدا جێ کردەوە و سواری بوو و لەئاسمان لەشارەکەی خۆی لەدۆنباوەند تا بابلی بەیەك ڕۆژ بڕی و ئەو ڕۆژە هورموز ڕۆژی مانگی فەروەردین (خاکە لێوە) بوو. خەڵك لەم شتەی سەیرەی بینیان، نەورۆزیان گرت و فەرمانیدا ئەم ڕۆژە و پێنج ڕۆژ دوای ئەوە بکەن بەجەژن و شادمانی بکەن و لەڕۆژی شەشەم کە مۆرداد ڕۆژ(مانگی گەلاوێژ) بوو لەگەڵ نوسراوێك خەڵکانی ئاگادار کردەوە لەبەر ئەوەی خواوەند شێوازی پاشایەتی کردنی ئەوی پەسەند کردووە، بەوە پاداشتی دەداتەوە کەخەڵکەکەی لەگەڕما و سەرما و نەخۆشی و پیری و رژدی بەدوور دەبن. خەڵك دوای سێسەد و شانزە ساڵ لەپاشایەتی ئەو، سێسەد ساڵی دیکەیان بەسەر برد و لەزیانەکان بەدوور بوون.

دواتر جەم ناسوپاسی نیعمەتەکانی خواوەندی کرد و جنۆکە و خەڵکانی کۆکردەوە و ئاگاداری کردنەوە کە سالار و خاوەنی ئەوانە و بەهێزی خۆی نەخۆشی و پیری لەناو بردووە و حاشای لەچاکەکان و نیعمەتەکانی خواوەند کرد و لەگومڕایی خۆیدا ڕۆچوو. لەئامادە بوان کەس بوێری وەڵامدانەوەی ئەوی نەبوو، پێگەی و مەزنی ئەو لای خەڵکان لاواز و ئەو فریشتانەی خواوەند بۆ چارەسەر کردنی کاروبارەکانی ئەو رایسپاردبوون، خۆیان لەو بەدوور گرت و بیوراسب کەناوی بەزوحاك دەرکرد، لەمە ئاگادار بوویەوە و هێرشی کردە سەر

جەم تا تێکی بشکێنێت. جەم هەڵات و بیوراسب بەسەریدا زاڵ بوو و دڵ و ناوسکی ئەوی دەرهێنا و بەمشار کردی بەدو کەرت.

دەستەیەك لەزاناکانی فارس وتوویانە جەم تا سەد ساڵ پێش کۆتایی هاتنی پاشایەتییەکەی شێوازێکی پەسەند کراوی گرتەبەر. دواتر مێشکی پەرێشان و بانگەشەی خوایەتی کرد و کاروبارەکانی لەدەستدا نەما. براکەی ئەسەفتوز دژی ئەو شۆڕش و مەبەستی کوشتنی ئەوی کرد بەڵام جەم هەڵات. جەم وەك جاران پاشا بوو و لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە دەڕۆشت. ئەوسا بیوراسپ دژی ئەو راپەڕی و پاشایەتی لێ سەندەوە و بەمشار ئەوی کرد بەدو کەرتەوە.

دەستەیەك گومان دەکەن کەپاشایەتی جەم حەوتسەد و شانزە ساڵ و چوارمانگ وبیست رۆژ درێژەی کێشا.

لەوەهب کوڕی مونبە داستانێك سەبارەت بەیەکێك لەپاشا کۆنەکان هاوشێوەی داستانەکەی جەم دەگێڕنەوە کەئەگەر مێژووەکەی لەگەڵ مێژووی پاشایەتی جەم جیاوازی نەدەبوو، دەموت، داستانی پاشایەتی جەم پاشایە.

داستانەکەی وەهب بەمشێوەیە کەپیاوێکی گەنج بەپاشایەتی گەیشت و وتی: ((من پاشایەتی بەکارێکی چێژبەخش و خۆش دەبینم و نازانم هەموو خەڵکان بەو شێوەن یا من بەم شێوەم))

پێیان وت: پاشایەتی بەمشێوەیە.

وتی: هۆکاری بەردەوام بوونی پاشایەتی چییە؟

وتیان: بەوەی خواپەرەست بیت و خراپەکاری نەکەیتە پیشە.

ئەو دەستەیەك لەچاکەکارانی سنوری فەرمانڕەوایەتی خۆی بانگ کرد و پێی وتن: بەردەوام لای من بن و ئەوەی بەچاکەکار و خواپەرەستی دەزانن، بەمنی بڵێن تا ئەنجامی بدەم و ئەوەی دەزانن دەبێتە هۆی تورە بونی خواوەند، رێگەی ئەنجامدانی لەمن بگرن تا ئەو کارە نەکەم.

بەمشێوەیە پاشایەتی ئەو چوار سەد ساڵ درێژەی کێشا و خواپەرەستی کردە پیشە. ئیبلیس لەمە ئاگادار بوویەوە و وتی: پیاوێکم پشتگوێ خستووە لەپێگەی پاشایەتی چوارسەد ساڵ خواپەرەستی دەکات. هاوشێوەی پیاوێك

ڕۆشتە لای پاشا، پاشا لێی ترسا و وتی: کێیت؟

ئیبلیس وتی: مەترسە، تۆ بڵێ کێیت؟

وتی: یەکێك لەکوڕەکانی ئادەمم.

ئیبلیس وتی: ئەگەر لەمناڵەکانی ئادەم دەبویت، وەك ئەوان دەمردیت. مەگەر نەتبینوە چەندە لەخەڵکەکەی تۆ مردون و چەند وەچە لەناو چوون. ئەگەر لەوان دەبویت، تۆیش وەك ئەوان دەمردیت بەڵام تۆ خوایت و پێویستە خەڵك بۆ پەرەستینی خۆت هان بدەیت. ئەم وتەیە کاریگەری لەسەر دڵی پاشا دانا، ڕۆشتە سەر مینبەر و وتارێکی خوێندەوە و وتی: ئەی خەڵکینە، من شتێکم لەئێوە شاردبوویەوە و ئێستا دەمەوێت بۆتانی ئاشکرا بکەم. دەزانن من لەچوارسەد ساڵ پێش تا ئێستا پاشای ئێوەم و ئەگەر لەمناڵەکانی ئادەم دەبووم، تا ئێستا مردبووم بەهەمان شێوە کەئەوان مردوون، بەڵام من خوام، من بپەرستن. کاروبارەکانی پەرێشان و خواوەند وەحی بەیەکێك لەکەسە نزیکەکانی کرد ئەگەر لەگەڵ من راست بێت، لەگەڵ ئەو راستی دەگرمەبەر و ئەگەر لەپەرەستینی من یاخیگەری بکات، سوێند بەگەورەیی خۆم بەخت نەصر بەسەر ئەودا سەرکەوتوو دەکەم تا بیکوژێت و دەست بەسەر هەموو خەزێنەکانیدا بگرێت.

لەو رۆژگارەدا خواوەند لەهەر کەسێك تووڕە دەبوو، بەخت نەصری بەسەردا زاڵ دەکرد. بەڵام پاشا لەوتەکەی خۆی پەشیمان نەبوویەوە تا ئەوەی خواوەند بەخت نەصری بەسەردا زاڵ کرد کەکوشتی و حەفتا کەشتی زێری لەخەزێنەکانی ئەو بار کرد.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: لەنێوان بەخت نەصر و جەم رۆژگارێکی درێژە، مەگەر ئەوەی لەو رۆژگارەدا زوحاکیان بەبەخت نەصر ناو بردبێت.

لەهوشامی کەلبی دەگێڕنەوە کە جەم لەدوای تەهمورس پاشایەتی گرتە دەست، جوانترین و بەهێزترین کەسی رۆژگاری خۆی بوو. وتوویانە شەشسەد و نۆزدە ساڵ گوێرایەڵی وتەکانی خواوەند وپاشایەتیەکەی بەهێز بوو. دواتر سەرکێشی کرد و ستەمی کردە پیشە و خواوەند زوحاکی بەسەردا زاڵ کرد کەبەسوپایەکی دوسەد هەزار کەسی روبەروی بوویەوە و جەم بۆ ماوەی سەد ساڵ

لەدەستی ئەو رایدەکرد. دواتر زوحاك گرتی و ئەوی بەمشار دوکەرت کرد.

دەڵێت: هەموو ساڵەکانی پاشایەتی جەم تا ئەو کاتەی کوژرا، حەوتسەد و نۆزدە ساڵە.

دەستەیەك لەزانا کۆنەکان وتوویانە لەنێوان ئادەم و نوح دە وەچەیە کەهەموویان رێگەی راستی و خواپەرەستیان گرتەبەر و حاشا کردن لەخوایەتی خوا لەناو ئەو خەڵکانەی نوح وەك پێغەمبەری ئەوان هەڵبژێردرا، دەرکەوت. دەڵێن یەکەم کەس کەخواوەند بەمەبەستی ترساندن و بانگەشە کردن بۆ تاقانەیی خواوەند رەوانەی کرد، نوحی پێغەمبەرە.

ئاماژەدان بە بێژەری ئەم وتەیە

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە کە لەنێوان نوح و ئادەم دە وەچەیە کەهەموویان خواپەرەست و رێگەی راستیان گرتبوە بەر، بەڵام دواتر جیاوازی لەناویاندا دەرکەوت و خواوەند پێغەمبەرە مژدەدەر و ترسێنەرەکانی خۆی ڕەوانە کرد و ئایەی قورئان لەمبارەوە بەمشێوەیە: ((خەڵکان یەك ئۆمەت بوون و جیاواز بوون.))

## وتار سەبارەت بەرووداوەکانی رۆژگاری نوح

وتمان سەبارەت بەدینی ئەو نەتەوەی نوح بوبە پێغەمبەری ئەوان. جیاوازی هەیە. دەستەیەك وتوویانە ئەو کارانەیان ئەنجامدەدا کەرەزامەندی خوای لەسەر نەبوو وەك زینا و مەیخواردنەوە، لەپەرەستینی خواوەند دوور و سەرقاڵی گۆرانی وتن و ئامێر ژەنین بوون.

دەستەیەکی دیکە وتوویانە شوێنکەوتەی بیوراسپ بوون. بیوراسپ یەکەم کەسە وتاری صائیبیەکانی هێنایە سەرزمان وئەو نەتەوەی نوح بوبەپێغەمبەری

ئەوان، شوێنی کەوتن. بەخواستی خوا دواتر ئامارژە بەداستانی بیوراسپ دەدەین.

لەقورئاندا هاتووە: ئەوان بتپەرەست بوون و خواوەند لەکاتی باس کردنی بەسەرهاتی نوح دەفەرمێت: ((قال نوح رب انهم و اتبعوا من لم یزده ماله و ولده الاخسارا. ومکروا مکرا کبارا. و قالو الاتذرن آلهتکم و لاتذرن و داولا سواعا و لایغوث و یعوق و نسرا. و قد اضلوا کثیرا.

واتاکەی: نوح وتی: پەروەردگارا ئەوان دژی من گوناحیان کرد وشوێن کەسێك کەوتن کەماڵ ومناڵەکانی تەنیا بەزیان فراوان کردووە و فێڵیان کرد، فێڵێکی گەورە و وتیان، خواکانی خۆتان پشتگوێ مەخەن و دو سواع و یەغوس و یەعوق و نەسر پشتگوێ مەخەن.))

خواوەند نوحی وەك پێغەمبەر بۆ ئەوان ڕەوانە کرد و لەسزاکانی خواوەند، ئەوانی ترساند. لەتورەیی خۆی ئەوانی ئاگادار کردەوە و فەرمووی: تۆبە بکەن وبۆ ڕێگەی راست بگەڕێنەوە و فەرمانەکانی خوا بەکار ببەن کە بەپێغەمبەرەکانی ((لە صەحیفەکانی ئادەم و شیس و خنوخدا)) خۆی ڕەوانەی کردووە.

لەباوکی شەداد دەگێڕنەوە: کاتێك خواوەند نوحی بۆ لای نەتەوەکەی خۆی ڕەوانە کرد، تەمەنی سێسەد و پەنجا ساڵ و بۆ ماوەی نۆسەد و پەنجا ساڵ لەناو ئەوان مایەوە و دوای ئەوە سێسەد و پەنجا ساڵی دیکە ژیا.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: کاتێك خواوەند نوحی وەك پێغەمبەر(د.خ) ڕەوانە کرد، چوارسەد و هەشتا ساڵ تەمەن و سەد و بیست ساڵ پێشنیاری خواپەرەستی بەخەڵکەکەی کرد و لەتەمەنی شەشسەد ساڵ سوار کەسی و دوای ئەوە سێسەد و پەنجا ساڵی دیکە ژیا.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: بەهەمان شێوە کەخواوەند دەفەرمێت، نۆسەد و پەنجا ساڵ لەناو ئەواندا بوو و بەنهێنی و ئاشکرا پێشنیاری خواپەرەستی پێدەکردن، وەچە دوای وەچە دەهاتن و بەپێشنیارەکانی رازی نەدەبون تا ئەوەی سێ وەچە تێپەڕی و نوح و خەڵکەکەی بەشێوەی خۆیان مابوونەوە. کاتێك خواوەند مەبەستی لەناو بردنی ئەوانی کرد، نوح ئەوانی نفرین کرد و وتی: ((خواوەندا ئەوان نافەرمانی منیان کرد و شوێن کەسێك کەوتن کەماڵ و مناڵەکانی لەڕێگەی

زیان و فێڵەوە فراوان بووە)).

خواوەند فەرمانی پێدا دارێك بڕوێنێت، ڕەوانی و گەورە بوو. سێبەری خست و چل ساڵ دوای ناشتنی دارەکە فەرمانی بڕینەوەی دارەکە و دروست کردنی کەشتی پێدا بەهەمان شێوە کەدەفەرمێت: ((کەشتییەکە بەپێی بۆچون و وەحی ئێمە دروست بکە)) نوح دارەکەی بڕی و سەرقاڵی دروست کردنی کەشتییەکە بوو.

لەعایشە هاوسەری پێغەمبەر(د.خ) دەگێڕنەوە: پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەگەر خوا لەنەتەوەی نوح بەزەیی بەکەسێکدا دەهاتەوە، بەزەیی بەدایکی مناڵدا دەهاتەوە. فەرمووی نوح بۆ ماوەی نۆسەد و پەنجا ساڵ لەناو نەتەوەکەیدا ژیا و پێشنیاری پەرەستینی خواوەندی پێکردن و لەکۆتایی ڕۆژگاری خۆی دارێکی ناشت کەگەورە بوو و سێبەری خست و دواتر بڕی و دروست کردنی کەشتی دەستپێکرد. خەڵکان لای ئەو تێدەپەڕین و پرسیاریان لێدەکرد. نوح دەیوت (کەشتی دروست دەکەم) بەدەم گاڵتەوە پێیان دەوت(( لەوشکاییدا کەشتی دروست دەکەیت، چۆن دەڕوات؟) نوح دەیوت: ((دواتر دەزانن)).

کاتێك لەدروست کردنی کەشتییەکە تەواو بوو و تەنوورەکە هەڵقوڵی و ئاو لەکۆڵانەکاندا زیادی کرد، دایکی مناڵ کەنوح ئەوی زۆر خۆش دەویست، ترسا، ڕۆشتە سەر کێوەکە، یەك لەسەر سێی ڕێگەکەی بڕی و کاتێك ئاوەکەی پێگەیشت، ڕۆشت تا گەیشتە سەر لوتکەی کێوەکە، کاتێك ئاو تا گەردنی داپۆشی، مناڵەکەی بەرز کردەوە تا ئاوەکە نەیبات. ئەگەر خوا بەزەیی بەکەسێکدا دەهاتەوە، بەزەیی بەدایکی مناڵدا دەهاتەوە!).

لەسەلمانی فارسی دەگێڕنەوە: نوح لەتەمەنی چوارسەد ساڵی کەشتی دروست کرد. بۆ ماوەی سی ساڵ دارەکە گەشەی دەکرد و درێژی کەشتییەکەی نوح شەشسەد زەراعە. نوح کەشتییەکەی بەپێی ڕێنومایییەکانی خواوەند دروست کرد.

لەقتادە دەگێڕنەوە: درێژی کەشتییەکەی نوح سێسەد زەراع وپانییەکەی پەنجا زەراع و بەرزییەکەی سی زەراع بوو.

لەحەسەن دەگێڕنەوە: درێژی کەشتییەکەی نوح هەزار ودوسەد زەراع و پانییەکەی شەشسەد زەراع بوو.

هەروەها لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: حەوارییەکان بەعیسایان وت: کەسێك بێنە تا کەشتیەکەی بینیبێت و لەوبارەوە قسەمان بۆ بکات. عیسا ئەوانی برد تا گەشتنە سەر تەپۆڵکەیەکی بچوك و مشتێك خۆڵی هەڵگرت و وتی: دەزانن ئەمە چییە؟

وتیان: خوا و پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن.

وتی: ئەمە گۆڕی سام کوڕی نوحە.

دەڵێت بەگۆچانەکەی خۆی لەتەپۆڵکەکەی دەدا و وتی: بەفەرمانی خواوەند هەستە!. سام لەگۆڕەکەی هاتەدەر و تەپ و تۆزی لەخۆی دەتەکاند. ئەو پیر ببوو.

عیسا پێی وت: بەمشێوە بویت کاتێك مردیت؟

وتی: نا، گەنج بووم کەمردم بەلاّم گومانم کرد ڕۆژی پەسلاّن هاتووە و پیر بووم.

عیسا وتی: سەبارەت بەکەشتیەکەی نوح قسەمان بۆ بکە.

وتی: درێژییەکەی هەزار و دوسەد زەراع و پانایییەکەی شەشسەد زەراع و سێ قات بوو. لەقاتێکی چوارپێ و ئاژەڵە دڕندەکان دانرابوون و لەقاتێکی مرۆڤەکان و لەقاتەکەیتر باڵندەکان. کاتێك پیسایی ئاژەڵەکان زیادی کرد، خواوەند وەحی بەنوح کرد تا گوێچکەی فیل بخورێنێت. گوێچکەی فیلی خوراند و بەرازێکی نێ و بەرازێکی مێی لێ کەوتەخوار و رویان لەپیسایییەکان کرد بەمەبەستی خواردنی و کاتێك مشك کەشتیەکەیان کون کرد، خواوەند وەحی بەنوح کرد تا لەناوچاوی شێر بدات و لەلوتیەوە پشیلەیەکی نێر و پشیلەیەکی مێ هاتنەدەر و دەستیان بەخواردنی مشکەکان کرد.

عیسا پێی وت: نوح چۆن زانی کەئاو گەڕاوەتەوە بۆ شوێنی خۆی.

وتی: قەلەڕەشی نارد تا هەواڵی بۆ بێنێت. قەلەڕەش مردارێکی بینی و لەسەری دانیشت. نوح نفرینی کرد تا هەمیشە ترساو بێت و بەم شێوە عادەت بەماڵ نەگرێت. دوای ئەو کۆتری ڕەوانە کرد کەگەڕایەوە و گەڵای زەیتون

بەدەندوکی و چنگەکانی قوڕاوی بون. زانی ئاوەکە بۆ شوێنی خۆی گەڕاوەتەوە. نوح ئەو خەتەی گەردنی کۆتری کردە تەوقی ئەو و لەخوا پاڕایەوە تا هاودەمی مرۆڤەکان بێت و عادەت بەماڵەکان بگرێت.

حەوارییەکان وتیان: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، با بیبەین بۆ لای کەسەکانی خۆمان تا لەگەڵ ئێمە دانیشێت و قسە بکات. وتی: چۆن کەسێك کەرۆژی نییە، لەگەڵ ئێوەدا بێت؟ و پێی وت: بۆ شوێنی خۆت بگەڕێرەوە. سام بۆ ناو خاك گەڕایەوە.

هەروەها لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: نوح کەشتییەکەی لەسەر کێوی بوز دروست کرد و تۆفان لەوێوە دەستی پێکرد. درێژەی کەشتیەکەی شەشسەد زەراع، بەزەراعی باوەگەرێیی باوکی نوح و پانایییەکەی پەنجا زەراع و بەرزییەکەی سی زەراع و شەش زەراعی لەدەرەوەی ئاوەکە بوو. چەند قات و سێ دەرگای هەبوو کەهەندێکیان لەژێر ئەوانی دیکەوە بوو.

لەعومەیری لەیسی دەگێڕنەوە: نەتەوەی نوح لەگەڵ ئەودا توڕە بوون و قوڕگیان دەگوشی تا لەهۆش خۆی دەچوو، کاتێك دەهاتە خۆ، دەیوت: ئەی خوایە، لەخەڵکەکەی من خۆش بە، چوونکە نەزانن.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: نەتەوەی نوح لەناو گوناح وخراپەکاریدا نوقم و گوناحەکان لەسەر زەمین فراوان و مانەوەی نوح لەگەڵ ئەوان درێژەی کێشا و نوح زیانی گەورە و قورسی لەوانەوە پێبڕا. وەچە دوای وەچە چاوەڕوانی چاکە و خواپەرەستی دەکرد بەڵام وەچەی تازە لەوەچەی کۆن خراپتر و دەیانوت: ئەمە لەگەڵ باوك و باوەپیرانی ئێمەدا بووە و شێتە بۆیە بەپێشنیارەکانی رازی نەبوون. نوح لای خواوەند سکاڵای کرد بەهەمان شێوە کەخواوەند لەقورئاندا دەفەرمێت:

((رب انی دعوت قومی لیلا و نهارا. فلم یزدهم دعائی الا فرارا.

واتاکەی: پەروەردگارا، من شەو وڕۆژ پێشنیاری خواپەرەستی بەخەڵکەکەم دەکەم و پێشنیارەکانی من تەنیا دەبێتە هۆی دووری و هەڵاتنی ئەوان.)) تا کۆتایی داستانەکە... تا ئەوەی نوح وتی:

((لا تذر علی الارض من الکافرین دیارا. انك ان تذرهم یضلوا عبادك ولا یلدوا الافاجرا کفارا.

واتاکەی: پەروەردگارا لەم کافرانە کەس لەسەرزەوی مەهێڵەرەوە، ئەگەر ڕێگەیان پێبدەیت، بەندەکانی تۆ گومڕا دەکەن و جگە لەخراپەکاری و کوفران هیچ بەرهەمێکی دیکەیان نابێت.

تا کۆتایی داستانەکە.

کاتێك نوح سکالآی بۆ خوا بەرز کردەوە و داوای هاوکاری کرد، وەحی لەلایەن خواوەندەوە هات:

((ان اصنع الفلك باعيننا و وحينا و لاتخاطبني في الذين ظلموا انهم مفرقون.

واتاکەی: کەشتییەکەی بەپێی وەحی و چاودێری ئێمە دروست بکە و لەگەڵ من سەبارەت بەو کەسانەی ستەمیان کردووە، گفتوگۆ مەکە چوونکە ئەوان دەخنکێن.))

نوح سەرقاڵی دروست کردنی کەشتیەکەی بوو و لەنەتەوەی خۆی پەشیمان بوویەوە، داری دەبڕی و ئاسنی دەکوتی و تەور و کەرەستە پێویستییەکانی کەشتیەکەی ئامادە دەکرد. خەڵك لای ئەو تێدەپەرین و نوح سەرقاڵی کاری خۆی بوو. گاڵتەیان پێدەکرد، نوح لەوەلآمدا دەیوت:

((ان تسخروا منافانا نسخر منكم كما تسخرون. فسوف تعلمون من يأتيه عذاب يخزيه و يحل عليه عذاب مقيم.

واتاکەی: ئەگەر گاڵتە بەئێمە دەکەن، ئێمەیش، گاڵتە بەئێوە دەکەین بەهەمان شێوە کەئێستا گاڵتەمان پێدەکەن. بەم زوانە تێدەگەن کێیە، ئازابی خوایی دەیگرێتەوە کەریسوایی دەکات و سزاکانی خوا بەردەوام بەسەر ئەودا دەبارێت.))

دەڵێت، ئەوان بەوشێوەی کەبیستوومە، وتیان: ئەی نوح دوای پێغەمبەری بوویتە دارتاش؟

خواوەند ژنانی ئەوانی نەزۆك کرد تا مناڵیان نەبێت.

دەڵێت: بەگومانی شوێنکەوتەکانی تەورات، خواوەند فەرمانی بەنوحدا کەشتیەکەی لەداری ساج دروست بکات و درگای بۆ دانەنێت و لەناوەوە و دەرەوە بەقیر دایپۆشێت بەهەشتا زەراع درێژی و پەنجا زەراع پانی و سی زەراع بەرزی. سێ قاتی ژێر و ناوەراست و سەروی تیا دروست بکات و دەلاقەیەکی بۆ دابنێت،

نوح ئەو کارەی کرد کەخواوەند فەرمانی پێدابوو، کاتێك تەواو بوو و خواوەند فەرموو بووی:

اذا جاء امرنا و فار التنور فاحمل فيها من كل زوجين اثنين و اهلك الامن سبق عليه القول و من آمن و ما آمن معه القليل.

واتاکەی: کاتێك فەرمانی ئێمە هات و تەنوورەکە هەڵقوڵی، لەهەر جووتێك دوان بێنە، لەگەڵ بنەماڵەکەی خۆت مەگەر کەسێك کەفەرمانی خواوەند دەیگرێتەوە، لەگەڵ هەر کەسێك کەباوەڕی هێناوە، تەنیا دەستەیەکی کەم باوەڕیان بەنوح هێنا بوو.))

تەنوورەکەی لەنێوان خۆی و ئەو کردە نیشانە وفەرموو بووی کاتێك فەرمانی ئێمە بگات و تەنوورەکە هەڵقوڵێت، لەهەر جووتێك دوان بەرە ناو کەشتییەکە و سوار ببە. کاتێك تەنورەکە هەڵقولاً، نوح ئەو کەسانەی سوار کەشتییەکەی کرد کەخواوەند فەرمانی پێدا.ژمارەیان کەم بوو. لەهەر جووتێك دوانی هەڵگرت و سێ کوڕەکەی خۆی سام و حام و یافس و هاوسەرەکانیان و شەش کەس لەموسوڵمانانی بردە ناو کەشتییەکە و لەگەڵ نوح و منداڵەکانیان و ژنەکانیان، ژمارەیان گەیشتە دەکەس. هەروەها ئەو چوارپێیانەی سوار کەشتییەکە کرد کەخواوەند فەرمانی پێدابوو. کوڕەکەی یام کەباوەڕی نەهێنابوو، سەرنەکەوت.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: یەکەم زیندەوەر کەڕۆشتە ناو کەشتیەکە، مێروولە بوو و دواییینان کەر. کاتێك کەریان هێناو سکی گەشتە ناو کەشتیەکە، ئیبلیس کلکی گرت، قاچەکانی نەڕۆشتە ناو کەشتیەکە و نوح دەیوت: هاوار لەتۆ، وەرە ناو. کەر نەیتوانی و نوح وتی: ((هاوار لەتۆ، تەنانەت ئەگەر شەیتانت لەگەڵدا بێت.)) کاتێك ئەم قسەی هێنایە سەرزمان، شەیتان کلکی کەری بەردا، کەر سوار کەشتیەکە بوو و شەیتانیش هاوڕێ لەگەڵ ئەو سەرکەوت. نوح پێی وت: ئەی دوژمنی خوا، بۆ سەرکەوتیت؟

شەیتان وتی: مەگەر نەتوت، سەرکەوە تەنانەت ئەگەر شەیتانیشت لەگەڵدا بێت؟

وتی: ئەی دوژمنی خوا، بڕۆ دەر.

شەیتان وتی: دەبێت من لەگەڵ خۆت ببەیت. وەك دەڵێن شەیتان لەسەر پشتی کەشتیەکە بوو.

کاتێك نوح سوار کەشتی بوو و باوەڕداران و کەرەستە پێویستەکان، بردە ناو کەشتییەکە، کانییەکان هەڵقولان و((ئەم رووداوە لەشانزەیەمین رۆژ لەیەکەم مانگی ساڵی شەشسەدی تەمەنی نوح روویدا)) و دەرگاکانی ئاسمان کرانەوە، بەهەمان شێوە کەخواوەند بەپێغەمبەری فەرموو:

((ففتحنا ابواب السماء بماء منهر. و فجرنا الارض عیونا فالتقی الماء علی امرقد قدر.

واتاکەی: درگاکانی ئاسمانمان کردەوە بەرووی ئەو ئاوەی دەمانرژاندە خوار. و سەرچاوەکانی زەویمان تەقاند و ئاوی (زەوی و ئاسمان) بۆ ئەو کارەی فەرمانی پێدرابوو، پەیوەستی یەك بوون.))

نوح لەگەڵ هاوەڵانی لەناو کەشتیەکەدا بوو و دەلاقەکەی گرت و لەو کاتەی خواوەند ئاوی ڕەوانە کرد تا ئەو کاتەی کەشتیەکە سەرئاوکەوت، چل شەو ورۆژی خایاند. دواتر ئاو بەهەمان شێوە کەشوێنکەوتەکانی تەورات گومان دەکەن، فراوان وبەرز بوویەوە، بەهەمان شێوە کەخواوەند بە پێغەمبەری فەرموو:

(و حملناە علی ذات الواح و دسر. تجری باعیننا جزاء لمن کان کافر.

واتاکەی: ئەومان بەشتێك کەتەختە و بزماری هەبوو، هەڵگرت. کەشتیەکە بەچاودێری ئێمە دەڕۆشت و تۆفان سزای کافرەکان بوو.))

کەشتی و کەسەکانی ناو کەشتی لەناو شەپۆلە کێوە ئاساکان بۆ پێشەوە دەڕۆشت. نوح کاتێك بینی بەڵێنەکەی خواکەی دێتەدی، کوڕەکەی خۆی بانگ کرد کەلەو کاتەدا لەکەنارێکدا وەستابوو، پێی وت: کوڕم لەگەڵ ئێمەدا سەرکەوە و هاوڕێیەتی کافرەکان مەکە.

بەڵام کوڕەکەی چوونکە بەدبەخت و دڵی بەکوفر سپاردبوو، وتی: دەڕۆمە سەرکێوێك تا من لەئاوکە بپارێزێت. بینیبووی کەکێوەکان لەئاوی باران پارێزراون و گومانی دەکرد تۆفانیش بەهەمان شێوە دەبێت.

نوح وتی: هیچ شتێك لەفەرمانی خوا پارێزراو نییە مەگەر ئەوکەسانەی

خواوەند ڕەحمیان پێ بکات.

شەپۆل دیواری لەنێوان ئەواندا دروست کرد و کوڕ لەئاوەکەدا خنکا. ئاو فراوان و لافاو بەرز بوویەوە. بەپێی قسەی شوێنکەوتەکانی تەورات، ئاو تاپانزە زەراع لەسەرووی کێوەکان بەرز بوویەوە و هەموو بونەوەرەکانی سەرزەوی لەگیاندار و دارەکانی لەناو برد و جگە لەنوح و کەسانی ناو کەشتی، و بەگومانی شوێنکەوتەکانی کتێب عوج کوڕی عەناق، کەس لەبوونەوەرەکان ڕزگاری نەبوو. لەو کاتەوەی خواوەند تۆفانی ڕەوانە کرد تا دامرکانەوەی ئاو، شەش مانگ و دەرۆژی خایاند.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: خواوەند چل شەو و چل ڕۆژ بارانی ڕەوانە کرد و وەحشیەکان و باڵندەکان لەدژواری باران روویان لەنوح کرد و دەستەمۆ بوون. لەبەر ئەوەی خواوەند فەرمانی پێدا بوو، لەهەر جووتێك دوانی هەڵگرت. جەستەی ئادەمی لەگەڵ خۆی بۆ ناو کەشتیەکە برد و کردی بەدیواری نێوان ژنان و پیاوان. دەرۆژ لەرەجەب تێپەڕی کردبوو کەسوار کەشتیەکە بوون و ڕۆژی عاشوورای موحەڕەم لەکەشتیەکە هاتنە دەر. ڕۆژو گرتنی خەڵکان لەڕۆژی عاشوورا لەبەر ئەمەیە. ئاو لەدولاوە هات وەك چۆن خواوەند فەرمووی دەرگاکانی ئاسمانمان کردەوە و سەرچاوەکانی سەرزەویمان تەقاند و ئاوەکان بەهەمان شێوە کەفەرمانی پێدرابوو، پەیوەستی یەك بوون. ئاو دوو نیوە بوو، نیوەی لەئاسمان و نیوە لەزەوی و تا ئاستی پانزە زەراع لەبەرزی کێوەکان بەرز بوویەوە، کەشتییەکەی نوحی برد و بۆ ماوەی شەش مانگ بەدەوری زەویدا سوڕاندییەوە. لەهیچ شوێنێك نەوەستایەوە تا گەیشتە حەرەم، لەوێ لەجووڵە نەکەوت و بۆماوەی یەك حەفتە بەدەوری حەرەمدا سووڕایەوە. ئەوماڵەی ئادەم دروستی کرد و ناوی بیت المعمور بوو، بۆ ئاسمان بەرز کرابوویەوە تا نەکەوێتە ژێر ئاو. حجر الاسود لەئەشکەوتی ئەبو قەبیس بوو. کەشتی دوای ئەوەی بەدەوری حەرەمدا سووڕایەوە، رووی لەشوێنەکانی دیکەی سەرزەوی کرد تا گەیشتە جودی کەکێوێکە لەسەرەوەی سەرزەمینی موسڵ. دوای شەش مانگ کەشتی لەجووڵە کەوت و خواوەند فەرمووی: ((نەتەوەی ستەمکاران دوور بن)) کاتێك

کەشتی لەسەر جودی نیشتەوە، خواوەند فەرمووی: ((زەوی ئاوی خۆت بگەڕێنەرەوە بۆخۆت وئاسمان ئاوی خۆت بگێڕەوە و ئاو گەڕایەوە.)) ئەو ئاوەی لەئاسمانەوە، باری، دەریاکانە کەدەیبینن و دوایین پاشماوەی تۆفان لەسەر زەوی ئاوێك بوو کەچل ساڵ دوای تۆفان لەحەسمی روویدا. ئەو تەنورەی ئاوی لێهەڵقولاً و نیشانەی نێوان خواوەند و نوح بوو، تەنووره بەردینەکەی حەوا بوو کەوەك میرات بۆ نوح مابوویەوە.

لەحەسەن دەگێڕنەوە: تەنووری بەردینی حەوا بەنوح گەیشت و پێی وترا: ((کاتێك ئاو لەتەنورەکە هەڵقوڵی، لەگەڵ هاورێکانت سوار کەشتی ببە.

سەبارەت بەو تەنورەی خواوەند هەڵقولاّنی ئاوەکەی لەنێوان خۆی و نوح کردە نیشانە، بیروبۆچوونەکان جیاوازن. دەستەیەك وتوویانە لەهیند بوو.

ئاماژەدان بە بێژەری ئەم وتەیە

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: سەبارەت بەم ئایە و هەڵقولاّنی ئاو لەتەنوورەکە، وتی: تەنورەکە لەهیندستان بوو.

و دەستەیەکی دیکە دەڵێن: تەنوورەکە لەکوفە بوو.

ئاماژەدان بە بێژەری ئەم وتەیە

لەموجاهید دەگێڕنەوە: ئاو لەتەنوورەکە هەڵقوڵی و هاوسەری نوح پێی زانی و نوحی لێ ئاگادار کردەوە. ئەمە لەناوچەی کوفەدا بوو.

سەبارەت بەژمارەی ئەو کەسانەی لەناو کەشتییەکەدا بوون، جیاوازی هەیە. دەستەیەك وتوویانە هەشتا کەس بوون.

ئاماژەدان بە بێژەری ئەم وتەیە

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: هەشتا پیاو لەناو کەشتییەکەی نوحدا بوون کەیەکیان جورهەم بوو.

هەروەها لەو دەگێڕنەوە: نوح هەشتا مرۆڤی لەگەڵ خۆی بردە ناو کەشتییەکە.

لەسوفیان دەگێڕنەوە: کەسانی ناو کەشتییەکە هەشتا کەس بوون. ئەمان ئەو (ژمارە کەمە بوون) کەخواوەند فەرمووی: جگە لەژمارەیەکی کەم کەس باوەڕی بەو نەهێنا.

هەروەها لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: نوح منداڵەکانی خۆی، سام و حام و یافس و هاوسەرەکانیان هاوریَ لەگەڵ حەفتا و سێ کەس لەمنداڵەکانی شیسی بردە ناو کەشتییەکە کەباوەڕیان هێنابوو. ژمارەی ئەو کەسانەی سوار کەشتییەکە بوون، هەشتا کەس بوو.

دەستەیەکی دیکە وتوویانە: ژمارەی ئەو کەسانەی سوار کەشتیەکە بوون، هەشت کەس بوو.

### ئاماژەدان بە بێژەری ئەم وتەیە

لەقتادە دەگێڕنەوە: لەکەشتییەکە تەنا نوح و هاوسەرەکەی و سێ کوڕەکەی و هاوسەرەکانی بوون و ژمارەیان دەگەیشتە هەشت کەس.

هەروەها لەحەکەم دەگێڕنەوە: تەنیا ژمارەیەکی کەم باوەڕیان بەنوح هێنا، نوح بوو لەگەڵ سێ کوڕەکەی و چوار بووکەکەی.

لەکوڕی جەریح دەگێڕنەوە: نوح، سێ کوڕەکەی و سێ بووکەکەی سوار کەشتیەکە کرد و هەموویان هەشت کەس بوون. ناوی کوڕەکانی سام و حام و یافسە. حام لەکەشتیەکە لەگەڵ ژنەکەی خۆی خەوت و نوح نفرینی کرد تا نەوەی ئەو گۆڕانیان بەسەردابێت و لەبەر ئەمە منداڵەکانی ئەو ڕەش بوون.

کەسانی دیکە وتوویانە: ژمارەکەی کەسانی ناو کەشتییەکە دەکەس بوو.

ئامارژەدان بە بێژەری ئەم وتەیە

لەکوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە: نوح سێ کوڕەکەی و هاوسەرەکانیان و شەش کەسی دیکەی سوار کەشتییەکەی کرد. هەموویان لەگەڵ نوح و سێ کوڕەکەی جگە لەژنەکانیان ژمارەیان دەگەیشتە دەکەس.

بەهەمان شێوە کەزاناکانی شوێنکەوتەی کتێب وکەسانی دیکە وتوویانە، لەساڵی شەشسەد لەتەمەنی نوح و دوای دوهەزار و دوسەد و پەنجا و شەش ساڵ لەدەرکرانی ئادەم لەبەهەشت بوو کەخواوەند تۆفانی ڕەوانە کرد.

وتوویانە، خواوەند تۆفانی لەڕۆژی سیانزەی مانگی ئاب ڕەوانە کرد، نوح لەکەشتیەکەدا مایەوە تا ئاو بۆ شوێنی خۆی گەڕایەوە. کەشتی لەقەردی لەسەر کێوی جودی ئارامی گرت و ئەمە لەڕۆژی حەفدەی مانگی شەشی ساڵ بوو. کاتێك نوح لەکەشتیەکە هاتەدەر، لەناوچەی قەردی لەسەرزەمینی جەزیرە، شوێنێکی دەستنیشان کرد و بناغەی گوندێکی داڕشت و ناوینا هوناد. لەوێ بۆ هەر یەك لەوکەسانەی باوەڕیان پێی هێنابوو و ژمارەیان دەگەیشتە هەشتا کەس،ماڵێکی دروست کرد. تا ئێستا ئەو شوێنە بە (سوق الثمانین) ناو دەبن یانی بازاری هەشتا کەس (گوندی هەشتا کەس).

هەموو منداڵەکانی قابیل لەناو ئاوەکەدا خنکان. هەموو باوکانی نوح تا ئادەم شوێنکەوتەی ئیسلام بوون.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: نوح لەگەڵ کەسەکانی لەو گوندەدا ژیانی بەسەر برد و خواوەند وەحی پێکرد هەرگیز تۆفانێکی دیکە بۆ سەرزەوی نانێرێت.

لەپێغەمبەر دەگێڕنەوە: نوح لەیەکەم ڕۆژی ڕەجەب سوار کەشتی بوو. خۆی و هەموو کەسانی هاوڕێی بەڕۆژو بوون و کەشتی بۆ ماوەی شەش مانگ ئەوانی دەسوڕاندەوە تا گەیشتنە حەرەم. لەڕۆژی عاشورا کەشتی لەسەر جودی نیشتەوە. نوح بەڕۆژو بوو و فەرمانی بەهەموو هاوڕێکانی خۆیدا ( بەوەحشی و چوارپێکانیشەوە) تا بۆ سوپاس کردنی خواوەند بەڕۆژو بن.

لەکوڕی جەریح دەگێڕنەوە: سەرەوەی کەشتییەکە تایبەت بوو بەباڵندەکان و

لەناوەڕاست مرۆڤەکان و لەژێرەوە دڕندەکان. سەرەوەی کەشتیەکە سی زەراع بوو و لەرۆژی هەینی دەی مانگی رەجەب لەعەین وەردە کەوتە سەر ئاو و لەرۆژی عاشورا لەسەر جودی نیشتەوە. لەسەر رێگاکەی لای حەرەم تێپەڕی و حەوت جار بەدەوریدا سوڕایەوە و خواوەند ئەوانی لەنوقم بوون و خنکان پاراست. دواتر ڕۆشتە یەمەن و گەڕایەوە.

لەقتادە دەگێڕنەوە: نوح لەرۆژی دەی موحەڕەم لەکەشتی هاتەخوار و بەهاوەڵانی خۆی وت: هەرکەس لەئێوە بەرۆژوە، رۆژوەکەی خۆی بشکێنێت و هەرکەس بەرۆژو نییە، رۆژو بگرێت.

هەروەها لەقتادە دەگێڕنەوە: کەشتی لەرۆژی دەی رەجەب کەوتە سەرئاو و بۆ ماوەی سەد و پەنجا رۆژ لەسەر ئاو مایەوە. یەك مانگ لەسەر کێوی جودی بوو و لەرۆژی دەی موحەڕەم، یانی رۆژی عاشورا لەکەشتیەکە دابەزین.

لەمحەممەد کوڕی قەیس دەگێڕنەوە: لەرۆژگاری نوح یەك بست زەوی نەبوو کەخاوەنی نەبێت.

لەکوڕی شەداد دەگێڕنەوە: نوح دوای ئەوەی نۆسەد و پەنجا ساڵی لەناو خەڵکەکەی خۆی بەسەر برد، سێسەد و پەنجا ساڵی دیکە ژیا.

بەڵام لەکوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە: بەگومانی شوێنکەوتەکانی تەورات تەمەنی نوح دوای ئەوەی لە کەشتییەکەی دابەزی، سێسەد و هەشتا و چوار ساڵ بوو. دەڵێت: هەموو ساڵەکانی تەمەنی نوح تا ئەو کاتەی خواوەند ئەوی بۆ لای خۆی بردەوە، نۆسەد و پەنجا ساڵ درێژەی کێشا.

دەڵێن سام کوڕی نوح هەشتا ساڵ پێش تۆفان چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

بەڵام دەستەیەك لەشوێنکەوتەکانی تەورات دەڵێن نۆح پێش تۆفان هیچ منالێکی نەهێنایە دنیا. وتوویانە: هاوەڵانی ئەو لەناو کەشتی دەستەیەك بوون لەو کەسانەی باوەڕیان هێنابوو بەڵام هەموویان لەناوچوون و کەس لەوەچەی ئەوان نەمایەوە. هەموو منالەکانی ئادەم لەسەر زەوی لەنەوەی نوح و منالەکانی ئەون و لەمنالەکانی دیکەی ئادەم کەس لەسەر زەوی نەماوەتەوە. خواوەند لەمبارەوە فەرمووی: نەوە و نەژادی ئەومان هێشتەوە.

وتوویانە: نوح پێش تۆفان دو کوڕی بوو کەهەردوکیان مردن، یەکیان بەناوی کەنعان کەئەو کەسە بوو لەئاوەکەدا خنکا و ئەوی دیکەیان عابر بوو کەپێش تۆفان مرد.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: نوح منالێکی هێنایە دنیا بەناوی سام کەمناڵەکانی ئەو سپی و خاکی ڕەنگن و حام کەمناڵەکانی سپی و ڕەشن و یافس کە مناڵەکانی سورباو و زەرد رەنگن، کەنعان لەئاودا خنکا و عەرەبەکان بەیام ناوی دەبەن. دایکی هەموویان یەکێك بوو.

ئاگرپەرستەکان بەسەرهاتی تۆفانیان نەبیستووە و دەڵێن: لەرۆژگاری کیومەرسەوە پاشایەتی لەناو ئێمەدا بەردەوام بووە و کیومەرس هەمان ئادەمە و پاشایەتی لەکۆنەوە بەتازە گەیشت تا گەیشتە دەورانی فیروز کوڕی یەزدگێرد کوڕی شەهریار. دەڵێن: ئەگەر تۆفانێك لەئارادا دەبوو، دەبێت نەژاد و ڕەچەڵەکی نەتەوەیەك پچڕابێت و پاشایەتی لەناو چوبێت.

دەستەیەك لەوان باوەڕیان بەڕوودانی تۆفان هەیە و دەڵێن لەسنورەکانی بابل و ناوچەکانی نزیك بەو سەرزەمینە ڕوویداوە بەڵام شوێنی نیشتەجێ بوونی مناڵەکانی کیومەرس رۆژهەڵاتە و تۆفان ئەوانی نەگرتەوە.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: بەپێچەوانەی ئەوان خواوەند باسی تۆفانی کردووە و وتاری خواوەندە کەدەفەرمێت: ((و لقدنا دانا نوح فلنعم المجيبون. و نجيناة و اهلة من الكرب العظيم. و جعلنا ذريته هم الباقين.

واتاکەی: نوح سکاڵای لای ئێمە کرد و بەباشی داواکارییەکەیمان هێنایە دی. ئەو و کەسەکانیمان لەو خەمە گەورەیە رزگار کرد و نەژادی ئەومان هێشتەوە.))

و دەفەرمێت کەتەنیا نەوەکانی نوح مانەوە نەکەسانی دیکە.

جیاوازی کەسەکانمان سەبارەت بەکیومەرس ئاماژە پێدا لەگەڵ وتەی ئەو کەسانەی سەبارەت بەکیومەرس بۆچوونیان لەگەڵ فارسەکان یەك ناگرێتەوە و هەروەها ئەوانەی نەژدای ئەو بۆ نوح دەگەرێننەوە.

سەمورە کوڕی جەندەب لەپێغەمبەر دەگێڕێتەوە: مەبەست لەوتاری خواوەند کەدەفەرمێت نەوەکانی نوحمان هێشتەوە، سام و حام و یافسە.

هەروەها لەقتادە دەگێڕنەوە: خوا دەفەرمێت: ((نەوەکانی نوحمان هێشتەوە)) هەموو کەسەکان لەمناڵەکانی نوح ماونەتەوە. لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە کەوتاری خواوەند کەدەفەرمێت: نەوەکانی ئەومان هێشتەوە. و جگە لەنەژادی نوح کەس نەمایەوە.

لەزوهری و شەعبی دەگێڕنەوە: کاتێك ئادەم لەبەهەشت دابەزی و مناڵەکانی فراوان بوون، هاتنەخوارەوەی ئادەمیان کردە دەسپێکی مێژوو تا ئەو کاتەی خواوەند نوحی ڕەوانە کرد. دەستنیشان کردنی ئەو وەك پێغەمبەریان کردە دەسپێکی مێژوو و کاتێك تۆفان هات و خەڵکی زەوی لەناچون و نوح و کەسانی بنەماڵەکەی لەکەشتی دابەزین، زەوی لەنێوان مناڵەکانی خۆی دابەش کرد: ناوەڕاستی زەوی بە سام بەخشی کەبیت المقدس و نیل و دیجل و فورات و سەیحان و جەیحان و فیشونە و لەفیشون تا ڕۆژهەلآتی نیل، شوێنی هەڵکردنی بای باشوور، تا شوێنی هەڵکردنی بای باکوور.

بەشی ڕۆژئاوای نیل و پشتی نیلی تا شوێنی هەڵکردنی بای دەبووری بەحام بەخشی. ئەولای فبشون تا شوێنی هەڵکردنی بای سەبای بەیافس بەخشی. دەسپێکی مێژوو لەتۆفانەوە دەستی پێکرد تا ئاگری ئیبراهیم. ئەوسا دەسپێکی مێژوو لەئاگری ئیبراهیمەوە دەستی پێکرد تا هەڵبژاردنی یوسف وەك پێغەمبەر، دواتر لەهەڵبژاردنی یوسف تا هەڵبژاردنی موسا بۆ پێغەمبەرایەتی کرایە دەسپێکی مێژوو، دواتر لەهەڵبژاردنی موسا تاپاشایەتی سلێمان، لەپاشایەتی سلێمان تا هەڵبژاردنی عیسا کوڕی مریەم، لەهەڵبژاردنی عیسا تا هەڵبژاردنی محەممەد پێغەمبەری موسوڵمانان.

ئەم سەرچاوە مێژووییانە کەلەوتەکانی شەعبی سەرچاوە دەگرێت، بەپێی مێژووی جوولەکەکانە بەلآم موسوڵمانان کۆچی پێغەمبەریان کردە سەرەتای مێژوو و پێش ئەوە هیچ سەرەتایەکی مێژوویان نییە بەلآم وەك وتوویانە قورەیش پێش ئیسلام ساڵی فیلیان کردبووە دەسپێکی مێژووی خۆیان. هەروەها عەرەبەکان ڕۆژە ناسراوەکانی خۆیان کردۆتە سەرەتای مێژوو وەك ڕۆژی جەبەلە و کەلابی یەکەم و کەلابی دوەم کەدەسپێکی مێژووی ئەوان بوو. نەسارییەکانی

ڕۆژگاری ئەسکەندەری زولقەرنەیینیان کردۆتە سەرەتای میژووی خۆیان و گومان دەکەم تا هەنوکەیش لەسەر ئەو سەرەتایە کۆك بن.

بەلام فارسەکان سەرەتای میژووی خۆیان بۆ پاشاکانیان دەگیڕنەوە و بەوشیوەی کەدەزانم ئیستاکە دەورانی یەزدگیرد کوڕی شەهریاریان کردۆتە سەرەتا و دەسپیکی میژوو، چوونکە دوایین پاشای ئەوانە کەپاشایەتی بابل و ڕۆژهەلات دەکات.

## وتـار سەبـارەت بەبیوراسپ کەهەمان ئەزدهاقە ( ئاژی دهاك )

عەرەبەکان بەزوحاك ناوی دەبەن و ئەو پیتەی بەدەربڕین لەنیوان (س و ز)ی فارسیدایە بە (ض) دەردەبڕن و (ه) بە (ح) و (ق) بە (ك) دەردەبڕن و حەبیب کوڕی ئەوس لەم شیعرە مەبەستی ئەوە کەدەلیت:

ئەوەی ئەو هەیبو، فیرعەون و هامان و قارون نەیانبوو.

((لەدەسەلات هاوشیوەی زوحاك بوو)

((بەلام تۆ فەرەیدونیت))

هەروەها ئەوە کەحەسەن کوڕی هانی، باوکی نەواس، شانازی و بانگەشەی ئەوە دەکات لەنەتەوەی ئەو بووە و دەلیت:

((زوحاك، کەشەیتان و جنۆکە لەریگەکانی خۆیان))

((ئەویان دەپەرەستی، لەئیمە بوو)). دانیشتووانی یەمەن دەلین لەنەژادی ئەون.

لەهوشامی کەلبی دەگیڕنەوە: سەبارەت بەزوحاك دەلیت: عەجەم نەژادی خۆیان بۆ زوحاك دەگەڕیننەوە و گومان دەکەن جەم خوشکی خۆی کردە هاوسەری یەکیك لەبنەمالەی ئەشراف و ئەوی کردە پاشای یەمەن و زوحاك بۆ ئەو ژنە و پیاوە هاتە دنیا.

خەلکی یەمەنیش نەژادی خۆیان بۆ ئەو دەگەڕیننەوە و گومان دەکەن زوحاك خەلکی ناوچەکەی ئەوانە و زوحاك کوڕی عەلوان کوڕی عوبەید کوڕی عوەیج بوو

و سەنان، براکەی خۆی کردە پاشای میسر کەسەرەتای دەسپێکردنی بنەماڵەی فیرعەونەکانە. کاتێك ئیبراهیمی خەلیل ڕۆشتە میسر، پاشایەتی ئەو سەرزەمینەی دەکرد.

بەڵام فارسەکان سەبارەت بەنەژادی ئەزدهاق بۆچوونیان جیاوازە لەوەی هوشام لەدانیشتووانی یەمەنی دەگێڕێتەوە. دەڵێن: ئەو بیوراسب کوڕی ئەروەند ئەسب کوڕی زینکا و کوڕی ویروشك کوڕی تاز کوڕی فەرواك کوڕی سیامەك کوڕی مەشی کوڕی کیومەرسە. دەستەیەکیان نەژادی ئەو بۆ کیومەرس دەگەڕێننەوە بەلأم ناوی باوکەکانی بەشێوەیەکی دیکە دەبەن و دەڵێن زوحاك کوڕی ئەندەر ئەسب کوڕی ریحدار کوڕی ویدرسەنگ کوڕی تاج کوڕی فریاك کوڕی ساعمەك کوڕی مازی کوڕی کیومەرسە.

بەگومانی ئاگرپەرستەکان، تاج باوەگەوڕێی زوحاك باوکی عەرەبەکانە و وتوویانە کەدایکی زوحاك وەدەك کچی ویونگهانە کەباوکی خۆی کوشت تا لەشەیتانەکان خۆی نزیك بکاتەوە و زیاتر لەبابل نیشتەجێ و دوو کوڕی بوو بەناوی: سەرەبقوار و بەقوار.

لەشەعبی دەگێڕنەوە: ناوی قرشت بوو و خواوەند ئەوی بۆ ئەجدهاق گۆڕی.

## گێڕانەوەی شەعبی لەمبارەوە

گێڕانەوەی قاسم کوڕی سەلمان لەشەعبی بەمشێوەیە: ئەبجەد و هوز و حەتی و کەلمەن و سەعفەس و قرشت پاشا ستەمکارەکان بوون. ڕۆژێك قرشت بیری کردەوە و وتی: ((بەپیرۆز زانینی خواوەند کەباشترینی ئافرێنەرانە، و خواوەند ئەوی کردە ئەجدهاق، حەوت سەری بوو و ئەو کەسەیە لەدۆنباوەندە و بەگومانی شوێنکەوتەکانی کتێب لەعەرەب و عەجەم پاشایەتی هەموو هەرێمەکانی دەکرد و پیاوێکی جادوگەر و خراپەکار بوو))

لەهوشام کوڕی محەممەدی دەگێڕنەوە: زوحاك دوای جەم بەهەمان شێوە کەوتوویانە و خوا زاناترە، هەزار ساڵ پاشایەتی کرد و لەسوادی عێراق لەگوندێك

بەناوی نرس لەسنوری ڕێگەی کوفە نیشتەجێ بوو، پاشایەتی هەمو سەرزەوی دەکرد وپیاوێکی ستەمکار و خراپەکار بوو، دەستی بۆ کوشتن درێژ کرد و یەکەم کەس بوو ڕێ و ڕەسمی لەداردان و سەربڕینی بلاو کردەوە، یەکەم کەس بوو دە یەکی لەخەڵکان وەرگرت و درەم و سکەی لێدا و یەکەم کەس بوو گۆرانی خوێند و گۆرانیان بۆ خوێند.

دەڵێت: وتوویانە دو لەتە گۆشت لەشانەکانی بەرز بوونەوە کەبەردەوام لێی دەدا و ئازاری زۆر بوو تا مێشکی مرۆڤی بخەنەسەر، لەبەر ئەمە ڕۆژانە دوکەسی دەکوشت و مێشکیانی دەبرد و دەیخستە سەر دو لەتە گۆشتەکەی سەرشانی و بەم شێوەیە ئازارەکەی هێور دەبویەوە. پیاوێك لەبابل دژی ئەو شۆڕشی کرد وئالاّی بەست و خەڵکانێکی زۆر لەدەوری کۆبوونەوە. کاتێك زوحاك ئاگادار بوویەوە، ترسا و کەسی بۆ لای ئەو ڕەوانە کرد و پێی وت: کاری تۆچییە و چی دەخوازیت؟

وەلاّمی دایەوە: مەگەر گومان ناکەیت پاشای جیهانی و جیهان تایبەتە بەتۆ؟

وتی: بۆنا.

وتی: کەواتە دەبێت ئازار و ڕەنجی تۆ لەسەر هەمو جیهان بێت نەك تەنیا لەسەر شانی ئێمە، بەلاّم تۆ لەناو هەمو خەڵکانی جیهان تەنیا ئێمە دەکوژیت.

زوحاك بۆچوونەکەی پەسەند کرد و فەرمانی دەرکرد تا ئەو دو پیاوەی دەبێت ڕۆژانە بکوژرێن، لەناو هەموو خەڵکانی جیهانەوە بیانهێنن و تەنیا تایبەت نەبن بەشوێنێك.

دەڵێن: خەڵکی ئیصفەهان لەنەوەکانی ئەو پیاوەن کەئالاّی هەڵکرد و ئالاّکە بەهەمان شێوە لای پاشاکانی ئێران لەخەزێنەکەیان دەپارێزرێت و بەو شێوەی بیستوومانە ئالاّکە لەپێستی شێرە و پاشاکانی ئێران بەزێر و هەوریشم دایدەپۆشن و بەپیرۆزی دەزانن.

دەڵێت: بیستوومە کەزوحاك هەمان نەمروودە کەئیبراهیم لەرۆژگاری ئەو چاوی بەدنیا هەڵهێنا و ئەو بوو مەبەستی ئەوی کرد ئیبراهیم لەناو ئاگردا بسوتێنێت.

دەڵێت: بیستوومە کەئەفرەیدون لەمناڵەکانی جەمە وپێش زوحاك پاشایەتی دەکرد و گومانیان کردووە نۆیەمین مناڵی جەمە و لەدۆنباوەند چاوی بەدنیا هەڵهێناوە. لەوێوە بەرێکەوت و گەشتە شوێنەکەی زوحاك کە لەوکاتەدا لەهیند بوو. ئەفرەیدون دەستی بەسەر هەموو ماڵەکان و کەرەستەکانی ئەودا گرت. زوحاك ئاگادار بوویەوە وگەڕایەوە. خواوەند هێزی لێ سەندبوویەوە و دەوڵەتەکەی لەناو چبوو. ئەفرەیدون هێرشی کردەسەر و ئەسیری کرد و بۆ کوێستانی دۆنباوەندی برد و بەگومانی عەجەمەکان تا ئێستا لەوێ لەبەندێکی ئاسنیندایە و ئەشکەنجە دەدرێت.

دەستەیەکی دیکە وتوویانە زوحام لەشوێنەکەی خۆی دوور نەکەوتبویەوە و ئەفرەیدون کوڕی ئەسقیان لەمانگی مێهر ڕۆشتە نشینگەکەی ئەو کەقەڵایەك بوو بەناوی زرنگ و دوو ژنی کردە هاوسەر بەناوەکانی ئەروناز و سەنوار، بیوراسب کاتێك ئەمەی بینی، بێ ئاگا و مەست کەوت و ئەفرەیدون بەگورزێکی سەرپێچراوە لەسەریدا کە نائاگایی و بێ ئاوزی ئەو زیادی کرد.

دواتر ئەفرەیدون ئەوی بۆ کوێستانی دۆنباوەند برد و فەرمانیدا تا خەڵکان مانگی مێهر کەمێهرەگان و ڕۆژی بەند کردنی بیوراسب بوو، بکەنە جەژن. ئەفرەیدون لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت.

دەڵێن کاتێك زوحاك لەسەر تەخت دانیشت و تاجی خستەسەر، وتی: ئێمە شاکانی جیهانین و خاوەنی هەموو شتەکانی جیهان.

فارسەکان گومان دەکەن پاشایەتی تایبەت بوو بەبنەماڵەی نوشهەنگ و جەم و تەهمورس و زوحاك داگیرکەر بوو و بەجادوو و خراپەکانی پاشایەتی گرتەدەست. خەڵکانی لەدوو مارەکەی سەرشانی دەترساند و لەسەرزەمینی بابل بناغەی شارێکی داڕشت و ناوینا حوب. خەڵکانی نەبتی کردە کەسە تایبەت و نزیکەکانی خۆی. خەڵك لەوان ڕەنجێکی زۆریان بینی. ئەوان مناڵەکانیان سەردەبڕی.

دەستەیەك لەشوێنکەوتەکانی کتێب وتوویانە لەسەر شانی ئەو دوو لەتە گۆشت بەرز ببویەوە هاوشێوەی سەری مار، زوحاکی خراپەکار بەجل و بەرگ دایدەپۆشی و بۆ ترساندنی خەڵکان دەیوت کەدوومارە و داوای خواردن دەکەن.

کاتێك برسی دەبوو، دو لەتە گۆشتەکەی سەرشانی دەجوولان بەهەمان شێوە کەئەندامەکانی مرۆڤ لەکاتی برسیەتی و تورەیی دەجولێن و دەلەرێنەوە.

دەستەیەك لەخەڵکان وتوویانە دوو مار بوو. ئامارژەمان بەگێرانەوەی شەعبیدا و خوا لەراستییەکان زاناترە.

دەستەیەك لەرەچەڵەك ناسان و شارەزایانی مێژووی فارسەکان وتوویانە خەڵك بەردەوام لەلایەن بیوراسبەوە رەنجیان دەکێشا تا ئەو کاتەی خواوەند مەبەستی لەناو بردنی ئەوی کرد. یەکێك لەدانیشتووانی ئیسفەهان بەناوی کابی(کاوە) هێرشی کردەسەر. هۆکاری شۆرشی ئەو لەبەر دوو کورەکەی بوو کەنێردراوانی بیوراسب ئەوانیان گرتبوو.

دەڵێن: کاتێك کابی لەتاو دوکورەکەی تورە بوو، گۆچانێکی بەدەستەوە گرت و ئەو پێستەی بەدەستیەوە بوو، بەسەری گۆچانەکەوە هەڵیواسی و خەڵکی بۆ شۆرش دژی بیوراسب هاندا و کەسانێکی زۆر لەدەوری کۆبوونەوە. کاتێك کابی سەرکەوتنی بەدەست هێنا، خەڵکان ئالآکەی ئەویان بەپیرۆز لەقەڵەمدا و شتی دیکەیان پێ زیاد کرد تا بووە ئالآی پیرۆز و گەورەی شاکانی فارس کەئەوانیش بەپیرۆزیان دەزانی و بەناوی ئالآی کابیان ناویان برد کەتەنیا لەکاتی رووداوە گەورەکان هەڵدەکرا و تەنیا لەدەستی شازادەکاندا بوو.

لەگێرانەوەکانی تایبەت بەکابی، دەڵێن: لەگەڵ شوێنکەوتەکانی لەئیسفەهانەوە بەرێکەوت و لەرێگا خەڵکان پەیوەستی بوون و کاتێك لەزوحاك نزیك کەوتنەوە، زوحاك ترسی ئەو کەوتە دڵییەوە و لەنشینگەکەی خۆی هەلآت و گۆرەپانی چۆڵ کرد و بەمشێوەیە عەجەمەکان بەمەبەستەکەی خۆیان گەیشتن و لەدەوری کابی کۆبوونەوە و درگای گفتوگۆیان کردەوە. کابی وتی مەبەستی پاشایەتی نییە چوونکە لەبنەماڵەی پاشاکان نییە و دەبێت یەکێك لەمناڵەکانی جەم وەك پاشا هەڵبژێرن چوونکە جەم کوری ئوشهەنگ پاشای گەورە بوو بناغەی رێ و رەسمی پاشایەتی دارشت. ئەفرەیدون کوری ئەسقیان کە لەیەکێك لەویلایەتەکان لەترسی زوحاك خۆی حەشاردابوو، هاتە لای کابی و شوێنکەوتە و خەڵکان لەهاتنی شادمان بوون. ئەویان وەك پاشای خۆیان هەڵبژارد و کابی و

سەرانی خەڵك لەدەوری کۆبوونەوە.

کاتێك ئەفرەیدون لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت و کاروبارەکانی سەقامگیر کرد، دەستی بەسەر شوێنی مانەوەی زوحاکدا گرت و شوێنی کەوت و لەکوێستانی دۆنباوەند زیندانی کرد.

بەگومانی دەستەیەك لەئاگرپەرستەکان، زوحاکی لەکوێستانی زیندانی کرد و دەستەیەك لەجنۆکەکانی وەك پاسەوان بۆ ئەو دانا. دەستەیەکیان دەڵێن ئەوی کوشت.

ئاگرپەرستەکان دەڵێن: لەزوحاك هیچ کارێکی پەسەند کراو نەبینرا جگە لەیەك جار. کاتێك ستەم لەناو خەڵکدا فراوان و زیانەکان زیادی کرد و ڕۆژگاری پاشایەتی ئەو درێژەی کێشا، خەڵك لەتاو ڕەنج و ئازارەکانی ئەو تەنگیان پێهەڵچنرا وگەورەکانی خەڵك چەندین نامەیان بۆ نوسی و ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی بڕۆنە بارەگاکەی. سەران و گەورەکانی خەڵك لەویلایەتە جۆراوجۆرەکانەوە روویان لەبارەگای زوحاك کرد و گفتوگۆیان دەستپێکرد. مەبەستی ئەویان کرد لەستەم کردن دووری بخەنەوە و ڕێگە چاکەکاری لەگەڵ خەڵکان بگرێتەبەر. ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی کابی (کاوە) ئیسصفەهانی لەقسە کردن پێش بخەن. کاتێك گەیشتنە بەردەرگای بارەگای پاشا، پاسەوانەکانیان ئاگادار کردەوە و داوای فەرمانی چوونە ژوورەوەیان کرد. کابی لەپێش ئەوانەوە بوو و لەبەردەم پاشا وەستا، سلاّوی نەکرد و وتی: ئەی پاشا بە چ شێوەیەك سلاّو بۆ تۆ بنێرم، سلاّو لەپاشای هەمو هەرێمەکان بکەم یا تەنیا پاشای یەك هەرێم و بەس.

زوحاك وتی: وەك پاشای هەموو هەرێمەکان سلاّو بۆ ئێمە بنێرە چوونکە من پاشای سەرزەویم.

ئیسفەهانی وتی: ئەگەر پاشای هەموو هەرێمەکانی و دەستی تۆ بەهەموو شوێنێك دەگات، بۆ لەناو خەڵکی هەمو هەرێمەکان زوڵم و ستەمی تۆ تەنیا لەسەر شانی ئێمەیە و فلاّن کار و فیسارە کار لەنێوان ئێمە و هەرێمەکانی دیکە دابەش ناکەیت؟

ئاماژەی بەچەندین شتی دیکەدا و راستییەکانی هێنایە سەرزمان. قسەکانی

کاریگەریان لەسەر زوحاك دانا و بێدەنگ بوو. دانی بەخراپەکاری خۆیدانا و بەڵێن و مژدەی پێدان و بەمەبەستی حەوانەوە بەرێی کردن تا بحەسێنەوە و دواتر بگەرێنەوە بۆ ئەوەی نیازەکانیان بەراوەردە بۆ سەرزەمینەکەی خۆیان بگەرێنەوە.

گومانیان کردووە وەدەك دایکی زوحاك لەکورەکەی ستەمکارتر بووە. لەکاتی سەردانی سەرانی خەڵك لەو کۆبوونەوەدا ئامادە و وتەکانی ئەوانی دەبیست و تورە و نارازی بوو. کاتێك سەرانی خەڵك لای زوحاك رۆشتن. رۆشتە لای کورەکەی و سەرکۆنەی کرد کەبۆ بە هەڵس و کەوت و قسەی سەرانی خەڵکەکەی رازی بووە، وتی: بوێری ئەوانم لەبەرابەر تۆ بینی کە فلان قسە و فیسارە قسەیان هێنایە سەرزمان، بۆ تورە نەبویت و دەستی ئەوانت نەبری؟

لەگەڵ زوحاك زۆر پەیڤی و زوحاکی مەغرور وەڵامی دایەوە: منیش لەگەڵ ئەندێشەکەی تۆ هاورام بەلام خەڵکەکەم بەوتاری راست ناکاوگیریان کردم و کاتێك مەبەستی ئەوەم کرد دەسەلات و هێزی خۆم نیشان بدەم و هێرشیان بکەمەسەر، راستییەکان لەبەرابەر من قووت بوونەوە و وەك کێوێك لەنێوان من و ئەوان لەمپەرێکیان دروست کرد و نەمتوانی هیچ کارێك بکەم. ئەوی بێدەنگ ودەریکرد.

دوای چەند رۆژێك خەڵکانی بینی و بەڵێنەکانی خۆی بردەسەر و ئەوانی رەوانە کردەوە و نەرمی و چاکەی لەگەڵ ئەوان گرتەبەر ونیازەکانیانی هێنایەدی. وەك وتوویانە جگە لەمجارە هیچ کات کارێکی پەسەندکراو لەزوحاك نەبینراوە.

دەڵێن: تەمەنی ئەجدهاق هەزار ساڵ بوو کەشەسەد ساڵی پاشایەتی دەکرد و پاشماوەی تەمەنی بۆ بەهێزی و کاریگەری، هاوشێوەی پاشاکان ژیانی بەسەر برد.

دەستەیەکی دیکە وتوویانە ساڵەکانی تەمەنی هەزار وسەد ساڵ درێژەی کێشا و بۆ ماوەی هەزار ساڵ پاشایەتی کرد تا ئەو کاتەی ئەفرەیدون شۆرشی کرد و زوحاك شکستی خوارد و کوژرا.

دەستەیەك لەزاناکانی فارس وتوویانە، لەو کەسانەی ماوەی تەمەنیان لەتەوراتدا ئاماژەی پێنەدراوە، کەسمان نەبینیوە تەمەنی لەتەمەنی زوحاك و لەجامر کوری یافس کوری نوح، باوکی فارسەکان درێژتر بێت چوونکە وەك دەڵێن

ئەویش هەزار ساڵ ژیا.

لێرەدا ئاماژەمان بەداستانی بیوراسب دا لەبەر ئەوەی بەگومانی دەستەیەك نوح هاورۆژگاری ئەوبوو و نوح وەك پێغەمبەر بۆ لای زوحاك و خەڵكەكەی كەستەمكاریان كردبووە پیشە، ڕەوانە كرا. ئاماژەمان بەنیعمەت و بەخششەكانی خوا بەنوحداو وتمان نوحی لەگەڵ باوەڕداران ڕزگار كرد و نەوەكانی لەسەر زەمین هێشتەوە. ئاماژەمان بەچاكەكارییەكانی نوحدا كەلەو دنیایش بەخششەكانی خوایی پێدەبڕێت. هەروەها ئەو دەستە لەخەڵكان كە بەهۆی یاخیگەری و ستەمكاری لەناوچوون و خواوەند بەخششەكانی خۆی لەوان گرتەوە و بوونە وانەیەك بۆ خەڵكان و لەو دنیایش سزایان جەهەننەمە.

ئێستا دووبارە درێژە بەداستانەكەی نوح دەدەین و بەسەرهاتی منداڵەكانی دەڵێین كەئێستا بەهەمان شێوە كەخواوەند دەفەرمێت، لەسەر زەوی ماونەتەوە. ئەو كەسانەی نوح وەك پێغەمبەری ئەوان هەڵبژێردرا، جگە لەو كەسانەی باوەڕیان پێهێنا، هەموویان لەناوچوون و كەس لەوان لەسەر زەوی نەمایەوە. پێش هەمووان ئاماژەمان بەوتاری پێغەمبەردا سەبارەت بەمنداڵەكانی نوح كە لەقوڕئاندا باسی لێوە كراوە، دەفەرمێت: سام و حام و یافس بوون.

لەوەهب كوڕی مونبە دەگێڕنەوە: سام كوڕی نوح باوكی عەرەبەكان و حام باوكی ڕەشپێستەكان و یافس باوكی توركەكان و باوكی یاجوج و ماجوجە كەكوڕە مامی توركەكان.

دەڵێن: هاوسەری یافس ئەربەسیسە كچی مەرازیل كوڕی درەمسیل كوڕی مەحویل كوڕی خنوخ كوڕی قین كوڕی ئادەمە و حەوت و كوڕ و كچێكی هێنایە دنیا: بەم ناوانە: جومەر كوڕی یافس كەبەوتەی كوڕی ئیسحاق باوكی یاجوج و ماجوجە، مارج كوڕی یافس و وایل كوڕی یافس، توبیل كوڕی یافس، هوشل كوڕی یافس، ترس كوڕی یافس و شەبەكە كچی یافس.

دەڵێت: گومان دەكەن یاجوج و ماجوج و سەقلابیەكان و توركەكان لەمنداڵەكانی یافسن.

ژنی حام كوڕی نوح، یەحلەب كچی مارب كوڕی درەمسیل كوڕی مەحویل

کوڕی خنوخ کوڕی قین کوڕی ئادەمە و سیٚ کوڕی هێنایە دنیا: کوش کوڕی حام و قوت کوڕی حام و کەنعان کوڕی حام. کوش کوڕی حام، کچی بەتاویل کوڕی ترسی کردە هاوسەر و بەهەمان شێوە کەدەڵێن، قیبتیەکانی میسر لەمناڵەکانی ئەون. کەنعان کوڕی حام ئەرسل کچی بەتاویل کوڕی ترس کوڕی یافس کوڕی نوحی وەك هاوسەری خۆی هەڵبژارد و ڕەشەکان و فەزان وزەنگیەکان و زەغاوە و هەموو نەتەوە ڕەشەکان لەمناڵەکانی ئەون.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: بەگومانی شوێنکەوتەکانی تەورات ئەمە لەبەر نفرینی نوح بوو کە لەحامی کوڕی کرد. داستانەکە بەمشێوەیە: نوح خەوت و شەرمی دەرکەوت و حام بینی و داینەپۆشی و سام و یافس بینیان و پەڕۆیەکیان خستەسەر و شەرمی باوکیان داپۆشی. کاتێك نوح لەخەو هەستا و لەکردەی حام و سام و یافس ئاگادار بوویەوە، وتی: کەنعان کوڕی حام مەلعون بێت و مناڵەکانی کۆیلەی براکانیان بن. ئەوسا وتی: خوا، بەرەکەت بەسام ببەخشە و حام کۆیلەی دوبراکەی خۆی بێت. خوا پاشایەتی بەیافس ببەخشە و بگاتە پێگەی سام و حام کۆیلەی ئەوان بێت.

دەڵێت: هاوسەری سام کوڕی نوح، صەلیب کچی بەتاویل کوڕی مەحویل کوڕی خنوخ کوڕی قین کوڕی ئادەمە و چەند کوڕی هێنایە دنیا: ئەرفەخشز کوڕی سام و ئەشوز کوڕی سام و لاوز کوڕی سام و عویلەم کوڕی سام. دەڵێت: سام کوڕێکی بوو بەناوی ئەرەم بەلاّم نازانم لەدایکی ئەرفەخشز و براکانییەتی یا نا.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە، کاتێك سوق الثمانین لەنێوان فورات و صەرات بۆ مناڵەکانی نوح تەنگ بوو، بەرێکەوتن و بناغەی شاری بابلیان داڕشت کەدوانزە فەرسەخ لەدوانزە فەرەسەخە. ژمارەیان زیادی کرد و گەیشتە سەد هەزار کەس. هەموویان شوێنکەوتەی ئیسلام بوون.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: لاوز کوڕی سام کوڕی نوح، سەبکە کچی یافس کوڕی نوحی وەك هاوسەری خۆی دیاری کرد و خەڵکی فارس و گورگان و نەتەوەکانی فارس لەمناڵەکانی ئەون. هەروەها تمس و عەملیق کوڕی ئەون بەلاّم نازانم ئایا لەدایکی فرس بوون یا نە.

دەڵێت: عەملیق باوکی عەمالقە بوو کە لەزەویدا بڵاو بوونەوە و لەرۆژهەڵات و عەمان و حیجاز و شام و میسر نیشتەجێ بوون. پاشا ستەمکارەکانی شام کە بەکەنعانییەکان دەناسران، لەوان بوون، هەروەها فیرعەونەکانی میسریش. خەڵکی بەحرەین و نەتەوەی جاسم و عەممان و منداڵەکانی هەڤ مەدینە و منداڵەکانی سەعد کوڕی هەزان و منداڵەکانی مەتەر و منداڵەکانی ئەزرەق و دانیشتووان نەجد و تایەفەی بودەیل و راحل و غەفار و خەڵکی تیما و پاشای حیجازی نیشتەجێی تیما ناسراو بەئەرقەم لەوان بوون. پێگەیان لەنەجدیش هەبوو و خەڵکی تائیف، منداڵەکانی عەبد کوڕی زەخم تایەفەیەك لەعەبسی کۆن، لەمنداڵەکانی لاوزن.

دەڵێت: منداڵەکانی ئەمیم کوڕی لاوز کوڕی سام کوڕی نوح لەوبار لەریخەلآنەکانی عالج نیشتەجێ بوون و ژمارەیان زیادی کرد و بەهۆی ئەو گوناحەی ئەنجامیاندا، سزای خوا، ئەوانی گرتەوە و لەناوچوون. پاشماوەی ئەوان بەنەسناس ناو دەبەن.

دەڵێت: منداڵەکامی تسم کوڕی لاوز نیشتەجێی یەمامە و سەرزەمینەکانی دەوروبەری بوون. ژمارەیان فراوان و رویان لەبەحرەین کرد و تسم و عەمالیق و جاسمی عەرەب بوون و زمانیان عەرەبی. فارسیەکانی رۆژهەڵات کە لەسەرزەمینی فارسەکان ژیانیان بەسەر دەبرد، بەزمانی فارسی دەئاخاوتن.

دەڵێت: منداڵەکانی ئەرەم کوڕی سام کوڕی نوح، عەوس کوڕی ئەرەم و غاسر کوڕی ئەرەم و حەویل کوڕی ئەرەم بوون.

عەوس کوڕی ئەرەم، غاسر کوڕی عەوس و عاد کوڕی عەوس و عەبیل کوڕی عەوسی هێنایە دنیا و غاسر کوڕی ئەرەم، سەمور کوڕی غاسر و جەدیس کوڕی غاسری هێنایە دنیا کەهەموویان عەرەب و بەزمانی موزەری قسەیان دەکرد و عەرەبەکان، ئەم نەتەوانە بەعاربە ناودەبەن یانی عەرەبی ڕەسەن کەزمانی دایکیان عەرەبی بوو. منداڵەکانی ئیسماعیل کوڕی ئیبراهیم بە (بەعەرەب بوەکان) یانی عەڕەبە ناڕەسەنەکان ناو دەبەن چوونکە کاتێك لەناو نەتەوەکانی عەرەب نیشتەجێ بوون، بەزمانی ئەوان قسەیان دەکرد. بەمشێوەیە عاد و سەموود و عەمالیق و ئەمیم و جاسم و جەدیس عەرەبی ڕەسەنن.

نەتەوەی عاد لە هەموو ریخەڵانەکانی حەزەرمەوت تا یەمەن نیشتەجێ بوون و نەتەوەی سەموود لەحەجەر لەنێوان حیجاز و شام تا وادی ئەلقورا و دەوروبەرەکانی. جەدیس پەیوەست تسم بوو ولەگەڵ ئەوان لەیەمامە و سەرزەمینەکانی دەرووبەری تا بەحرەین نیشتەجێ بوون. لەو رۆژگارە یەمامە بەجۆ ناوی دەبرا. نەتەوەی جاسم لەعەمان نیشتەجێ و لەوێ مانەوە.

کەسێکی دیکە جگە لەکوڕی ئیسحاق دەڵێت: نوح لەخوا بۆ سام پاڕایەوە تا پێغەمبەران و نێردراوەکان لەنەتەوەی ئەو بن. لەخوا بۆ یافس پاڕایەوە تا پاشاکان لەمناڵەکانی ئەو بن و لەمبارەوە پێش سامی خست. حامی نفرین کرد تا ڕەنگی بگۆڕێت و مناڵەکانی کۆیلەی مناڵەکانی سام و یافس بن.

دەڵێت: لەکتێبدا نوسراوە، دوای ئەوەی بێزاری بەرامبەر بەحام دەربڕی و لەخوا پاڕایەوە بۆ ئەوەی مناڵەکانی لەلایەن براکانییەوە ڕەنجیان پێبڕێت. لەناو نەوەکانی خۆی بۆ کوش کوڕی حام و جامر کوڕی یافس لەخوا پاڕایەوە، لەبەر ئەوەی چەند کەسێك لەنەوەکانی پەیوەستی نوح بوون و هاوشێوەی مناڵەکانی خۆی خزمەتیان دەکرد.

دەڵێت: سام غاسری هێنایە دنیا و عەلیم و ئەشوز و ئەرفەخشز و لاوز و ئەرەم. لەمەککە نیشتەجێ بوو. دەڵێت پێغەمبەرەکان و نێردراوان و چاکەکاران و هەموو عەرەبەکان و فیرعەونەکانی میسر لەمناڵەکانی ئەرفەخشز بوون و هەموو پاشاکانی عەجەم لەتورك و خەزەر و کەسانیتر و فارسەکان کەدوایین پاشایان یەزدگێرد کوڕی شەهریار کوڕی پەرویز بوو و نەژادی بۆ کیومەرس کوڕی یافس دەگەڕایەوە، لەمناڵەکانی یافس کوڕی نوحن.

دەڵێت: وتوویانە دەستەیەك لەمناڵەکانی لاوز کوڕی سام کوڕی نوح و براکانی دیکەی پەیوەستی جامر بوون. جامر ئەوانی لەنیعمەت و پاشایەتی خۆی کردە شەریك. مازی کوڕی یافس لەوان بوو کەشمشێرەکانی مازی بۆ ئەو دەگەڕێتەوە و دەڵێن کورشی ماوزی بکوژی بلشەسر کوڕی ئولمەردوخ کوڕی بەخت نەصر لەمناڵەکانی ئەوە.

دەڵێت: خەڵکی نەوبە و حەبەش و فەزان و هیند و سند و کەنارەکانی

ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا لەمناڵەکانی حام کوڕی نوحن. نەمروودیش لەوانە. ئەو نەمروود کوڕی کوش کوڕی حامە.

دەڵێت: ئەرفەخشز کوڕی سام، قینانی هێنایە دنیا بەڵام لەتەوراتدا ناوی نەبراوە و سەبارەت بەو وتوویانە کەشیاو نەبو ناوی لەناو کتێبەکاندا بێت لەبەر ئەوەی جادوگەر و خۆی وەك خوا ناساند. لەتەورات مەوالید بۆ ئەرفەخشز کوڕی سام و شالخ کوڕی قینان کوڕی ئەرفەخشز پەیوەست کرا و لەبەر ئەم هۆکارە لەتەوراتدا ئاماژە بەناوی قینان نەدراوە.

دەڵێت: شالخ کوڕی ئەرفەخشز لەمناڵەکانی قینانە و شالخ کوڕی غاسری هێنایە دنیا. غاسر دوو کوڕی بوو یەکیان فالغ کەناوەکەی بەعەرەبی قاسمە. لەبەر ئەمە بەو ناوە بانگی دەکەن چوونکە لەڕۆژگاری ئەو زەوی دابەش کرا و زمانەکان جۆراوجۆر بوون. ناوی کوڕەکەی دیکەی قەحتانە.

قەحتان یەعرب و یەقتانی هێنایە دنیاو لەسەرزەمینی یەمەن نیشتەجێ بوون. قەحتان یەکەم کەس بوو پاشایەتی یەمەنی کرد و یەکەم کەس بوو بۆ سڵاو کردن لەو (ابیت اللعن) (یانی دوور بیت لەزیان) بەکار برد. بەهەمان شێوە کەسڵاو بۆ پاشاکان دەنێرن.

فالغ کوڕی غابر، ئەرغوای هێنایە دنیا و ئەرغوا ساروغ و ساروغ ناحورا و ناحورا تارخی هێنایە دنیا کەناوەکەی بەعەرەبی ڕەبودە. تارخ ئیبراهیمی هێنایە دنیا. ئەرفەخشز: نەمروود کوڕی ئەرفەخشزی هێنایە دنیا و شوێنی مانەوەی ئەو لەناوچەی حەجەرە.

لاوز کوڕی سام، تەسم و جەدیسی هێنایە دنیا و شوێنی مانەوەیان یەمامە بوو. لاوز، عەملیق کوڕی لاوزی هێنایە دنیا و شوێنی مانەوەی ئەو لەحەرەم و دەوروبەری مەککە بوو. دەستەیەك لەمناڵەکانی ئەو پەیوەستی شام بوون و عەمالیق لەوانن. هەروەها لاوز ئەمیمی هێنایە دنیا. ئەمیم چەندین منالی هێنایە دنیا و دەستەیەکیان لەڕۆژهەڵات پەیوەستی جامر کوڕی یافس بوون.

ئەرەم کوڕی سام، عەوسی هێنایە دنیا و شوێنی مانەوەی ئەحقاف بوو. بۆ عەوس، عاد هاتەدنیا.

حام کوڕی نوح، کوش و مەصراییم و قوت و کەنعانی هێنایە دنیا. نەمروود ستەمکاری بابل کوڕی کوش کوڕی حامە. منداڵەکانی دیکەی حام لەکەنارەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و مەغریب و نەوبە و حەبەشە و فەزان بڵاو بوونەوە.

دەڵێت: وتوویانە، مەصراییم، قبت و بەربەری هێنایە دنیا. قوت، بۆ سەرزەمینی هند و سند ڕۆشت و خەڵکی ئەوێ لەمنداڵەکانی ئەون. یافس کوڕی نوح، جامر و موعەع وموادی و سوان و سوبال و ماشج و تیرشی هێنایە دنیا. پاشاکانی ئێران لەمنداڵەکانی جامرن و تورك و خەزەر لەمنداڵەکانی تیرش. ئەشبان لەمنداڵەکانی ماسج و یاجوج و ماجوج کە لەڕۆژهەڵاتی تورکەکان و خەزەرەکان نیشتەجێن، لەمنداڵەکانی موعەعن. سەقلابیەکان و بەرجانییەکان لەمنداڵەکانی ئەوانن.

خەڵکی ئەشبان لەڕۆژگاری کۆن، پێش ئەوەی منداڵەکانی عەیص بۆ سەرزەمینی ڕۆم کۆچ بکەن، نیشتەجێی ئەو سەرزەمینە بوون. هەرکام لەم سێ دەستەیە لەمنداڵەکانی سام و حام و یافس بەرەو سەرزەمینێك بەرێکەوتن و لەوێ نیشتەجێ بوون و کەسی دیکەیان لەسەرزەمینەکانی خۆیان جێگە نەکردووە.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: خواوەند وەحی بەموسا کرد: تۆ وخەڵکەکەت و دانیشتووانی جەزیرە و دانیشتووانی عال لەمنداڵەکانی سام کوڕی نوحن وعەرەب و فارس و نەبتی و هند و سند لەمنداڵەکانی سام کوڕی نوح.

محەممەدی کەلبی دەڵێت: هند و سند منداڵەکانی تۆفین کوڕی یەعتن کوڕی عابر کوڕی شالَخ کوڕی ئەرفەخشز کوڕی سام کوڕی نوحن.

حەزەرمەوت کوڕی یەقتن کوڕی عابر کوڕی شالخە. یەقتن، قەحتان کوڕی عابر کوڕی شالخ کوڕی ئەرفەخشز کوڕی سام کوڕی نوحە بەوتەی ئەو کەسانەی نەژادی ئەو بۆ خەڵکانێك جیاواز لەنەژادی ئیسماعیل دەگەڕێننەوە.

فارسەکان کوڕانی فارس کوڕی بیرس کوڕی ناسور کوڕی سام کوڕی نوحن.

نبتیەکان کوڕی نەبیت کوڕی کاش کوڕی ئەرەم کوڕی سام کوڕی نوحن.

دانیشتووانی جەزیرە و عال منداڵەکانی ماش کوڕی ئەرەم کوڕی سام کوڕی نوحن.

عەملیق و تسم و ئەمیم کوڕانی لوز کوڕی سام کوڕی نوحن.

عەملیق باوکی عەمالیقەیە کەنەتەوەی بەربەر منالەکانی سەمیلا کوڕی مارب کوڕی فاران کوڕی عەمرۆ کوڕی عەملیق لەوانن جگە لە صەنهاجە و کەتامە کەمنالەکانی فەریقیش کوڕی قەیس کوڕی صەیفی کوڕی سەبان.

دەڵێن نەتەوەی عەملیق یەکەم کەسان بوون بەعەرەبی قسەیان کرد. ئەمە کاتێك بوو لەبابل هاتنەدەر و ئەوانیان بەجورهەمی عەرەب، بەعاربە، ناو دەبرد.

سەموود و جەدیس کوڕانی عابر کوڕی سام کوڕی نوحن.

عاد و عەبیل کوڕانی عەوس کوڕی ئەرەم کوڕی سام کوڕی نوحن.

ڕۆمیەکان کوڕانی لەنتی کوڕی یۆنان کوڕی یافس کوڕی نوحن.

نەمروود کوڕی کوش کوڕی کەنعان کوڕی نوحە کەپاشای بابل و ڕکەبەری ئیبراهیمی خەلیل بوو.

دەڵێت: عادیان لەڕۆژگاری خۆیان بەعادی ئەرەم ناو دەبرد و کاتێك عاد لەناوچوو، سەموودیان بەئەرەم ناو برد و کاتێك سەموود لەناوچوو، منالەکانی ئەرەمیان بەئەرەمییەکان ناو برد کەنبتی بوون.

هەموویان شوێنکەوتەی ئیسلام و لەبابل نیشتەجێ بوون تا ئەو کاتەی نەمروود کوڕی کوش پاشایەتی ئەوانی گرتەدەست و بۆ پەرەستینی بتەکان هانیدان و ڕازی بوون. زمانیان سریانی و لەکاتی بەیانی خواوەند زمانی ئەوانی گۆڕی بەشێوەیەك لەقسەی یەکتر حاڵی نەدەبوون.

منالەکانی سام بەهەژدە زمان قسەیان دەکرد و منالەکانی حامیش بەهەژدە زمان. منالەکانی یافس بەشەست و سێ زمان قسەیان دەکرد و خواوەند نەتەوەی عاد و عەبیل و سەموود و جەدیس و عەملیق و تسم و ئەمیم و منالەکانی یەقتن کوڕی عابر کوڕی شالخ کوڕی ئەرفەخشز کوڕی سام کوڕی نوحی فێری عەرەبی کرد و ئالأداری ئەوان لەبابل بەرنازر کوڕی نوح بوو.

نوح بەهەمان شێوە کە لەکوڕی عەباس دەیگێڕنەوە، یەکێك لەکچەکانی بنەماڵی قابیلی وەك هاوسەری خۆی دەستنیشان کردبوو و کوڕێکی بۆ هێنایە دنیا و ناوی نا بەرنازر. منالەکانی ئەو لەڕۆژهەلأت لەشارێك بەناوی مەعلون

شەمسا نیشتەجێ بوون.

منداڵەکانی سام لەمەجدەل، سەرزەمینی نوخبە لەساتیدما تا دەریا و لەیەمەنەوە تاشام جێگیر بوون. خواوەند پێغەمبەری و کتێب و جوانی و ڕەنگی ڕۆشن و سپییەتی بەوان بەخشی.

منداڵەکانی حام لەشوێنی هەڵکردنی بای باشوور و دەبوور جێگیر بوون کەتا ئەوێ بەداروووم ناو دەبەن. خواوەند ئەسمەری بەوان بەخشی و سەرزەمین و ئاسمانی ئەوانی ئاوەدان کردەوە و تاعونی لەناو ئەوان هەڵگرت و ئەسەل و ئەراك و عەنبەر و گوڵاو و دارخورمای بەسەرزەمینەکەیان بەخشی و هەتاو و مانگی لەئاسمانی سەرسەریان ڕەوانە کرد.

منداڵەکانی یافس لەصەفوون، شوێنی هەڵکردنی بای باکوور و صەبا نیشتەجێ بوون و سوری و ڕەنگ زەردی بوو بەبەشیان. خواوەند زەمینەکانی ئەوانی چۆڵ کرد بەسەرمای سارد و ئاسمانیان چۆڵ بەشێوەیەك لەحەوت هەسارەکە هیچیان بەسەر سەریاندا ناڕوات لەبەر ئەوەی لەژێر (بنات النعش و جەدی و فەرقەدینن). هەروەها زیانی تاعوون لەناو ئەواندا بڵاوە.

نەتەوەی عاد پەیوەستی شەحر بوون و لەوێ لەدۆڵێك بەناوی مەغیس لەناچوون. دوای ئەوە نەتەوەی موهرە لەشەحر پەیوەستیان بوون.

عەبیل بۆ شوێنی یەسرب کۆچیان کرد.

عەمالیق لەصەنعا نیشتەجێ بوون پێش ئەوەی بەصەنعا ناو دەربکات. دواتر دەستەیەکیان بەرەو یەسرب کۆچیان کرد و عەبیلیان لەوێ دوورخستەوە و لەشوێنی جوحفەت دابەزین. لافاو هات و ئەوانی لەناو برد و لەبەر ئەمە بەجۆحفە ناوی دەرکرد.

سەموود لەحەجر و سەرزەمینەکانی دەروبەری نیشتەجێ و لەوێ لەناوچوون.

تەسم و جەدیس لەیەمامە جێگیر و لەوێ لەناو چوون.

ئەمیم لەسەرزەمینی ئەبار نیشتەجێ و لەوێ لەناو چوون.

ئەبار، سەرزەمینێکە لەنێوان یەمامە و شەحر. لەئێستادا کەس لەمرۆڤەکان ناتوانێت سەردانی ئەوێ بکات چوونکە جنۆکەکان بەسەریدا زاڵبوون. بەناوی

ئەبار کوڕی ئەمیم، ئەو سەرزەمینە بەئەبار ناو دەبەن.

منداڵەکانی یەقتن کوڕی عامر لەیەمەن نیشتەجێ بوون. بۆیە بەیەمەن ناوی دەرکرد چوونکە لەلای راستەوە ڕۆشتنە ئەو سەرزەمینە.

دەستەیەك لەمنداڵەکانی کەنعان ڕۆشتنە شام. بۆیە بەشام ناویان برد چوونکە لەلای (شیمال) باکوورەوە ڕۆشتنە ئەو سەرزەمینە و شامیان بەسەرزەمینی منداڵەکانی کەنعان ناودەبرد. دواتر منداڵەکانی ئیسرائیل هاتن و ئەوانیان کوشتار و لەو سەرزەمینە دەریانپەڕاندن و شام تایبەت بوو بەمنداڵەکانی ئیسرائیل. دوای ئەوە، ڕۆمیەکان هێرشیان کردە سەر منداڵەکانی ئیسرائیل و ئەوانیان کوشتار کرد جگە لەدەستەیەکی کەم کەروویان لەسەرزەمینەکانی عێراق کرد. دوای ئەوان عەرەبەکان هاتن و بەسەر شامدا زاڵبوون.

فالغ کوڕی عابر کوڕی ئەرفەخشز کوڕی سام کوڕی نوحە. بەهەمان شێوە کەئاماژەمان پێدا، زەوی لەنێوان منداڵەکانی نوح دابەش کرد.

بەڵام گێڕانەوەکان لەپێغەمبەر و زاناکانی شارەزای ڕەچەڵەکی خەڵکانی کۆن بەمشێوەیە و لەگێڕانەوەی سەمووره باسی کراوە، فەرمووی: سام باوکی عەرەب و یافس باوکی ڕۆم و حام باوکی حەبەشە. ئاماژەیان بەچەندین گێڕانەوەی دیکە بەم ناوەڕۆکە داوە.

گێڕانەوەیەك لەسەعید کوڕی موسەییب هەیە کەدەڵێت: نوح سێ کوڕی بوو و هەرکامیان سێ کوڕ: سام و حام و یافس. سام، باوکی عەرەب و ڕۆم و فارسە کەهەموویان چاکەکارن. یافس، باوکی تورك و سەقلاب و یاجوج و ماجوج کەچاکەیان لێ نابینرێت. حام، باوکی قبتی و ڕەشەکان و بەربەرە.

لەحەمزە کوڕی ڕەبیعە دەگێڕنەوە: هەر ڕەشێکی موو فڕ منداڵی حامە، هەر روخسار گەورەیەکی چاو بچوك منداڵی یافسە، هەر جوان روخسارێکی قژ جوان کوڕی سامە.

دەڵێت: نوح، حامی نفرین کرد تا قژی منداڵەکانی لەگوێچکەیان تێنەپەڕێت و لەهەر شوێنێك منداڵەکانی ڕووبەڕووی منداڵەکانی سام بوونەوە، بیانکەن بەکۆیلە.

بەگومانی شوێنکەوتەکانی تەورات تەمەنی نوح پێنسەد ساڵ بوو، کەسام

چاوی بەدنیا هەڵهێنا، تەمەنی سام سەد و دو ساڵ بوو کەئەرفەخشز چاوی بەدنیا هەڵهێنا. هەموو ساڵەکانی تەمەنی سام، وەك دەڵێن، سەد و دو ساڵ درێژەی کێشا.

ئەرفەخشز، قینانی هێنایە دنیا و هەموو ساڵەکانی تەمەنی ئەرفەخشز چوارسەد و سی هەشت ساڵ بوو. ئەرفەخشز لەکاتی لەدایك بوونی قینان، سی وپێنج ساڵ تەمەنی بوو.

قینان، شالخی هێنایە دنیا لەکاتێکدا تەمەنی قینان سی و نۆ ساڵ بوو. لەکتێبەکاندا ئاماژەیان بەدرێژی ساڵەکانی تەمەنی قینان نەداوە، لەبەر ئەو هۆکارەی پێشتر ئاماژەمان پێدا.

شالخ، عابری هێنایە دنیا و لەکاتی لەدایك بوونی ئەو، تەمەنی سی ساڵان بوو. هەموو ساڵەکانی تەمەنی شالخ چوارسەد و سی و سێ ساڵە.

عابر، فالغ و قەحتانی هێنایە دنیا. فالغ سەد و چل ساڵ دوای تۆفان چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

کاتێك خەڵکان فراوان و تۆفانەکەیان لەبیر بوو، بناغەی شارێکیان داڕشت تا لەوێ کۆببنەوە و بڵاوەی لێنەکەن یا بورجێکی گەورە دروست بکەن بۆ ئەوەی ئەگەر تۆفان روویدا، پارێزراو بن و نەخنکێن. خواوەند مەبەستی ئەوەی کرد کارەکەیان سەرنەگرێت و گومانەکەیان نەبێتە راستی تابزانن هەموو دەستەلاتەکان لەدەستی ئەودایە. بڵاوەی بەکۆبوونەوەکەیان کرد و زمانەکانی ئەوانی بۆ چەندین زمان دابەش کرد.

ساڵەکانی تەمەنی عابر چوارسەد و حەفتا و چوار ساڵە.

فالغ، ئەرغەوای هێنایە دنیا و هەموو تەمەنی ئەرغوا دوسەد وسی و حەوت ساڵ درێژەی کێشا. لەکاتی لەدایك بوونی ئەرغوا تەمەنی سی ساڵ بوو.

ئەرعوا، ساروغی هێنایە دنیا و ساڵەکانی تەمەنی ئەرغوا دوسەد و نەوەد وسێ ساڵ بوو. لەکاتی لەدایك بوونی ساروغ تەمەنی سی و دوو ساڵ بوو.

ساروغ، ناحوری هێنایە دنیا و ساڵەکانی تەمەنی دوسەد وسی ساڵ درێژەی کێشا. لەکاتی لەدایك بوونی ناحور سی ساڵ تەمەنی بوو.

ناحور، تارخی هێنایە دنیا کەباوکی ئیبراهیمە. باوکی ئەم ناوەی لێنا و کاتێک سەرپەرەستی کردنی خواکانی (بتەکان) نەمروودی گرتە ئەستۆ، ناوی ئازەری لێنا.

دەڵێن: ئازەر ناوی باوکی ئیبراهیم نەبوو، بەڵکو ناوی بتێکە. ئەم وتەیان لەموجاهید گێڕاوەتەوە. بەوتەی ئەو، ئەمە نازناوی تارخە بەمانای کەمئەندامی دێت چوونکە ئەو گێر بوو.

ناحور لەکاتی لەدایك بوونی تارخ، بیست و حەوت ساڵە بوو. تەمەنی ناحور دوسەد و نەوەد و هەشت ساڵ درێژەی کێشا.

تارخ، ئیبراهیمی هێنایە دنیا و لەکاتی لەدایك بوونی ئیبراهیم، هەزار و حەوتسەد و نۆساڵ بەسەر تۆفانەکەی نوح تێپەڕی کردبوو.

دەستەیەك لەشوێنکەوتەکانی کتێب وتوویانە لەدایك بوونی ئیبراهیم دوسەد و شەست و سێ ساڵ دوای تۆفان و سێ هەزار و سی و حەوت ساڵ، دوای لەدایك بوونی ئادەم بوو.

قەحتان کوڕی عابر، یەعربی هێنایە دنیا و یەعرب، یەشجب و یەشجب، سەبا و سەبا، حەمیر و کەهلان و عومەر و ئەشعەر و ئەنمار و موڕ و عاملەی هێنایە دنیا.

عومەر کوڕی سەبا عودەی هێنایە دنیا و عودەی لەخم و جوزام.

بەگومانی دەستەیەك لەڕەچەڵەك ناسانی فارسی، نوح هەمان ئەفرەیدونە و ئاژیدهاقی لەناو برد و پاشایەتی لێ سەندەوە. دەستەیەکی دیکە گومان دەکەن ئەفرەیدونی زولقەرنەیین هەمان نەیارەکەی ئیبراهیمی پێغەمبەرە کە لە (بئر السبع) کۆچی دوایی کرد و لەقورئاندا ناوی هاتووە.

دەستەیەکی دیکە دەڵێن ئەو سلێمان کوڕی داوودە. لێرەدا ئاماژەمان پێدا چوونکە وتوویانە، ئەو نوحە. داستانی ژیانی ئەو هاوشێوەی نوحە کەئەویش سێ منالی هەبوو، دادپەروەر و جوان روخسار و زوحاك لەسەر دەستی ئەو کوژرا.

دەڵێن لەناوچونی زوحاك لەسەر دەستی نوح رویدا و نەتەوەی نوح هەمان

نەتەوەی زوحاکە.

فارسەکان سەبارەت بەڕەچەڵەکی ئەفرەیدون دەڵێن کەئە و لەمناڵەکانی جەم شاد پاشایە. وەك چۆن پێشتر ئاماژەمان پێدا، ئەزدهاق ئەوی کوشت. نێوان فەرەیدون و جەم دە باوکە.

لەگێڕانەوەکەی هوشامی کەلبی بیستم کەئەفرەیدون لەوەچەی جەم پاشایە وپێش زوحاکە. گومانیان کردووە نۆیەمین وەچەی جەمە و لەدۆنباوەند چاوی بەدنیا هەڵهێنا و لەوێوە شۆڕشی کرد تا گەشتە شوێنی زوحاك و ئەوی گرت و بەندی کرد. دوسەد ساڵ پاشایەتی و شەڕی ستەمکارانی کرد و خەڵکی بۆ خواپەرەستی و چاکەکاری هاندا و زەوی و هەموو ئەو شتانەی زوحاك لەخەڵکانی زەوت کردبوو، بۆ خاوەنەکانیان گەڕاندەوە مەگەر ئەوانەی خاوەنیان نەبوو کە لەنێوان هەژاران و خەڵکان بەگشتی دابەشی کرد.

دەڵێن: یەکەم کەسە سەرقاڵی زانستەکانی پزیشکی و ئەستێرە ناسی بوو. سێ کوڕی بۆ هاتەدنیا، گەورەکەیان ناوەی سەرەم، دوەمی ناوی توج و سێیەمی ناوی ئیرەج بوو.

ئەفرەیدون دەترسا لەوەی کوڕەکانی لەناو خۆیاندا تەبا نەبن و دەست درێژی بکەنە سەریەك. لەبەر ئەمە پاشایەتی خۆی لەناو ئەواندا دابەش کرد و لەسەر تیرەکان نووسی. فەرمانی پێدان هەرکامیان تیرێك هەڵبگرن. ڕۆم و ناوچەکانی ڕۆژئاوا بەسەرەم بڕا، تورك و چین بۆ توج و عێراق و سند بۆ ئیرەج. تاج و تەختی بەو بەخشی. کاتێك ئەفرەیدون مرد، دوبراکەی هێرشیان کردە سەر ئیرەج وکوشتیان و بۆماوەی سێسەد ساڵ پاشایەتی لەناو ئەواندا بەردەوام بوو.

دەڵێت: بەگومانی فارسەکان باوکانی ئەفرەیدون تا دەپشت ناوی ئەسقیان بوو. لەبەر ئەوەی لەستەمی زوحاك بۆ سەر مناڵەکانی خۆیان دەترسان و دەیاوت کەیەکیان بەسەر زوحاکدا زاڵ دەبێت و تۆڵەی جەم دەستێنێتەوە. ئەوان بەنازناوەکان دەناسرانەوە. یەکیان بەئەسقیان خاوەنی گای سوور ناو دەبرد و ئەویان بەئەسقیان خاوەنی گای ئەبڵەق و خاوەنی گای فلانە ڕەنگ و گای فیسارە ڕەنگ. فەرەیدون کوڕی ئەسقیان مانگادار بوو بەمانای خاوەنی گای زۆر. کوڕی

ئەسقیانی مانگا چاک، یانی خاوەنی مانگا چاکەکان، کوڕی ئەسقیان گای تێر، یانی خاوەنی مانگا قەڵەوەکان، کوڕی ئەسقیانی پور گا. یانی خاوەنی گاکان بەڕەنگی کەڵەکێوی، کوڕی ئەسقیانی ئەخشین گا، یانی خاوەنی مانگا زەردەکان، کوڕی ئەسقیانی ڕەش گا، یانی خاوەنی مانگا ڕەشەکان، کوڕی ئەسقیانی سپی گا، یانی خاوەنی مانگا سپییەکان، کوڕی ئەسقیانی کبر گا، یانی خاوەنی مانگا خۆڵەمێشیەکان، کوڕی ئەسقیانی ڕەمین گا، یانی خاوەنی هەموو جۆرە مەڕومالاتێك و هەموو جۆرە مانگایەك،کوڕی ئەسقیان کوڕی بنفروسن کوڕی جەم شاد.

دەڵێن: ئەفرەیدون یەکەم کەس بوو نازناوی (کەی) پێبڕا و بەناوی کەی ئەفرەیدون بانگیان دەکرد. مانای کەی، پاکە، وەك دەڵێن ڕۆحانی یانی کارەکانی ئەو پاك و تایبەتە و پەیوەستی ڕۆحیانییەت بووە و دەڵێن مانای کەی سوودخوازە و بەگومانی دەستەیەك، کەی بەمانای شکۆ دێت و ئەفرەیدون کاتێك زوحاکی کوشت، شکۆی پێبڕا.

فارسەکان دەڵێن: فەرەیدون پیاوێکی چوارشانە و جوان روخسار وخاوەن شکۆ و شارەزا بوو. زۆربەی شەڕەکانی بەگورز دەکرد و سەری گورزەکەی هاوشێوەی سەر گا بوو.

پاشایەتی ئیرەج لەعێراق وسەرزەمینەکانی دەورووبەری لەرۆژگاری ئەودا و رۆژگاری ئیرەج لەگەڵ رۆژگاری پاشایەتی فەرەیدون تێکەڵ بوو. ئەو، پاشایەتی هەموو هەرێمەکانی دەکرد و بەناو سەرزەمینەکاندا گەڕا و کاتێك لەسەر تەخت دانیشت، وتی: بەهاوکاری و هاریکاری خواوەند، زوحاکمان لەناو برد و شەیتان و دار و دەستەکەیمان سەرکوت کرد. ئامۆژگاری خەڵکانی کرد و بۆ دادپەروەری و سوپاس کردنی خواوەند هانیدان. حەوت کێویار یانی سەرپەرەستی کوێستانەکانی دۆنباوەند و شوێنەکانی دیکە دەستنیشان کرد و ناوچەکانی بەوان سپارد.

دەڵێن کاتێك بەسەر زوحاکدا زاڵبوو، زوحاك پێی وت: من لەتۆڵەی باوەگەورێت، جەم مەکوژە.

فەرەیدون وتی: خۆت بەگەورە دەزانیت کەبەم شێوەیە تەماحت هەیە. بیری خستەوە کەباوەگەورێی گەورەتر لەوەیە هاوشانی زوحاك بێت و وتی ئەو لەتۆڵەی مانگایەکی ماڵی باوەگەورێی دەکوژێت.

دەڵێن فەرەیدون یەکەم کەس بوو فیلی دەستەمۆ کرد. سوار فیل و ئێستر بوو، مراوی و کۆتری راگرت و تریاکی هەبوو. شەڕی دوژمنانی دەکرد و لەناوی دەبردن و زەوی لەنێوان سێ کوڕەکەی خۆی دابەش کرد. سنورەکانی چین و خەزەر و تورکی بەتوج بەخشی و بەچینی بەغا ناوی دەرکرد. هەموو سەرزەمینەکانی دەوروبەری پەیوەستی سنوری فەرمانڕەوایەتی توج کرد. رۆم و سەقلاب و بەرجان و سەرزەمینەکانی دەوروبەری بەسەلەم بەخشی و بەشی ناوەڕاست و ئاوەدانی زەوی کەسنوری بابلە و بەخەنارس ناویان دەبرد لەگەڵ سند و هند و حجیاز و شوێنەکانی دیکەی بەئیرەج بەخشی کەبرا بچوکی هەموویان بوو و ئەوی زیاتر لەبراکانی دیکەی خۆش دەویست. لەبەر ئەمە سنوری بابل شار ناوەکەی بۆ ئێرانشار گۆڕا. هەروەها لەبەر سنوری بابل ناسازگاری و دژایەتی لەنێوان منداڵەکانی فەرەیدون و منداڵی منداڵەکانی هاتە کایەوە و پاشاکانی خارس و تورك و رۆم بەمەبەستی تۆڵەسەندنەوە شەڕیان دەست پێکرد.

دەڵێن کاتێك توج و سەلەم زانیان باوکیان لەپێشی بەئیرەج بەخشیوە، دژایەتی ئەویان کرد ودوژمنایەتی لەنێوان ئەوان پەرەی سەند تا ئەوەی توج و سەلەم هێرشیان کردە سەرئیرەج و بەهاوکاری یەك ئەویان کوشت. توج کەمەندێکی هەڵدا و ئەوی خنکاند. بەم شێوە تورکەکان بوون بەکەمەند هاوێژەکان.

ئیرەج دوو کوڕی بوو بەناوەکانی وەندان و ئەستونە و کچێك بەناوی خوزەك و بەوتەی دەستەیەك خوشەك. سەلەم و توج دوو کوڕەکە و باوکیان کوشت و کچەکە مایەوە.

دەڵێن: رۆژێك کەفەرەیدون بەسەر زوحاکدا زاڵبوو. رۆژی مێهری مانگی مێهر(ڕەزبەر) بوو و خەڵك ئەم رۆژەیان کردە جەژن چوونکە ڕەنج و زیانی زوحاك

لەناو ئەوان کۆچی کرد. لەبەر ئەمە بەمێهرەگان ناویان برد.

دەڵێن: فەرەیدون ستەمکارێکی دادپەروەر بوو، بەرزی بالآی نۆ رم و هەر رمێك بەئەندازەی کێشراوی دوو دەست بوو. پانایی کەمەری سێ رم و پانای سینەی چوار رم بوو.شوێن پاشماوەی نبتیەکان و نەمروودییەکانی سوادی عێراق کەوت و گەورەکانی ئەوانی کوشت و شوێنەواری سڕینەوە. پاشایەتی ئەو پێنسەد ساڵی خایاند.

## وتار سەبارەت بەو ڕووداوانەی لەسەردەمی نوحتاسەردەمی ئیبراهیمی خەلیل ڕوویاندا

پێشتر ئاماژەمان بە بەسەرهاتی نوح و منالەکانیدا کەزەویان لەدوای باوکیان دابەش کرد و وتمان کەشوێنی هەردەستەیەك کوێ بوو. دو دەستە لەمنالەکانی ئەرەم کوڕی سام کوڕی نوح دوای نوح یاخیگەرییان کردە پیشە: یەکیان منالەکانی عاد کوڕی عەوس کوڕی ئەرەم کوڕی سام کوڕی نوح کەعادی کۆن بوون و ئەوی دیکەیان سەموود کوڕی جاسر کوڕی ئەرەم کوڕی سام کوڕی نوح کەهەموویان لەعەرەبە ڕەسەنەکان بوون.

نەتەوەی عاد:

خواوەند هود کوڕی عەبدالله کوڕی رەباح کوڕی جەلود کوڕی عاد کوڕی عەوس کوڕی ئەرەم کوڕی سام کوڕی نوحی وەك پێغەمبەر بۆ لای ئەوان ڕەوانە کرد. بەگومانی دەستەیەك لەڕەچەڵەك ناسان، هود، عامر کوڕی شالخ کوڕی ئەرفەخشز کوڕی سام کوڕی نوحە. نەتەوەی هود سێ بتیان هەبوو ودەیانپەرەست. یەکیان صدا و ئەوی دیکەیان صەمود و سێیەمی راهبا. هود پێشنیاری پەرەستینی خوا و دەست کێشانەوە لەستەمکاری پێکردن بەلاّم رازی نەبوون و وتیان: چ کەسێك لەئێمە بەهێزترە. تەنیا دەستەیەکی کەم باوەڕیان بەهود هێنا.

کاتێك لەسەر یاخیگەری و گوناحکاری پێداگریان کرد، هود ئامۆژگاری کردن و وتی:

((اتبنون بکل ربع آیة تعبثون. و تتخذون مصانع لعلکم تخلدون. و اذا بگشتم بگشتم جبارین. فاتقوالله و اطیعون. و اتقوالذی امدکم بما تعلمون. امدکم بانعام و بنین. و جنات و عیون. انی اخاف علیکم عذاب یوم عظیم. واتاکەی: بۆ لەهەر شوێنێك بەبێهۆ، نیشانەیەك بینا دەکەن؟ و ئەستێرەکان دروست دەکەن، مەگەر

هەمیشەیی و نەمر دەبن؟ کاتێك سەرسەختی دەکەن، هاوشێوەی ستەمکاران سەرسەختی دەکەن. لەخوا بترسن و گوێ لەفەرمانەکانم بگرن لەو کەسەی کەئەوەی دەیزانن، هاوکاری کردوون، بترسن چوونکە بەپێدانی چوارپێکان و منداڵەکانتان هاوکاری کردوون، بەباغ و کانیاوەکان، من بۆ ئێوە لەئازابی رۆژی گەورە دەترسم.))

وەڵامیان بۆ هود ئەمە بوو:

قالواسواء علینا او عظت ام لم تکون من الواعظین.

واتاکەی: وتیان: ئامۆژگاری بکەیت یا ئامۆژیار نەبیت، بۆ ئێمە چون یەکە.))

((و قالوا یا هود ما جئتنا ببینة و ما نحن بتارکی آلهتنا عن قومك و ما نحن لك بمؤمنین، ان نقول الا اعتراك بعض آلهتنا بسوؤ.

واتاکەی: وتیان: ئەی هود هیچ بەڵگە و نیشانەیەکت بۆ ئێمە نەهێناوە و بەوتەکانی تۆ پشت ناکەینە خواکانی خۆمان و باوەڕ بەتۆ ناکەین و جگە لەمە ناهێنینە سەرزمان کەدەستەیەك لەخواکانی ئێمە زیانیان لەتۆداوە.))

وەك وتوویانە خواوەند بۆ ماوەی سێ ساڵ بارانی لەوان گرتەوە تا ئەوەی کەوتنە ڕەنجەوە. دەستەیەکیان بۆ داواکردنی باران ڕەوانە کرد.داستانەکەی لەگێڕانەوەی حەسانی بەکریدا هاتووە، دەڵێت:((ڕۆشتمە لای پێغەمبەر(د.خ) و لەرەبزە ژنێکم بینی، دەیوت: دەتوانی من بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) ببەیت؟

وتم: بەڵێ و ئەوم هەڵگرت تا گەیشتمە مەدینە و ڕۆشتمە ناو مزگەوت. پێغەمبەر(د.خ) لەسەر مینبەر بوو و بیلال شمشێر لەدەست و ئاڵای ڕەشیان هەڵکردبوو.

وتم: ئەمە چییە؟

وتیان: عەمرۆ کوڕی عاص لەغەزا (شەڕ لەرێگەی خوا) هاتۆتەوە.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەمینبەر هاتەخوار، ڕۆشتمە لای و داوای مۆڵەتم لێکرد و وتم: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، ژنێك لەمناڵەکانی تەمیم لەبەردەرگایە و داوای لەمن کرد بیهێنمە لای تۆ.

فەرمووی: بیلال مۆڵەتی پێبدە.

دەڵێت: ژن هات و کاتێك دانیشت. پێغەمبەر(د.خ) بەمنی فەرموو: لەنێوان ئێوە و مناڵەکانی تەمیم هیچ روویداوە؟

وتم: بەڵێ و شکست بەوان برا، ئەگەر دەخوازیت سارا لەنێوان ئێمە و ئەوان بکەیتە سنور، ئەو کارە بکە.

ژن وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، نیازمەند بەتۆ روو لەکوێ بکات؟

وتم: من هاوشێوەی ئەو مەڕەم گورگێکی لەگەڵ خۆیدا بردبێت. پێم وت: تۆم هێنا بۆ ئەوەی ببیتە دوژمنم؟ خوا نەکات هاوشێوەی نێردراوەکانی عاد بم.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: نێردراوەکانی عاد چۆن بوون؟

وتم: بەباشی داستانەکەیان دەزانم. عادییەکان گرفتاری وشکەساڵی بوون و کەسانێکیان بۆ دۆعای باران ڕەوانە کرد. ئەوان لەمەککە لای بەکر کوڕی معاویە تێپەڕین کەشەرابی پێدان و دوو کەنیز بۆ ماوەی یەك مانگ گۆرانیان بۆ خوێندن. دواتر یەکێکیان بەرەو کوێستانەکانی موهرە ڕەوانە ودۆعای کرد. هەورەکان دەهاتن و کاتێك هەورێك دەهات، پێی دەوت بۆ فلان شوێن بڕۆ تا ئەوەی هەورێك هات وتی: بیگرە، ئەمە خۆڵەمێشە و لەخەڵکانی عاد کەس بەزیندوویی مەهێڵەرەوە.

وتی: نێردراو ئەمەی بیست و لەوانی شاردەوە تا سزایی خوایی گەیشت.

باوکی بەکر کوڕی عەیاش سەبارەت بەداستانی خەڵکانی عاد دەڵێت، نێردراو بەرەو کوێستانەکانی موهرە سەرکەوت و وتی: خوایە بۆ ئەسیرێك نەهاتووم تا بەهای ئازادییەکەی بدەم یا نەخۆشێك کەشیفای ببەخشی، بارانمان پێ ببەخشە.

دەڵێت: هەورەکان هاتن و دەنگێکی بەرگوێ کەوت کە لەم هەورانە خۆت بەدوور بگرە. ئەو بەردەوام دەیوت: بۆ لای مناڵەکانی فلان بڕۆن. لەکۆتاییدا هەورێکی ڕەش هات و نێردراو وتی: بەرەو عاد بڕۆم. دووبارە دەنگ بەگوێچکەی گەیشت کەوتی، بگرە ئەمە خۆڵەمێشە و لەخەڵکانی عاد کەس بەزیندووی مەهێڵەرەوە.

دەڵێت: داستانەکەی لەو دەستەی لای بەکر کوڕی معاویە سەرقاڵی شەراب

خواردن بوون، شاردەوە و بەکر کوڕی معاویە نەیویست. داستانەکە بەمیوانەکانی بڵێت، بەڵام لەناو گۆڕانییەکەدا ناوەڕۆکەکەی باس کرد.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك نەتەوەی عاد گیرۆدەی وشکەساڵی بوون، وتیان دەستەیەك بۆ مەدینە ڕەوانە دەکەین تا داوای بارانمان بۆ بکات. وەقیل کوڕی عەمرۆ و لەقیم کوڕی هەزال کوڕی هوزەیل، عەبیل کوڕی زد کوڕی عادی گەورە و مورسەد کوڕی سەعد کوڕی عەفیر کەموسوڵمان بوو و باوەڕی خۆی دەشاردەوە، هاوڕێ لەگەڵ جەلهەمە کوڕی خەیبەر خاڵی معاویە کوڕی بەکر و لوقمان کوڕی عاد کوڕی فلان کوڕی زید کوڕی عادی گەورەیان ڕەوانە کرد. ئەوان هەرکام لەگەڵ دەستەیەك لەخەڵکەکەی خۆیان بەرێکەوتن و کۆی گشتی نێردراوەکان حەفتا کەس بوو. کاتێك گەیشتنە مەککە، لای معاویە کوڕی بەکر دابەزین. جێگەیان لەدەرەوەی مەککە و لەدەرەوەی حەرەم بوو. معاویە میوانداری ئەوانی کرد و ڕێزی گرتن چوونکە خاڵوان و زاواکانی ئەو بوون. هوزەیلە کچی بەکر و خوشکی معاویە، هاوسەری لەقیم کوڕی هەزال بوو کەعوبەید کوڕی لەقیم و عومەیر کوڕی لەقیمی هێنایە دنیا. ئەوان لەبنەماڵەی معاویە لای خاڵۆکانی خۆیان ژیانیان بەسەر دەبرد. ئەوان لەخەڵکانی عادی کۆتایی و پاشماوەی عادی کۆن بوون.

کاتێك نێردراوەکان لای معاویە کوڕی بەکر دابەزین، بۆ ماوەی یەك مانگ لای ئەو مانەوە و شەرابیان خوارد و دوو کەنیزی معاویە گۆڕانیان بۆ دەخوێندن. یەك مانگ ڕێگەیان بڕیبوو و یەك مانگ جێگەیان خۆش کرد. کاتێك معاویە بینی مانەوەیان درێژەی کێشاوە و خەڵکەکەیان ئەوانیان ڕەوانە کردووە تا بۆ نەهێشتنی بەڵای وشکەساڵی دۆعایان بۆ بکەن وبۆیان بپارێنەوە، ئەم کارەی ئەوانی پەسەند نەکرد و وتی: خاڵۆکان و زاواکانم لەناوچوون. ئەمانە میوانی من و لەسەر سفرەی من دابەزیون، نازانم چی بکەم وشەرم دەکەم بڵێم بەدوای مەبەستەکەی خۆیاندا بڕۆن چوونکە گومان دەکەن لەمانەوەیان بێزار بووم، بەڵام خەڵکەکەیان لەتاو تینویەتی وبێ ئاوی لەناوچوون. ئەم داستانەی لەگەڵ دوکەنیزە گۆڕانیبێژەکەی خۆی باس کرد و وتیان: شێعرێك بهۆنەرەوە تا بەگۆڕانی بۆیان بخوێنین و نازانن شاعیرەکەی کێیە، بەڵکو بکەونە خۆ. معاویە

شێعرێکی بەم ناوەرۆکە هۆنییەوە:

ئەی قیل، هەستە و دۆعا بکە

ئەگەری هەیە خواوەند هەورێك بنێرێت

چوونکە خەڵکی عاد لەتاو تینویەتی

ناتوان قسە بکەن و پیر وپەککەوتە

و گەنج، هیوای بارانیان نییە

حاڵی ژنان خراپ نەبوو و هەنووکە

ژنانیش بێوەژن کەوتوون.

ئاژەڵە وەحشیەکان بەئاشکرا بەرەو لای خەڵکانی عاد دەڕۆن

و لەتیری ئەوان ناترسن

و ئێوە لەم کاتەدا بەدڵخوازی خۆتان شەو و رۆژ بەسەر دەبەن.

چ نێردراوانێکی خراپن

و شیاوی درووود و سڵاو نین.

کاتێك معاویە ئەم شێعرەی وت و کەنیزەکان بەگۆڕانی خوێندیانەوە، و نێردراوەکان دەنگی ئەوانیان بیست، بەیەکیان وت: خەڵکەکەتان ئێوەیان ڕەوانە کردووە تا بۆ دوور خستنەوەی زیانەکانی وشکەساڵی بۆیان بپاڕێنەوە وئێوە دانیشتون. بڕۆنە ناو حەرەم و دۆعای باران بخوێنن.

مورسەد کوڕی سەعد کوڕی عەفیر وتی: سوێند بەخوا ئێوە بەدۆعا کردن بارانتان دەست ناکەوێت. بەڵام ئەگەر شوێن پێغەمبەرەکەی خۆتان بکەون و بۆ لای ئەو بگەڕێنەوە، بارانتان دەست دەکەوێت. بەمشێوەیە باوەڕی خۆی ئاشکرا کرد. جەلهەمە کوڕی خەیبەر کاتێك ئەمەی بیست و زانی ئەو باوەڕی بەهود هێناوە و شوێنکەوتەی دینەکەی ئەوە، شێعرێکی بەم ناوەرۆکە هۆنییەوە:

((ئەی سەعد تۆ لەبنەماڵەیەکی بەرێزیت

و دایکت لەنەتەوەی سەموودە

بەڵام ئێمە هیچ کات شوێن تۆ ناکەوین

و ئەوەی دەیڵێیت، ئەنجامی نادەین

پێمان دەڵێیت پشت لەدینی ڕەفد و ڕەمل و بنەماڵەی زد و عەبود بکەین و پشت بکەینە ئایینی باوباپیرانی ئازیزی خۆمان و شوێن دینەکەی هود بکەوین.))

ڕەفد و ڕەملُ و زد لەهۆزەکانی عاد بوون و عەبودیش یەکێك بوو لەوان.

دواتر بەمعاویە کوڕی بەکری وت: مورسەد کوڕی سەعد لای خۆت بێڵەرەوە بۆ ئەوەی لەگەڵ ئێمەدا نەیێت بۆ مەککە، چوونکە باوەڕی بەدینی هود هێناوە و پشتی کردۆتە دینەکەی ئێمە. بەرەو مەککە بەرێکەوتن و بۆ نەتەوەی عاد دۆعای بارانیان کرد. کاتێك رێگەی مەککەیان گرتەبەر، مورسەد کوڕی سەعد لەماڵی معاویە هاتەدەرە و پێش ئەوەی دۆعای باران دەست پێبکەن، پێیان گەیشت. لەگەڵ ئەوان وەستا و نێردراوان بۆ دۆعا کۆبوونەوە. مورسەد وتی: خوایە تەنیا نیازی من بەراوەردە بکە و دۆعای من تێکەڵ بەدۆعای ئەوان مەکە. گەڕایەوە. قیا کوڕی عابر سەرۆکی نێردراوانی عاد بوو، نێردراوانی عاد وتیان: ((خواوەندا، ئەوەی قیل داوای دەکات، پێی ببەخشە ودۆعاکەی ئێمە بکە هاوڕێی دۆعاکەی ئەو.

لوقمان کوڕی عاد لەنێردراوانی عاد جیابیویەوە، ئەو سالاری نەتەوەی عاد بوو و کاتێك نێردراوان لەدۆعا کردن و پاڕانەوە تەواو بوون، وتی: ئەی خواوەندا، تەنیا بۆ نیازی خۆم هاتووم، نیازەکەم بێنەدی. قیل کوڕی عابر لەکاتی دۆعا وتی: خواوەندا، ئەگەر هود راستگۆیە، باران بەئێمە ببەخشە، چوونکە لەمردن نزیك بوینەتەوە. خواوەند سێ هەوری ڕەوانە کرد، سپی و سوڕ و ڕەش. یەکێك لەهەورەکان هاواری کرد، ئەی قیل، بۆخۆت و خەڵکەکەت یەکێك لەم هەورانە هەڵبژێرە. وتی: هەوری ڕەشم هەڵبژارد چوونکە لەهەورەکانی دیکە زیاتر بارانی پێیە. و دەنگ لەئاسمانەوە هات کەخۆڵەمێشت هەڵبژارد و لەنەتەوەی عاد کەس نەمایەوە، نە باوك دەمێنێتەوە و نە منالْ و هەموویان لەناو دەچن، جگە لەمناڵەکانی لوزیە کەباوەڕیان بەرێگەی راست هێناوە. مناڵەکانی لوزیە مناڵەکانی لەقیم کوڕی هەزار کوڕی هوزەیل کوڕی هوزەیلە کچی بەکر بوون و لەگەڵ خاڵەکانی خۆیان لەسەرزەمینی مەککە نیشتەجێ و لەسەرزەمینی عاد دوور

بوون. ئەوان پاشماوەی خەڵکانی عادی کۆنن.

خواوەند بەهەمان شێوە کەوتوویانە، هەوری ڕەش کەقیل کوڕی عابر هەڵیبژارد و سزای خواوەندی هەڵگرتبوو، بۆ لای خەڵکانی عاد ڕەوانەی کرد. هەورەکە گەیشتە دۆڵەکەی ئەوان بەناوی مەغیس. کاتێك هەورەکەیان بینی، شادمان بوون و وتیان: ئەم هەورە باران دەبارێنێت. خواوەند دەفەرمێت:

((بل هو ما استعجلتم بەريح فيها عذاب اليم. تدمر كل شيئى بامر ربها.

واتاکەی: ئەمە شتێکە بەپەلە داواتان کرد. بایەکە ئازابێکی دەردهێنەری هەڵگرتو و بەفەرمانی پەروەردگار هەموو شتێك لەناو دەبات.))

وەك وتوویانە، یەکەم کەس زانی چی لەهەورەکەدایە و جگە لەبا هیچی تیا نییە، ژنێك لەعاد بوو بەناوی مەهدەد. کاتێك زانی هەورەکە چی هەڵگرتووە، هاواری کرد و لەهۆش خۆی چوو، کاتێك هاتە هۆش، وتیان: چیت بینی؟

وتی: بایەکم بینی وەك بڵێسەکانی ئاگر و لەپێشیەوە پیاوەکان بوون کە بۆ پێشەوە دەیانبردە پێش.

خواوەند بۆماوەی حەوت شەو و ڕۆژ بای بەسەر ئەواندا زاڵ کرد. لەخەڵکی عاد کەس نەمایەوە و هەموویان کوژران.

دەڵێن: هود و باوەڕداران بەهود، لەچواردیواریەکدا مانەوە. ئەو بایەیی بەوان دەگەیشت، فێنك وچێژ بەخش بوو، بەڵام کاتێك با بەخەڵکانی عاد دەگەیشت، ئەوانی بەرز دەکردەوە و دەیکێشان بەبەردەکاندا.

نێردراوانی عاد لەمەککەوە گەڕانەوە لای بەکر کوڕی معاویە و باوکی و لای ئەو دابەزین. لەشەوێکی مانگەشەو، پیاوێك سوار لەسەر وشتر هات و هەواڵی مردنی خەڵکی عادی پێدان. ئەمە لەسێیەم ڕۆژی ڕووداوەکەدا بوو. وتیان: هود لەکوێ بوو؟

وتی: لەکەناری دەریا لەوان جیابوومەوە. گومانیان لەقسەی ئەو پیاوە کرد. بەڵام هوزەیلە کچی بەکر وتی: سوێند بەخوای کەعبە راست دەکات.

مسەوەب کوڕی یەعفەر کوڕی برای معاویە کوڕی بەکر لەگەڵ ئەوان بوو، وەك دەڵێن و خوا زاناترە، بەمورسەد کوڕی سەعد و لوقمان کوڕی عاد و قیل کوڕی

عابری وت کاتێك لەمەککە دۆعایان دەکرد: ئارەزوی ئێوە دێتەدی، بۆخۆتان هەڵبژێرن بەڵام تەمەنتان هەمیشەیی نابێت چوونکە هیچ ڕێگەیەکی هەڵاتنتان لەمردن نییە.

مورسەد کوڕی سەعد وتی: خوایە ڕێگەی چاك و راستیم پیێ ببەخشە و پێی بەخشرا.

لوقمان کوڕی عاد وتی: خوایە تەمەنی فراوانم پیێ ببەخشە. وترا: تەمەن بۆ خۆت دیاری بکە بەڵام داوای نەمری مەکە، تەمەنێك وەك بزنێکی خۆڵاوی، لەکێوێکی سەخت کەتەنیا باران دەبینێت یا تەمەنی حەوت داڵ کەکاتێك یەکیان بڕوات، ئەوی دیکە جێگەی بگرێتەوە. لوقمان داڵەکانی هەڵبژارد و وەك دەڵێن بەئەندازەی تەمەنی حەوت داڵ ژیا. جوجکەیەك کاتێك سەری لەهێلکە دەردەهێنا، دەیکوشت و کاتێك دەمرد جوجکەیەکیتر و ئەم کارەی کرد تا گەیشتە جوجکەی حەوتەم. وەك دەڵێن تەمەنی هەر داڵێك هەشتا ساڵە و کاتێك دوایین داڵ مایەوە، برازاکەی لوقمان وتی: مامەگیان، لەتەمەنی تۆ بەئەندازەی تەمەنی ئەم داڵە ماوەتەوە.

لوقمان وتی: برازاکەم، ئەمە (لبدە). لبد لەزمانی خەڵکانی عاد بەمانای ڕۆژگارە.

کاتێك داڵەکەی لوقمان پیر و تەمەنی کۆتایی هات، بەرەبەیان داڵەکان لەکێوەکە بەرز بوونەوە بەڵام ڕۆژگار نە. لوقمان چاودێری داڵەکەی خۆی دەکرد و کاتێك بینی لەگەڵ داڵەکانی دیکە هەڵنەفڕی، ڕێگەی کێوەکەی گرتەبەر بۆ ئەوەی بزانێت چی بەسەر داڵەکەی هاتووە، لاوازی بەسەریدا زاڵ بوو، پێشتر خۆی بەمشێوەیە نەبینیبوو. کاتێك گەیشتە سەر کێوەکە، داڵەکەی خۆی بینی کە لەداڵەکانی دیکە بەجێماوە. هاواری لێکرد هەستە و بفڕە. داڵ مەبەستی فڕینی کرد بەڵام نەیتوانی، چنگاڵەکانی سست و لاواز ببون. هەردوکیان کەوتن و مردن.

بەقیل کوڕی عامر وترا کەدەنگی هەورەکەی بیستبوو: بۆ خۆت هەڵبژێرە بەهەمان شێوە کەدوو هاورێکەت هەڵیانبژارد. وتی: دەمەوێت ئەوەی دەبێتە بەشی خەڵکەکەم، ببێتە بەشی منیش. وترا: کوژرانە. وتی: هەرچی بێت، دوای

ئەوان چ نیازێکم بەزیندوو مانەوە هەیە. ئەو ئازابەی بەخەڵکانی عاد گەیشت، ئەویشی گرتەوە و کوژرا.

مورسەد کوڕی سەعد کوڕی عەفیر کاتێك وتەی سوارەکەی بیست کەباسی لەناوچونی خەڵکانی عادی دەکرد، شێعرێکی بەم ناوەرۆکە هۆنییەوە:

((خەڵکانی عاد نافەرمانی پێغەمبەری خۆیانیان کرد

تینو مانەوەو و ئاسمان بارانی پێنەبەخشین

نێردراوەکانیان بۆ ماوەی یەك مانگ ڕێگەیان بڕی تا داوای باران بکەن

بەڵام لەگەڵ تینویەتی کوێریشیان پێبڕا

چوونکە ئاشکرا بەخوای خۆیان کافر بوون

شوێنەواری کۆنیان سڕایەوە

خواوەند ئاوزی لەخەڵکانی عاد سەندەوە

دڵیان کوێر و تاریك بوو

وئاگایان لەهەواڵە ئاشکراکان نەبوو

ئامۆژگاری لەگەڵ بەدبەختی هیچ سوودێکی نابێت

من و دوو کچەکەم و دایکی مناڵەکانم

قوربانی هودی پێغەمبەر بین

کەهات و لەو کاتەدا دڵەکان ستەمکاریان کردبووە پیشە

و ڕووناکی لەنێوان ئێمە کۆچی کردبوو

بتێکمان بوو بەناوی صعود

و دو بتەکەی دیکە صدا و هوبا

تۆبەکەران ئەویان بینی

بەڵام درۆزنەکان بەدبەخت بوون

منیش کاتێك شەو هەڵبێت

پەیوەستی هود و کەسەکانی دەبم.))

دەڵێن: لەو ڕۆژگارەدا گەورە و سالاری نەتەوەی عاد، خەلەجان بوو.

لەمحەممەد کوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە، کاتێك با لەدۆڵی خەڵکانی عاد

هەڵیکرد، حەوت دەستە لەوان کەخەلەجانیش هاورێیەتی دەکرد، وتیان: دەڕۆینە قەراغ دۆڵەکە و زیانی با لەخۆمان دوور دەخەینەوە. با کەسێکی لەوان هەڵدەگرت و دەیکێشا بەزەویدا و گەردنی دەشکاند بەهەمان شێوە کەخواوەند دەفەرمێت، ئەوی وەك قەدی دار خورما بەجێدەهێشت. جگە لەخەلەجان کەس لەوان نەمایەوە. ئەو بەرەو کێوەکە بەرێکەوت و دەستی لێ گیردەکرد، کێوەکە دەلەرزی.

هود پێی وت: ئەی خەلەجان، باوەڕ بێنە تا تەندروست رزگارت بێت.

خەلەجان وتی: ئەگەر باوەڕ بێنم، لەلایەن خوای تۆوە چیم پێدەبڕێت؟

هود وتی: بەهەشت.

خەلەجان وتی: ئەوانەی لەناو هەورەکەدا دەبینرێن، کێن؟

هود وتی: فریشتەکانی خواوەند.

خەلەجان وتی: ئەگەر باوەڕ بێنم، خوا لەدەستی ئەوان دەمپارێزێت؟

هود وتی: هیچ پاشایەك هەیە، سوپاکەی فەرمانەکانی جێبەجێ نەکەن؟

خەلەجان وتی: ئەگەر پاشایەکی لەو چەشنە هەبێت، پاشایەکی خراپە.

دواتر با هات و ئەویشی هاوشێوەی هاورێکانی لەناو برد.

دەڵێن تەمەنی هود سەد و پەنجا ساڵ درێژەی کێشا.

لەئەحمەد کوڕی موفەزەل دەگێڕنەوە، بەهەمان شێوە کەخواوەند فەرمووی، هودی وەك پێغەمبەر بۆ لای خەڵکانی عاد ڕەوانە کردو وتی: ئەی خەڵکی من، خوا بپەرەستن چوونکە جیاواز لەو خوایەکتان نییە. ئامۆژگاری کردن و وتەکانی خواوەندی بیرخستنەوە کە لەقورئاندا باسی کراوە. بەڵام خەڵکەکەی ئەویان بەدرۆزن ناوبرد و حاشایان لێکرد و وتیان، سزامان بدات. هود وتی: خوا دەزانێت، من تەنیا پەیامەکەی ئەو دەگەیێنم.

کاتێك خەڵکانی عاد لەکوفر و ناسوپاسی کردن بەردەوام بوون، گیرۆدە وشکەساڵی و ڕەنج بوونەوە. هود نفرینی کردن و خواوەند هەورێکی بێ بارانی ڕەوانە کرد. کاتێك بینیان، وتیان: ئەم هەورە باران دەبارێنێت. کاتێك نزیك کەوتنەوە، بینیان پیاو و وشتر بۆ ئاسمان بەرز دەکاتەوە. کاتێك ئەمەیان بینی، پەنایان بۆماڵەکان برد. با گەیشتە ناو ماڵەکان و هەموویان لەناو برد.

لەماڵەکانیش هاتنەدەر. ڕۆژە شوومەکان بەردەوام بوو. بۆماوەی حەوت شەو و ڕۆژ ئازابی خوایی درێژەی کێشا. بەهەرچی دەگەیشت، لەناوی دەبرد. خواوەند دەفەرمێت: خەڵکانی لەماڵەکانی جیا دەکردەوە و هاوشێوەی قەدی دارخورماکان لەسەر زەوی کەوتبوون. کاتێك خواوەند لەناوی بردن، باڵندە ڕەشەکانی ڕەوانە کرد ولاشەی ئەوانیان بۆدەریا گواستەوە. خواوەند دەفەرمێت: بەشێوەیەك لەناوچوون کەتەنیا دەتوانی ماڵەکانیان ببینیت.

لەوەهب کوڕی مونبە دەگێڕنەوە، کاتێك خواوەند فەرمانی سزای خەڵکانی عادی بە بادا، با، دارەکانی لەڕەگ و ریشە دەردەکێشا و ماڵەکانی خاپوور دەکرد، هەر کەس لەماڵەوە نەبوایە، با لەسەرزەوی بەرزی دەکردەوە و دەیکێشا بەکێوەکەدا و لەت لەتی دەکرد تا هەموویان لەناوچوون.

## نەتەوەی سەموود

ئەوانیش نافەرمانی خوایان کرد و کافر بوون. لەزەوی خراپەیان کردە پیشە. خواوەند سالّح کوڕی عوبەید کوڕی ئەسەف کوڕی ماسخ کوڕی عوبەید کوڕی خادر کوڕی سەموود کوڕی جاسر کوڕی ئەرەم کوڕی سام کوڕی نوحی وەك پێغەمبەری ئەوان ڕەوانە کرد تاپەرەستینی خوایان پیّ پێشنیار بکات.

بەوتەیەك سالّح کوڕی ئەسەف کوڕی کەماشج کوڕی ئەرەم کوڕی سەموود کوڕی جاسر کوڕی ئەرەم کوڕی سام کوڕی نوحە.

خەلّکانی سالّح وەلاّمیان دایەوە: ((یا صالح قد کنت فینا مرجوا قبل هذا أتنهانا ان نعبد ما یعبد آباؤنا و اننا لفی شك مماتدعونا الیە مریب.

واتاکەی: ئەی سالّح، پێش ئەمە هیوامان بەتۆ بوو، چۆن ئێمە لەپەرەستینی ئەو خوایانەی باوکانی ئێمە دەیانپەرەست، دوور دەخەیتەوە، ئێمە لەم دینەی بانگەشەی بۆ دەکەیت، بەتەواوی گومانمان هەیە.))

خواوەند تەمەنی درێژی بەوان بەخشیبوو. لەناوچەی حەجەر یا وادی ئەلقورا لەنێوان شام و حیجاز نیشتەجیّ بوون. سالّح لەگەلّ نافەرمانی و ستەمکاری خەلّکەکەی، لەسەر بانگەوازەکەی خۆی بەردەوام و پێداگری دەکرد. کاتێك کاروباری ئەوان درێژەی کێشا، وتیان: ئەگەر ڕاست دەکەیت، نیشانەیەکمان نیشان بدە.

لە باوکی توفەیل دەگێڕنەوە: خەلّکی سالّح پێیان وت: ئەگەر ڕاست دەکەیت، مۆجیزەیەك بێنە. سالّح بەوانی وت: بەرەو بەرزایی سەر زەوی بڕۆن کەوەك ژنی دوگیان دەنالێنێت. ئەوسا قەلّشتی برد و وشتری لیّ هاتەدەر. سالّح وتی: ((هذه ناقة الله لکم آیة فذروها تأکل فی ارض الله و لا تمسوها بسوء فیأخذکم عذاب الیم. لها شرب و لکم شرب یوم معلوم.

واتاکەی:، ئەی خەلّکینە، ئەمە وشتری خوایە و مۆجیزەیەك بۆ ئێوە.

لێبگەڕێن لەزەوی خوا بلەوڕێت و زیانی پێ مەگەیێنن چوونکە سزایەکی دەردهێنەر دەتانگرێتەوە. ئەو شوێنی ئاو خواردنەوەی خۆی هەیە و ئێوەی شوێنی ڕۆژی بەدەست هێنانی دیاریکراو.))

کاتێك لەوشترەکە بێزار بوون، وشترەکەیان سەربڕی. پێی وتن: بۆ ماوەی سێ ڕۆژ لەماڵەکانی خۆتان بمێننەوە، چوونکە ئەم بەڵێنە درۆ نییە.

لەعەبدولعەزیز دەگێڕنەوە: ساڵح بەخەڵکەکەی وت: نیشانەکانی سزای خوا بەمشێوەیە کەبەیانی سور هەڵدەگرێن و لەڕۆژێکی دیکە زەرد و لەڕۆژی سێیەم ڕەش دەبن و سزا لەسەر ئێوە بەردەوام دەبێت. کاتێك ئەمەیان بینی، خۆیان بۆ مەرگ ئامادە کرد.

بەعەمرۆ کوڕی خاریجەیان وت: داستانی سەموودمان بۆ باس بکە.

وتی: لەپێغەمبەری خوام بیست کەفەرمووی: سەمود نەتەوەی ساڵح بوون. خواوەند تەمەنی درێژەی پێبەخشین بەشێوەیەك یەکیان ماڵێکی بەهێز و پتەوی دروست دەکرد، ماڵەکە دەڕووخا بەلأم خۆی هێشتا زیندوو بوو. کاتێك ئەمەیان بینی، لەکێوەکان خانوویان دروست کرد و بەردەکانیان داتاشی. ژیانێکی خۆشیان بەسەر دەبرد.

وتیان: ئەی ساڵح داوا لەخواکەی خۆت بکە، مۆجیزەیەك ڕەوانە بکات بۆ ئەوەی باوەڕ بکەین، تۆ پێغەمبەری خوایت.

ساڵح لەخوا پاڕایەوە و وشتری بۆ هێنان. ڕۆژی ئاو خواردنەوەی وشر ڕۆژێك و ڕۆژی ئاو خواردنەوەی خەڵکان ڕۆژێك بوو. لەڕۆژی ئاو خواردنەوە وشتر، شوێنی ئاوخواردنەوەیان بۆ وشتر بەجێ دەهێشت. لەشیری ئەو وشترە هەموو دەفر و قاپەکانیان پڕ دەکرد.

خواوەند وەحی بەساڵح کرد کەخەڵکەکەت وشترەکە دەکوژن. ساڵح بەوانی وت.

وتیان: هەرگیز ئەو کارە ناکەین.

ساڵح وتی: ئەگەر ئێوە نەیکەن، کەسێك دێت و ئەو کارە دەکات.

وتیان: نیشانەی ئەو کەسە چییە، تا بیدۆزینەوە و بیکوژین.

ساڵح وتی: مناڵێکی ئەسمەر و ئەبڵەق و سووریاوە.

دەڵێت: دو پیری بەرێز لەو شارەدا ژیانیان بەسەر دەبرد. یەکیان کوڕێکی بوو کەهاوسەری لەخەڵکانی عادی نەدەویست و یەکیان کچێك کەکوڕێکی هاوشانی کچەکەی دەست نەدەکەوت. ڕۆژێك کۆبوونەوە و یەکیان بەوی دیکە وت: بۆ ژن بۆ کوڕەکەت ناهێنیت؟

وتی: کەسێکی هاوشانی ئەوم دەست ناکەوێت.

وتی: کچەکەی من هاوشانی ئەوە و من دەیکەم بەهاوسەری کوڕەکەت. کچی کردە هاوسەری کوڕەکە و کەسی ئاماژە پێدراو لەوان لەدایك بوو.

دەڵێت: لەو شارەدا هەشت کەس بوون لەسەر زەوی خراپە و ستەمیان دەکرد و شوێنکەوتەی ساڵح نەبوون. کاتێك ساڵح وتی کەسێك لەئێوە وشترەکە دەکوژێت، هەشت ژنی مامانیان هەڵبژارد و تیغیان پێدان بۆ ئەوەی لەگوندەکاندا بگەڕێن و لەهەر شوێنێك ژنێك مناڵی هێنایە دنیا ونیشانەکانیان تیا بینی، ئەگەر کوڕ بوو بیکوژن و ئەگەر کچ بوو، بیهێڵنەوە. کاتێك ئەو مناڵەیان بینی، هاواریان کرد، ئەمە ئەو کەسەیە کەساڵح نیشانەکانی پێ وتووین. مەبەستی ئەوەیان کرد بەتیغ بیکوژن، بەڵام باوەگەورێکانی نەیانهێشت و وتیان ئەگەر ساڵح بیەوێت، دەیکوژین.

مناڵێکی خراپ بوو، لەیەك ڕۆژ بەئەندازەی حەفتەیەکی مناڵەکانی دیکە گەشەی دەکرد و لەحەفتەیەك بەئەندازەی یەك مانگی ئەوان و لەیەك مانگ بەئەندازەی یەك ساڵی ئەوان گەورە دەبوو. ئەو هەشت کەسە خراپەکارە، لەگەڵ ئەو دو پیرە کۆبوونەوە و وتیان: ئەم کوڕەیش بەهۆی ڕێز و شکۆی باوەگەورێکانی هاوڕێی ئێمە دەبێت، ژمارەیان گەیشتە نۆ کەس.

ساڵح لەگەڵ خەڵکان لەگوندەکەدا نەدەمایەوە. شوێنی مانەوەی ئەو مزگەوتێك بوو کەپێیان دەوت مزگەوتی ساڵح. شەوانی لەمزگەوتەکە بەسەر دەبرد و ڕۆژەکان دەهات و خەڵکی مۆجیاری دەکرد و دەگەڕایەوە بۆ مزگەوت.

حەجاج کوڕی جورەیح دەڵێت: کاتێك ساڵح بەوانی وت مناڵێك دێتەدنیا کە لەناوچوونی ئەم خەڵکە لەسەر دەستی ئەو دەبێت، وتیان: چی لێ بکەین؟ وتی:

بیکوژن. هەموو کوڕەکانیان کوشت، جگە لەیەك دانەیان و کاتێك ئەو منالە گەورە بوو، وتیان: ئەگەر کوڕەکانی خۆمان نەدەکوشت، ئێستا هەرکام خاوەنی کوڕێکی خۆمان دەبوین، ئەمە تاوانی سالحە. لەسەر کوشتنی ئەو هاوڕا بوون. وتیان: بەبیانوی سەفەر دەڕۆین تا خەلکان بمانبینن و فلان شەو لەفلان مانگ دەگەڕێینەوە و لەنزیك نوێژگەکەی ئەو خۆمان حەشار دەدەین و دەیکوژین. خەلك گومان دەکەن ئێمە هێشتا لەسەفەرین.

هاتن و لەژێر بەردێکی گەورە خۆیان حەشاردا. خواوەند بەردەکەی بەسەردا خستنە خوار و هەموویانی کوشت. دەستەیەك کەئاگاداری مەبەستەکەی ئەوان بوون، هاتن و بینیان هەمویان لەژێر بەردەکەدا پان و پلیش بوونەتەوە. گەڕانەوە و لەناو گوندەکە جاڕیاندا سالح بەوە بەسەندەی نەکرد کەوتی منالەکانی خۆتان بکوژن، ئێستا باوکی ئەوانیشی کوشت. خەلکی گوندەکە کۆبوونەوە تا وشترەکە سەر ببڕن بەلام کەس جگە لەو کوڕە دە سالە ئەو کارەی نەکرد.

ئەبو جەعفەر دەلێت: ئێستا ئاماژە بەحەدیسی پێغەمبەر(د.خ) دەدەین کەفەرمووی: ئەو هەشت کەسە مەبەستی کوشتنی سالحیان کرد و لەسەر رێگەکەی ئەو خۆیان حەشاردا و وتیان کاتێك بێت، خوێنی دەرێژین و شەوانە هێرش دەکەینە سەر کەسەکانی. خواوەند ئەوانی کوشتار کرد. خەلك کۆبوونەوە و بەرەو لای وشترەکە بەرێکەوتن کەلای حەوزی ئاوەکە وەستا بوو، ئەو بەدبەختە بەیەکێکی دیکەی وت: بڕۆ و سەری ببڕە. ئەو هات بەلام کارەکەی بەگەورە و دژوار بینی، ئەو کارەی نەکرد و کەسێکی دیکەی نارد. ئەویش کارەکەی بەگەورە و دژوار بینی و نەیکرد و کەسێکی دیکەی نارد. کەس توانای ئەنجامدانی ئەو کارەی نەبوو، خۆی ڕۆشت و لەدوو پاژنەی وشترەکەی دا و وشتر دەستی بەڕاکردن کرد. کەسێك سالحی ئاگادار کردەوە کەفریای وشترەکە بکەوە چوونکە دەیانەوێت سەری ببڕن. سالح هات و خەلکان لەدەوری کۆبوونەوە و داوای لێخۆش بونیان کرد و وتیان ئەی پێغەمبەر، فلان کەس ئەو کارەی کرد و ئێمە بێ تاوانین.

سالح وتی: بگەڕێن و بێچووە وشترەکە بدۆزنەوە؟ ئەگەر بیدۆزنەوە، سزا

لەسەر ئێوە هەڵدەگیرێت. بەدوای بێچووە وشترەکەدا گەڕان. بێچووە وشتر کاتێک دایکی خۆی لەو حاڵەدا بینی، بەکێوێک کەپێیان دەوت قارە قەصیرا، سەرکەوت. خواوەند وەحی بەکێوەکە کرد و بەشێوەیەک بەرز بوویەوە کەباڵندەکان نەیاندەتوانی بگەنە لووتکەکەی.

فەرمووی: کاتێک ساڵح گەڕایەوە بۆ ناو گوندەکە و بێچووە وشترەکە ساڵحی بینی، گریا و فرمێسکەکانی دابارین. هاتە لای ساڵح و کەفی کەوتە سەر لێو، دوبارە کەف کەوتە سەرلێوی و دوبارە کەف کەوتە سەر لێوی. ساڵح وتی: هەر کەف هاتنە سەرلێوێک، مۆڵەتی یەک ڕۆژە و سێ ڕۆژ لەماڵەکانی خۆتان بەسەر بەرن چوونکە ئەم بەڵێنە درۆ نییە و نیشانەی سزادانی ئێوەیە کە لەرۆژی یەکەم روخسارتان زەرد هەڵدەگەڕێت و لەرۆژی دوەم سوور و لەرۆژی سێیەم ڕەش. کاتێک بەیانی داهات، روخساری بچوک و گەورە و ژن وپیاو بەشێوەیەک بوو دەتوت زەعفەرانیان تێ ساویوە، کاتێک شەو داهات، هاواریان لەیەک دەکرد کە ڕۆژی یەکەم تێپەڕی و سزا نزیک بۆتەوە.

بەیانی ڕۆژی دوەم روخساریان سووربباو بوو، دەتوت بەخوێن رەنگیان کردووە. هاواریان کرد و ناڵان و گریان و زانیان سزای خوایان بەسەردا دەبارێت. کاتێک شەو داهات، هەمووان هاواریان کرد، دو ڕۆژ لەمۆڵەتەکە تێپەڕی و سزای خوا نزیک بۆتەوە.

بەیانی ڕۆژی سێیەم، روخساریان ڕەش بەشێوەیەک دەتووت بەقیر رەشیان کردووە. هەموویان هاواریان کرد: سزای خوا داباری. کفنیان پۆشی و (حنوت)(( بۆنێکی خۆشە هاوشێوەی کافوور کەلەکاتی مردن لەجەستەی مردوی دەدەن بۆ ئەوەی بۆن نەگرێت)) یان لەخۆیاندا. حنوتی ئەوان صەبر و چەدروا و کفنەکانیان چەرم بوو.

کەوتنە سەرزەوی و دەتلانەوە و ترساو و لەرزان چاویان بڕیبووە ئاسمان و هەندێ کات چاویان دەبڕیە زەمین. نەیاندەزانی سزا لەئاسمانەوە دێت یا لەزەمین. بەیانی ڕۆژی چوارم دەنگێک لەئاسمانەوە بەرزبوویەوە کەدەنگی هەموو هەورەتریشقەکانی سەرزەوی و هەموو دەنگەکانی زەوی هەڵگرتبوو. دڵ لەناو

سینەیان لەت لەت و بەم شێوەیە هەموویان لەناوچوون.

کوڕی جورەیح دەڵێت، بیستم کەپێغەمبەر فەرمووی: کاتێگك دەنگی ئاسمانی بەرز بوویەوە. هەموو خەڵکانی سەموود کە لەرۆژهەڵاتەکان و رۆژئاواکان بوون، لەناو چوون جگە لەیەك کەس. چوونکە لەحەرەمی خوادا بوو و رێزی حەرەم ئەوی لەسزای خوایی پاراست. وتیان: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، کێ بوو؟

فەرمووی: باوکی رەغال.

پێغەمبەر(د.خ) کاتێك لای گوندی سەموود تێدەپەڕی، بەئەصحابەکانی دەفەرموو: هیچ کەس نەڕواتە ناو ئەم گوندە و ئاو نەخواتەوە. رێگەی بەچکە وشتری نیشاندان کەلەوێوە بۆ ئاسمان بەرز کرایەوە.

لەکوڕی عیمران دەگێڕنەوەو کە پێغەمبەر(د.خ) کاتێك لای گوندی سەموود تێپەڕی، فەرمووی: مەڕۆنە لای ئەم نەتەوە ئازاب دیتووە مەگەر ئەوەی بگرین. ئەگەر چاو بەگریان نەبن، نەڕۆنە لایان، چوونکە ترسی ئەوە هەیە ئەو ئازاب و سزای ئەوانی گرتەوە، ئێوەیش بگرێتەوە.

لەجابر کوڕی عەبداللە دەگێڕنەوە، کاتێك پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشتە حەجەر، سوپاس و ستایشی خوای بەجێهێنا و فەرمووی: داوای مۆجیزە لەپێغمبەری خۆتان مەکەن، ئەم نەتەوە داوای مۆجیزەیان لەپێغەمبەرەکەی خۆیان کرد. خواوەند وشتری وەك مۆجیزە ڕەوانە کرد کە لەم دۆڵەوە دەهات و لەو دۆڵەوە دەڕۆشت و رۆژی تایبەت بەخۆی لەئاوی ئەوانی دەخواردەوە.

هەروەها لەباوکی تۆفەیل دەگێڕنەوە، کاتێك پێغەمبەر(د.خ) بۆ شەڕی تەبووك دەڕۆشت، لەحوجر دابەزی فەرمووی: ئەی خەڵکینە! داوای مۆجیزە لەپێغەمبەری خۆتان مەکەن. نەتەوەی سالح داوایان لەپێغەمبەری خۆیان کرد مۆجیزەیەکیان نیشان بدات. خواوەند، ناقەی ڕەوانە کرد و لەرۆژی تایبەت بەخۆی لەم دۆڵەوە دەهات و ئاوی دەخواردەوە و لەرۆژی تایبەت بەئاو خواردنەوەی خەڵکان، بەئەندازەی ئاوەکەیان شیریان لێ دەدۆشی، ئەوسا وشترەکە لەم دۆڵەوە دەڕۆشت. بەڵام نافەرمانی فەرمانی پەروەردگاریان کرد و وشترەکەیان سەربڕی و خواوەند بەڵێنی پێدان دوای سێ رۆژ سزای خۆی ڕەوانە دەکات. بەڵێنەکەی خوا

درۆ نەبوو و لەرۆژهەڵاتەکان و رۆژئاواکان هەموو خەڵکانی سەموودی لەناو برد جگە لەیەك کەس کە لەحەرەمی خوادا بوو و لەبەر رێزی حەرەم ئازاب و سزای خوایی ئەوی نەگرتەوە.

وتیان: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، ئەو کەسە کێ بوو؟

فەرمووی: باوکی رەغال.

بەگومانی شوێنکەوتەکانی تەورات، ئاماژە بەخەڵکانی عاد و سەموود و هود و سالح نەدراوە، بەڵام داستانی ئەوان لای عەرەبەکان لەسەردەمی جاهلیت و ئیسلام وەك داستانی ئیبراهیم و خەڵکەکەی بەناوبانگە.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: ئەگەر لەدرێژدادڕی لەم کتێبە بەهۆی بابەتە ناپەیوەندیدارەکان ترسم نەدەبوو، لەشێعری شاعیرانی دەورانی جاهلیت کەسەبارەت بەعاد و سەموود و بەسەرهاتی ئەوان وتوویانە، ئاماژەم بەچەند شێعرێك دەدا تا نەیارانی وتەکانی ئێمە بزانن ناوبانگی بەسەرهاتی ئەوان لەناو عەرەبەکان چەندە!

دەستەیەك لەشوێنکەوتەکانی هەواڵ گومانیان کردووە سالح لەمەککە کۆچی دوایی کرد و لەکاتی مردن ساڵەکانی تەمەنی هەشتا و پێنج و بۆ ماوەی بیست ساڵ لەناو خەڵکەکەی خۆی ژیانی بەسەر بردبوو.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: ئێستاکە دەگەڕێنەوە سەر باس کردنی داستانی ئیبراهیمی خەلیل و کاتێك لەمێژووی باوکان لەنێوان نوح و ئادەم و مێژووی ئەو رۆژگارانە قسەمان کرد، ئاماژە بەپاشاکانی عەجەمی هاورۆژگاری ئەوان دەدەین.

## گێڕانەوەکان سەبارەت بەئیبراهیمی خەلیل

ئیبراهیم، کوڕی تالخ کوڕی ساروغ کوڕی ئەرغوا کوڕی فالغ کوڕی عابر کوڕی شالخ کوڕی قینان کوڕی ئەرفەخشز کوڕی سام کوڕی نوحە.

سەبارەت بەزادگای ئەو بۆچونەکان جیاوازن: دەستەیەك وتوویانە، زادگای ئەو لەشووش سەرزەمینی ئەهوازە، دەستەیەکی دیکە وتوویانە لەبابلی عێراق چاوی بەدنیا هەڵهێنا، دەستەیەك وتوویانە لەعێراق لەدایك بوو بەڵام لەناوچەی کوسی. دەستەیەکی دیکە بۆچونیان وایە زادگای ئیبراهیم، لەوەرکا لەناوچەی زابەکان و سنوری کەسکەرە و باوکی ئەوی هێنایە سەرزەمینی کوسی کەشوێنی مانەوەی نەمروودە. دەستەیەکی دیکە وتوویانە لەحەران چاوی بەدنیا پشکوت و باوکی ئەوی بۆ بابل برد.

هەموو شوێنکەوتەکانی زانستی کۆن وتوویانە لەدایك بوونی ئیبراهیم لەرۆژگاری نەمروود کوڕی کوشە و هەمو شوێنکەوتەکانی هەواڵ وتوویانە لەدایك بوونی ئیبراهیم لەدەورانی ئەزدهاق بووە کە بەگومانی دەستەیەکیان نوح لەسەرزەمینی بابل و دەوروبەری، وەك پێغەمبەری سەردەمی ئەو هەڵبژێردراوە.

بەڵام دەستەیەك لەشارەزایانی کۆن وتوویانە، پاشایەکی سەربەخۆ بوو. وەك دەڵێن، ناوی زێرهی کوڕی تەهماسفان بوو.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: بیستوومە و خوا زاناترە، ئازەر لەدانیشتووان کوسی، گوندێك لەسوادی کوفەیە. لەو رۆژگارەدا نەمروودی ستەمکار پاشایەتی رۆژهەڵاتی دەکرد. ئەویان بەستەمگەر ناودەبرد و گومانیان کردووە پاشایەتی ئەو لەسەرزەمینەکانی رۆژهەڵات و رۆژئاوا بڵاو ببویەوە و خۆی لەبابل نیشتەجێ بوو. پاشایەتی ئەو و خەڵکەکەی لەرۆژهەڵات پێش پاشایەتی فارسەکانە و وتوویانە پاشایەتی جیهان و هەموو خەڵکی سەرزەمین تەنیا بۆ سێ کەس دەستەبەر بوو: نەمروود کوڕی ئەرغوا و زولقەرنەیین و سلێمان کوڕی داوود.

دەستەیەك وتوویانە: نەمروود هەمان زوحاکە.

هوشام کوڕی محەممەد دەڵێت: بیستوومە و خوا زاناترە، زوحاك هەمان نەمرووده و ئیبراهیمی خەلیل لەڕۆژگاری ئەو چاوی بەدنیا هەڵهێنا. ئەو بوو مەبەستی ئەوەی کرد ئیبراهیم لەئاگردا بسوتێنێت.

لەکوڕی مەسعود و دەستەیەك لەهاوەڵانی پێغەمبەر دەگێڕنەوە: یەکەم کەس پاشایەتی ڕۆژهەلآت و ڕۆژئاوایی کرد، نەمروود کوڕی کەنعان کوڕی کوش کوڕی سام کوڕی نوحە. ئەو پاشای فەرمانڕەوایی هەموو جیهانیان دەکرد، چوار کەس بوون: نەمروود، سلێمان کوڕی داوود، زولقەرنەیین و بەخت نەصر کەدووانیان موسوڵمان و دووانیان کافر بوون.

لەکوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە: خواوەند مەبەستی ئەوەی کرد ئیبراهیم وەك بەڵگە و نیشانە و پێغەمبەری بەندەکانی خۆی ڕەوانە بکات. لەنێوان نوح و ئیبراهیم دوای نوح، جگە لەساڵح و هود هیچ پێغەمبەرێکی دیکە ڕەوانە نەکرا و کاتێك زەمانی ئیبراهیم نزیك کەوتەوە، خوا مەبەستی ئاشکرا کردنی مەبەستەکەی خۆی کرد. دەستەیەك لەئەستێرەناسەکان ڕۆشتنە لای نەمروود و وتیان: ئاگادار بە، ئێمە لەزانستەکەی خۆمان دەبینین لەمانگی فلآن لەساڵی فلآن، کوڕێك لەم گوندە چاو بەدنیا هەڵدەهێنێت بەناوی ئیبراهیم کەپشت دەکاتە دینی ئێوە و بتەکان دەشکێنێت.

کاتێك ساڵی دیاریکراو گەیشت، نەمروود کەسی ڕەوانە کرد و هەموو ژنە دوگیانەکانی گوندەکەی کۆکردەوە و زیندانی کردن جگە لەدایکی ئیبراهیم و هاوسەری ئازەر لەبەر ئەوەی لەدووگیانی ئەو ئاگادار نەبوونەوە چوونکە ژنێکی گەنج و ئاگای لەسکپڕی خۆی نەبوو. هەر کوڕێك لەو مانگ و ساڵەدا لەدایك بوو، بەفەرمانی نەمروود کوژرا. کاتێك دایکی ئیبراهیم، ژانی مناڵبونی گرت، شەوانە ڕۆشتە ئەشکەوتێکی نزیك و ئیبراهیمی لەناو ئەشکەوتەکە هێنایە دنیا. دوای ئەوە، لەئەشکەوتەکە هاتەدەر، دەرگای ئەشکەوتەکەی داپۆشی وبۆ ماڵ گەڕایەوە. سەردانی مناڵەکەی دەکرد و دەیبینی زیندووە و پەنجەی دەمژێت. وەك وتوویانە، خواوەند ڕۆژی ئەو مناڵەی لەناو پەنجەیدا جێگیر کردبوو. گومانیان کردووە کەئازەر لەدایکی ئیبراهیمی پرسی مناڵەکەی چی بەسەر هات و ئەو وەلآمی

دایەوە، منداڵەکە لەدایك بوو و مرد. ئازەر باوەڕی بەوتەکانی کرد و هیچی نەوت.

وەك وتوویانە، ئیبراهیم لەرۆژێك، بەئەندازەی مانگێك، گەشەی دەکرد و لەمانگێك بەئەندازەی ساڵێك. زیاتر لەپانزە مانگ لەناو ئەشکەوتەکە نەمایەوە و بەدایکی وت: من ببەدەر، تا لەدەوروبەر بڕوانم. دایك شەوانەی ئەوی هێنایە دەر و سەیری کرد. بیری لەئافراندنی ئاسمانەکان و زەوی کردەوە و وتی: ئەو کەسەی منی ئافراند و رۆژی و خواردن و ئاوی پێدام، پەروەردگاری راستینە و جگە لەو خوایەکەم نییە.

دواتر سەیری ئاسمانی کرد و ئەستێرەیەکی بینی، وتی: ئەمە پەروەردگاری منە.

سەیری کرد تا لەبەرچاو ونبوو، کاتێك دیار نەما، وتی: ئەوانەی لەناو دەچن، وەك خوا پەسەندیان ناکەم.

ئەوسا مانگ دەرکەوت و بینی کەرۆشن و رووناکە، وتی: ئەمە پەروەردگاری منە. سەیری کرد تا لەبەرچاو ونبوو، وتی: ئەگەر خوا رێنوێنیم نەکات، لەدەستەی گومڕاکان دەبم.

کاتێك رۆژ بویەوە و خۆر هەڵات و گەورەیی هەتاوی بینی، لەهەمووان نووری زیاتر بوو، وتی: پەروەردگاری من ئەمەیە، ئەمە گەورەترە) کاتێك هەتاو ئاوا بوو، وتی:

(( یاقوم انی بری مما تشرکون، انی وجهت وجهی للذی فطر السموات و الارض حنیف و ما انا من المشرکین. واتاکەی: ئەی خەڵکی من، لەوەی دەیکەنە شەریکی خوا، بێزارم من پەرەستینی خۆم تایبەت کردووە بەکەسێك کەئاسمانەکان و زەوی ئافراندووە و لەخراپەکاران نیم.))

دوای ئەوە ئیبراهیم ڕۆشتە لای ئازەر. رێگەی خۆی دۆزیبویەوە و خوای ناسی. پشتی کردە دینی خەڵکەکەی، بەڵام هیچی نەوت و بەباوکی وت کەکوڕی ئەوە. دایکی ئیبراهیمیش وتی کەکوڕی ئازەرە و بەسەرهاتەکەی بۆ باس کرد. ئازەر شادمان بوو.

ئازەر بتتاشی خەڵکەکەی بوو. بتی دروست دەکرد و بەئیبراهیمی دەدا تا

بیفرۆشێت. ئیبراهیم وەك دەڵێن، بتەکانی دەبرد و دەیوت: چ کەسێك شتێك دەکرێت کەسوود و زیانی نییە؟ هیچ کەس لێی نەدەکڕی. دواتر دەڕۆشتە لێواری جۆگەیەك و سەری بتەکانی دەکردە ژێر ئاو و بۆگاڵتە کردن بەخەڵکەکەی و گومڕایی ئەوان، دەیوت: ئاو بخۆرەوە.

سەرئەنجام نهێنییەکەی ئاشکرا بوو. خەڵکەکەکی و خەڵکی گوندەکەی زانییان دژی بتەکان قسە دەکات. بەڵام هێشتا هەواڵی ئیبراهیم بەنەمرود نەگەیشتبوو.

کاتێك ئیبراهیم مەبەستی ئەوەی کرد پێچەوانەی کردەی خەڵکەکەی هەڵس وکەوت بکات و فەرمانەکانی خوا ئەنجام و پێشنیاری خوا پەرەستی بەخەڵکان بکات، سەیری ئەستێرەکانی کرد و وتی: ( نەخۆشم.) خەڵکەکەی ئەمەیان بیست و خۆیان لەو بەدوور گرت. ئیبراهیم دەیوست خەڵك بڕۆن تا ئەوەی دەخوازێت لەگەڵ بتەکان ئەنجامی بدات. کاتێك ڕۆشتن، ڕۆشتە لای بتەکان کەلەجیاتی خوا دەیانپەرەست. خواردنی خستە بەردەم بتەکان و وتی: ((بۆ ناخۆن، بۆ قسە ناکەن) دەستی بەگاڵتە کردن بەبتەکان کرد.

لەکوڕی عەباس و کوڕی مەسعود و دستەیەك لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) دەگێڕنەوە: داستانی ئیبراهیم بەمشێوە بوو: لەرۆژگاری نەمروود، ئەستێرەیەك دەرکەوت و نووری هەتاو ومانگی برد. نەمروود ترسا، وتیان: لەپاشایەتی تۆ پیاوێك لەدایك دەبێت کە لەناوچوونی پاشایەتییەکەت لەسەر دەستی ئەو دەبێت. شوێنی نیشتەجێ بوونی نەمروود بابل بوو. لەگوندەکەی خۆی بۆ گوندێکی دیکە دەڕۆشت و پیاوانی دەردەکرد و ژنانی دەهێشتەوە. فەرمانی دا تا هەر کوڕێك لەدایك ببێت، سەری ببڕن. سەری کوڕەکانیان بڕی.ئەوسا کارێکی لەشاردا بۆ پێشهات کەتەنیا باوەڕی بەئازەری باوکی ئیبراهیم دەکرد. ئەوی بانگ و ڕەوانەی کرد و پێی وت لەهاوسەرەکەت نزیك نەکەویتەوە. وتی: دینی من ئازیزتر لەوەیە. ئازەر کاتێك بۆ گوندەکەی گەڕایەوە، نەیتوانی خۆی بگرێت، لەهاوسەرەکەی خۆی نزیك کەوتەوە و ئەوی بۆ گوندێك لەنێوان کوفە و بەسرە برد کەپێیان دەوت، ئور. خستیە ناو چاڵێکی ژێرزەمینی و خواردن و ئاو و کەرەستە پێویستەکانی ژیانی

بۆ ئامادە کرد. کاتێك ماوەیەك تێپەڕی، پاشا وتی: جادووگەران درۆیان کرد. بۆ سەرزەمینی خۆتان بگەڕێنەوە. گەڕانەوە و ئیبراهیم لەدایك بوو. ڕۆژانە بەئەندازەی حەفتەیەك و حەفتانە بەئەندازەی مانگێك و مانگانە بەئەندازەی ساڵێك گەشەی دەکرد. شا داستانەکەی لەبیر کرد.

ئیبراهیم گەورە بوو، کەسی جگە لەدایك و باوکی خۆی نەدەبینی. باوکی ئیبراهیم بەکەسەکانی خۆی وت: من کوڕێکم هەیە کەدامشاردوە، ئەگەر بیبەمە لای پاشا، ترسی لەسەرە؟

وتیان: بیهێنە.

کوڕەکەی خۆی برد. کاتێك ئەوی لەچاڵەکە هێنایە دەر و چوارپێ و مرۆڤەکانی بینی، لەباوکی پرسی: ئەمانە چین؟

باوك پێی وت: وشتر، وشترە، مانگا، مانگایە، ئەسپ، ئەسپە و بزن بزنە.

ئیبراهیم وتی: ئەم خەڵکە بەناچاری دەبێت ئافرێنەرێکیان هەبێت.

کاتێك لەچاڵەکە هاتەدەر، خۆر ئاوا ببوو، سەری بۆ ئاسمان بەرز کردەوە و ئەستێرەی مشتەری بینی، وتی: ئەمە پەروەردگاری منە. زۆری نەخایاند، ئەستێرەکە دیار نەما، وتی: ئەوەی لەناو بچێت، وەك خواوەند پەسەندی ناکەم. یانی ئەو خوایەی لەبەر چاو ون دەبێت.

کوڕی عەباس دەڵێت: کۆتایی مانگ بوو، لەبەر ئەمە مانگی پێش ئەستێرەکانی دیکە نەبینی، کاتێك کۆتاییەکانی شەو، مانگ دەرکەوت، وتی: ئەمە پەروەردگاری منە. کاتێك مانگ ئاوا بوو، وتی: ئەگەر خوا ڕێنوێنیم نەکات، لەدەستەی گومڕاکان دەبم. کاتێك بەیانی بوویەوە و هەتاوی بینی، وتی: ئەمە پەروەردگاری منە ، ئەمە گەورەترە.

خواوەند بەئیبراهیمی فەرموو: باوەڕ بێنە.

وتی: تەسلیمی پەروەردگاری جیهانیانم.

بۆ لای خەڵکەکەی خۆی گەڕایەوە و پێشنیاری باوەڕهێنانی پیکردن، وتی: ئەی خەڵکی من، لەخواکانی ئێوە بێزارم و بەدڵێکی پاکەوە، ڕوودەکەمە ئەو خوایەی کەئاسمان و زەوی ئافڕاند. بەردەوام پێشنیاری باوەڕهێنانی

بەخەڵکەکەی دەکرد و مۆجیاری دەدان.

باوکی ئیبراهیم بتی دروست دەکرد و بەکوڕەکانی خۆی دەدا بۆ ئەوەی بیفرۆشن. ئیبراهیم هاواری دەکرد: کێ شتێك دەکرێت کە نەزیانی هەیە نەسوود؟ براکانی بتەکانی خۆیان دەفرۆشت و ئیبراهیم بتەکانی خۆی دەهێنایەوە.

دواتر پێشنیاری باوەڕهێنانی بەباوکی کرد و وتی: باوکە، بۆ شتێك کەنابینێت و نابیستێت و سوودی نییە، دەپەرەستیت؟

((باوك وتی: اراغب انت عن آلهتی یا ابراهیم. لئن لم تنته ارجمنك و اهجرنی ملیا.

واتاکەی: ئەی ئیبراهیم، مەگەر لەخواکانی من بێزاریت، ئەگەر تەواوی نەکەیت، جوێنت پێ دەدەم و بۆ ماوەیەکی زۆر لەبەر چاوی من مەمێنە.))

باوك وتی: ئەی ئیبراهیم، جەژن نزیك بۆتەوە، ئەگەر لەگەڵ مندا بێیت، شادمان دەبم.

کاتێك ڕۆژی جەژن هات و ڕۆشتنەدەر، ئیبراهیم لەگەڵیان ڕۆشت بەلام لەنیوەی ڕێگە خۆی خستە سەرزەوی و وتی: ((نەخۆشم، قاچم ئازاری هەیە)) بەهەمان شێوە کە لەسەر زەوی کەوتبوو، قاچیان شێلا. کاتێك ڕۆشتن، بەخەڵکانی دواوەی وت، سوێند بەخوا کاتێك بڕۆن، فێڵێك لەخواکانی ئێوە دەکەم. ئەمە قسەیان بیست.

دوای ئەوەی ئیبراهیم بۆ ماڵی خواکان گەڕایەوە کەشوێنێکی گەورە بوو. لەسەر دەرگاکەی بتێکی گەورە و بتێکی بچوك لەتەنیشتی. بتەکان بچوك و بچوکتر دەبوونەوە. خەڵك خواردنیان ئامادە و لەبەر دەم بتەکان دایاننابوو. وتبوویان: تا دەگەڕێینەوە، خواکان خواردنەکەمان پیرۆز دەکەن، ئەوسا دەیخۆین.

کاتێك ئیبراهیم بتەکان و خواردنەکەی بەردەمیانی بینی، وتی: بۆ ناخۆن؟ لەبەر ئەوەی وەڵامی لەلایەن خواکانەوە دەست نەکەوت، تەورێکی هەڵگرت و دەستی بەشکاندنی تەنیشتی بتەکان کرد. دواتر تەورەکەی خستە سەر شانی بتەگەورەکە و ڕۆشتەدەر. کاتێك خەڵك بۆ لای خواردنەکانی خۆیان گەڕانەوە و خواکانی خۆیانیان بینی، وتیان: کێ ئەم بەڵای بەسەر خواکانی ئێمەدا هێناوە،

کەسێکی ستەمکار و ستەمگەرە.

ئەوسا بیریان کەوتەوە و وتیان: لەگەنجێکمان بیست کەباسی ئەوانی دەکرد، ناوی ئیبراهیم بوو. یانی گەنجێك کەخراپەی بتەکانی باس دەکرد وگاڵتەی پێدەکردن. جگە لەو کەس ئەم قسانەی نەهێناوەتە سەرزمان، گومان دەکەین کاری ئەو بێت.

داستانەکە بەنەمرود و گەورەکانی خەڵك گەیشت و وتیان: ئەو بێننە لای خەڵك، لەوانەیە پێمان بڵێن چی لیّ بکەین.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك ئەویان هێنا، خەڵك لای پاشاکەی خۆیان، کۆبوونەوە و وتیان: ئەی ئیبراهیم تۆ ئەم بەلاّت بەسەر خواکانی ئێمەدا هێناوە؟

وتی: نە، بتی گەورە ئەو کارەی کردووە، لەوان بپرسن تا بیڵێن. ئەو رازی نەبوو لەگەڵ ئەم بتە بچوکانە بیپەرەستن و لەبەر ئەوەی لەهەموویان گەورەتر بوو، ئەوانی شکاند.

خەڵك ترسان و بیریان کردەوە و وتیان: ئێمە ستەم لەو دەکەین، راست دەکات. زانیان کەبتەکان هیچ سوود وزیانێکیان نییە. وتیان: تۆ دەزانی کەبتەکان قسە ناکەن و ناڵێن کیّ ئەم بەلاّی بەسەردا هێناون.

ئیبراهیم وتی: کەواتە بۆ لەجێگەی خوا، شتێك دەپەرەستن کەهیچ سوود و زیانێکتان پیّ نابەخشێت، مەگەر ئاوزتان نییە؟

خەڵك سەبارەت بەخوا گفتوگۆیان لەگەڵ کرد و پرسیاری خوایان هێنایە کایەوە، وتیان: بتەکانیان لەخواکەی زاناترە.

ئیبراهیم وتی: سەبارەت بەخواوەند لەگەڵ من گفتوگۆ مەکەن چوونکە منی رێنوێنی کردووە. نمونەی بۆ هێنانەوە و ئامۆژگاری کردن کەخواوەند بۆ پەرەستین شیاوترە لەبتەکان.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: وەك وتوویانە، نەمروود بەئیبراهیمی وت: ئەم خوایەی تۆ کێیە دەیپەرەستی و خەڵك بۆ پەرەستینی ئەو هان دەدەیت و دەڵێی هێزی لەهەمووان زیاترە؟

ئیبراهیم وتی: خوای من کەسێکە دەمرێنێت و زیندوو دەکاتەوە.

نەمروود وتی: منیش دەمرێنم و زیندوو دەکەمەوە.

ئیبراهیم وتی: چۆن دەمرێنیت و زیندوو دەکەیتەوە؟

وتی: دو کەس کە بەفەرمانی من شیاوی کوشتنن، دەهێنم، یەکیان دەکوژم و ئەوم مراندووە و یەکیان ئازاد دەکەم و گیانم پێ بەخشیوە.

ئیبراهیم وتی: خواوەند هەتاو لەرۆژهەڵاتەوە دێنێت، تۆ لەرۆژئاواوە بیهێنە تا بزانین کەقسەکەی تۆ راستە.

نەمروود سەریسوڕما و هیچی نەوت. زانی توانای وەڵامدانەوەی ئیبراهیمی نییە.

دەڵێت: نەمروود و خەڵکەکەی هاوڕابوون و وتیان: بیسوتێنن و هاوکاری خواکانی خۆتان بکەن.

لەموجاهید دەگێڕنەوە: ئەم ئایەم ((بیسوتێنن و هاوکاری خواکانی خۆتان بکەن) بۆ عەبدالله کوڕی عومەر خوێندەوە، وتی: ئەی موجاهید، دەزانی کێ وتی ئیبراهیم بەئاگر بسوتێنن؟

وتم: نا.

وتی: یەکێك لەعەرەبەکانی فارس بوو.

وتیم: ئەی باوکی عەبدولرەحمان مەگەر فارسەکانیش عەرەبیان هەیە؟

وتی: بەڵێ، کوردەکان عەرەبی فارسەکانن.

لەشوعەیب کوڕی جەبا دەگێڕنەوە کەناوی کەسێك کەوتی ئیبراهیم بسوتێنن، هیزن بوو. خواوەند ئەوی بەناخی زەویدا بردە خوار و تارۆژی پەسلاَن هاوار دەکات.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: نەمروود وتی داروتەختە کۆبکەنەوە، لەهەموو دارەکانیان هێنا، تەنانەت ژنانی گوندەکەی ئیبراهیم نەزریان کرد تا نیازەکانیان بێتەدی. ئەوانیش داروچیلکەیان بۆ ئاگرەکەی ئیبراهیم برد.

کاتێك ویستیان بیخەنە ناو ئاگرەکەوە، ئاگریان لەچیلکە و چەوێڵ بەردا، کاتێك بڵێسەی سەند و ویستیان ئیبراهیم بخەنە ناو ئاگرەکەوە، لەئاسمان و زەوی خەڵکان هاوار بەرز بوویەوە: خواوەندا، لەزەوی تۆ جگە ئیبراهیم،

خواپەرەستێك نییە، ئەو لەبەر تۆ دەسوتێنن، فەرمانمان پێبدە تا هاوکاری بکەین.

دەڵێن و خوا زاناترە، کاتێك ئەمەیان وت: خواوەند فەرمووی: ئەگەر داوای هاوکاری لەئێوە کرد، هاوکاری بکەن وئەگەر تەنیا داوای هاوکاری لەمن کرد، من سەرپەرەستی ئەوم، خۆم دەیپارێزم.

کاتێك ئەویان خستە ناو ئاگرەکە، فەرمووی: ئەی ئاگر، بۆ ئیبراهیم فێنك وبێ زیان بە. ئاگر بەهەمان شێوە بوو کەخوا فەرمانی پێدا.

لەسەدی دەگێڕنەوە، خەڵکی ئیبراهیم وتیان: بینایەك دروست بکەن و بیخەنە ناو ئاگر. ئەویان لەماڵێکدا گرت و داروچیلکەیان کۆکردەوە تا ئەو جێگەی ژنێك نەخۆش دەکەوت و دەیوت: ئەگەر خوا شیفام بدات، دار بۆ سوتاندنی ئیبراهیم دەبەم. کاتێك دارو وچیلکە فراوان بوو و ئاگر بڵێسەی سەند، باڵندەکان کە بەسەر ئاگرەکەدا هەڵدەفڕین، دەسوتان، ئیبراهیمیان بردە سەر بەرزایی بیناکە. سەری بۆ ئاسمان بەرز کردەوە و ئاسمان و زەوی و کێوەکان و فریشتەکان وتیان: خواوەندا، ئیبراهیم لەبەر پەرەستینی تۆ دەسوتێنن.

خواوەند فەرمووی: من باشتر ئاگاداری حاڵی ئەوم، ئەگەر داوای لەئێوە کرد، هاوکاری بکەن.

ئیبراهیم سەری بۆ ئاسمان بەرز کردەوە، وتی: خواوەندا، تۆ لەئاسمان تاقانەیت و من لەزەوی تاقانە، چوونکە لەسەر زەوی کەس جگە لەمن تۆ ناپەرستێت. خوایە تۆ بۆ من بەسیت چوونکە باشترین پشتیوانیت.

ئەویان خستە ناو ئاگرەکە. دەنگ لەئاسمانەوە هات، ئەی ئاگر بۆ ئیبراهیم فێنك وبێ زیان بە. جبرەئیل ئەم فەرمانەی خوای گەیاند.

کوڕی عەباس دەڵێت: ئەگەر وشەی (بێ زیان) (بەدوای) وشەی (فێنك) دا نەدەهات، ئیبراهیم لەفێنکی ئاگرەکە دەمرد و لەئێستادا ئاگر لەسەر زەوی بونی نەدەبوو.

کاتێك ئاگر کوژایەوە، ئیبراهیمیان بینی کەپیاوێکی دیکەی لەگەڵدایە و سەری خستۆتە داوێنی ئیبراهیم و ئارەق لەناوچاوانی دەسڕێت. دەڵێن، ئەو پیاوە فریشتەی سێبەر بوو. ئیبراهیمیان هێنایەدەر و بردیانە لای پاشا، چوونکە

پێشتر پاشای لەنزیکەوە نەبینیبوو.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: خواوەند فریشتەی سێبەری بۆ لای ئیبراهیم ڕەوانە ولەناو ئاگرەکە لای دانیشت و قسەی لەگەڵ دەکرد. چەند ڕۆژێك تێپەڕی و نەمروود گومانی کرد ئاگر ئیبراهیمی لەناوبردبێت. سوار ئەسپ لای ئاگرەکە تێپەڕی و سەیری کرد. بینی ئیبراهیم لەناو ئاگرەکە دانیشتووە و کەسێکی دیکەی هاوشێوەی خۆی، هاوڕێیەتی. لەوێ گەڕایەوە و بەخەڵکەکەی خۆی وت: ئیبراهیمم بینی لەناو ئاگرەکەدا زیندووە و گومانم لای دروست بوو، بورجێك دروست بکەن تا بتوانم لەسەرەوە ببینم. بورجێکیان بۆ دروست کرد و ڕۆشتەسەر. سەیری ئاگرەکەی کرد و ئیبراهیمی بینی لەناو ئاگرەکەدا دانیشتوە و فریشتەیەکی بینی هاوشێوەی ڕوخساری ئیبراهیم هاوڕێیەتی دەکات.

نەمروود بانگی کردن ئەی ئیبراهیم، گەورەیە ئەو خوایەی ڕێگەی نەدا ئاگر زیان بەتۆ بگەیێنێت، دەتوانی لەئاگرەکە بێیتەدەر؟

ئیبراهیم وتی: بەڵێ. نەمروود وتی: ئایا ئەگەر لەناو ئاگرەکە بمێنیتەوە، زیانت پێدەگات؟ وتی: نا.

وتی: هەستە و لەئاگرەکە وەرەدەر.

ئیراهیم هەستا و لەناو ئاگرەکە بەرێدا دەڕۆشت و لێی هاتەدەر.

کاتێك گەیشتە لای نەمروود، لێی پرسی: ئەی ئیبراهیم، ئەو پیاوەی هاوشێوەی تۆبوو و لەناو ئاگرەکەدا بینیم، کێ بوو؟

وتی: فریشتەی سێبەر. خواوەند ڕەوانەی کرد تا هاودەمی من بێت و ئاگرەکە بۆ من فێنك و بێ زیان بکات.

نەمرود وتی: ئێستا کەهێز و گەورەیی خوای تۆم بینی، چوار هەزار مانگای بۆ دەکەمە قوربانی.

ئیبراهیم وتی: تا لەسەر دینەکەی خۆت بیت، خوا بەقوربانییەکانی تۆ ڕازی نابێت مەگەر ئەوەی پشت بکەیتە دینەکەی خۆت.

وتی: ئەی ئیبراهیم، ناتوانم دەستبەرداری پاشایەتی بم بەڵام قوربانی دەکەم. قوربانی کرد و چاوپۆشی لەئیبراهیم کرد. خوا زیانی نەمرودی لەئیبراهیم

دورخستەوە.

لەسلێمانی تەمیمی دەگێڕنەوە، کاتێك ئیبراهیمیان دەبەستەوە بۆ ئەوەی بیخەنە ناو ئاگرەکە، جبرەئیل هات و وتی: ئەی ئیبراهیم، هیچ نیازێکت هەیە؟ وتی: بەتۆ نا.

لەباوکی سلێمان دەگێڕنەوە کەوتی: ئاگرەکە تەنیا بەندەکانی دەستی ئیبراهیمی سووتاند.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: زۆربەی خەڵکانی نەتەوەی ئیبراهیم کەبەخششەکانی خوایان بۆ ئیبراهیم بینی، هەرچەندە لەنەمرود دەترسان، باوەڕیان پێ هێنا، لەناو ئەوان لوت برازای ئیبراهیم باوەڕی هێنا. لوت کوڕی هاران کوڕی تارخە و هاران برای ئیبراهیمە. برایەکی دیکەیان هەبوو بەناوی ناحور کوڕی تارخ. هاران باوکی لوتە و ناحور باوکی بەتویل و بەتویل باوکی لابان و رەبقا کچی بەتویل هاوسەری ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم و دایکی یەعقوبە و لیا و راحیل دوهاوسەرەکەی یەعقوب کچەکانی لابانن.

سارە کچی مامی ئیبراهیم باوەڕی هێنا، ئەو، کچی هارانی گەورە، مامی ئیبراهیمە. خوشکێکی بوو بەناوی مەلیکا کەهاوسەری ناحورە.

دەڵێن: سارە کچی پاشای حەرانە.

ئامارژەدان بە بێژەری ئەم وتەیە

لەسەدی دەگێڕنەوە: ئیبراهیم و لوت بەرەو شام بەرێکەوتن. ئیبراهیم سارەی بینی و سارە کچی پاشای حەران بوو کەپشتی کردبووە ئایینی خەڵکەکەی خۆی. ئیبراهیم ئەوی کردە هاوسەری،بەو مەرجەی جگە لەو کەس نەکاتە هاوسەر.

ئیبراهیم پیشنیاری دینەکەی خۆی بەئازەری باوکی کرد و وتی: باوکە، بۆ ئەو بتانەی چاو و گوێیان نییە و هیچ کارێك بۆ تۆ ئەنجام نادەن، دەپەرەستیت؟ باوك بەپێشنیارەکەی رازی نەبوو.

ئیبراهیم و هاورێ باوەڕدارەکانی بڕیاریاندا خۆیان لەخەڵکەکەیان دوور بخەنەوە، وتیان: ئێمە لەئێوە و ئەو بتانەی وەك خوا دەیانپەرەستن، بێزارین، ئەی

بتەکان و ئەی بتەپەرستەکان، حاشا لەئێوە دەکەین. لەنێوان ئێمە و ئێوە دوژمنایەتی و کینە هەیە تا ئەو کاتەی باوەڕ بەخوای تاقانە دەهێنن.

ئیبراهیم لەرێگەی خوادا کۆچی کرد. لوت هاورێی بوو.

ئیبراهیم سارەی ئامۆزای وەك هاوسەری خۆی هەڵبژارد. ئەوی لەگەڵ خۆیدا برد و لەحەران دابەزی و تا ئەو کاتەی خواوەند ویستی، لەوێ مایەوە.

دواتر لەوێ ڕۆشت و لەمیسر دابەزی کەیەکێك لەفیرعەونە کۆنەکان پاشایەتی دەکرد. سارە وەك دەڵێن بەرادەیەك جوان و فەرمانبرداری ئیبراهیم بوو، خواوەند ڕێزی لێدەگرت. کاتێك وەسفی جوانی ئەویان بۆ فیرعەون کرد، ئیبراهیمی بانگ کرد و وتی: ئەم ژنە چیتە؟

ئیبراهیم وتی: خوشکی منە. چوونکە دەترسا ئەگەر بڵێت هاوسەرمە، فیرعەون بۆ بەدەست هێنانی سارە بیکوژێت.

فیرعەون بەئیبراهیمی وت: بیرازێنەرەوە و بۆ منی بنێرە تا بیبینم.

ئیبراهیم گەڕایەوە و بەسارەی وت بۆ ئەوەی خۆی ئامادە بکات. ئەوی بۆ لای فیرعەون ڕەوانە کرد. کاتێك سارە لای فیرعەون دانیشت، دەستی بۆ درێژ کرد بەلاّم دەستی بەسینگیەوە وشك بوو، کاتێك ئەمەی بینی، کارەکەی بەگەورە و دژوار زانی، وتی: داوا لەخوا بکە، دەستی من چاك بکاتەوە، سوێند بەخوا خراپە لەگەڵ تۆ ناکەم و ڕێزت لێدەگرم.

سارە وتی: خواوەندا ئەگەر راست دەکات، دەستی چاك بکەرەوە. خواوەند دەستی ئەوی چاك کردەوە. فیرعەون سارەی بۆ ئیبراهیم گەڕاندەوە. هەروەها هاجەری پێبەخشی کەکەنیزێکی قیبتی بوو.

ئەبو هورەیرە دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئیبراهیم سێ جار درۆی کرد، دوو جاریان لەرێگەی خوادا بوو، یەکیان ئەوەی کەوتی: نەخۆشم، یەکی دیکە ئەوەی کەوتی: بتە گەورەکە بتەکانی دیکەی شکاندوە لەگەڵ ئەو جارەی ڕۆشتە سەرزەمینی یەکێك لەستەمکاران و لەماڵێك دابەزی، پیاوی خاوەن ماڵەکە ڕۆشتە لای پاشا و وتی: پیاوێك لەسەرزەمینەکەی تۆدایە و ژنێکی زۆر جوان هاورێیەتی دەکات. پاشا داوای ئەو ژنەی کرد و وتی: ئەم ژنە کێیە؟

وتی: خوشکی منه.

پاشا وتی: بڕۆ و بینێره بۆ لای من.

ئیبراهیم ڕۆشته لای ساره و وتی: ئەم پاشا ستەمکاره پرسیاری تۆی لەمن کرد و وتم خوشکی منی، لای ئەو، درۆکەم ئاشکرا مەکە چوونکە لەرێگەی خوادا خوشکی منیت. لەبەر ئەوەی لەسەر زەوی موسوڵمانێك جگە لەمن و تۆ بوونی نییە.

فەرمووی: ئەوی برد و ئیبراهیم بۆ نوێژ وەستا. کاتێك ساره ڕۆشته لای پاشا، بڕیاریدا بیبەستێتەوە، بەڵام دەستی وشك بوو، بەسارەی وت: لەخوا بپاڕێرەوە و من خراپە لەگەڵ تۆ ناکەم.

ساره لەخوا پاڕایەوە و پاشا رزگاری بوو. دوباره دەستی بۆ درێژ کرد بەڵام بەهەمان شێوەی جاری یەکەم دەستی وشك بوو، وتی: لەخوا بپاڕێرەوە، من خراپە لەگەڵ تۆ ناکەم. ساره لەخوا پاڕایەوە وپاشا رزگاری بوو. سێیەم جار دەستی بۆ ساره درێژ کرد و دوباره دەستی وشك بوو. پاشا داوای لەساره کرد لەخوا بپاڕێتەوە.

پاشا داوای پەردەدارەکەی خۆی کرد و وتی: ئەمە مرۆڤە نییە بۆ منت هێناوە، شەیتانە. ئەو بگەرێنەرەوە و هاجەری پێ ببەخشە. ئەویان گەڕاندەوە و هاجەریان پێ بەخشی.

کاتێك ئیبراهیم هەستی بەگەڕانەوەی ساره کرد، کۆتایی بەنوێژەکەی هێنا و وتی: چی ڕوویدا؟

وتی: خواوەند زیانی کافری لەمن دوور خستەوە و هاجەری وەك خزمەتکار پێبەخشیم.

محەممەد کوڕی سیرین دەڵێت: کاتێك ئەبو هورەیره ئەم حەدیسەی دەگێڕایەوە، وتی: دایکتان بەمشێوە بوو.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: هاجەر کەنیزێکی جوان روخسار بوو، ساره بەئیبراهیمی بەخشی و وتی: ژنێکی جوانە، ئەو بکەره هاوسەری خۆت، ئەگەری هەیە خواوەند منداڵێکت پێ ببەخشێت.

سارە منالی نەبوو و تا تەمەنی پیری هیچ منالێکی بۆ ئیبراهیم نەهێنایە دنیا. ئیبراهیم داوای لەخوا کردبوو، منالێکی سالحی پێببەخشێت. داواکەی دواکەوت تا ئەوەی ئیبراهیم ساڵەکانی تەمەنی درێژ بوویەوە. سارە نەزۆك بوو، ئیبراهیم نزیکی لەگەڵ هاجەر کرد وئیسماعیل چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

لەکەعبی ئەنساری دەگێڕنەوە: پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: کاتێك دەستان بەسەر میسردا گرت، چاکە لەگەڵ خەڵکەکەی بکەن، چوونکە پەیوەندی خزمایەتیتان لەگەڵ ئەوان هەیە.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: پرسیارم لەزۆهری کرد سەبارەت بەم خزمایەتیەی پێغەمبەر(د.خ) باسی دەکرد؟ وتی: هاجەر دایکی ئیسماعیل لەوانە.

دەلێن و خوا زاناترە، سارە لەبێ منالی، خەمبار و خەمگین بوو.

ئیبراهیم لەمیسرەوە بەرەو شام بەڕێکەوت چوونکە لەشای میسر دەترسا و لەزیانی ئەو نیگەران بوو. کاتێك لەشام دابەزین، لەسەرزەمینی فەلەستین کەسارای شامە، نیشتەجێ بوون. لوت لەمۆتەفکە نیشتەجێ بوو. تا سەبع یەك شەو و رۆژ کەمتر رێگا و خواوەند ئەوی وەك پێغەمبەر هەڵبژارد.

ئیبراهیم وەك وتوویانە سەبع مایەوە، چاڵێکی هەڵکەند و مزگەوتێکی دروست کرد، شوێنی ئاوخواردنەوەی ئەو پاك و مەڕەکان لەوێ تێراو دەبوون بەڵام خەڵکانی سەبع ئازاریاندا. لەوێ ڕۆشت و لەناوچەیەك لەنێوان رەملە و ئیلیا لەشارێك بەناوی قت، دابەزی. کاتێك سەبعی بەجێهێشت، ئاو وشکی کرد. خەڵکەکەی شوێن ئیبراهیم کەوتن تا پێی گەیشتنەوە و لەکارەکەی خۆیان پەشیمان بوونەوە. وتیان: پیاوێکی خواپەرستمان لەناو خۆمان دەرکرد، داوایان لێکرد بگەڕێتەوە.

وتی: من بۆ ئەوشارەی لێی دەرکراوم، ناگەڕێمەوە.

وتیان: ئەو ئاوەی لێت دەخواردەوە و ئێمەیش لێمان دەخوارد، وشکی کردووە.

ئیبراهیم ڕۆشت وحەوت بزن لەمەڕومالاتی خۆی بەوان بەخشی، وتی: بزنەکان لەگەڵ خۆتان ببەن، کاتێك بیانبەنە سەر چاڵەکە، ئاو هەڵدەقوڵێت و کانیاوکە

هاوشێوەی پێشوو، پاك و خاوێن دەبێت. لێی بخۆنەوە. بەڵام ژنی نەخۆش (سووڕی مانگانە) ئاوی لیّ هەڵنەگرێت.

ئەوان بزنەکانیان برد و کاتێك بزنەکان لەسەر چاڵەکە وەستان. ئاو هەڵقوڵی، لەئاوەکەیان خواردەوە، ئاوی کانیاوکە بەردەوام بوو تا ئەو کاتەی ژنێکی نەخۆش هات و مشتێك ئاوی لێهەڵگرت. ئاوەکە کەمی کرد بەو شێوەی کەئێستا دەیبینین.

دەڵێت: ئیبراهیم میوانداری خەڵکانی دەکرد چوونکە خواوەند ڕۆژی ئەوی فراوان و مەڕومالآتی پێبەخشیبوو.

کاتێك خواوەند مەبەستی ئەوەی کرد نەتەوەی لووت لەناو ببات، نێردراوەکانی خۆی ڕەوانە کرد تاپێی بڵێن لەناو نەتەوەکەی خۆی کۆچ بکات چوونکە هیچکەس لەجیهانیان هاوشێوەی ئەوان گوناحی خوایان ئەنجام نەدابوو. حاشایان لەپێغەمبەرەکەی خۆیان کرد و ئامۆژگاری ئەویان لەگویّ نەگرت.

نێردراوان فەرمانیان پێدرابوو بڕۆنە لای ئیبراهیم و مژدە ئیسحاق بەسارە وئیبراهیم بدەن. پانزە شەو تێپەڕیبوو و ئیبراهیم میوانداری کەسی نەکردبوو. لەنەهاتنی میوان خەمبار بوو، کاتێك ئەوانی بینی، شادی دەست پێکرد چوونکە تا ئەوکات میوانداری کەسی جوانی وەك ئەوانی نەکردبوو، وتی: کەس جگە لەخۆم خزمەتی ئەوان ناکات. بۆ لای کەسانی بنەماڵەکەی ڕۆشت و بەهەمان شێوە کەخواوەند دەفەرمێت، گوێرەکەیەکی برژاوی هێنا و لەبەردەم ئەوان داینا. دەستیان لێنەدا، ئیبراهیم ڕەنجا و نیگەران بوو لەوەی خواردنیان نەدەخوارد.

وتیان: مەترسە، ئێمەیان بۆ لای نەتەوەی لوت ڕەوانە کردووە.

سارە وەستا بوو، کاتێك لەفەرمانی خواوەند ئاگادار بوویەوە، پێکەنی چوونکە بەسەرهاتی خەڵکی لوتی دەزانی. مژدەی ئیسحاقیان بەسارەدا و بەدوای ئیسحاق یەعقوب، یانی کوڕ و کوڕی کوڕ. سارە لەڕوخساری خۆیدا وتی: هاوار، منی پیرۆ نەزۆك، مناڵم دەبێت؟

دەستەیەك لەزاناکان وتوویانە لەوکاتەدا تەمەنی سارە نەوەد و یەك ساڵ بوو وئیبراهیم سەد وبیست ساڵ.

کاتێك ترسی ئیبراهیم ڕەویەوە و مژدەی لەدایك بونی ئیسحاق و یەعقوبی

لەپشتی ئیسحاق پێگەیشت، وتی: سوپاس بۆخوا کە لەکاتی پیری ئیسماعیل و ئیسحاقی بەمن بەخشی. ئەو بیسەری نزاکانە..

لەشوعەیب کوڕی جەبا دگێڕنەوە: ئیبراهیم شانزە ساڵە بوو کاتێك ئەویان خستە ناو ئاگرەوە. ئیسحاق حەوت ساڵە بوو کاتێك فەرمانی سەربڕینی هاتەخوار و سارە نەوەد ساڵە بوو کاتێك منالی هێنایە دنیا. شوێنی قوربانی کردنی ئیسحاق دو میل لەماڵی ئیلیاوە دوور بوو. کاتێك سارە هەواڵی سەربڕینی ئەوی بیست، دو رۆژ نەخۆش کەوت و لەسێیەم رۆژ کۆچی دوایی کرد.

دەڵێن: سارە لەتەمەنی سەد و بیست و حەوت ساڵی کۆچی دوایی کرد.

لەسەدی دەگێڕنەوە: خواوەند فریشتەکانی ڕەوانە کرد تا نەتەوەی لوت لەناو ببەن. فریشتەکان لەروخساری پیاوە قۆزەکان دەرکەوتن و بوونە میوانی ئیبراهیم. ئیبراهیم رێزی لێگرتن و گوێرەکەیەکی برژاوی خستە بەردەمیان. لەگەڵ ئەوان دانیشت و سارە خزمەتی دەکردن. خواوەند لەقورئاندا دەفەرمێت: (( و امرئتە قائمە و هو جالس. واتاکەی: ژنەکەی وەستابوو و خۆی دانیشتبوو.)) کاتێك گوێرەکەکەی نزیك کردەوە، وتی: بۆ ناخۆن؟

وتیان: ئەی ئیبراهیم، ئێمە خواردنی خۆڕایی ناخۆین.

ئیبراهیم وتی: ئەم خواردنەیش بەهای خۆی هەیە.

وتیان: بەهاکەی چییە؟

وتی: ئەوەی لەسەرەتادا ناوی خوا بێنن و ستایش و سوپاسی بکەن.

جبرەئیل سەیری میکائیلی کرد و وتی: بەراستی شیاوە خواوەند وەك خەلیلی خۆی دەستنیشانی بکات.

کاتێك ئیبراهیم بینی، دەست بۆ خواردنەکە نابەن، ترسا و کاتێك سارە بینی ئیبراهیم رێزیان لێدەگرێت و خۆی بۆ خزمەتی ئەوان وەستابوو، پێکەنی و وتی: کاری میوانەکانی ئێمە سەیرە، رێزیان دەگرین و خۆمان خزمەتیان دەکەین بەڵام خواردنەکەی ئێمە ناخۆن.

## وتار سەبارەت بەدروست کردنی کەعبە

دەڵێن، دوای لەدایك بوونی ئیسماعیل و ئیسحاق خواوەند فەرمانی بەئیبراهیمدا ماڵێك دروست بکات تا لەوێ پەرەستشی خوا بکەن. ئیبراهیم نەیدەزانی بینای کەعبە لەکوێ دروست بکات چوونکە لەمبارەوە هیچی پێ نەوترابوو. دەستەیەك لەزاناکان وتوویانە: خواوەند (ئارامی) بۆ ئەو ڕەوانە کرد تا شوێنی ماڵەکەی نیشان بدات. (ئارامی) لای ئەو تێپەڕی و هاجەر و ئیسماعیل کەمناڵێکی کەم تەمەن، هاوڕێی ئیبراهیم بوون.

دەستەیەکی دیکە وتویانە خواوەند جبرەئیلی ڕەوانە کرد و شوێنی ماڵەکەی نیشاندا و وتی دەبێت چۆن کارەکەی تەواو بکات.

## ئاماژەدان بەو کەسانەی وتوویانە خواوەند ئارامی بۆ لای ئەو ڕەوانە کرد

لەخالید کوڕی عەرعەرە دەگێڕنەوە، پیاوێك لای عەلی کوڕی ئەبی تالب وەستا و وتی: ئایا کەعبە یەکەم ماڵ بوو لەسەرزەوی بیناغەی دارێژرا؟

وتی: نە، یەکەم ماڵ بوو لەبەرەکەتی، پێگەی ئیبراهیم بینا کرا. هەرکەس بڕواتە ناوی، پارێزراوە و ئەگەر دەتەوێت باسی دەکەم چۆن بینا کرا. خواوەند وەحی بەئیبراهیم کرد کە لەسەرزەمینی من ماڵێك دروست بکە. ئیبراهیم نەیدەزانی دەبێت چی بکات و خواوەند ئارامی ڕەوانە کرد کە بایەکی سەخت و دو سەر بوو. سەرەکانی بەدوای یەکترەوە بوون و ڕۆشت تا گەیشتە مەککە و لەشوێنی کەعبە لوولیان خوارد بەهەمان شێوە کەمار خۆی لوول دەدات. ئیبراهیم فەرمانی پێدرا، لەهەر شوێنێك ئارامی جێگەی گرت، ماڵەکە دروست بکات.

ئیبراهیم ماڵەکەی دروست کرد و شوێنی یەك بەرد مایەوە. کوڕەکەی ڕۆشت شتێك بێنێت. ئیبراهیم وتی: بەردێك بێنە. کوڕ بەدوای بەرد گەڕا و بینی کەئیبراهیم حجر الاسودی لەشوێنەکە داناوە. وتی: باوکە، کێ ئەم بەردەی هێنا.

وتی: ئەو کەسەی پێویستی بەبینای تۆ نییە، جبرەئیل لەئاسمانەوە هێنای.ماڵەکەیان تەواو کرد.

لەعەلی کوڕی ئەبی تالب دەگێڕنەوە، کاتێك ئیبراهیم فەرمانی دروست کردنی ماڵەکەی پێدرا، ئیسماعیل و هاجەری لەگەڵ خۆی برد و کاتێك گەیشتە مەککە، لەشوێنی ماڵەکە شتێکی هاوشێوەی هەوری لەسەر سەری خۆی بینی. دەتوت سەری هەیە و قسەی لەگەڵ دەکات کە: ئەی ئیبراهیم لەسێبەری من و بەئەندازەی من ماڵەکە دروست بکە بێ کەم و زیاد.

کاتێك ماڵەکەی دروست کرد، ئیسماعیل و هاجەری دانا. هاجەر وتی: ئێمە بەکێ دەسپێریت؟

وتی: بەخواوەند.

هاجەر وتی: بڕۆ، چوونکە خواوەند ئێمە بەتەنیا جێ ناهێڵێت.

فەرمووی: ئیسماعیل تینووی بوو. هاجەر ڕۆشتە سەر صەفا و سەیری کرد و هیچی نەبینی. ئەم کارەی بۆ حەوت جار دووبارە کردەوە، وتی: ئیسماعیل کاتێك دەتبینم کەمردوویت. ڕۆشتە لای ئیسماعیل و بینی لەتینویەتی پێی لەزەوی دەخشێنێت. جبرەئیل هاواری کرد، کێیت؟

وتی: من هاجەر دایکی منداڵی ئیبراهیمم.

جبرەئیل وتی: ئێوەی بەکێ سپارد؟

وتی: بەخواوەند.

جبرەئیل وتی: ئەم پاسەوانە بۆ ئێوە بەسە.

ئەو منداڵە بەپەنجەی زەوی هەڵدەکۆڵی و زەمزەم هەڵقوڵی. هاجەر ڕێگەی ئاوەکەی هەڵبەست.

جبرەیل وتی: ڕێگەکەی بکەرەوە چوونکە ئاوەکە ڕەوانە.

لەسەدی دەگێڕنەوە، خواوەند لەگەڵ ئیبراهیم و ئیسماعیل پەیمانی بەست تا ماڵەکەی بۆ حاجیەکان و خواپەرستان بەپاك و خاوێنی بهێڵنەوە.

ئیبراهیم بەرێکەوت تا گەیشتە مەککە. لەگەڵ ئیسماعیل وەستا و پاچیان بەدەستەوە بوو. نەیاندەزانی شوێنی ماڵی خوا کامەیە. خواوەند بایەکی ڕەوانە

کرد کەپێیان دەوت بای سەخت. دوو باڵی بوو و سەرێك هاوشێوەی مار. با، دەوروبەری کەعبە و بینا ماڵەکەی پاك کردەوە. ئیبراهیم و ئیسماعیل بەپاچ هەڵیانکەند و بناغەی ماڵەکەیان دارِشت. خواوەند فەرمووی: ئەو کاتەی شوێنی ماڵەکەمان نیشانی ئیسماعیلدا.

هەروەها لەعەلی کوڕی ئەبی تالب دەگێڕنەوە: کاتێك خواوەند فەرمانی دروست کردنی بیناکەی و هاندانی خەڵك بۆ حەج کردنی پێدان. ئیبراهیم لەشوێنەکەی خۆی بەرێکەوت و ئیسماعیل و هاجەر هاورێیەتیان دەکرد. خواوەند ئارامی لەگەڵ ئەودا ڕەوانە کرد. ئارامی، مار بوو، قسەی دەکرد و هاورێ لەگەڵ ئیبراهیم ڕێگەی دەبڕی، لەهەر شوێنێك وەستا. ئیبراهیمیش وەستا تا ئەوەی گەشتنە مەککە. کاتێك گەیشتنە شوێنی ماڵەکە، لەدەوری شوێنەکە لوولی خوارد و بەئیبراهیمی وت: لەجێگەکەی من دروستی بکە، لەجێگەکەی من دروستی بکە، لەجێگەکەی من دروستی بکە. ئیبراهیم پایەکانی دانا و ئیسماعیل دیوارەکانی بەرز دەکردەوە تا گەیشتنە شوێنی ڕۆکن. ئیبراهیم وتی: بەدوای بەردێك بگەڕێ تا بۆخەڵکانی بکەینە نیشانە. ئیسماعیل بەردی هێنا، ئیبراهیم پەسەندی نەکرد و وتی: بەردێکی دیکە بێنە. ئیسماعیل بۆ هێنانی بەردێکی دیکە ڕۆشت و هێنای. بەڵام حجر الاسودی بینی کەباوکی لەناو دیوارەکە دایناوە، وتی: باوکە، کێ ئەم بەردەی هێنا؟ وتی: کوڕم، کەسێك هێنای کەمنی بەتۆ نەسپارد.

کەسانی دیکە وتوویانە، ئەو کەسەی لەگەڵ ئیبراهیم لەشامەوە بەرێکەوت و شوێنی ماڵەکەی نیشاندا، جبرەئیل بوو. وتوویانە، هاجەر و ئیسماعیلی بردە مەککە، لەبەر ئەوەی سارە ڕژدی بەئیسماعیل دەبرد.

ئاماژەدان بە بێژەری ئەم وتەیە

لەسەدی دەگێڕنەوە: سارە، هاجەری بەئیبراهیم بەخشی. ئیبراهیم لەگەڵی خەوت و ئیسماعیلی هێنایە دنیا. ئیبراهیم لەگەڵ سارە خەوت و ئیسحاقی هێنایە دنیا. کاتێك ئیسحاق گەورە بوو، لەگەڵ ئیسماعیل شەڕی کرد. سارە لەدایکی

ئیسماعیل تورە و رژدی پێبرد. ئەوی لەماڵەکەی دەرکرد و دوبارە گەڕاندییەوە. سوێندی خوارد لەتێك لەگۆشتی جەستەی ببڕێت. وتی: لووتی ببڕم، گوێچکەی ببڕم کەعەیببار بێت؟ وتی: خەتێنەی دەکەم. ئەم کارەی کرد و هاجەر کارێکی کرد تا خوێنەکە بشارێتەوە. خەتێنەی ژنان لێرەوە بوو بەنەریت. سارە بەهاجەری وت: لەگەڵ من لەیەك شوێندا مەمێنەرەوە. خواوەند وەحی بۆ ئیبراهیم نارد تا بەرەو مەککە بڕوات. لەو کاتەدا هیچ ماڵێك لەمەککە نەبوو. ئیبراهیم هاجەر و کوڕەکەی بردە مەککە و لەوێ بەجێی هێشتن. هاجەر وتی: ئێمە بەکێ دەسپێریت؟ درێژەی داستانەکە لەگێڕانەوەی سەدیدا ئاماژەی پێدراوە.

لەموجاهید دەگێڕنەوە: کاتێك خواوەند شوێنی ماڵەکە و سنوری حەرەمی نیشانی ئیبراهیمدا، هاتەدەر و جبرئیل هاورێیەتی دەکرد. لای هەر گوندێك تێدەپەڕین، ئیبراهیم پرسیاری دەکرد: ئێرە کوێیە؟ جبرەئیل دەیوت: بڕۆین. تا گەیشتنە مەککە کەچڵستان بوو و خەڵکەکەی بەناوی عەمالیق لەدەرەوەی مەککە نیشتەجێ بوون. لەشوێنی ماڵەکە بەرزاییەکی سوورڕەنگی خاکی بوو. ئیبراهیم بەجبرەئیلی وت: لێرە دەبێت بەجێیان بێڵم؟ جبرەئیل وتی: بەڵێ. ئەوانی لەشوێنی حوجر جێگە کردەوە و لەوێ دابەزین. بەهاجەری وت تا سایەوانێك دروست بکات، وتی: ئەی خوایە، من وەچەی خۆم لەدۆڵێکی بێ کشتوکاڵ لەنزیك بیت الحرام بەجێهێشت. دواتر بۆ لای کەسەکانی لەشام گەڕایەوە. هاجەر و ئیسماعیلی لەنزیك ماڵی خوا بەجێهێشت.

دەڵێت: ئیسماعیل تینووی بوو. دایکی بەدوای ئاودا گەڕا بەڵام دەستی نەکەوت. گوێی هەڵخست لەوانەیە دەنگێك ببیستێت و ئاوی دەست کەوێت. لەلای سەفاوە دەنگێکی بیست ورۆشت و لەسەر بەرزاییەکەی وەستا بەڵام هیچی نەبینی. دەنگێکی لەلای مەروەوە بیست. ڕۆشت و لەوێ وەستا، بەڵام هیچی نەبینی.

دەڵێن: لەسەر سەفا وەستا و لەخوا پاڕایەوە وداوای هاوکاری بۆ ئیسماعیل کرد. بەرەو مەروە بەرێکەوت و لەوێش پاڕایەوە و داوای هاوکاری کرد. لەم کاتەدا لەو شوێنەی ئیسماعیلی بەجێهێشتبوو، دەنگی باڵندەکانی بیست و بەڕاکردن

گەڕایەوە. بینی کەئیسماعیل دەستی خۆی خستۆتە ناو کانییەك کەلەتەنیشت ئەو هەڵقوڵاوە و ئاو دەخواتەوە. هاجەر ڕێگەی ئاوەکەی بەست و دەفرەکەی خۆی پڕکرد و ئاوی بۆ ئیسماعیل هەڵگرت. دەڵێن ئەگەر ئەم کارەی نەدەکرد، زەمزەم هەمیشە ئاوەکەی ڕەوان دەبوو.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: یەکەم کەس کە لەنێوان سەفا و مەروە رایکرد، دایکی ئیسماعیل بوو. یەکەم کەس لەژنانی عەرەب کەخەتێنە کرا، هاجەر، دایکی ئیسماعیل بوو.

دەڵێت: کاتێك لەدەست سارە رایکرد، کارێکی کرد تا شوێن پێکانی بسڕێتەوە. ئیبراهیم، هاجەر و ئیسماعیلی برد تا گەشتنە شوێنی ماڵەکە. ئەوانی لەوێ دانا. هاجەر شوێنی کەوت و وتی: ئێمە بەکێ دەسپێریت؟ ئیبراهیم بێدەنگ بوو.

هاجەر وتی: ئەمە فەرمانی خوایە؟

ئیبراهیم وتی: بەڵێ.

وتی: خوا ئێمە بەجێ ناهێڵێت.

دەڵێت: ئیبراهیم گەڕایەوە و گەیشتە ڕێڕەوی کەدا. ڕووی کردە دۆڵەکە و وتی: خوایە، من نەوەکانی خۆم لەدۆڵێکی بێ کشتوکاڵ لەنزیك بیت الحرام بەجێهێشت.

دەڵێت: ژنەکە دەفرێك ئاوی پێبوو. ئاو کۆتایی هات و تینوو مانەوە. شیرەکەی وشکی کرد و کوڕەکەی تینووی بوو. هاجەر سەیری کرد تا بزانێت کام یەك لەکێوەکان بەرزترە. بەسەفادا سەرکەوت و گوێی هەڵخست تا دەنگێك ببیستێت یا هاودەمێك بدۆزێتەوە. بەڵام هیچی نەبینی و هیچی نەبیست. هاتەخوار و کاتێك گەشتە دۆڵەکە، دەستی بەراکردن کرد بەڵام حەزی لەڕاکردن نەبوو وەك مرۆڤێك کەبخوازێت رابکات بەڵام تاقەتی راکردنی نەبێت.

دوبارە سەیری کرد تا بزانێت کام یەك لەکێوەکان نزمترە. بەمەروەدا سەرکەوت. گوێی هەڵخست بۆ ئەوەی دەنگێك ببیستێت یا کەسێك ببینێت. باوەڕی نەدەکرد کەسی لێ نەبێت. دڵنیا بوو و وتی: دەنگی تۆم بیست، هاوکاریم

بکە چوونکە من و منالّەکەم خەریکە لەناو دەچین. فریشتە ئەوی بۆ شوێنی زەمزەم هێنایە خوار. قاچی لەزەوی کوتا و کانییەك هەڵقولاّ و ژن بەخێرایی دەفرەکەی خۆی پڕکرد. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەگەر پەلەی نەدەکرد، ئاوی زەمزەم ڕەوان دەبوو.

فریشتە پێی وت: بۆ خەڵکی ئەم دیارە، لەتینوویەتی مەترسە چوونکە ئەم کانییە بۆ خواردنەوەی میوانەکانی خوایە. هەروەها وتی: بەم زوانە باوکی ئەم منالّە دێت و بۆ خوا مالّێك دروست دەکات. شوێنی مالّەکەی نیشاندا.

دەڵێت: ئەوکەسانەی لەجورهەمەوە بەرەو شام دەڕۆشتن، لەویّ تێپەڕین و بالّندەکانیان لەسەر کێوەکە بینی، وتیان: بالّندە نیشانەی ئاوە، ئایا لەم دۆڵەدا ئاوتان بینیوە؟

وتیان: نە. ڕۆشتنە سەر بەرزایی و ژنەکەیان بینی و لێی نزیك کەوتنەوە. داوایان لێکرد لای ئەو بمێننەوە. هاجەر ڕێگەی پێدان.

دەڵێت: هاجەر مرد و ئیسماعیل لەو خەڵکە ژنێکی کردە هاوسەری خۆی. ئیبراهیم هات و پرسیاری مالّی ئیسماعیلی کرد. کاتێك مالّەکەی دۆزییەوە، ئەوی نەبینی. هاوسەرەکەی بینی، توڕە و دڵ ڕەق، وتی: کاتێك هاوسەرەکەت گەڕایەوە پێی بڵیّ پیرێك بەفلاّنە و فیسارە تایبەتمەندی هاتە لای تۆ و پەیامی بۆ تۆدانا کە، بەردەرگای مالّەکەتم پەسەند نەکرد، بیگۆڕە. ڕۆشت.

کاتێك ئیسماعیل گەڕایەوە و ژن ئاگاداری کردەوە، ئیسماعیل وتی: ئەوە باوکم بوو و تۆ بەردەرگای مالّی منیت. ئەوی تەلاّقدا و ژنێکی دیکەی لەو خەڵکە وەك هاوسەر هەڵبژارد.

ئیبراهیم جاریکی دیکە هات و گەیشتە بەردەرگای مالّی ئیسماعیل. ئەوی نەبینی. هاوسەرەکەی بینی کەرووگەش و ڕێزدار بوو. وتی: هاوسەرەکەت لەکوێیە؟

وتی: ڕۆشتووە بۆ راو.

وتی: خواردنتان چییە؟

وتی: گۆشت و ئاو.

وتی: خوایە، گۆشت و ئاوی ئەوان فراوان بکە. سێ جار ئەمەی دوبارە کردەوە. وتی: کاتێك هاوسەرەکەت گەڕایەوە، پێی بڵێ: پیرێك بەفڵانەو فیسارە تایبەتمەندی هات و وتی: بەردەرگای ماڵەکەتم پەسەند کرد، بیپارێزە. کاتێك ئیسماعیل گەڕایەوە، ژنەکەی ئاگاداری کردەوە.

جاری سێیەم ئیبراهیم گەڕایەوە و پایەکانی ماڵی خوایان دروست کرد.

دەڵێن: ئیبراهیم داوای لەسارە کرد تا بڕواتە سەردانی هاجەر. سارە مۆڵەتی پێدا بەو مەرجەی لەئەسپەکەی دانەبەزێت.

ئیبراهیم گەیشتە بەردەرگای ماڵی ئیسماعیل و بەژنەکەی وت: هاوسەرەکەت لەکوێیە؟

وتی: لێرە نییە و بۆ ڕاو ڕۆشتووە. ئیسماعیل لەحەرەم دەڕۆشتەدەر و ڕاوی دەکرد و دەگەڕایەوە.

ئیبراهیم وتی: ئایا خواردن و خواردنەوەتان هەیە؟

ژن وتی: هیچم نییە و کەسم لای نییە.

ئیبراهیم وتی: کاتێك هاوسەرەکەت گەڕایەوە، سڵاوی بگەیێنە و پێی بڵێ بەردەرگای ماڵەکەی بگۆڕێت.

کاتێك ئیبراهیم ڕۆشت و ئیسماعیل گەڕایەوە، بۆنی باوکی کرد، بەهاوسەرەکەی وت: ئایا کەس هاتوە؟

وتی: پیاوێکی پیری ئاوا و ئاوا هات. زۆر گرنگی پێنەدا.

ئیسماعیل پرسی: چی پێ وتی؟

وتی: پێی وتم سڵاوی مێردەکەت بگەیێنە وپێی بڵێ بەردەرگای ماڵەکەی بگۆڕێت.

ئیسماعیل ئەوی تەڵاقدا و ژنێکی دیکەی کردە هاوسەر.

ئیبراهیم تا ئەو کاتەی خواوەند ویستی، مایەوە و دوبارە داوای لەسارە کرد تا بۆ سەردانی ئیسماعیل بڕوات. سارە مۆڵەتی پێدا بەو مەرجەی لەئەسپەکەی دانەبەزێت. ئیبراهیم ڕۆشت تا گەیشتە ماڵی ئیسماعیل. بەژنەکەی وت: هاوسەرەکەت لەکوێیە؟

وتی: بۆ راو ڕۆشتووە و ئەگەر خوا بیەوێت، ئێستا دەگەڕێتەوە. دابەزە خوا لێت خۆش بێت.

ئیبراهیم وتی: میوان رادەگریت.

وتی: بەڵێ.

وتی: نانی گەنم یا جۆ یا خورمات هەیە.

دەڵێت: ژن شیر و گۆشتی هێنا و ئیبراهیم داوای فراوانی بۆ کرد. ئەگەر ئەو رۆژە نانی گەنم یا جۆ یا خورمای دەهێنا، زەوی خوا زیاتر لەهەموو شتێك گەنم یا جۆ یا خورمای لێدەڕوا.

ژن وتی: دابەزە، تا سەرت بشۆم.

ئیبراهیم دانەبەزی و بەردێکی هێنا و لای راست داینا. ئیبراهیم قاچی خستەسەر. شوێنی قاچەکەی لەسەر بەردەکە مایەوە. ژن، بەشی راستی سەری ئەوی شۆرد. دواتر بەردەکەی بردە لای چەپ و بەشی لای چەپی سەری شۆرد. ئیبراهیم پێی وت: کاتێك هاوسەرەکەت گەڕایەوە، سڵاوی بگەیێنە و بڵێ، بەردەرگایماڵەکەت بەهێزە.

کاتێك ئیسماعیل گەڕایەوە، هەستی بەبۆنی باوکی کرد. بەژنەکەی خۆی وت: کەس هاتە لای تۆ؟

وتی: بەڵێ، پیرەپیاوێکی بۆنخۆشی جوان روخسار هات و ئەمە و ئەوەی وت. منیش ئەمە و ئەوەم کرد، سەریم شۆرد و ئەمە شوێن پێی ئەوە لەسەر ئەم بەردە بەجێماوە.

ئیسماعیل وتی: چی پێ وتی؟

وەڵامی دایەوە و وتی: کاتێك مێردەکەت گەڕایەوە، سڵاوی بگەیێنە وبڵێ بەردەرگای ماڵەکەت بەهێزە.

ئیبراهیم تا ئەو کاتەی خواوەند ویستی، مایەوە. خواوەند فەرمانی پێدا تا ماڵی کەعبە دروست بکات. لەگەڵ ئیسماعیل ماڵەکەی دروست کرد و کاتێك ماڵەکە بەرز کرایەوە، دەنگێك هات ووتی: لەنێوان خەڵکان بانگەوازی حەج بکە. ئیبراهیم لای هەر خەڵکێك کەتێدەپەڕی، دەیوت: ئەی خەڵکینە، ماڵێکتان بۆ

دروست کراوە، زیارەتی بکەن. هەرکەس لەمرۆڤ و دار و بەرد کەوتەکانی ئەویان دەبیست، دەیوت: ((اللهم لبیك)). لەوتارەکەی ئەو کەوتی خوایە من منالەکانم لەم دۆڵە بێ کشتوکاڵە لای تۆ بەجێهێشت تا ئەو کاتەی سوپاسی خواوەندی کرد بۆ ئەوەی لەتەمەنی پیری ئیسماعیل و ئیسحاقی پێبەخشی، فلان ساڵ و فیسارە ساڵ دوورییە. بێژەر بیری کردووە ئاماژە بەم ساڵانە بدات.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: کاتێك ئیبراهیم بۆ سێیەم جار هات، ئیسماعیلی بینی کە لەنزیك زەمزەم سەرقاڵی تیر دروست کردن بوو، وتی: ئەی ئیسماعیل، پەروەردگار فەرمانی پێداوم، ماڵێکی بۆ دروست بکەم.

ئیسماعیل وتی: داواکارییەکەی بێنەدی.

ئیبراهیم وتی: فەرمانی بەتۆیشداوە، هاوکاریم بکەیت.

ئیسماعیل وتی: دەیکەم.

دەڵێت: ئیبراهیم بناغەی دادەڕشت و ئیسماعیل بەردی دەدایە دەست، دەیانوت:

خوایە لێمان رازی ببە چوونکە تۆ بیسەر و زانایت.

کاتێك ئیبراهیم لەبینای ئەو ماڵەی خواوەند فەرمانی پێدابوو، تەواو بوو، خواوەند فەرمانی پێدا تا بانگەوازی حەج بەگوێی خەڵکان بگەیەنێت بۆ ئەوەی پیادە و سوار لەهەر دۆڵێکەوە لەدەوری ماڵەکەی کۆببنەوە.

لەگێڕانەوەیەکی دیکە لەکوڕی عەباس ئاماژەی پێدراوە کەئیبراهیم دەڵێت: خواوەندا، دەنگی من بەکوێ دەگات؟

فەرمووی: گەیاندی لەئەستۆی من.

ئیبراهیم وتی: ئەی خەڵکینە! حەجی ماڵی کۆن لەسەر ئێوە پێویست کرا.

دەڵێت: هەموو ئەو بوونەوەرانەی لەسەر ئاسمان و زەوی بوون، دەنگی ئەویان بیست، مەگەر نابینی خەڵك لەهەموو سووچ و قوژبنێکەوە لەدەوری ئەو ماڵە کۆدەبنەوە.

هەروەها لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: کاتێك ئیبراهیم ماڵی خوای دروست کرد، خواوەند وەحی پێکرد تا بانگەوازی حەج بەخەڵك بگەیەنێت. ئیبراهیم وتی:

بزانن کەپەروەردگار ماڵێکی هەیە و فەرمانی داوە، زیارەتی بکەن. هەرچی لەبەرد و دار و خاک بییستی، وەڵامی دایەوە.

کوڕی عەباس سەبارەت بەفەرمانی خواوەند کەدەفەرمێت. بانگەوازی حەج بەگوێی خەڵکان بگەیێنە، دەڵێت: ئیبراهیم لای دەریا وەستا و وتی: ئەی خەڵکینە، حەج لەسەر ئێوە پێویست کرا. ئەوەی لەناو پشتی پیاوان و پزدانی ژناندا بوو بیستی و ئەوەی لەزانستی خوادا بوو تا ڕۆژی کۆتایی حەج بکات، وتی: لبیک، اللهم لبیک.

لەموجاهید دەگێڕنەوە: کاتێک بەئیبراهیم وترا، بانگەوازی حەج بەخەڵک بگەیێنە، وتی: پەروەردگارا، چی بڵێم؟ وەحی هات کەبڵێ: لبیک، اللهم لبیک... ئەمە یەکەم لبیک بوو هاتە سەرزمان.

دەگێڕنەوە: عەبدالله کوڕی زوبەیر لەعوبەیدالله کوڕی عومەیری لەیسی پرسی: ئیبراهیم چۆن خەڵکی بۆ حەج بانگێشت کرد؟

وتی: بیستوومە کاتێک لەگەڵ ئیسماعیل پایەکانی ماڵەکەی بەرز کردەوە و ئەوەی خوا فەرمانی پێدابوو، ئەنجامیدا و کاتی حەج نزیک بوویەوە، ڕووی کردە یەمەن و بۆ پەرەستینی خوا و حەج کردن خەڵکی بانگێشت کرد و وەڵامی دەستکەوت: لبیک اللهم لبیک. دواتر ڕووی کردە ڕۆژهەڵات و پێشنیاری خواپەرەستی و حەجی بەخەڵکان کرد و وەڵامی بیست: لبیک اللهم لبیک. ڕووی کردە ڕۆژئاوا و پێشنیاری خواپەرەستی و حەجی ماڵی خوای بەخەڵکان کرد و وەڵامی بیست: لبیک اللهم لبیک. ڕووی کردە شام و پێشنیاری خواپەرەستی و حەجی بەخەڵکان کرد و وەڵامی بیست: لبیک اللهم لبیک.

ئیبراهیم لەڕۆژی ترویە لەگەڵ ئیسماعیل و موسوڵمانەکانی هاوڕێی، هاتەدەر و لەمەنی دابەزی. نوێژی نیمەڕۆ و ئێواری و شێوان و خەوتنانیان کرد و شەو لەوێ مانەوە. کاتێک بەیانی داهات، نوێژی بەیانی لەگەڵ ئەوان خوێند. دواتر ئەوانی بۆ لای عەرەفە برد و وتی: لێرە بمێننەوە. کاتێک خۆر بەرەو ئاوا بوون دەڕۆشت، نوێژی نیمەڕۆ و ئێوارێی پێکەوە خوێند: دواتر ئەوانی بۆ شوێنی وەستان لەعەرەفە برد. کاتێک خۆر ئاوا بوو، هاوڕێکانی خۆی بەرەو موزدەلیفە

برد و نوێژی شێوان و خەوتنانیان پێکەوە خوێند. شەوی لەوێ بەسەر برد تا بەیانی بوویەوە و نوێژی بەیانی لەگەڵ خەڵکان خوێند و کاتێك خۆر هەڵات، (رمی جمرە)ی فێری ئەوان کرد و شوێنی قوربانی کردنی مەنی نیشاندان. قوربانی کرد و مووی تاشی. لەمەنی ڕۆشت تا بلێت چۆن بەدەوری ماڵی خوادا بسوڕێنەوە. کاتێك لەحەج تەواو بوو، لەگەڵ خەڵك بانگەوازی حەجی ڕاگەیاند.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: دەگێڕنەوە کەجبرەئیل لەکاتی حەج کردن ڕێ و ڕەسمەکانی فێری ئیبراهیم کرد.

ئاماژەدان بەگێڕانەوەیەك لەپێغەمبەر لەمبارەوە

عەبدالله کوڕی عومەر لەپێغەمبەر دەگێڕێتەوە: جبرەئیل لەڕۆژی ترویە ڕۆشتە لای ئیبراهیم و ئەوی بۆ مەنی برد و نوێژی نیمەڕۆ و ئێوارێ و شێوان و خەوتنانی لەوێ خوێند و نوێژی بەیانی لەمەنی خوێند. دواتر ئەوی بردە عەرەفات و لەوێ دابەزی و نوێژی نیمەڕۆ و ئێوارێی لەوێ خوێند. نوێژی بەیانی خوێند ورووی لەمەنی کرد و رمی جمرەی بەجێهێنا، قوربانی کرد و مووی تاشی و بەرەو ماڵی خوا ڕۆشت و بەدەوریدا سوڕایەوە.

دەڵێت: خواوەند بۆپێغەمبەری خۆی (محەممەد) وەحی ڕەوانە فەرموو: بەوپەڕی پاکییەوە شوێنکەوتەی ئایینی ئیبراهیم بە چوونکە ئەو لەکافرەکان نەبوو.

## خواوەند خەلیلی خۆی یانی ئیبراهیمی بەسەر بڕینی کوڕەکەی تاقیکردەوە

زاناکانی کۆن لەئۆمەتی پێغەمبەر(د.خ) بۆچوونیان جیاوازە لەوەی ئیبراهیم بۆ قوربانی کردنی کام کوڕەی فەرمانی پێدرا، دەستەیەك وتوویانە ئیسحاق و دەستەیەك وتوویانە ئیسماعیل.

هەردووکیان وتاری خۆیان لەپێغەمبەر دەگێڕنەوە. ئەگەر حەدیسەکان راست دەبوون، پشت گوێمان نەدەخست بەڵام بەڵگەی قورئانی سەبارەت بەوەی قوربانی ئیسحاقە، لەگێڕانەوەکانی دیکە ئاشکراتر و بەهێزترە.

عەباس کوڕی عەبدولموتەلیب لەپێغەمبەر(د.خ) دەگێڕێتەوە: سەبارەت بەم ئایەی قورئان کەدەفەرمێت: قوربانییەکەی دیکەمان فیدای ئەو کرد. فەرمووی: ئیسحاق بوو.

ئەم گێڕانەوەیان بەشێوەیەکی وردتر گێڕاوەتەوە، بەڵام دەڵێن بێژەرەکەی عەباسە و وتاری پێغەمبەر(د.خ) نییە.

دەگێڕنەوە: ئەوەی دەڵێت قوربانی ئیسماعیلە، معاویەیە، صەنابجی دەڵێت: لای پێغەمبەر(د.خ) دانیشتبوین و گفتوگۆ کرا سەبارەت بەوەی ئایا قوربانی ئیسماعیل بووە یا ئیسحاق؟ معاویە وتی: لای پێغەمبەر(د.خ) دانیشتبووین، پیاوێك هات و وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، ئەی منالی دو قوربانی. لەوەی خواوەند بەتۆی بەخشیوە، بەمنی ببەخشە، پێغەمبەر(د.خ) پێکەنی.

پێیان وت: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، دوو قوربانی کێ بوون؟

فەرمووی: کاتێك عەبدولموتەلیب راسپێردرا، سەر لەنوێ زەمزەم هەڵکەنێت، نەزری کرد ئەگەر خوا کاری بۆ ئاسان بکات، یەکێك لەدوو کوڕەکەی خۆی دەکاتە قوربانی. تیروپشك بەناوی عەبدالله هاتەدەر. خاڵەکانی رێگەی ئەم کارەیان لێگرت و وتیان: سەد وشتر بکەرە فیدای کوڕەکەت. قوربانییەکی دیکە ئیسماعیلە.

## ئەوانەی وتوویانە قوربانی ئیسحاقە

دەگێڕنەوە: کەعبە بەئەبو هورەیرەی وت: دەتەوێت لەبەسەرهاتی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم ئاگادارت بکەمەوە؟

وتی: بەڵێ.

کەعب وتی: کاتێك خواوەند فەرمانیدا ئیبراهیم کوڕەکەی خۆی یانی ئیسحاق بکاتە قوربانی، شەیتان وتی: ئەگەر لەم کارەدا بنەماڵەی ئیبراهیم فریو نەدەم، هەرگیز ناتوانم کەسێك لەوان فریو بدەم.

شەیتان لەروخساری پیاوێك کەدەیانناسی، هات و کاتێك ئیبراهیم ئیسحاقی دەبرد بۆ ئەوەی قوربانی بکات، ڕۆشتە لای سارە و وتی: ئیبراهیم بەم بەیانییە ئیسحاقی بۆ کوێ برد؟

وتی: بەدوای کارێکدا ڕۆشتن.

شەیتان وتی: نا سوێند بە خوا، ئەوی بۆ ئەو کارە نەبرد.

سارە وتی: کەواتە بە چ مەبەستێك ئەوی برد؟

شەیتان وتی: بردی تا لەرێگەی خوادا بیکاتە قوربانی.

سارە وتی: ڕاست نییە، ئەو کوڕەکەی خۆی ناکاتە قوربانی.

شەیتان وتی: بۆ نا. سوێند بەخوا دەیکات.

سارە وتی: بۆ ئەو دەکاتە قوربانی؟

شەیتان وتی: گومان دەکات خواوەند فەرمانی ئەو کارەی پێداوە.

سارە وتی: باشترە فەرمانەکانی خواوەند ئەنجام بدات.

شەیتان لای سارە ڕۆشت و خۆی بەئیسحاق گەیاند کەبەدوای باوکیدا رێگەی دەبڕی، پێی وت: بەم بەیانییە زووە، باوکت بۆ کوێت دەبات؟

ئیسحاق وتی: بۆ کارێکی تایبەت.

شەیتان وتی: سوێند بەخوا بەمشێوە نییە، تۆ دەبات بۆئەوەی بتکاتە قوربانی.

ئیسحاق وتی: باوکم من ناکاتە قوربانی.

شەیتان وتی: دەیکات.

ئیسحاق وتی: بۆ؟

شەیتان وتی: گومان دەکات خواوەند فەرمانی پێداوە.

ئیسحاق وتی: ئەگەر خواوەند فەرمانی پێدابێت، دەبێت ئەنجامی بدات.

شەیتان وازی لێهێنا و ڕۆشتە لای ئیبراهیم، وتی: بەم بەیانییە، کوڕەکەت بۆ کوێ دەبەیت؟

ئیبراهیم وتی: بۆ کارێکی تایبەت.

شەیتان وتی: نا، دەیبەیت تا بیکەیتە قوربانی.

ئیبراهیم وتی: بۆ دەبێت ئەو کارە بکەم؟

شەیتان وتی: گومان دەکەیت خواوەند فەرمانی ئەو کارەی پێداویت.

ئیبراهیم وتی: ئەگەر خواوەند فەرمانی پێدابێتم، ئەو کارە دەکەم.

کاتێك ئیبراهیم ئیسحاقی برد بۆ ئەوەی بیکاتە قوربانی، ئیسحاق ئامادە بوو، بەڵام خواوەند ئەوی بەخشی و قوربانییەکی دیکەی لەجێگەی ئەو ڕەوانە کرد. ئیبراهیم بەئیسحاقی وت: کوڕم، هەستە، خواوەند تۆی بەخشی. خواوەند وەحی بەئیسحاق کرد کەدۆعاکەی تۆم هێنایەدی.

ئیسحاق وتی: دەخوازم هەر بەندەیەك کەکافر نەبێت، بیخەیتە بەهەشتەوە.

لەعوبەید کوڕی عومەیر دەگێڕنەوە کەوتی: موسا بەخواوەندی وت: ئەی خوایە، بۆ تۆ بەخوای ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوب ناو دەبەن؟

خواوەند فەرمووی: لەبەر ئەوەی ئیبراهیم هیچ کات شتێکی نەکردە بەرابەری من، ئیسحاق بۆ قوربانی کران ئامادە بوو و یەعقوب، هەرچەندە زیان و بەڵاکانیم فراوان کرد، بەشێوەیەکی چاکتر گومان و بیری لەمن دەکردەوە.

لەکوڕی سابت دەگێڕنەوە کەوتی: قوربانی ئیسحاقە.

لەباوکی هوزەیل دەگێڕینەوە کەوتی: قوربانی ئیسحاقە.

لەکوڕی مەیسەرە دەگێڕنەوە کەوتی: یوسف بەپاشای وت: بۆ ناتەوێت لەگەڵ من نان بخۆیت، سوێند بەخوا من یوسف کوڕی یەعقوب نێردراوی خوا کوڕی ئیسحاق قوربانی خوا کوڕی ئیبراهیمم.

لەکوڕی مەسعود و دەستەیەك لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) دەگێڕنەوە: ئیبراهیم

خەوی بینی وپێی وترا، نەزرت کردووە ئەگەر منالێکت لەسارە هەبێت، قوربانی دەکەیت، بەڵێنەکەت ببەسەر.

لەمەسروق دەگێڕنەوە کەوتی: قوربانی ئیسحاقە.

## ئەوانەی وتوویانە قوربانی ئیسماعیل بوو

لەکوڕی عومەر دەگێڕنەوە: قوربانی ئیسماعیلە.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: لەشیکردنەوەی ئەم وتارەی خواوەند کەفەرمووی: وقوربانییەکی گەورەمان فیدای ئەو کرد، وتی: ئیسماعیل بوو.

گێرانەوەیەکی دیکە لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە کەقوربانی ئیسماعیلە و گومانی جوولەکەکان کەوتوویانە، قوربانی ئیسحاقە، درۆیە.

لەعامر دەگێڕنەوە کەقوربانی ئیسماعیل بوو و دوو شاخی قوربانی بەکەعبەوە هەڵواسرابوو.

لەشەعبی دەگێڕنەوە کەدەڵێت: من شاخی قوربانیم لەکەعبە بینی.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت لەکەعبی قورەزیم بیست کەدەیوت: ئەو کەسەی خواوەند فەرمانی قوربانی کردنی بەئیبراهیمدا، ئیسماعیل بوو. دەتوانین ئەمە لەکتێبی خواوەند ببینین چوونکە دوای گێڕانەوەی داستانی قوربانی دەڵێت، مژدەی ئیسحاقمان پێبەخشی کەپێغەمبەرێك لەخواپەرستەکان بوو، هەروەها دەڵێت: مژدەی ئیسحاق و دوای ئەو مژدەی یەعقوبمان پێدا یانی بەکوڕ و کوڕی کوڕ لەئیسحاق مژدەی پێدرابوو. بەمشێوەیە فەرمانی قوربانی کردنی ئەوەی نەدەدا. قوربانی تەنیا ئیسماعیل بوو.

هەروەها لەکەعبی قورەزی دەگێڕنەوە: کاتێك لەگەڵ عومەر کوڕی عەبدولعەزیزی خەلیفە، لەشام بووین، ئەم قسەم لەگەڵ عومەردا باس کرد. عومەر وتی: من لەمبارەوە زانیاریم نییە و گومان دەکەم، راستی ئەوەیە تۆ دەیلێیت. دواتر کەسی ڕەوانە و جوولەکەیەکی تازە موسوڵمانی هێنا و لەمبارەوە پرسیاری لێکرد.

کەعبە دەڵێت: لای عومەر کوڕی عەبدولعەزیز دانیشتبووم کەبەو تازە موسوڵمانەی وت: ئیبراهیم بۆ قوربانی کردنی کام یەك لەدو کوڕەکەی راسپێردرا؟

جوولەکە وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئیسماعیل بوو. جولەکەکانیش دەزانن بەلاّم رژدی بەعەرەبەکان دەبەن کەباوکتان بەمشێوەیە و فەرمانی خوایان بەجێهێنا بێت. حاشای لێدەکەن و گومان دەکەن قوربانی ئیسحاقە لەبەر ئەوەی ئیسحاق باوکی جولەکەکانە.

ئەو بەڵگانەی لەقورئان ئاماژەمان پێدا، بەروونی بۆمان ئاشکرا دەکات کەقوربانی ئیسحاقە. بەمشێوەیە خواوەند باسی ئیبراهیم دەکات کاتێك لەخەڵکەکەی خۆی دوورکەوتەوە ولەگەلّ هاوسەرەکەی سارە رێگەی شامی گرتەبەتر: بەرەو لای خوا دەڕۆم کەرێنوێنیم دەکات.

ئەمە پێش ئەوە بوو کەهاجەر بناسێت و ببێتە دایکی ئیسماعیل.

دوای ئەوە خواوەند باسی هاتنەدی دۆعاکەی ئیبراهیم دەکات بە لەدایك بوونی کوڕێکی بیرمەند و خەونی ئەو کەکوڕەکەی دەکاتە قوربانی رێگەی خوا. لەقورئاندا لەهەر شوێنێك باسی مژدەی ئیبراهیم دەکات، سەبارەت بەئیسحاقە، لەوشوێنەی کەدەفەرمێت: هاوسەرەکەی وەستابوو و پێکەنی. مژدەی ئیسحاقمان پێبەخشی و بەدوای ئیسحاق یەعقوب. دووبارە دەفەرمێت: و لەوان ترسان. وتیان مەترسە و مژدەی کوڕێکی زانایان پێبەخشی. هاوسەرەکەی لەخۆیدا و وتی، پیرێکی نەزۆکم . لەهەموو جێگەیەك باسی مژدەی کوڕ بۆ سارە دەکرێت و لەم ئایە کەدەفەرمێت:((مژدەی کوڕێکی بیرمەندمان پێبەخشی)) دەبێت، هاوشێوەی ئایەکانی دیکە مەبەستی قورئان کوڕەکەی سارە بێت.

ئەم حەدیسەی وتوویانە: خواوەند پێش لەدایك بونی ئیسحاق مژدەی یەعقوبی کوڕی ئەوی بەسارە و ئیبراهیمداوە و فەرمان بەقوربانی کردنی ئەو راست بەرچاو ناکەوێت، ناڕاستە، چوونکە خواوەند فەرمانیدا بوو ئیسحاق دوای گەشە کردن قوربانی بکرێت و دەتوانێت یەعقوب پێش ئەوەی فەرمانی قوربانی کردنی ئیسحاق بگات، لەدایك بوبێت.

هەروەها ئەمەی دەڵێن: دوو شاخی قوربانییەکەیان بینیوە بەدیواری کەعبە هەڵواسراوە، ناڕاستە چوونکە ئەگەری نییە ئەو شاخەیان لەشامەوە بۆ کەعبە بردبێت و لەوێ هەڵیانواسیبێت.

## وتار سەبارەت بەئیبراهیم و کوڕەکەی کەبۆ قوربانی کردنی راسپێردرا و هۆکاری ئەوەی فەرمانی قوربانی کردنی پێدرا

هۆکاری ئەوەی خواوەند فەرمانی قوربانی کردنی کوڕی بەئیبراهیمدا، ئەمەیە: کاتێك ئیبراهیم لەخەڵکەکەی خۆی دوور کەوتەوە و بۆ پاراستنی دینەکەی خۆی هەڵات و لەرێگەی خوادا کۆچی کرد، لەسەرزەمینی عێراقەوە رووی کردە شام و لەخوا پاڕایەوە تا لەسارە کوڕێکی ساڵحی پێببەخشێت. خواوەند لەگێڕانەوەی وتارەکەی ئەو دەفەرمێت: ((بەرێگەی خوادا دەڕۆم کەرێنوێنیم دەکات، خوایە لەچاکەکاران بەمن ببەخشە)) و کاتێك فریشتە نێردراوەکانی مۆتەفیکە و نەتەوەی لوت بوونە میوانی ئیبراهیم، مژدەی کوڕێکی بیرمەندیان پێدا. ئیبراهیم وتی: ئەو دەبێتە قوربانی خوا. کاتێك کوڕەکەی چاوی بەدنیا هەڵهێنا وباڵغ بوو، پێی وترا: ئەو نەزرەی لەگەڵ خوادا کردووتە، بیهێنەرەدی.

### گێڕانەوەکان لەمبارەوە

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: کاتێك جبرەئیل مژدەی بەسارە بەخشی کەکوڕێکی دەبێت، سەری سوڕما و وتی: نیشانەکەی چییە؟ جبرەئیل دارێکی وشکی خستە نێوان پەنجەکانی، دارەکە جووڵا و سەوز بوو، ئیبراهیم وتی: بەمشێوەیە دەبێتە قوربانی خواوەند. کاتێك ئیسحاق گەورە بوو، ئیبراهیم خەوی بینی وپێیان وت: نەزرەکەی خۆت بێنەرەدی. ئیبراهیم بەئیسحاقی وت: بابڕۆین و لەرێگەی خوادا قوربانی بکەین. کێرد و تەناف هەڵگرت و لەگەڵ ئەودا بەرێکەوت و کاتێك گەیشتنە نێوان کێوەکان، کوڕ وتی: باوکە، کوا قوربانییەکەی تۆ؟

ئیبراهیم وتی: کوڕم، لەخەودا بینیم کەتۆ دەکەمە قوربانی. بۆچونی تۆچییە؟

ئیسحاق وتی: باوکە، ئەوەی فەرمانیان پێداویت، ئەنجامی بدە، بەخواستی خوا خۆڕاگردەبم. وتی: بەتوندی بمبەستەرەوە تا پەلەقاژە نەکەم و جلەکانم پاك رابگرە تا خوێناوی نەبێت تا دایکم نەیبینێت و خەمبار بێت. بەخێرایی کێرد بەقوڕگمدا بێنە تا مەرگم ئاسانتر بێت. کاتێك بۆ لای دایکم گەڕایتەوە، سڵاوی بگەیێنە.

ئیبراهیم لێی نزیك كەوتەوە و ماچی كرد. دواتر دەست وپێی بەستەوە و دەگریا. ئیسحاقیش دەستی بەگریان كرد و فرمێسك بەروخساریدا هاتە خوار. ئیبراهیم كێردی بەقوڕگیدا هێنا. خواوەند وەرقەیەكی مسینی لەسەر قوڕگیدانا. ئیبراهیم كاتێك ئەمەی بینی، كێردی لەنێوچاوانیدا و دواتر لەپشتی. خواوەند فەرمووی: (تەسلیم بوون و كێردی لەنێوچاوی دا). وەحی هات كەئەی ئیبراهیم، خەونەكەی تۆهاتەدی، بڕوانە. مەڕێكی گەورەی بینی، مەڕەكەی گرت و كوڕەكەی ئازاد كرد. بەردەوام كوڕەكەی ماچ دەكرد و دەیوت: كوڕم، ئەمڕۆ تۆیان بەمن بەخشی. خواوەند فەرمووی: قوربانییەكەی گەورمان كردە فیدایی ئەو. كاتێك ئیبراهیم گەڕایەوە، داستانەكەی بۆ سارە باس كرد. سارە خەمبار و وتی: دەتویست كوڕەكەم بكەیتە قوربانی و منت ئاگادار نەكردەوە.

لەمحەممەد كوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە: كاتێك ئیبراهیم دەیویست بڕواتە بینینی هاجەر، سوار بوراق دەبوو. بەیانی لەشام بوو و نیمەڕۆ لەمەككە و لەوێ دەگەڕایەوە و لەكاتی شەو لەناو كەسانی بنەماڵەی خۆیدا بوو.كاتێك كوڕەكەی گەورە بوو، لەدڵیدا شیرین و هیوادار بوو سەرقاڵی خواپەرەستی و پاڕانەوە بێت و نهێنییەكانی ئەو بپارێزێت. لەخەودا فەرمانی پێدرا تا بیكاتە قوربانی.

كوڕی ئیسحاق لەدەستەیەك لەشارەزایان دەگێڕێتەوە: كاتێ ئیبراهیم فەرمانی پێدرا كوڕەكەی بكاتە قوربانی، وتی: كوڕم، كێرد و تەناف هەڵبگرە تا بڕۆینە ئەو دۆڵە و چیلكە و دار كۆبكەینەوە. هیچی سەبارەت بەفەرمانی خواوەند پێ نەوت. كاتێك بەرەو دۆڵەكە بەرێكەوتن، ئیبلیس لەروخساری پیاوێك هات تارێگەی ئەنجامدانی فەرمانی خوای لێبگرێت، وتی: ئەی پیرەپیاو، بۆ كوێ دەڕۆیت؟ ئیبراهیم وتی: لەم دۆڵەدا كارێكم هەیە.

وتی: سوێند بەخوا دەزانم شەیتان هاتۆتە خەوی تۆ و فەرمانی پێداویت كوڕەكەت قوربانی بكەیت و ئێستا مەبەستی قوربانی كردنی كوڕەكەت لەسەر دایە.

ئیبراهیم ئیبلیسی ناسیەوە، وتی: دوژمنی خوا، لەمن دووربە. فەرمانی خواكەم ئەنجام دەدەم.

كاتێك شەیتان لەئیبراهیم بێهیوا بوو، بۆلای ئیسماعیل بەرێكەوت كەكێرد و تەنافەكەی باوكی هەڵگرتبوو و بەدوای باوكیدا رێگەی دەبڕی، پێی وت: دەزانی

باوکت تۆ بۆ کوێ دەبات؟

وتی: دەڕۆین دار و چیلکە کۆبکەینەوە.

وتی: سوێند بەخوا دەیەوێت تۆ بکاتە قوربانی.

ئیسماعیل وتی: بۆ؟

شەیتان وتی: گومان دەکات، خواوەند فەرمانی ئەم کارەی پێداوە.

ئیسماعیل وتی: دەبێت فەرمانی خواکەی ئەنجام بدات. منیش فەرمانبەر و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی ئەوم.

کاتێك لەکوڕەکەیش بێهیوا بوو، ڕۆشتە لای هاجەر، پێی وت: دەزانی ئیبراهیم، ئیسماعیل بۆ کوێ دەبات؟

وتی: ڕۆشتن دار و چیلکە بێنن.

وتی: سوێند بەخوا ئەوی برد تا قوربانی بکات.

هاجەر وتی: نا ئەوی خۆش دەوێت، ئەو کارە ناکات.

شەیتان وتی: گومان دەکات خواوەند فەرمانی ئەو کارەی پێداوە.

هاجەر وتی: ئەگەر خواوەند فەرمانی ئەو کارەی پێداوە، دەبێت ملکەچی فەرمانەکانی بێت.

دوژمنی خوا تووڕە گەڕایەوە چوونکە نەیتوانی فریوی بنەماڵەی ئیبراهیم بدات. ئیبراهیم و بنەماڵەکەی بەهاوکاری خواوەند ئەویان لەخۆیان دوورخستەوە و لەسەر خواپەرەستی و ئەنجامدانی فەرمانەکانی خوا پێداگر بوون.

کاتێك ئیبراهیم لەناو دۆڵەکە لەگەڵ کوڕەکەی بەتەنیا مایەوە و بەهەمان شێوەکە وتوویانە لەدۆڵی سەبیر بوون، پێی وت: لەخەودا بینیم کەتۆ دەکەمە قوربانی.

وتی: ئەوەی فەرمانی ئەنجامدانیت پێدراوە، ئەنجام بدە، چوونکە من خۆڕاگرم.

لەمحەممەد کوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە کە ئیسماعیل بەباوکی وت: ئەگەر دەتەوێت من بکەیتە قوربانی، دەست وپێم بەتوندی ببەستەرەوە تا خوێنی من بەرتۆ نەکەوێت و خێرەکەم کەم نەکات چوونکە مەرگ سەختە و دەترسم کاتێك کێرد بەقوڕگم بگات، پەلەقاژە بکەم. کێردەکەت تیژ بکە تا ئاسان ببڕیت و ئاسودەم بکەیت. کاتێك دەتەوێت قوربانیم بکەیت، بەلادا بمخە چوونکە دەترسم کاتێك سەیری ناوچاوم بکەیت، خۆشەویستی بەسەر تۆدا زاڵ ببێت و نەتوانی فەرمانی

خواوەند ئەنجام بدەیت. ئەگەر ویستت، کراسەکەم ببە بۆدایکم تا دڵی ئارام ببێتەوە.

دەڵێت: ئیبراهیم وتی: کوڕم، چەندە بەجوانی بۆ ئەنجامدانی فەرمانی خواوەند هاوکاریم دەکەیت.

بەهەمان شێوە کەئیسماعیل وتی، ئەوی بەتوندی بەستەوە و کێردەکەی تیژ کرد و ئەوی بەلادا خست. سەیری روخساری نەکرد. کێردی خستە سەرقوڕگی. خواوەند دیوی تیژی کێردەکەی بۆ دیوی کولی کێردەکە گۆڕی. ئیبراهیم کوڕەکەی هێنایە پێش تا بەخێرایی کۆتایی بەکارەکەی بێنێت. وەحی لەئاسمانەوە هات، ئەی ئیبراهیم، خەونەکەی تۆ هاتەدی. ئەمە قوربانی تۆیە کە لەجیاتی کوڕەکەت دەیکەیتە قوربانی.

خواوەند دەفەرمێت: کاتێك تەسلیم بوون، ئەوی خستە سەر پشت. نەریت وابوو لەکاتی قوربانی کردن، قوربانیان بەلادا دەخست.

ئەمە نیشانەی راستی حەدیسەکەیە کە بەباوکی وت من بەلادا بخە و لەگەڵ وتاری خواوەند یەك دەگرێتەوە کەفەرمووی: ئەوی خستە سەرلا و وەحیمان پێکرد: ئەی ئیبراهیم، خەونەکەی تۆ هاتەدی وئێمە چاکەکاران بەمشێوەیە پاداشت دەدەینەوە و ئەمە تاقیکردنەوەیەکی ئاشکرا بوو و قوربانییەکی گەورمان لەجیاتی ئەو پێبەخشی.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: مەڕێکی گەورەیان هێنا کە بۆماوەی چل رۆژ لەبەهەشتا لەوەڕا بوو. ئیبراهیم کوڕەکەی ئازاد کرد و بەدوای مەڕەکە تا جەمرەی یەکەم ڕۆشت و حەوت بەردی لێدا. وازی لێهێنا تا گەیشتە جەمرەی ناوەڕاست. لەوێیش حەوت بەردی لێدا و وازی لێهێنا و لەنزیك جەمرەی گەورە پێی گەیشت و حەوت بەردی لێدا. ئەوسا مەڕەکەی بۆ شوێنی قوربانی کردنی مەنی برد و سەری بڕی. سوێند بەو خوایەی گیانی کوڕی عەباس لەدەستی ئەودایە، لەسەرەتای ئیسلام سەری وشك کراوی مەڕەکە لەگەڵ دوو شاخەکەی بەدیواری ناوەوەی کەعبەوە هەڵواسرابوو.

هەروەها لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: کاتێك ئیبراهیم بۆ ئەنجامدانی رێ ورەسمەکانی حەج بەرێکەوت، لەنێوان سەفا و مەروە، شەیتان پێی گەیشت و لەگەڵ ئەودا کێبڕکێی کرد. ئیبراهیم پێش شەیتان کەوتەوە. دواتر جبرەئیل ئەوی بۆ نزیکی

جەمرەی عوقەبە برد و شەیتان هات و ئیبراهیم حەوت بەردی تێگرت تا ڕۆشت. گەیشتە نزیك جەمرەی ناوەڕاست و حەوت بەردی دیکەی تێگرت تا دوور کەوتەوە. دواتر ئیسماعیلی خستە سەرزەوی، کراسێکی سپی لەبەردا بوو، وتی: باوکە جگە لەمە کراسی دیکەم نییە بیکەیتە کفنی من، دەری بێنە تا ببێتە کفنی من. ئیبراهیم سەیری کرد و بینی مەڕێکی قەڵەو و شاخدار لەوێ بوو.

کوڕی عەباس دەڵێت ئێمە بەردەوام بەدوای ئەم مەڕانەوە بووین.

عوبەید کوڕی عومەیر دەڵێت: شوێنی ئیبراهیم لەجێگەی ئیبراهیمدا بوو. موجاهید دەڵێت: لەمەنی بوو. کوڕی عەباس دەڵێت: ئەو مەڕەی ئیبراهیم سەری بڕی، ئەو مەڕە بوو کوری ئادەم کردییە قوربانی و خواوەند پێی رازی بوو.

سەعید کوڕی جوبەیر دەڵێت: ئەو مەڕەی ئیبراهیم سەری بڕی، چل ساڵ لەبەهەشتا لەوەڕا بوو. ڕەنگی لێڵ و خورییەکەی سوور بوو. هەروەها لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە کەقوربانییەکەی ئیسماعیل بزنە کێوی بوو.

لەحەسەن دەگێڕنەوە: قوربانی ئیسماعیل بزن بوو ولەسەبیر دابەزی. دەڵێت ئەوەی خواوەند قوربانییەکەی ئەوی بەگەورە ناو بردووە، تایبەت بەو نییە و هەرچی لەبەر دینەکەی ئەو قوربانی بکرێت، گەورەیە و ئەم کردارە تا ڕۆژی پەسلان بوو بەنەریت و دەزانن قوربانی رێگە لەمەرگی خراپ دەگرێت. کەواتە ئەی بەندەکانی خوا قوربانی بکەن.

ئومەییە کوڕی باوکی سەڵت سەبارەت بەهۆکاری فەرمانی خواوەند بۆ قوربانی کردن کوڕ بەدەستی ئیبراهیم شێعرێکی هەیە و وتارەکەی لەگەڵ ئەوەی لەسەدی گێڕامانەوە، سازگارە. دەڵێت: هۆکارەکەی نەزرەکەی ئیبراهیم بوو و خواوەند بۆ بردنەسەری بەڵێنەکەی فەرمانی پێدا. دەڵێت:

ئیبراهیم بۆ رەزامەندی خوا نەزەرەکەی خۆی بەدیهێنا

ئاگاداری کوڕەکەی نەبوو

نەیدەتوانی لەناو کوژراواندا بیبینێت

کوڕم، من تۆم لەرێگەی خوادا کردۆتە قوربانی

دەبێت خۆڕاگر بیت

باوکە بەتوندی بمبەستەرەوە وەك ئەسیرێکی گرفتاری بەند

لەژێر کێرد پەلەقاژە ناکەم

کێردەکەی تیژ بوو و دەیتوانی لەگۆشتەکەی بچەقێت

کاتێك جلەکانی ئەوی داکەند

خواوەند ئەوی بەمەڕێکی گەورە گۆڕییەوە

ئەمە بگرە و کوڕەکەت ئازاد بکە

چوونکە لەکردەوەکەی ئێوە شادمان بووم

باوك مایەوە و کوڕەکەیشی مایەوە

و ناوبانگی چاکەیان بلاو بوویەوە.

خواوەند دوای ئەوەی ئیبراهیمی بەئاگرەکەی نەمرود تاقیکردەوە، فەرمانیدا تا کوڕە باڵغەکەی خۆی قوربانی بکات کە لەبینا کردنی کەعبە هاوکاری کردبوو. تاقیکردنەوە، وشەکانی هێنایە پێش کەخواوەند فەرمووی: کاتێك خواوەند ئیبراهیمی بەوشەکان تاقی کردەوە و ئەوانی ئەنجامدا.))

زاناکانی کۆنی ئیسلام سەبارەت بەو وشانەی خواوەند ئیبراهیمی پیٚ تاقیکردەوە، بۆچوونەکانیان جیاوازە. دەستەیەك دەڵێن سی بەشە کەپێکهێنەری شەریعەتی ئیسلامە.

ئاماژەدان بە بێژەری ئەم وتەیە

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە سەبارەت بەئایەی ((خواوەند ئیبراهیمی بەوشەکان تاقی کردەوە)) دەڵێت: کەس جگە لەئیبراهیم، تاقیکردنەوەی ئەم دینەی تەواو نەکرد، خواوەند بەوشەکان تاقیکردەوە و ئیبراهیم ئەنجامیدا. خواوەند باسی بێبەری بوونی ئەو دەکات و دەفەرمێت: ((ئیبراهیم کەوەفای کرد)). دەوشەیان لەسورەی ئەحزابدایە و دە وشە لەسورەی برائت و دە وشە لەسورەی مۆمنین و سأل و سائل، ئیسلام، ئەم سی بەشەیە.

هەروەها لەو دەگێڕنەوە، دەڵێت: لەو وشانەی ئیبراهیمی پیٚ تاقیکرایەوە، دە وشەیان لەسورەی برائتە: التائبون العابدون الحامدون. دە وشەیان لەسورەی ئەحزاب: ان المسلمین و المسلمات. دە وشە لەسورەی مۆمنون تا وتارەکەی

خواوەند: و الذين هم على صلواتهم يحافظون. دە وشە لەسوڕی سأل سائل کە والذين هم على صلواتهم يحافظون.

کەسانیتر وتوویانە وشەکانی ئیبراهیم دە تایبەتمەندی لەسونەتەکانی ئیسلام بوو کەپێنج تایبەتمەندی لەسەردایە و پێنجی دیکە لەجەستە.

ئامازەدان بە بێژەری ئەم وتەیە

هەروەها لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: تاقی کردنەوەی ئیبراهیم بەپاك و خاوێنی بوو کەپێنجیان لەسەردایە و پێنجیان لەجەستە. لەسەردا، کورت کردنەوەی سمێڵ، ئاو لەدەم ڕادان، میسواك، چاك کردنی سەر. هەڵمژین بەلووت. لەجەستە، نینۆك کردن، پاك کردنەوەی مووە زیادەکانی جەستە، خەتێنە، پاك کردنەوەی بن باڵ، خۆپاك کردنەوە بەئاو.

دەستەیەکی دیکە وتوویانە لەو وشانەی ئیبراهیم شەشیان لەناو مرۆڤدایە و ئەوانەی دیکە لەرێ و رەسمەکاندایە. لەمرۆڤدا، پاك کردنەوەی مووی زیادەی جستە، خەتێنە کردن، پاك کردنەوەی بن باڵ، نینۆك کردن و سمێڵ کورت کردنەوە و غوسڵی هەینییە. ڕێ ورەسمەکان: سوڕانەوە بەدەوری ماڵی خوا، سەفا و مەروە و رمی جەمرات و ڕۆشتن بۆ عەرەفاتە.

دەستەیەکی دیکە وتوویانە، (مامت) خەڵکە و (مناسك) حەج.

لەباوکی سالح دەگێڕنەوە: ئەو وشانەی ئیبراهیمی پێ تاقی کرایەوە، ئەمانە بوون کەخواوەند دەفەرمێت: تۆ دەکەمە ئیمام (ڕێبەری) کەسەکان. و ئایاتی (مناسك) ڕێ و ڕەسمەکان.

لەموجاهید سەبارەت بەوتاری خواوەند بۆ ئەو وشانەی ئیبراهیمی پێ تاقیکردەوە، دەگێڕنەوە کەخواوەند بەئیبراهیمی فەرموو: تۆ بەوشەکان تاقیدەکەمەوە، دەزانی چین؟

ئیبراهیم وتی: من دەکەیتە پێشەوای خەڵکان؟

فەرمووی: بەڵێ.

وتی: مناڵەکانیشم؟

فەرمووی: پەیمانەکەی من ستەمکاران ناگرێتەوە.

وتی: کەعبە دەکەیتە مەبەستی خەڵکان؟

فەرمووی: بەڵێ.

وتی: ئەم سەرزەمینە دەپارێزیت؟

فەرمووی: بەڵێ.

وتی: ئێمە تەسلیمی خۆت دەکەیت و منداڵەکانی ئێمە دەکەیتە ئومەتی موسوڵمان؟

فەرمووی: بەڵێ.

وتی: ڕێ و ڕەسمەکان بۆ ئێمە دیاری دەکەیت و بەتۆبەی ئێمە ڕازی دەبیت.

فەرمووی: بەڵێ.

وتی: ڕۆژی باوەڕداران لەو میوانە دەدەیت؟

فەرمووی: بەڵێ.

لەسەدی دەگێڕنەوە: ئەو وشانەی ئیبراهیمی پێ تاقیکرایەوە، ئەم ئایانەیە کەدەفەرمێت: ((ربنا تقبل منا انك انت السميع العليم. ربنا و اجعلنا مسلمين لك و من ذريتنا امة مسلمة لك و ارنا مناسكا و بت علينا انك انت التواب الرحيم. ربنا و ابعث فيهم رسولا منهم.

واتاکەی: پەروەردگارا لێمان ڕازی بە چوونکە تۆ بیسەرێکی زانایت، پەروەردگارا، ئێمە بکەرە موسوڵمانەکانی خۆت ومنداڵەکانی ئێمە بکەرە دەستەیەك لەموسوڵمانەکانی خۆت و ڕێورەسمەکانی پەرەستینمان فێر بکە و لەئێمە خۆش ببە چوونکە تۆ بەخشەر و ڕەحیمیت، پەروەردگارا بۆ منداڵەکانی ئێمە پێغەمبەرێك لەخۆیان ڕەوانە بکە.

لەرەبیع دەگێڕنەوە: وشەکانی تاقیکردنەوە ئەم ئایانە بوو: تۆ دەکەمە پێشەوای خەڵکان و کەعبە دەکەمە شوێنی مەبەست و دەیپارێزم. شوێنی ئیبراهیم بکەنە نوێژگە و لەگەڵ ئیبراهیم و ئیسماعیل پەیمانمان بەست... تا کۆتایی ئایەکە. ئەمە، ئەو وشانەیە خواوەند ئیبراهیمی پێ تاقی کردەوە.

هەروەها گێڕانەوەیەك لەسەدی ئاماژەی پێدراوە بەم ناوەرۆکە و بەم زیادیە

کەمحەممەد رسول الله لەمناڵەکانی ئیبراهیمە.

دەڵێن: ئەو وشانەی ئیبراهیمی پێ تاقیکرایەوە، ڕێ و ڕەسمەکانی حەجە. ئەم بابەتە لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە.

کەسانی دیکە وتوویانە، وشەکانی تاقیکردنەوە چەند شتێك بوو و خەتێنە یەکێك بوو لەوان.

لەشەعبی دەگێڕنەوە: لەو وشانەی ئیبراهیمی پێ تاقیکرایەوە، خەتێنە بوو.

کەسانی دیکە وتوویانە: شەش شت بوو: ئەستێرە و مانگ و هەتاو و ئاگر و کۆچ و خەتێنە کەئیبراهیم بەوان تاقیکرایەوە و خۆڕاگری کرد.

باوکی رەجا دەڵێت: لەحەسەن سەبارەت بەو وشانەی خواوەند ئیبراهیمی پێ تاقیکردەوە، پرسیارم کرد، وتی: ئەوی بەئەستێرە تاقیکردەوە و لێی رازی بوو، بەمانگ و لێی رازی بوو، بەهەتاو و لێی رازی بوو، بەئاگر و لێی رازی بوو، بەکۆچ تاقیکردەوە و لێی رازی بوو و سەرئەنجام ئەوی بەخەتێنە تاقیکردەوە.

لەحەسەن دەگێڕنەوە: خواوەند بۆهەر شتێك، ئیبراهیمی تاقیکردەوە، خۆڕاگر بوو. بەئەستێرە و هەتاو و مانگ تاقیکردەوە،بەڵام ئیبراهیم زانی خواوەند هەمیشەیی و ناکۆتایە و ڕووی لەو کرد و لەگومان خۆی دوور خستەوە. بەکۆچ تاقی کردەوە و لەخەڵك و دیاری خۆی دووركەوتەوە و لەرێگەی خوادا کۆچی کرد و لەشام نیشتەجێ بوو. پێش تاقیکردنەوە بەکۆچ بەئاگر تاقیکردەوە، بەقوربانی کردن و سەربڕینی کوڕەکەی و خەتێنەی تاقیکردەوە و ئیبراهیم لەهەموویاندا سەرفراز هاتەدەر.

ئەبو هورەیرە لەپێغەمبەر دەگێڕێتەوە: ئیبراهیم لەتەمەنی هەشتا ساڵی بەتەشوێ خۆی خەتێنە کرد.

لەباوکی ئەمامە دەگێڕنەوە: پێغەمبەر(د.خ) سەبارەت بەئایەی (ئیبراهیم وەفای کرد) فەرمووی: خواوەند و پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن. فەرمووی: هەموو رۆژێك چوار رەکعەت نوێژی دەخوێند.

ئەنس لەباوکی دەگێڕێتەوە:پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: دەزانن بۆ خواوەند ئیبراهیمی بەخەلیلی خۆی ناوبرد، لەبەر ئەوەی هەمو بەیانی و شەوێك دەیووت:

((فسبحان الله حين تمسون و حين تصبحون)) یانی کاتێك شەو دەکەن و کاتێك بەیانی دەکەن، پاکی خواوەندی تاقانە بیربخەنەوە.

کاتێك خواوەند بینی ئیبراهیم بۆ تاقیکردنەوەکان خۆڕاگرە و هەموو ئەرکەکانی ئەنجام دەدات، پەرەستینی ئەوی پێش هەموو شتێك خست و ئەوی بەخەلیلی خۆی ناوبرد و کردی بەپێشەوای خەڵك و وەك پێغەمبەر(د.خ) ڕەوانەی کرد و کتێب و پێغەمبەری بەمناڵەکانی ئەو بەخشی و کتێبەکان و زانستەکانی تایبەت کرد بەوان. گەورەکان و سالار وسەردارەکان لەوانن، هەر کاتێك سەروەرێك ڕۆشت، سالارێك جێگەکەی گرتەوە و ناوبانگی ئەوانی لەناو خەڵکان پاراست چوونکە هەموو نەتەوەکان خوازیاری پەیوەندی و دۆستایەتی ئەوانن. ئەمە ڕێزی ئەم دنیایە خوا پێی بەخشیون بەڵام ڕێزی ئەو دنیایان گەورەتر و زیاترە بەشێوەیەك کەس ناتوانێت وەسفی بکات و خوا دەزانێت.

ئێستا باسی بەسەرهاتی دوژمنی خوا و دوژمنی ئیبراهیم دەکەین کەباوەڕی بەپێغەمبەراتی ئیبراهیم نەکرد و گوێی لەئامۆژگاریەکانی نەگرت چوونکە نەزان و مەغرور بوو. ئەو، نەمرود کوڕی کوش کوڕی کەنعان کوڕی حام کوڕی نوحە. بەباس کردنی کۆتایی ئەو لەم دنیا کەسەرکێشی و سەرپێچی فەرمانەکانی خوای کرد و خواوەند ڕۆژگاری درێژ کردەوە و بۆ سزادانی پەلەی نەکرد. ئەو کاتەی دەیویست ئیبراهیمی خەلیل لەناو ئاگرەکەدا بسوتێنێت بەتاوانی شکاندنی بتەکان و بانگەوازی خواپەرەستی، خواوەند ڕۆژگاری درێژ کردەوە وچوارسەد ساڵی خایاند و لەخۆبایی بوونی ئەوی زیاد کرد و و ئازابێکی بەئەندازەی مانەوەی لەم دنیایە پێبەخشی و لاوازترین ئافرێنراوی خۆی یانی مێشوولەی بەسەر ئەودا زاڵ کرد.

## وتار سەبارەت بەلەخۆبایی بوونی نەمروود، ئەو ئازابەی خواوەند پێی بەخشی

لەزەید کوڕی ئەسلەم دەگێڕنەوە: یەکەم ستەمکاری سەرزەوی نەمرووده. خەڵکان لای ئەو توێشوویان هەڵدەگرت و ئیبراهیم لەگەڵ خەڵکان ڕۆشت و کاتێك خەڵکان لای ئەو تێدەپەڕین، دەیوت: خواکەتان کێیە؟ دەیانوت: تۆ خوای ئێمەیت. کاتێك ئیبراهیم لای ئەو تێپەڕی کرد، بەم شێوەیە وەڵامی دایەوە: پەروەدگاری من کەسێکەدەتوانێت بمرێنێت و زیندوو بکاتەوە.

نەمرود وتی: منیش دەتوانم بمرێنم و زیندوو بکەمەوە.

ئیبراهیم وتی: خواوەند هەتاو لەرۆژهەلأتەوە دەهێنێت، ئەگەر دەتوانی لەرۆژئاواوە بیهێنە.

نەمرود، سەریسوڕما. ئەوی بێ توێشوو گەڕاندەوە. ئیبراهیم بۆلای کەسەکانی خۆی گەڕایەوە. لەسەر تەپۆڵکەیەك تێپەڕی و بەخۆی وت: بۆ لەم خۆڵە هەڵنەگرم و بیبەم بۆ لای کەسەکانی خۆم، تا کاتێك دەمبینن، شادمان بن. لەخۆڵەکەی هەڵگرت و گەڕایەوە بۆ لای کەسەکانی خۆی. بارەکەی خست و خەوت. ژنەکەی هەستا و بارەکەی ئەوی کردەوە و توێشوی زۆری بینی کەپێشتر هاوشێوەی ئەوەی نەبینیبوو. خواردنی لێ ئامادە کرد و لەبەر دەم ئیبراهیم داینا.

ئیبراهیم پرسی: ئەمەت لەکوێ هێناوە؟

ژن وتی: لەو توێشوەی تۆ هێنات.

ئیبراهیم زانی خواوەند رۆژی پێبەخشیوە و سوپاسی کرد.

دواتر خواوەند فریشتەیەکی بۆ لای نەمرود ڕەوانە کرد و پێی فەرموو ئەگەر باوەڕ بێنێت، پاشایەتییەکەی دەپارێزێت.

نەمرود وتی: مەگەر جگە لەمن خوایەکی دیکە هەیە؟

فریشتەیەکی دیکە هات و ئەو قسەی دوبارە کردەوە، بەلأم نەمرود رازی نەبوو. فریشتەی سێیەم هات و نەمرود رازی نەبوو.

فریشتە وتی: تا سێ رۆژی دیکە هەموو داروەدستە و سوپاکەی خۆت کۆبکەرەوە. نەمرود، سوپا و داروەدستەکەی کۆکردەوە.

خواوەند فریشتەی ڕەوانە کرد و دۆڵێك لەمێشوولەی بەرووی ئەواندا کردەوە. کاتێك خۆر هەڵات، لەزۆری مێشولەکان نەیانتوانی ببینن. خواوەند مێشوولەکانی ڕەوانە کرد کەگۆشتی مرۆڤەکانیان دەخوارد و خوێنیان دەخواردنەوە و ئێسقانەکانیان دەهێشتنەوە. هێشتا پاشا زیندوو و زیانی پێنەگەیشتبوو. خواوەند مێشولەیەك بۆ نارد کەڕۆشتە ناو لووتی. تەمەنی چوارسەد ساڵ و بەچەکوش لەسەری ئەویان دەدا. خۆشەویستترین کەس لای نەمرود ئەوە بوو کەچەکوشەکەی بەهەر دودەستی دەگرت و دەیکێشا بەسەریدا. بۆماوەی چوارسەد ساڵ ستەمکاری کرد و خواوەند بەئەندازەی ئەو چوارسەد ساڵە ئازابی پێبەخشی.

نەمرود بوو، بورجێکی گەورەی دروست کرد و خواوەند لەبناغەوە روخاندی. خواوەند لەقورئاندا دەفەرمێت: خواوەند بناغەی ئەوانی لەڕەگ و ریشەوە هەڵتەکاند.

لەکوڕی مەسعود و دەستەیەك لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) دەگێڕنەوە: ئەو کەسەی دوژمنایەتی ئیبراهیمی دەکرد، فەرمانیدا تا لەشارەکە دووری بخەنەوە و کاتێك ڕۆشتەدەر، لوتی برازای لەبەر دەروازەی شار بینی و پێشنیاری خواپەرەستی پێکرد. لوت رازی و پێی وت: من لەرێگەی خوادا کۆچ دەکەم.

نەمرود سوێندی خوارد بەدوای خواوەندی ئیبراهیمدا بگەڕێت. چوارجوجکە داڵی گرت و بەگۆشت وشەراب بەخێوی کردن. کاتێك گەورە بوون و هێزیان گرت، ئەوانی بەصنوقێکەوە بەست و خۆی لەناو صنوقەکە دانیشت. ڕانێکی (گۆشت) بۆ ئەوان لەسەرەوەی صنوقەکە هەڵواسی و داڵەکان بەمەبەستی بەدەست هێنانی گۆشتەکە بۆ سەرەوە هەڵفڕین. کاتێك گەیشتنە ئاسمان و لەسەرەوە سەیری زەوی کرد و کێوەکانی وەك مێرووله هاتەبەرچاو، گۆشتەکەی زیاتر بەرز کردەوە. لەسەرەوە زەوی بینی کەبەدەریا گەماڕۆ دراوە هاوشێوەی بازنەیەکی ئاو. کاتێك زیاتر بەرز بوویەوە، کەوتە ناو تاریکی و سەروخواری خۆی نەبینی، ترسا و گۆشتەکەی هێنایە خوار و داڵەکان بۆ گەیشتن بەگۆشتەکە رێگەی خوارەوەیان گرتەبەر. کاتێك کێوەکان دەنگی هاتنەخوارەوەی ئەوانیان بیست، ترسان و ئەوەندەی نەما بوون لەشوێنی خۆیان بجولێن. بەڵام ئەمە رووی نەدا و مانای وتاری خواوەند کەدەفەرمێت:فێڵی خۆیان کرد و فێڵی ئەوان لای خوا زانراوە هەرچەندە ئەوەندەی نەمابوو کێوەکان لەتاو فێڵەکەیان لەشوێنی خۆیان بجولێن.

هەڵفرینی داڵەکان لەبیت المقدسەوە دەستی پێکرد و لەجبل الدخان نیشتنەوە. کاتێك نەمرود زانی ناتوانێت هیچ کارێك بکات، دەستی بەدروست کردنی بورجێکی گەورە کرد و کاتێك بورجەکە بەرز بوویەوە، ڕۆشتەسەر تا بەگومانی خۆی خواوەندی ئیبراهیم ببینێت. حاڵی خراپ بوو بەشێوەیەك پێشتر ئەو حاڵەی بەخۆیەوە نەبینیبوو. خواوەند بناغەی بیناکەی ئەوی رووخاند. لەقورئاندا دەفەرمێت: سەقفەکە لەسەرەوە بەسەریاندا دارما و سزا لەخوارەوە بەوان گەیشت و نەیانزانی. لەو کاتەوەی پایەکانی بورجەکە دارمان، زمانی خەڵکان پەرێشان و خەڵك بەحەفتا و سیٚ زمان قسەیان دەکرد. ئەو شوێنە بەبابل ناوی دەرکرد کە لەچاوگی تەبلیل بەمانای تێکچوونە. پێش ئەوە زمانی خەڵکەکەی سریانی بوو.

لەسەعید کوڕی جوبەیر دەگێڕنەوە کەسەبارەت بەم ئایەی قورئان: هەرچەند ئەوەندەی نەمابوو لەفێڵی ئەوان کێوەکان لەشوێنی خۆیان بجوڵێن، وتی، نەمرود بەخاوەنی داڵەکانی وت تا صنوقێکیان هێنا و پیاوێکی لەگەڵ خۆی برد و کارێکی کرد تاداڵەکان ئەوان بەرز بکەنەوە. کاتێك بەرزبوونەوە، بەهاورێکەی خۆی وت: چی دەبینیت؟ وتی: ئاو دەبینم و دوورگە. مەبەستی دنیا بوو. دوبارە بەرز بوونەوە و بەهاورێکەی خۆی وت: چی دەبینیت.؟ وتی: بەردەوام لەئاسمان دوردەکەوینەوە. وتی: دابەزین.

یەکێتر دەڵێت: وەحی لەئاسمانەوە هات کەئەی یاخی بۆ کویٚ دەڕۆیت؟ کێوەکان دەنگی داڵەکانیان بیست و بەفەرمانی ئاسمانیان زانی و ئەوەندەی نەمابوو لەشوێنی خۆیان بجوڵێن. مانای وتاری خواوەند ئەمەیە کەدەفەرمێت ئەوەندەی نەمابوو کێوەکان لەشوێنی خۆیان بجوڵێن.

لە عەبدولرەحمان کوڕی دانیاڵ دەگێڕنەوە: عەلی کوڕی ئەبی تالب سەبارەت بەم ئایەی قورئان کەدەفەرمێت: هەرچەند ئەوەندەی نەمابوو کێوەکان لەشوێنی خۆیان بجوڵێن، دەڵێت: ئەو کەسەی لەگەڵ ئیبراهیم سەبارەت بەخوا دوژمنایەتی دەکرد، دە بێچووە داڵی گرت و ئەوانی پەروەردە کرد تا هێزیان گرت و گەورە بوون. دەڵێت، چنگاڵی هەرکامیان بەسنوقەکەوە بەستەوە و لەگەڵ هاورێکەی لەناو تابوتەکە (سنوقەکە) دانیشت.

دەڵێت: دارێکی لەناو صنوقەکە بەرز کردبویەوە کەسەرەکەی گۆشتی پێوە بوو.

دالەکان هەڵفڕین و ئەویان لەگەڵ خۆیان برد. بەهاورێکەی خۆی وت: بڕوانە بزانە چی دەبینیت؟

وتی: ئەمە و ئەوە دەبینم. تا ئەو کاتەی وتی: دنیا دەبینم هاوشێوەی زەردەواڵەیەك. وتی: دارەکە سەرەو خوار بکە. سەرەو خواریان کرد و دابەزین. دەڵێت: مانای وتاری خواوەند کەدەفەرمێت ئەوەندەی نەمابوو کێوەکان لەفێڵی ئەوان لەشوێنی خۆیان بجوڵێن، ئەمەیە.

دەستەیەك وتوویانە: نەمرود کوڕی کوش کوڕی کەنعان پاشای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بوو. شارەزایانی مێژووی پاشاکان بەم وتەیە ڕازی نابن چوونکە حاشای لێناکرێت کە لەدایك بوونی ئیبراهیم لەدەورانی زوحاك کوڕی ئەندرماسبە و ئاماژەمان بەبەشێك لەبەسەرهاتەکەیدا. لەو دەورانەدا پاشایەتی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا لەدەستی زوحاکدا بوو. دەستەیەك لەشارەزایان سەبارەت بەبەسەرهاتی نەمرود دژواری و کێشەیان لا دروست دەبێت چوونکە شارەزای بەسەرهاتی زوحاك و دەورانی ئەون و ئەم گێڕانەوەیشیان بیستووە کەدوو کافر و دوو باوەڕدار پاشایەتی هەموو سەرزەمینیان کردووە. دو کافرەکە نەمرود و بەخت نەصر و دو باوەڕدارەکە سلێمان کوڕی داوود وزولقەرنەیینن. هەروەها بیستوویانە زوحاك لەدەورانی ئیبراهیم پاشایەتی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایی دەکرد و گومان دەکەن نەمرود هەمان زوحاکە.

لای شارەزایان و مێژووناسانی کۆن، ئەم گومانە ڕاست نییە چوونکە نەژادی نەمرود لەناو نەتەوەی نبت ناسراو و زانراوە و نەژادی زوحاك لای خەڵکانی فارس. زاناکانی بەسەرهاتە کۆنەکان وتوویانە زوحاك پاشایەتی سواد و دەوروبەری لەچەپ و ڕاست بەنەمرود بەخشی. ئەو، کوڕ ودەست و پێوەندەکانی خۆی کردە لێپرسراوی ناوچە وشارەکان. خۆی بەوڵاتەکەیدا دەگەڕا. زادگای خۆی وباوباپیرانی دۆنباوەند لەکوێستانەکانی تەبەرستانە. فەرەیدون بەسەریدا زاڵ و بەزنجیری ئاسنین بەستییەوە.

هەروەها بەخت نەصر لە لایەن لەهراسبەوە، ئیسپەهبۆدی ڕۆژئاوایی دیجلە لەنێوان ئەهەواز تا سەرزەمینی ڕۆمی پێبەخشرا، چوونکە لەهراسب سەرقاڵی شەڕ لەگەڵ تورکەکان و و بۆ ڕوبەڕو بوونەوە لەگەڵ ئەوان لەشاری بەڵخ نیشتەجێ ببوو.

وەك دەڵێن کاتێك نیشتەجێ بوونی ئەو بۆ شەڕ کردن لەگەڵ تورکەکان درێژەی کێشا، بناغەی شاری بەڵخی داڕشت و ئەوان کە لەکاری خەڵکەکەی خۆیان بێ ئاگا بوون، لەدرێژی فەرمانڕەوایی ئەوان لەم ناوچەیە کە لەلایەن کەسێکی دیکەوە فەرمانڕەوایەتی دەکرا، گومانیان کردووە، پاشای ئەوان بوون. بەڵام تا ئەو جێگەی دەزانین هیچ کام لەزاناکانی بەسەرهاتە کۆنەکان، کەس ئاماژەی بەوە نەداوە کەسێك لەخەڵکانی نبت لەرۆژهەڵات و رۆژئاوا پاشایەتی یەك بست زەوی سەربەخۆی کردبێت چ بگات بەوەی پاشای رۆژهەڵات و رۆژئاوا بێت.

بەڵام زاناکانی شوێنکەوتەی کتێب و شارەزایان لەبەسەرهاتە کۆنەکان کەڕەنجی نووسینی مێژوویان کێشاوە، دەڵێن: نەمرود لەلایەن ئەزدهاقی بیوراسب بۆ ماوەی چوارسەد ساڵی تەواو فەرمانڕەوایەتی هەرێمی بابلی دەکرد و دوای لەناوچونی نەمرود، یەکێك لەمناڵەکانی ئەو بەناوی نبت کوڕی قەعود بۆ ماوەی سەد ساڵ فەرمانڕەوایەتی ئەو ناوچەی کرد. دوای ئەو داوص کوڕی نبت هەشتا ساڵ پاشایەتی کرد. دوای ئەو بالش کوڕی داوس سەد و بیست ساڵ و نەمرود کوڕی باڵش یەك ساڵ و چەند مانگ کە لەسەریەك دەبێت حەوتسەد و یەك ساڵ و چەند مانگ و ئەمە لەرۆژگاری پاشایەتی زوحاکدا بوو. کاتێك فەرەیدون بەسەر زوحاکدا سەرکەوت، نەمرود کوڕی باڵشی کوشت و نەتەوەی نبتی لەناو برد. خەڵکانێکی زۆری لەوان کوشت لەبەر ئەوەی هاوخەمی و هاوکاری زوحاکیان کردبوو و نەمرود و مناڵەکانی لەلایەن زوحاکەوە پاشایەتیان دەکرد.

دەستەیەك لەزاناکان گومان دەکەن بیوراسب پێش لەناوچونی ئەوان کوژرا بوو و کاروبارەکان لەنەمرود و مناڵەکانی شێوا.

## روداوەکانی دیکەی رۆژگاری ئیبراهیم

یەکێك لەروداوەکانی رۆژگاری ئیبراهیم، داستانی لوت کوڕی هارن کوڕی تارخ برازای ئیبراهیمە لەگەڵ نەتەوەی سەدوم. وەك وتوویانە، لوت لەسەرزەمینی بابل لەگەڵ مامی خۆی بەرێکەوت چوونکە باوەڕدار و شوێنکەوتەی ئەو بوو. لەڕۆشتن بۆ شام هاورێیەتی کرد. سارە کچی ناحوریش لەگەڵیاندا بوو.

دەستەیەکی دیکە وتوویانە سارە کچی هەنال کوڕی ناحورە و وتویانە تارخ کەنەیاری دینی ئیبراهیم و شوێنکەوتەی بتپەرەستی بوو، لەم سەفەرەدا هاورێیەتی ئەوانی دەکرد و کاتێك گەیشتنە حەران، تارخ کەباوکی ئیبراهیم بوو، لەوێ مرد. ئیبراهیم و لوت بەرەو شام بەرێکەوتن و لەوێوە بۆ میسر. لەوێ یەکێك لەفیرعەونەکانیان بینی و بەوتەی سەنان: کوڕی عیلوان کوڕی عوبەید کوڕی عوەیج کوڕی عەملاق کوڕی لاوز کوڕی سام کوڕی نوح بوو.

بەوتەیەك، فیرعەونی میسر لەو رۆژگارەدا برازای زوحاك وزوحاك لەلایەن خۆیەوە پاشایەتی ئەو سەرزەمینی پێبەخشی. بەشێك لەداستانی فیرعەونی میسر و ئیبراهیممان باس کرد.

دواتر بۆ شام گەڕانەوە و دەڵێن ئیبراهیم لەفەلەستین نێشتەجێ و برازاکەی خۆی لەئەردەن بەجێهێشت. خواوەند لوتی بۆ لای نەتەوەی سەدوم ڕەوانە کرد کەکافر و خراپەکار بوون بەهەمانشێوە کەخواوەند باسی ئەوان دەکات و دەفەرمێت: ((انکم لتأتون الفاحشة ما سبقکم بها من احد العالمین. ائنکم لتأتون الرجال و تقطعون السبیل و تأتون فی نادیکم المنکر.

واتاکەی: ئێوە ئەم کارە قێزەونە دەکەن کەهیچ کام لەخەڵکانی جیهان پێش ئێوە نەیانکردووە. ئێوە لەپیاوەکان نزیك دەبنەوە وچەتەیی دەکەن و لەناو کۆڕ و کۆبوونەوەی خۆتان کاری قێزەون ئەنجام دەدن.)) رێگری و چەتەی ئەوان وەك وتوویانە، بەشێوەیەك بوو کە هەر کەسێك دەڕۆشتە ناو شارەکەیان، کاری

خراپەیان لەگەڵ ئەنجام دەدا.

لەکوڕی زەید سەبارەت بەوتاری خواوەند کەدەفەرمێت: ((چەتەیی دەکەن)) دەگێڕنەوە: کاتێك ڕێبوارێك لەشارەکەی ئەوان تێدەپەڕی، ڕێگەیان لێدەگرت و کاری ناشیرینیان لەگەڵ ئەنجام دەدا. بەوتەیەك ئەو کارە نەشیاوە لەناو کۆبوونەوەکانی خۆیان ئەنجامیان دەدا، ئەوەبوو کەهەر کەس لای ئەوان تێدەپەڕی، لێیان دەدا.

دەستەیەکی دیکە وتوویانە لەکۆبوونەوەکانی خۆیان بەئاشکرا (تڕ)یان لێدەدا و دەستەیەکی دیکە وتوویانە کاری قێزەونیان لەگەڵ یەك دەکرد.

ناوی ئەو کەسەی دەڵێت لەڕێبوارەکانیان دەدا

عێکرەمە لەڕوونکردنەوەی وتاری خواوەند کەدەفرمێت: ((لەکۆبوونەوەکانی خۆتان کاری ناڕەوا ئەنجام مەدەن)) دەڵێت: ئازاری ڕێبوار و گەشتیارانیان دەدا و لێیان دەدان.

لەکوڕی مەسعود و دەستەیەك لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) دەگێڕنەوە: کاری ناڕەوای ئەوان بریتی بوو لەلێدانی ڕێبواران. ئەم کارە ناڕەوا بوو.

ناوی ئەو کەسەی دەڵێت

لەکۆبوونەوەکانی خۆیان تڕیان لێدەدا

لەعایشە دەگێڕنەوە: سەبارەت بەکاری ناڕەوای ئەوان دەڵێت: بەئاشکرا لەناو کۆبوونەوەکانی خۆیان تڕیان لێدەدا.

ناوی ئەو کەسەی دەڵێت

لەکۆبوونەوەکان کاری قێزەونیان لەگەڵ یەکدەکرد

[1]لەموجاهید دەگێڕنەوە: سەبارەت بەکارە ناڕەواکانی ئەو نەتەوەیە دەڵێت: لەکۆبوونەوەکانی خۆیان کاری ناڕەوایان لەگەڵ یەك ئەنجامدەدا. هەروەها لەموجاهید دەگێڕنەوە: لەکۆبوونەوەکانی خۆیان زینایان دەکرد.

عەمرۆ کوڕی دینار سەبارەت بەوتاری خواوەند کەدەفەرمێت:

((هیچ کەس لەخەڵکانی جیهان ئەو کارەی نەکردووە)) دەڵێت: پێش نەتەوەی لوت هیچ کات نێرێك لەگەڵ نێرێك نزیکی نەکردبوو.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: وتاری راست لای من ئەویە کە: کاری ناڕەوای ئەوان لەکۆبوونەوەکانی خۆیان ڕێبوارانیان دەگرت و لێیان دەدان.

لەگێڕانەوەی دایکی هانی لەپێغەمبەر هاتووە کەدەفەرمێت: گاڵتەیان بەڕێبواران دەکرد و لێیان دەدان و کاری ناڕەوای ئەوان ئەمە بوو.

چەندین گێڕانەوەی دیکە بەم ناوەرۆکە باسی کراوە.

لوت پێشیناری خواپەرەستی و خۆدوور خستنەوە لەکارە ناڕەواکانی پێکردن و لەچەتەیی و زیناکاری و نێربازی ئاگاداری کردنەوە و هۆشداری پێدان. دەیوت: ئەگەر لەسەر کردەکانی خۆیان بەردەوام بن و تۆبە نەکەن، سزایەکی قورسیان پێدەبڕێت. بەڵام هەڕەشە و هۆشدارییەکانی لوت کاریگەریان دانەنا وئامۆژگارییەکانی پێداگری ئەوانی زیاتر کرد و بەمشێوەیە خوازیاری سزای پەروەردگار بوون و وتیان: ئەگەر راست دەکەیت، سزای خوا بەسەر ئێمەدا ببارێنە.

کاتێك رۆژگاریان درێژەی کێشا و لەگومڕایی خۆیان پێداگریان کرد، لوت داوای هاوکاری لەخواوەند کرد. کاتێك خواوەند مەبەستی لەناو بردن و هاوکاری کردنی پێغەمبەرەکەی خۆی کرد، جبرەئیل و دو فریشتەی دیکەی ڕەوانە کرد. دەڵێن: دو فریشتەکەی دیکە، میکائیل و ئیسرافیل بوون.

وەك وتوویانە فریشتەکان پیادە و لەشێوەی پیاواندا دەرکەوتن.

ئاماژەدان بە بێژەری ئەم وتەیە

لەکوڕی مەسعود و دەستەیەك لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) دەگێڕنەوە:

پێغەمبەر(د.خ)، فەرمووی: خواوەند فریشتەکانی ڕەوانە کرد تا خەڵکی لوت لەناو ببەن. ئەوان پیادە و لەروخساری پیاواندا دەرکەوتن و بوونە میوانی ئیبراهیم. پێشتر باسی ئەم داستانەمان کرد. کاتێك ترسی ئیبراهیم ڕەوییەوە و مژدەیان پێدا، نێردراوان وتیان، خواوەند ئەوانی بۆ لەناو بردنی خەڵکی لوت ڕەوانە کردووە. ئیبراهیم لەگەڵ ئەوان گفتوگۆی کرد، بەهەمان شێوە کەخواوەند دەفەرمێت: کاتێك ترسی ئیبراهیم ڕەوییەوە و مژدەی پێبەخشرا، لەکاری خەڵکی لوت، گفتوگۆی لەگەڵ ئێمەدا کرد.

گفتوگۆکە بەمشێوە بوو کە لەگێڕانەوەی سەعیددا باسی لێوەکراوە: کاتێك جبرەئیل و هاورێکانی بەئیبراهیمیان وت: ئێمە ئەم گوندانە و خەڵکەکەی لەناو دەبەین چوونکە خەڵکەکەی ستەمکارن. ئیبراهیم پێی وتن: ئایا گوندێك وێران دەکەن چوار هەزار باوەڕداری تیا دەژیت؟

وتیان: نە.

وتی: ئایا گوندێك لەناو دەبەن کەسێسەد باوەڕداری تیا دەژیت؟

وتیان: نە.

وتی: ئایا گوندێك وێران دەکەن کەدوسەد باوەڕداری تیا بژی؟

وتیان: نە.

وتی: ئەی گوندێك کەسەد باوەڕداری تیا دەژیت؟

وتیان: نە.

وتی: ئەی گوندێك کەچواردە باوەرداری تیا دەژیت؟

وتیان: نە.

ئیبراهیم، باوەڕداران بەلوتی بەچواردە کەس دەزانی (بەهاوسەرەکەیەوە) ئەرخەیان بوو.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: فریشتە بەئیبراهیمی وت: ئەگەر لەو گوندە پێنج کەس نوێژ بخوێنن، سزایان لەسەر هەڵدەگیرێت.

قتادە سەبارەت بەگفتوگۆی ئیبراهیم دەڵێت: بیستوومە ئیبراهیم بەفریشتەکانی وت: ئەگەر پەنجا موسوڵمان لەو گوندەدا بژین؟

وتیان: ئەگەر پەنجا موسوڵمان لەو گوندەدا بژین، سزایان نادەین.

وتی: ئەگەر چل بن؟

وتیان: سزایان نادەین.

وتی: ئەگەر سی بن؟

وتیان: ئەگەر سی کەسیش بن.

کاتێك گەیشتن بەدەکەس، وتیان: ئەگەر دە باوەڕدار لەو گوندەدا بن، سزایان نادەین. ئیبراهیم وتی: هیچ نەتەوەیەك نییە دە چاکەکار لەناویاندا نەژیت.

ئیبراهیم کەداهاتوی خەڵکی لوتی لەفریشتەکان بیست. وتی: لوت لەوێیە، بۆ ئەو نیگەران بوو.

فریشتەکان وتیان: ئێمە باشتر دەزانین کێ لەوێیە، لوت و کەسەکانی رزگار دەکەین، بێجگە لەهاوسەرەکەی چوونکە لەخراپەکارانە.

دواتر فریشتەکان بەرەو خەڵکی سەدوم بەرێکەوتن و کاتێك گەیشتن، بەوتەیەك سەرەتا لوتیان بینی لەزەوییەکەی خۆی سەرقاڵی کار کردن و بەوتەیەك لای جۆگەی ئاوێك، کچی لوتیان بینی کەئاوی هەڵدەگرت.

ئاماژەدان بەبێژەری وتەی یەکەم

لەحوزەیفە دەگێڕنەوە: کاتێك فریشتەکان ڕۆشتنە لای لوت، ئەویان لەزەوییەکەی خۆی بینی کەسەرقاڵی کار کردن بوو(( بەفریشتەکان وترابوو و خوا زاناترە)) نەتەوەی لوت لەناو مەبەن مەگەر ئەوەی لوت دژی ئەوان قسە بکات.

دەڵێت:بۆ لای ڕۆشتن و وتیان: ئێمە ئەمشەو میوانی تۆین. لوت ئەوانی بردەوە بۆ ماڵ. دوای کاژێرێك سەیری ئەوانی کرد و وتی: مەگەر نازانن، خەڵکی ئەم گوندە چ عادتێکیان هەیە، سوێند بەخوا لەسەر زەوی کەس خراپەکارتر لەوان نییە.

دەڵێت: لەگەڵ فریشتەکان ڕۆشت وجارێکی دیکە قسەکەی دوبارە کردەوە. کاتێك ژنەکەی ئەوانی بینی، ڕۆشت و خەڵکەکەی ئاگادار کردەوە.

لەقتادە دەگێڕنەوە: کاتێك فریشتەکان هاتن، لوتیان لەکێڵگەکەی خۆیدا بینی. خواوەند بەفریشتەکانی وتبوو، ئەگەر لوت چوار جار دژی خەڵکەکەی قسەی کرد، مۆڵەتتان هەیە لەناویان ببەن. فریشتەکان وتیان: ئەی لوت. دەمانەوێت، ئەمشەو میوانی تۆبین.

لوت وتی: مەگەر لەکاری خەڵکەکەم ئاگادار نین؟

وتیان: کاری ئەوان چییە؟

وتی: خوا شایەتە خراپەکارترین خەڵکانی سەر زەوین. چوارجار ئەم قسەی دوبارە کردەوە. فریشتەکان لەگەڵ ئەو ڕۆشتنەوە بۆ ماڵ.

**ئاماژەدان بەبێژەری وتەکەیتر**

وتەکەی دیکە کەوتوویانە، فریشتەکان کاتێك لەسەدوم نزیك کەوتنەوە، کچەکەی لوتیان بینی نەك خۆی، لەگێڕانەوەی کوڕی مەسعود و دەستەیەك لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ دەگێڕنەوە:فەرموی: کاتێك فریشتەکان لای ئیبراهیم ڕۆشتن و بەرەو شوێنی خەڵکەکەی لوت، ملی ڕێگەیان گرتەبەر، لەکاتی نیمەڕۆدا گەیشتن و کاتێك گەیشتنە نزیك جۆگەی ئاوی سەدوم، کچەکەی لوتیان بینی کەئاوی بۆ ماڵەوە دەبردەوە. لوت باوکی دو کچ بوو بەناوەکانی ریسا و رەعر.

فریشتەکان بەکچەکەی لوتیان وت: کچەکە، دەتوانی بمانکەیتە میوانی ماڵەکەتان؟

کچی وت: بەڵێ، بەڵام چاوەڕێ بن و مەڕۆنە ناو گوندەکە تا من دەگەڕێمەوە. لەخەڵکەکەی خۆی بۆ ئەوان دەترسا.

کچ ڕۆشتە لای باوکی و وتی: باوکە، چەندین گەنج بەدوای تۆدا دەگەڕێن کەروخسار جوانتر لەوانم نەبینیوە. نەبا خەڵکەکەی تۆ بیانگرن و ریسوایان بکەن.

خەڵکی لوت پێشتر ئاگاداریان کردبویەوە تا کەس نەکاتە میوانی خۆی. وتبویان ئێمە میوانداری پیاوان دەکەین. لوت ئەوانی بردەوە بۆ ماڵ. کەس جگە لەئەندامانی خێزانەکەی ئاگادار نەبوویەوە. هاوسەرەکەی ڕۆشت و خەڵکی

ئاگادار کردەوە و وتی: پیاوانێك هاتونەتە ماڵی لوت کەکەسی جوانی وەك ئەوانم نەبینیوە.

خەڵکەکەی بەراکردن هاتن و کاتێك گەیشتنە لای ماڵی لوت، پێی وتن: ئەی خەڵکینە، لەخوا بترسن و من لای میوانەکانم سەرشۆڕ مەکەن، مەگەر بیرمەندێك لەناو ئێوەدا نییە. کچەکانی منتان پێشکەش بێت، بۆ ئەو کارەی دەتانەوێت، شیاوتر و پاکترن.

وتیان: مەگەر پێمان نەوتی هیچ کات میوانداری پیاوان نەکەیت، تۆ دەزانی ئێمە کارمان بەکچەکانت نییە و لەمەبەستی ئێمە ئاگاداریت.

کاتێك خەڵکەکەی گوێیان لێ نەگرت، وتی: خۆزگە شوێنکەوتەم دەبوو یا بەپشتیوانی نەتەوەیەك پشتم دەبەست. مەبەستی ئەوەیە، خۆزگە هاوڕێم دەبوو تا لەدەستدرێژی ئێوە بمپارێزن و دەبوونە ڕێگر لەبەردەم مەبەستی خراپی ئێوە بەرابەر بەمیوانەکانم.

لەوەهب دەگێڕنەوە: کاتێك لوت وتی خۆزگە بەپشتیوانی نەتەوەیەك پشتم دەبەست، فریشتەکان وتیان: پشتیوانەکەی تۆ بەهێزە. کاتێك لوت لەسازان لەگەڵ خەڵکەکەی بێ هیوا بوو، فریشتەکان وتیان: ئەی لوت، ئێمە نێردراوی خواین و ئەوان دەستیان بەتۆ ناگات. شەوان کەسەکانی خۆت هەڵبگرە و برۆ، کەس لەئێوە سزا نادرێت مەگەر هاوسەرەکەت کە لەگەڵ خەڵك لەناو دەچێت.

دەڵێن: لوت کاتێك زانی میوانەکانی نێردراوی خوان و بۆ لەناو بردنی خەڵکەکەی هاتون، وتی: هەر ئێستا لەناویان ببەن.

ئاماژەدان بە بێژەری ئەم وتەیە

لەسەعید دەگێڕنەوە: کاتێك فریشتەکان ڕۆشتنە لای لوت و ئەوەی خواوەند فەرمانی پێدابوو، ڕوویدا، جبرئەیل بەلوتی وت: ئێمە خەڵکی ئەم گوندە لەناو دەبەین، لەبەر ئەوەی خەڵکەکەی ستەمکارن.

لوت وتی: هەر ئێستاکە لەناویان ببەن.

جبرەئیل وتی: کاتی دیاریکراو بەیانییە، مەگەر بەیانی نزیك نییە؟

دەڵێت: وتی: شەوانە کەسەکانی خۆت هەڵگرە، کەس شوێنتان ناکەوێت. ئەوان ڕۆشتن و کاتێك کاتی لەناو بردنی خەڵکەکەی گەیشت، جبرەئیل باڵەکانی خۆی لەژەوی ئەوان چەقاند و هەڵیتەکاندن، بەرزی کردنەوە تا ئەو جێگەی دانیشتووانی ئاسمان، دەنگی کەڵەشێر وسەگەکانیان بیست. ئەوانی هەڵگەڕاندەوە و بەردبارانی کردن.

دەڵێت: کاتێك هاوسەری لوت بەوێران کردنی گوندەکەی زانی. بۆچارەنوسی خەڵکەکەی گریا. بەردێکی بەرکەوت و لەناوچوو.

لەکوڕی عەتییە دەگێڕنەوە: لوت بەهاوسەرەکەی خۆی وت تا نهێنی میوانەکانی ئاشکرا نەکات. کاتێك جبرەئیل وهاورێکانی ڕۆشتنە لای لوت و ژن ئەوانی بینی، بۆ لای خەڵکەکەی ڕۆشت و لەناو کۆبوونەوەی ئەوان بەدەست ئیشارەی کرد. خەڵکەکەی بەپەلە هاتن و گەیشتنە ماڵی لوت. لوت ئەو قسانەی پێ وتن کەخواوەند لەقورئاندا ئاماژەی پێدەکات. جبرەئیل پێی وت: ئێمە نێردراوەکانی خواین و ئەوان دەستیان بەتۆ ناگات. دەڵێت: بەدەستی خۆی ئیشارەی کرد و بەرچاوی خەڵك تاریك بوو. بەدوای دیوارەکاندا دەگەڕان و هیچیان نەبینی.

لەحوزەیفە دەگێڕنەوە: کاتێك هاوسەری لوت فریشتەکانی بینی و هەواڵی ئەوانی بەخەڵك گەیاند، وتی: لوت میوانی هەیە کەجوانتر و سپیتر و بۆنخۆشتر لەوانم نەبینیوە. خەڵك بەراکردن هاتن بەهەمان شێوەکە خوا دەفەرمێت. لوت دەرگاکەی بەست و خەڵك لەدەرگایاندا. جبرەئیل داوای فەرمانی لەخواوەند کرد تا سزایان بدات و فەرمانی پێدرا. جبرەئیل بەباڵی خۆی لەژەوی ئەوانیدا کەکوێر بوون و بەمشێوەیە شەوی تەمەنی خۆیان بەسەر برد. دواتر لوتی ئاگادار کردەوە: ئێمە نێردراوی خواین، تۆ، شەوانە کەسەکانی خۆت ببەرە دەر.

دەڵێن: کاتێك لوت لەگوندەکە ڕۆشتەدەر، ژنەکەی هاورێیەتی دەکرد. کاتێك دەنگی لەپشت سەری خۆی بیست و ئاوڕی دایەوە، خواوەند بەردێکی بۆ ڕەوانە کرد و کوشتی.

هەروەها لەقتادە دەگێڕنەوە: کاتێك ژنەکەی لوت خەڵکەکەی ئاگادار کردەوە و هاتن، لوت ویستی ڕێگەیان لێبگرێت بەڵام خەڵك ڕۆشتنە لای فریشتەکان و فریشتەکان دەستیان بەر خەڵك کەوت کەکوێر بوون و وتیان: ئەی لوت. کەسانێك میوانی تۆن کەهاوشێوەی خۆت جادوگەرن. تا بەیانی چاوەڕێ دەبین.

جبرەئیل چوار گوندەکەی خەڵکی لوتی هەڵگێڕایەوە. لەهەر گوندێك نزیکەی سەد هەزار کەس ژیانی بەسەر دەبرد. ئەوانی لەسەر باڵەکانی خۆی بۆ نێوان ئاسمان و زەوی بەرز کردەوە تا ئەو جێگەی دانیشتووانی ئاسمان دەنگی کەڵەشێرەکانی ئەوانیان بیست. دواتر ئەوانی هەڵگەڕاندەوە کەژێرورووو بون.

لەموجاهید دەگێڕنەوە: جبرەئیل باڵەکانی خۆی لەزەوی خەڵك گیر کرد و ئەوان و هەموو چوارپێکانی لەسەر باڵی راستی بەرز کردەوە.

هەروەها لەقتادە دەگێڕنەوە: جبرەئیل، دەسگرەی گوندی ناوەڕاستی گرت و بۆ ئاسمانی برد و خاپووری کرد. ئەوسا بەردبارانی کردن. بیستوومانە دەڵێن ژمارەیان چوار هەزار کەس بوو.

لەگێڕانەوەی مەعاز ئاماژەی پێدراوە: ئەو کەسانەی مابوونەوە، بەبەرد لەناوچون. سێ گوند بو بەناوەکانی سەدووم لەنێوان مەدینە و شام. بیستوومانە کەژمارەیان چوار هزار هەزار کەس بوو. ئیبراهیم بینەری رووداوەکە بوو و وتی: رۆژی سەدووم، هەژێنەرە.

هەروەها لەگێڕانەوەی سەدی ئاماژەی پێدراوە: بەرەبەیان جبرەئیل زەوی تا چینی حەوتەم هەڵکەند و بەرزی کردەوە و سەرەوخواری کرد. هەرکەس لەکاتی کەوتنەخوار، نەمرد، بەبەرد گیانی لێ ستێنرا. بەردی سزا لەناو گوندەکان بەدوای زیندووەکاندا دەگەڕا. خەڵکان سەرقاڵی قسە کردن بوون کەبەردیان بەردەکەوت و دەمردن.

لەگێڕانەوەی محەممەد کوڕی کەعبی قورەزی باس کراوە: مۆتەفیکە، گوندەکەی خەڵکی لووت بوو. جبرەئیل سەرەوخواری کرد و پێنج دێ بوو بەناوەکانی صەبعە، سەعرە، عەمرە، دوما و سەدوم. سەدوم گەورەترین گوند بوو. خوا لوت و بنەماڵەکەی رزگاری کرد جگە لەژنەکەی.

## وتار سەبارەت بەمردنی سارە کچی هاران اوی هاوسەر و منداڵەکانی یبراهیم

پێشتر ئاماژەمان بەتەمەنی سارەدا و وتمان لەنێوان زاناکانی عەرەب و عەجەم سەبارەت بەشوێنی مردنی ئەو جیاوازی نییە. مردنەکەی لەشام بوو. دەڵێن لەحەبرون گوندی ستەمکاران لەسەرزەمینی کەنعان مرد و لەو کێڵگەی ئیبراهیم کڕیبووی، بەخاك سپێردرا. دەڵێن: هاجەر ماوەیەك دوای سارە ژیا، بەڵام بۆچوونەکان لەمبارەوە جیاوازن.

لەسەدی دەگێڕنەوە: ئیبراهیم تامەزرۆی بینینی ئیسماعیل بوو، بەسارەی وت: مۆڵەت بدە تا بڕۆم و کوڕەکەم ببینم. سارە بەڵێنی لێوەرگرت دانەبەزێت. ئیبراهیم سوار لەسەر بوراق ڕۆشتە حیجاز. ئیسماعیل کچێکی لەخەڵکی جورهەمی وەك هاوسەری دیاری کردبوو.

ماڵ و مەڕوماڵاتی ئیبراهیم زیادی کرد. هۆکارەکەی بەهەمان شێوە لەگێڕانەوەی سەدی ئاماژەی پێدراوە، ئەوە بووکە، ئیبراهیم نیازمەند بوو، هاوڕێیەکی هەبوو شتی بەقەرز لێوەردەگرت. سارە وتی: بڕۆلای هاوڕێکەی خۆت. سوار کەرەکەی بوو و ڕۆشتە لای هاوڕێکەی. هاوڕێکەی نیازەکەی نەهێنایەدی. ئیبراهیم شەرمی دەکرد بەو شێوەیە بۆ لای کەسەکانی بگەڕێتەوە. لای ڕێخەڵانێك تێپەڕی و بارداانی کەرەکەی پڕ کرد لەریخ و بەرەڵای کرد. کەر ڕۆشت و بارەکەی بوو بەگەنم.

ئیبراهیم خەوت و لەخەو هەستا و گەڕایەوە بۆ لای سارە کەخواردنی دروست کردبوو، وتی: هیچ دەخۆیت؟.

ئیبراهیم وتی: هیچت بۆ خواردن هەیە؟ وتی: بەڵێ، ئەو گەنمەی لای هاوڕێکەت هێنات. وتی: ڕاست دەکەیت، لای هاوڕێکەم هێنام. گەنمی چاند، سەوز بوو و فراوان. بەرهەمی خەڵك زیانی بەرکەوت و هۆکاری فراوان بوونی سامانی ئیبراهیم ئەمە بوو. خەڵك بۆ نیازەکانی خۆیان دەڕۆشتنە لای ئیبراهیم و

ئەو دەیوت: هەرکەس دەڵێت ((لا اله الا الله،)) بێتە ژوور. کەسانێك دەیانوت و هاوکاریان دەکرا و کەسانێك نەیاندەوت و هیچیان بەرنەدەکەوت. مانای وتاری خواوەند ئەمەیە کەدەفەرمێت:

((فمنهم من آمن به ومنهم من صد عنه و كفى بجهنم سعيرا.

واتاکەی: کەسانێك پەیوەستی ئەوان بوون و کەسانێك، پشتیان تێکردن و جەهەننەم بۆ ئەوان ئاگرێکی داگیرساوە.))

کاتێك سامانی ئیبراهیم فراوان بوو، پێویستی بەخانویەکی گەورەتر بوو. شوێنی ئەو لەنێوان سارای مەدینە و حیجاز لەرۆژهەلاتی شام بوو. برازاکەی (لوت) لەگەڵدا بوو و ماڵ و سامانی خۆی لەگەڵ ئەودا دابەش کرد و بەشی خۆی پێدا و شوێنێکی دیکەی بۆ نیشتەجێ بوونی ئەو هەڵبژارد. لوت روی لەئەردەن کرد و لەوێ نیشتەجێ بوو. ئیبراهیم لەشوێنی خۆی مایەوە بەلام ئارەزوی مەککەی دەکرد. ئیسماعیلی لەوێ نیشتەجێ کرد. ئەگەری هەیە بۆ سەرزەمینەکانی دیکەی شامیش ڕۆشتبێت.

کاتێك سارە کچی هاران و هاوسەری ئیبراهیم، مرد. ئیبراهیم دوای ئەو بەهەمان شێوەی کوڕی ئیسحاق باسی دەکات، کچی یەقتنی لەخەڵکانی کەنعان وەك هاوسەر هەڵبژارد و شەش کوڕی بۆ هێنایە دنیا: یەقسان کوڕی ئیبراهیم، زەمران کوڕی ئیبراهیم، مەدیان کوڕی ئیبراهیم، یەسبق کوڕی ئیبراهیم و سوج کوڕی ئیبراهیم. ئیبراهیم بەئیسماعیل و ئیسحاقەوە خاوەنی هەشت کوڕ بوو. ئیسماعیل براگەورەیان بوو.

دەڵێت: یەقسان کوڕی ئیبراهیم، رەعوە کچی زەمور کوڕی یەقتن کوڕی لوزان کوڕی جورهەم کوڕی یەقتن کوڕی عابری کردە هاوسەری خۆی و بەربەر و لفهای هێنایە دنیا. منداڵەکانی زەمران کوڕی ئیبراهیم مزماریەکانن کەبێ ئاوز بون. خەڵکی مەدیەن نەتەوەی شوعەیبی کوڕی میکائیلی پێغەمبەر، منداڵەکانی مەدیانن. شوعەیب لەمنداڵەکانی ئەوە.

لەهوشامی کەلبی دەگێڕنەوە: باوکی ئیراهیم خەڵکی حەران بوو. گرفتاری وشکەساڵی و رووی کردە هورموزگەردی ئەهواز. ژنەکەی یانی دایکی ئیبراهیم

لەم سەفەرە هاوڕێیەتی دەکرد. ناوی توتا کچی کرینا کوڕی کوسی لەمناڵەکانی ئەرفەخشز کوڕی سام کوڕی نوحە.

لەگێڕانەوەی ئەسلەمی باسی کراوە: ناوی ئەنموتایە و لەئیبراهیم دایکی کوڕی ئەرغوا کوڕی فالغ کوڕی شالخ کوڕی ئەرفەخشز کوڕی سام کوڕی نوحە. دەستەیەکی دیکە وتویانە ناوی ئەنمتلی کچی بەکفورە.

لەگێڕانەوەی هوشامی کەلبی ئاماژەی پێدراوە: کرینا باوەگەورێی (لەدایکەوە) ئیبراهیم جۆگەی کوسی هەڵکەند و باوکی چاودێری بتەکانی نەمرود بوو. ئیبراهیم لەهورموزگەرد چاوی بەدنیا پشکوت و دواتر روی کردە کوسی بابل. کاتێك ئیبراهیم گەیشتە تەمەنی بلۆق و دینێکی پێچەوانەی دینی خەڵکەکەی هەڵبژارد و پێشنیاری پەرەستینی خوای پێکرد، ئەم هەواڵە بەنەمرود گەیشت و بۆ ماوەی حەوت ساڵ زیندانی کرد. دواتر لەحیرە بەگەچ بینایەکی دروست کرد و ئاگری کردەوە و ئیبراهیمی خستە ناو ئاگرەکە. ئیبراهیم وتی: حسبی الله و نعم الوکیل، تەندروست لەناو ئاگرەکەی هاتەدەر و زیانی بەرنەکەوت.

لەگێڕانەوەی کوڕی عەباس باسی کراوە: کاتێك ئیبراهیم لەئاگرەکە هاتەدەر و لەکوسی هەڵات، بەزمانی سریانی قسەی دەکرد و کاتێك لەنزیك حەران لەفورات پەڕییەوە، خواوەند زمانی بۆ عیبرانی گۆڕی، لەبەر ئەوەی لەڕووبار پەڕییەوە و نەمرود چەندین کەسی بەدوای ئەودا ڕەوانە کرد و وتی: هەرکەس بەزمانی سریانی قسەی کرد، بیهێنن بۆ لای من. ئیبراهیمیان بینی بەزمانی عیبرانی قسە دەکات. وازیان لێهێنا و هەستیان بەزمانی دایکی ئەو نەکرد.

لەهوشامی کەلبی دەگێڕنەوە: کۆچی ئیبراهیم لەکوسی بۆ شام بوو و سارە هات و خۆی پێشکەشی ئەو کرد. ئەوی کردە هاوسەری خۆی ولەگەڵ ئەو بەرێکەوت و لەو کاتەدا تەمەنی سی وحەوت ساڵە بوو. ڕۆشتە حەران و بۆ ماوەیەك لەوێ مایەوە و دواتر رووی کردە ئەردەن و ماوەیەك لەوێ ژیانی بەسەر برد و دواتر بۆ میسر و لەوێیش بۆ ماوەیەك نیشتەجێ بوو. ئەوسا بۆ شام گەڕایەوە و لەسەبع لەنێوان ئیلیا و فەلەستین دابەزی و چاڵێکی هەڵکەند و

مزگەوتێکی دروست کرد. دەستەیەك لەخەڵکان ئازاریان دەدا. ئەوێی بەجێهێشت و لەنێوان رەملە و ئیلیا دابەزی و چاڵێکی هەڵکەند و لەوێ جێگیر بوو.

ئیبراهیم ماڵ و مەڕوماڵاتی فراوانی هەبوو. یەکەم کەس بوو میوانداری خەڵکانی کرد و یەکەم کەس موی لەبەر تەمەنی زۆر سپی بوو. دەڵێت: ئیبراهیم، ئیسماعیلی هێنایە دنیا کەمناڵە گەورە و دایکی هاجەر و لەقبتیەکان بوو. ئیسحاقی هێنایە دنیا کەکوێر و دایکی سارە کچی بەتویل کوڕی ناحور کوڕی ساروع کوڕی ئەرغوا کوڕی فالغ کوڕی عابر کوڕی شالخ کوڕی ئەرفەخشز کوڕی سام کوڕی نوحە.

هەروەها مەدیەن و یەقسان و زەمران و ئەسبەق و سوحی هێنایە دنیا کەدایکیان قەنتورا کچی مەفتور لەعەرەبە ڕەسەنەکانە. مناڵەکانی یەقسان ڕۆشتنە مەککە و مەدەن و مەدیەن لەسەرزەمینی مەدیەن مانەوە و ناوی شارەکە لەناوی ئەوان وەرگیراوە. کەسانی دیکە روویان لەشارەکانی دیکە کرد و بەئیبراهیمیان وت: باوکە،ئیسماعیل و ئیسحاقت لای خۆت هێشتۆتەوە و بەئێمە دەڵێی بڕۆینە سەرزەمینی ترس و غەریبی.

ئیبراهیم وتی: بەمشێوەیە فەرمانیان پێداوم. دەڵێت: چەند ناوێکی خواوەندی فێر کردن کەبەهاوکاری ئەو ناوانە بەدوای ئاودا دەگەڕان و سەرکەوتنیان بەدەست دەهێنا. دەستەیەکیان لەخوراسان دابەزین وخەزەرەکان هاتن و وتیان، ئەو کەسەی ئەم ناوانەی فێری ئێوە کردووە، دەبێت باشترین کەسی سەرزەوی بێت. دەڵێت: پاشاکانی خۆیان بەخاقان ناو برد.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: یەسبەق و یەساق و سوح، بەساحیش ناو دەبەن. دەستەیەك وتوویانە ئیبراهیم دوای سارە دوژنی عەرەبی کردە هاوسەری خۆی، یەکیان بەناوی قەنتورا کچی یەقتان کەشەش کوڕی بۆ ئیبراهیم هێنایە دنیا. ئاماژەمان بەناوەکانیاندا، ئەوی دیکەیان هەجور کچی ئەزهەر کەپێنج کوڕی بۆ ئیبراهیم هێنایە دنیا بەناوەکانی کیسان، سورخ، ئەمیم، لوتان و نافی.

## وتـار سەبارەت بەکۆچی دوایی ئیبراهیم خلیل الله

کاتێك خواوەند مەبەستی ئەوەی کرد گیانی ئیبراهیم بگرێت، فریشتەی مەرگی لەروخساری پیرەپیاوێکی بەتەمەن ڕەوانە کرد.

لەسەدەی دەگێڕنەوە: ئیبراهیم میوانداری خەڵکانی دەکرد و خواردنی بەکەسانی زۆر دەدا. ڕۆژێك لەناو میوانەکانی پیرەپیاوێکی بینی کە لەگەرمادا ڕێگەی دەبڕی. کەرێکی نارد سواری بوو و هات. کاتێك گەیشت، خواردنی پێدا. پیرەپیاو لەجیاتی ئەوەی پارووەکە بۆ دەمی ببا، بۆ لوت و گوێچکەی دەبرد و دواتر دەیخستە ناو دەمی و کاتێك بەسکی دەگەیشت، لێی دەهاتەدەر. ئیبراهیم داوای لەخواوەند کردبوو، گیانی نەگرێت تا ئەو کاتەی خۆی ئارەزوی دەکات. کاتێك حاڵی پیرەپیاوەکەی بینی، وتی: ئەی پیرەپیاو، بۆ بەم شێوەییت؟

پیرەپیاو وتی: ئەی ئیبراهیم، دەردی پیرییە.

ئیبراهیم وتی: تەمەنت چەندە؟ دوو ساڵ زیاتر لەتەمەنی ئیبراهیمی وت.

ئیبراهیم وتی: تۆ دو ساڵ لەمن گەورەتریت. منیش دوو ساڵی دیکە هاوشێوەی تۆم لێدێت؟

وتی: بەڵێ.

ئیبراهیم وتی: خوایە زوتر گیانی من بگرە. ئەوسا پیرەپیاو هەستا و گیانی گرت چوونکە فریشتەی مەرگ بوو.

کاتێك ئیبراهیم کۆچی دوایی کرد، دوسەد ساڵی بوو. بەوتەیەك حەفتا و پێنج ساڵە بوو. ئەویان لەنزیك گۆڕی سارە لەکێڵگەی حەبرون بەخاك سپارد.

وەك وتوویانە، خواوەند بیست صەحیفەی بۆ ئیبراهیم ڕەوانە کرد.

ئەبوزەری غەفاری دەڵێت: بەپێغەمبەرم وت: خواوەند چەند کتێبی ڕەوانە کرد؟

فەرمووی: سەد و چواردە کتێب. دەصەحیفەی بۆ ئادەم ڕەوانە کرد، پەنجا صەحیفە بۆ شیس و بۆ خنوخ سی صەحیفە و بۆ ئیبراهیم دەصەحیفە، دوای

ئەوان تەورات و ئینجیل و زەبوور و قورئانی ڕەوانە کرد.

وتم: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، صەحیفەکانی ئیبراهیم چی بوون؟

فەرمووی: هەمووی پەند بوو. بەم رستەیە دەستی پێدەکرد: ئەی پاشای مەغروری لەخۆبایی، من تۆم ڕەوانە نەکرد دنیا و سامانی دنیا کۆبکەیتەوە، تۆم ڕەوانە کرد بۆ ئەوەی دادی ستەملێکراو بسێنیت کەمنیش ئەو کارە دەکەم هەرچەندە کافر بێت. و هاوشێوەی ئەم پەندانە کەهەر کەسێك ئاوزی خۆی لەدەست نەدابێت، دەبێت کاژێرەکانی خۆی دابەش کردبێت: کاژێرێك بەخواپەرەستییەوە سەرقاڵ بێت و کاژێرێك بیر لەئافرێنراوەکانی خواوەند بکاتەوە و کاژێرێك داوەری سەبارەت بەخۆی بکات تا بزانێت چی کردووە و چی ئەنجامداوە و کاژێرێك بۆ بەدەستهێنانی بژێوی حەلاڵ تێبکۆشێت. ئاوزدار دەبێت جگە لەم سێ کارە ئەنجام نەدات: بۆ ئەو دنیا توێشو کۆبکاتەوە، بژێوی خۆی بەدەست بێنێت و بەدوای چێژی حەلاڵدا بگەڕێت. ئاوزدار دەبێت ڕۆژگاری خۆی بناسێت و جێگە وپێگەی خۆی بزانێت و زمانی خۆی بپارێزێت چوونکە هەرکەس قسە بەکردەی خۆی بزانێت، قسەی بێ مانای زۆر دێنێتە سەرزمان.

دەڵێن: ئیبراهیم دوو برای هەبوو یەکیان بەناوی هاران کەباوکی لوتە و بەوتەیەك هاران ئەو کەسە بوو بناغەی شاری حەرانی داڕشت و ناوی شارەکە لەناوی ئەو وەرگیراوە. براکەیتری ناخورە کەباوکی بەتویلە و بەتویل باوکی لابان ورەفقایە و ڕەفقا هاوسەری ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم و دایکی یەعقوبە و لیا و راحیل دوو هاوسەرەکەی یەعقوب کچی لابانن.

## وتار سەبارەت بەمناڵەکانی ئیسماعیل کوڕی ئیبراهیم

پێشتر ئاماژەمان پێدا لەبەرچی ئیبراهیم ئیسماعیل و هاجری برد بۆ مەککە و لەوێ نیشتەجێی کردن. ئیسماعیل لەخەڵکانی جورهەم هاوسەری هەڵبژارد و بەفەرمانی ئیبراهیم تەلاقیدا و هاوسەرێکی دیکە هەڵبژارد کەسیدە کچی مەزاز کوڕی عەمرۆ جورهەمی بوو. ئەو ژنە بوو، کاتێك ئیبراهیم هاتە مەککە، پێی وتبوو: کاتێك مێردەکەت گەڕایەوە، سڵاوی بگەیێنە و بڵێ بەردەرگای ماڵەکەت بەهێزە.

لەکوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە: ئیسماعیل کوڕی ئیبراهیم، دوانزە کوڕی هێنایە دنیا کەدایکیان سیدە کچی مەزاز کوڕی عەمرۆ جورهەمی بوو: نابت و قیدەر و ئەدبیل و مەبشا و مەسمەغ و دەما و ماس و ئەدد و تور و نەفیس و تەما و قیدمان.

دەڵێت: تەمەنی ئیسماعیل وەك دەڵێن، سێسەد ساڵ درێژەی کێشا. خواوەند عەرەبی لەمناڵەکاتی نابت و قیدەر دروست کرد و ئیسماعیلی کردە پێغەمبەری عەمالیق و هۆزەکانی یەمەن.

ناوی کوڕەکانی ئیسماعیلمان کە لەزمانی کوڕی ئیسحاقەوە ئاماژەمان پێدا، بەشێوەیەکی دیکە دەردەبڕن:

قیدە بەقیدار، ئەدبیل بەدەبال، مەبشا بەمەبشام، دەمار بە ئەزوما و مەسا و حەدارد وتیم و یەتور و نافس و قادمن.

دەڵێن: کاتێك وادەی مەرگی ئیسماعیل گەیشت، وەسیەتی لای براکەی خۆی ئیسحاق کرد و کچەکەی خۆی کردە هاوسەری عەیص کوڕی ئیسحاق. بەوتەیەك ئیسماعیل سەد و سی حەوت ساڵ ژیا و لەحەجر نزیك گۆڕی دایکی بەخاك سپێردرا.

لەعومەر کوڕی عەبدولعەزیز دەگێڕنەوە: ئیسماعیل لەتاو گەرمای مەککە لای خواوەند سکاڵای کرد و خواوەند وەحی پێکرد دەرگایەك لەبەهەشت بەرووی تۆدا دەکەمەوە تا لەرۆژی هەستانەوە، نەسیم بەسەرتۆدا هەڵکات و ئەو شوێنە ببێتە گۆڕی تۆ.

## وتار سەبارەت بەئیسحاق کوڕی ئیبراهیم

ئاماژەمان بەژنان و مناڵەکانی ئەودا کەدوای فارسەکان مێژووی هیچ نەتەوەیەك وەك ئەوان بێ پچڕان و پەیوەست بەیەك نییە. وەك چۆن ئاماژەمان پێدا، پاشایەتی فارسەکان لەرۆژگاری کیومەرس بەردەوام بوو تا لەلایەن موسوڵمانانەوە لەناوچوو. بەهەمان شێوە پاشایەتی و پێغەمبەرایەتی لەنێوان منالەکانی ئیسرائیل کوڕی ئیسحاق لەشام و دەوروبەری بێ پچڕان بوو تا ئەوەی دوای یەحیا کوڕی زەکەریا و عیسا کوڕی مریەم بەرەو نەمان ڕۆشت. لەکاتی گێڕانەوەی بەسەرهاتی یەحیا کوڕی زەکەریا ئاماژە بەهۆکارەکانی لەناوچونی پاشایەتی منالەکانی ئیسرائیل دەدەین.

بەلام نەتەوەکانی دیکە جگە لەفارسەکان مێژوویەکی دیاریان نییە چوونکە لەرۆژگاری کۆن وتازە پاشایەتیان بەردەوام نەبووە کەبتوانین بناغەی مێژووی ئەوان لەسەر گێڕانەوەی بەسەرهاتی پاشاکانیان دابرێژین.

منالەکانی یەعقوب هەرچەندە پاشایەتیان لەدەستدا، بەلام ماوەکەی کورت و دیاریکراوە.

یەمەنیش پاشاکانی بەخۆوە بینیوە بەلام پاشایەتی لەناو ئەوان بەردەوام نییە و لەیەکێك تا یەکێکی دیکە پچڕانی زۆری تێدەکەوێت. ماوەی پچڕانەکان زۆر و زاناکان ئەندازەکەی نازانن چوونکە پاشایەتی و رۆژگاری پاشاکانیان گرنگی زۆری پێنەدراوە لەبەر ئەوەی بەردەوام نەبوون. ئەگەر پاشایەتی بەردەوام دەبوو، بەهۆی کەسانی دیکەوە بوو چوونکە حکومەتی آل نەصر کوڕی رەبیعە کوڕی حارس کوڕی مالك کوڕی عەمم کوڕی نەمارە کوڕی لەخم کەسنورەکانی عەرەبیان لەحیرەوە تا سنوری یەمەن و تا سنوری شام و دەوروبەری بۆ فارسەکان دەپاراست، لەرۆژگاری ئەردەشێری بابەکانەوە بەردەوام بوو تا ئەوکاتەی خوسرەو پەرویز، نەعمان کوڕی مونزەری کوشت و حکومەتی سنورەکانی عەرەب

بەئەیاس کوڕی قەبیصەی تایی گەیشت.

لەکوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە: ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم ڕەفقا کچی بەتویل کوڕی ئەلیاسی کردە هاوسەر و عەیص و یەعقوبی هێنایە دنیا. گومان دەکەن ئەم دو کوڕە دوانەن و عەیص گەورەترە. دوای ئەو عەیص کوڕی ئیسحاق کچە مامی خۆی، بەسمە کچی ئیسماعیل کوڕی ئیبراهیمی وەك هاوسەری هەڵبژارد و رومی هێنایە دنیا کەهەموو منالەکانی ئەصەفەر لەمنالەکانی ئەون.

دەڵێت: دەستەیەك لەخەڵکان گومان دەکەن، ئەشبانیش لەمنالەکانی ئەون بەلأم نازانین لەکچی ئیسماعیلن یا نە. یەعقوب کوڕی ئیسحاق کەبەئیسرائیلیش ناو دەبرێت، کچی پورەکەی خۆی لیاد کچی لەبان کوڕی بەتویل کوڕی ئەلیاسی وەك هاوسەر هەڵبژارد و روبیلی هێنایە دنیا کەمنالی گەورەی یەعقوبە. شەمعون و لاوی و یەهودا و زەبالون و یەسحر کوڕەکانی یەعقوب و دینە کچی یەعقوبە. یەسحر بەیەشحریش ناو دەبەن.

کاتێك لیاد کچی لەبان مرد، یەعقوب خوشکی ئەو راحیا کچی لەبان کوڕی بەتویل کوڕی ئەلیاسی وەك هاوسەر هەڵبژارد کەیوسف و بنیامین دوو کوڕەکەی یەعقوب لەم دایکەن. مانای بنیامین بەعەرەبی شەدادە. یەعقوب لەدوکەنیز بەناوەکانی زوڵفە و لەهفە چوار منالی بۆ هاتەدنیا: دان و نەفتالی و جاد و ئەشرەو. هەموو کوڕەکانی یەعقوب دوانزە کوڕن.

دەستەیەك لەشوێنکەوتەکانی تەورات دەڵێن ڕەفقا هاسەری ئیسحاق کچی نافر کوڕی ئازەر مامی ئیسحاقە و دو کوڕەکەی ئەو عەیص و یەعقوب بەیەك سك هاتنە دنیا. ئیسحاق بەیەعقوبی کوڕی وتبوو تا کەس لەکەنعانییەکان وەك هاوسەری دیاری نەکات. یەکێك لەکچە پورەکانی خۆی لەبان کچی نافر وەك هاوسەری هەڵبژێرێت. کاتێك یەعقوب ویستی ژن بێنێت، ڕۆشتە لای پورەکەی خۆی یانی لەبان کچی نافر. لەرێگەدا شەوی بەسەرهات و لای بەردێك خەوت. لەخەودا بینی لەسەر سەری ئەو پەیژەیەك تا یەکێك لەدۆڵەکانی ئاسمان بەرز کراوەتەوە و فریشتەکان بەسەریدا هەڵدەگەڕێن و دادەگەڕێن. یەعقوب ڕۆشتە لای پورەکەی و خوازبێنی راحیلی کرد. لەبان دوکچی بوو، لیا کەگەورەتر و راحیل

کەبچوکتر بوو، بەیعقوبی وت: مارەییت هەیە؟

وتی: نە، بەڵام بۆ مارەیی کچەکەت کار دەکەم.

وتی: مارەییەکەی ئەوە بێت کەبۆ ماوەی حەوت ساڵ کار بۆ من بکەیت.

یەعقوب وتی: راحیلْ بەم مەرجە بەمن بدە و کار بۆ تۆ دەکەم.

لەبان وتی: ئەمە بڕیارە.

یەعقوب بۆ ماوەی حەوت ساڵ شوانی بۆ کرد و کاتێك مەرجەکەی خۆی بردە سەر، لەبانی پێدا و شەوانەی بۆ لای ئەو ڕەوانەی کرد. کاتێك بەیانی بوویەوە، زانی پووری پێچەوانەی بڕیارەکەی خۆی، لەبانی ڕەوانە کردووە. کاتێك لەبان لەناو کۆڕی خەڵکەکەیدا بوو، وتی: منت فریودا و فێڵت کرد، حەوت ساڵ کارت بەمن کرد و هاوسەری خۆمت پیْ نەدام.

لەبان وتی: کوڕی برا، دەتەوێت ئابڕوم بەریت کەی بینیوتە خەڵك کچە بچوکی خۆیان پێش کچە گەورەکەیان بەشوو بدەن. حەوت ساڵی دیکە کارم بۆ بکە تا ئەو کچەت پیْ بدەم. خەڵکی ئەو ڕۆژگارە نەیاندەتوانی دوو خوشك لەیەك کاتدا بکەنە هاوسەر تا ئەو کاتەی موسا هات و تەوراتی بۆ ڕەوانە کرا.

یەعقوب بۆ ماوەی حەوت ساڵی دیکە کاری بۆ کرد و راحیلی پێدا. لیا چواڕ کوڕی بۆ ئەو هێنایە دنیا بەناوەکانی روبیل و یەهودا و سەمعان و لاوی. راحیلْ یوسف و بنیامینی هێنایە دنیا لەگەڵ چەند کچێك.

لابان کاتێك دوکچەکەی کردە هاوسەری یەعقوب، دوکەنیزی پێبەخشی کەهەرکام بۆ یەعقوب سیْ منالْیان هێنایە دنیا. یەعقوب لەپوری جیابویەوە و گەڕایەوە و کێشە لەنێوان خۆی و عەیصی برای ڕوویدا.

دەستەیەك وتوویانە: دان و نەفتالی کوڕەکانی یەعقوب، لەزولْفی کەنیز راحیلْ هاتنە دنیا. راحیلْ کاتێك منالی نەدەبوو، ئەوانی بەیەعقوب بەخشی بۆ ئەوەی لەوان منالی هەبێت. لیایش کەنیزەکەی خۆی بەیەعقوب بەخشی بۆ ئەوەی منالی بۆ بێنێتەدنیا. جاد و ئەشیر لەکەنیزەکەی لیا لەدایك بوون. دوای ئەوە راحیلْ دوگیان و یوسف و بنیامینی هێنایە دنیا. یەعقوب لەگەڵ دوهاوسەرەکەی و منالەکانی ڕۆشتە مالی باوکی لەفەلەستین. لەعەیصی برای دەترسا، عەیص

ڕێگەی چاکەکاری لەگەڵ ئەو گرتەبەر.

عەیص وەك وتوویانە، ڕۆشتە لای ئیسماعیلی مامی و کچەکەی بەسمەی کردە هاوسەری خۆی و بردی بۆ شام. چەند کوڕێك لەو ژنە هاتنە دنیا و منداڵەکانی فراوان بوون و لەشام بەسەر کەنعانییەکاندا زاڵبوون و لەدەریا و ناوچەی ئەسکەندەریە و دواتر تا ڕۆم پێشڕەویان کرد. عەیصیان بەئادەم ناودەبرد چوونکە ڕەنگی خۆڵەمێشی بوو.

عەیص و یەعقوب دوانە بوون و دایکیان ڕەفقا کچی بەتویلە. لەکاتی لەدایك بوونی ئەوان تەمەنی ئیسحاق شەست ساڵ بوو. عەیص زوتر لەسکی دایکی هاتەدەر و ئیسحاق وەك دەڵێن یەعقوبی زیاتر خۆش دەویست و ڕەفقا یەعقوبی زیاتر دەویست. گومان دەکەن یەعقوب لەدوای لاوازی چاو وپیری، ئیسحاقی لەکاری قوربانی فریوداوە و دۆعاکانی ئیسحاق تایبەت بوون بەیەعقوب و دۆعای بەرەکتی باوك یەعقوبی گرتەوە. ئەم کارە بووە هۆی توڕەیی عەیص و هەڕەشەی کوشتنی لەبراکەی کرد. یەعقوب لەترسی ئەو ڕۆشتە لای پورەکەی لەبان و لابان ڕێزی کرد وهەر دوکچەکەی خۆی کردە هاوسەری. ئەوانی لەگەڵ کەنیزە و منداڵەکانی و خوشکەکەیان دینا، بۆ شام شوێنی نیشتەجێ بوونی باوکانی برد و لەگەڵ عەیص ئاشت بوویەوە. عەیص زەوییەکانی بەیەعقوب سپارد و لەشام کۆچی کرد تا گەشتە کەنارەکان و لەوێوە ڕوی کردە ڕۆم و نێشتەجێ بوو. وەك دەڵێن پاشاکانی یۆنانی لەنەوەکانی ئەون.

لەسەدی دەگێڕنەوە: ئیسحاق ژنێکی هێنا کە بەیەك سك بوو بەخاوەنی دوکوڕ و کاتێك ویستی منداڵەکانی ببێت، دوو کوڕەکە لەسکی ئەودا شەڕیان کرد. یەعقوب ویستی خێراتر لەعەیص لەسکی دایکی بێتەدەر، عەیص وتی: سوێند بەخوا ئەگەر خێراتر بڕۆیتەدەر، لەناو سکی دایکم دەمێنمەوە و دەیکوژم. عەیص پێش ئەو لەدایك بوو و یەعقوب پاژنەی عەیصی گرت و هاتەدەر. ئەویان بەعەیص ناو برد چوونکە (عوصیانی) (شۆڕش) کرد و پێش یەعقوب لەسکی دایکی هاتەدەر. منداڵەکەی دیکەیان بەیەعقوب ناوبرد چوونکە لەکاتی هاتنەدەر لەسکی دایك دواوەی عەیصی گرتبوو. یەعقوب لەسکی دایکی گەورەتر بوو بەلام

عەیص پێش ئەو چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

دو کوڕەکە گەورە بوون و عەیص لای باوکی خۆشەویستر و یەعقوب لای دایکی ئازیزتر. عەیص راوچی بوو. کاتێك ئیسحاق بەتەمەنی پیری گەیشت و چاوی کوێر بوو، بەعەیصی وت: کوڕم، گۆشتی راو دەرخواردی من بدە و لەمن نزیك بە تا دۆعات بۆ بکەم بەهەمانشێوە کەباوکم دۆعای بۆ کردم. عەیص پیاوێکی توکن بوو بەڵام یەعقوب بێ موو. عەیص بەمەبەستی ڕاو ڕۆشتەدەر. دایکی کەوتەکانی ئیسحاقی بیست، وتی: کوڕم بڕۆ بزنێك سەر ببڕە و بیبرژێنە و پێستەکەی لەبەر بکە و بڕۆ لای باوکت و بڵێ من عەیصم. یەعقوب ئەو کارەی کرد و کاتێك هات، وتی: باوکە بخۆ.

ئیسحاق وتی: تۆ کێیت؟

وتی: کوڕەکەت عەیص.

دەڵێت: ئیسحاق دەستی لێدا و وتی: دەست لێدان دەڵێتە عەیصە، بەڵام بۆنەکەی بۆنی یەعقوبە.

دایکی وتی: عەیصە، دۆعای بۆ بکە.

ئیسحاق وتی: خواردنەکەی بێنە.

یەعقوب خواردنەکەی برد و ئیسحاق لێی خوارد، وتی: نزیك بەرەوە. یەعقوب نزیك کەوتەوە و ئیسحاق دۆعای بۆ کرد تا پێغەمبەران و پاشاکان لەمناڵەکانی ئەو بن.

یەعقوب ڕۆشت و عەیص هات و وتی: ئەوەی داوات کردبوو، هێنام.

ئیسحاق وتی: کوڕم براکەت لەپێش تۆوەهات.

عەیص توڕە بوو و وتی: سوێند بەخوا دەیکوژم.

ئیسحاق وتی: کوڕم دۆعایەك ماوە بۆتۆ. دۆعای کرد تا مناڵەکانی وەك خاك فراوان بن و کەس جگە لەخۆیان نەبێتە پاشایان.

دایکی یەعقوب پێی وت: بڕۆ بۆلای پورەکەت. چوونکە دەترسا عەیص بیکوژێت. ئەو ڕۆشت بۆ لای پورەکەی، شەوانە ڕێگەی دەبڕی و ڕۆژانە خۆی دادەشارد.

عەیص وتی: ئێستا کە لەدۆعاکەدا پێش من کەوتیت. لەگۆڕدا پێش من کەویت و من بۆ لای باوکانم، ئیبراهیم و ئیسحاق دەڕۆم.

یەعقوب کچە پورەکەی خۆی خۆش دەویست. پورەکەی دوکچی بوو. یەعقوب خوازبێنی کچە بچوکەکەی کرد. باوکی رازی بوو بەو مەرجەی تاماوەیەکی دیاریکراو شوانیان بۆ بکات. کاتێك ماوەکە کۆتایی هات، خوشکی کچەی بۆ نارد، یەعقوب وتی: من داوای راحیلم کرد. پورەکەی وتی: ئێمە کچی بچوك پێش کچی گەورە بەشوو نادەین، شوانیمان بۆ بکە تا ئەویش بکەینە هاوسەری تۆ. یەعقوب ئەو کارەی کرد و کاتێك ماوەی دیارکراو کۆتایی هات، راحیلیان پێدا. یەعقوب هەردوکیان کردە هاوسەر، بەهەمان شێوە کەخواوەند دەفەرمێت: دوو خوشك پێکەوە مەکەنە هاوسەر، مەگەر ئەوەی پێشتر روویداوە.

دەڵێت: یەعقوب لەیەك کاتدا لیا و راحیلْ هاوسەری بوون. لیا، یەهودا و روبیل و شەمعونی هێنایە دنیا و راحیلْ یوسف و بنیامین. راحیلْ دوای لەدایك بونی بنیامین، لەنفاس مرد و پورەکەی یەعقوب ڕانە مەڕێکی پێبەخشی و مەبەستی ئەوەی کرد بۆ بیت المقدس بگەرێتەوە بەلاّم خەرجی رێگەی پێنەبوو. هاوسەری یەعقوب بەیوسفی وت: لەبتەکانی باوکم هەڵبگرە تا بیکەینە خەرجی رێگەکەمان. یوسف بتەکانی هەڵگرت و دو کوڕەکەی یەعقوبی لەگەڵیدا بوون. ئەوانی خۆش دەویست لەبەر ئەوەی دایکیان نەبوو و یوسفی زیاتر لەهەمویان خۆش دەویست. کاتێك گەیشتنە سەرزەمینی شام، یەعقوب بەیەکێك لەشوانەکانی خۆی وت: ئەگەر کەسێك هات و پرسی کێن، بڵێن، ئێمە لەیەعقوب بەندەی عەیصین. عەیص دەستی لەیەعقوب هەڵگرت و یەعقوب لەشام مایەوە. یوسف و براکەی یوسفی زۆر خۆش دەویست. براکانی کاتێك خۆشەویستی باوکیان بۆ یوسف و بنیامین بینی، رژدیان برد. یوسف لەخەودا بینی کەیانزە ئەستێرە و مانگ سوجدەیان بۆ برد. خەوەکەی لەگەڵ باوکیدا باس کرد. باوك وتی: کوڕی خۆم، خەوەکەت لای براکانت باس مەکە چوونکە دوژمنایەتی تۆ دەکەن. شەیتان دوژمنی ئاشکرای مرۆڤەکانە.

وەك دەڵێن: ئەییووب یەکێکە لەمناڵەکانی ئیبراهیم.

## وتار سەبارەت بە بەسەرهاتی ئەییووب

لەوەهب کوڕی مونبە دەگێڕنەوە: ئەیوب پیاوێك لەخەڵکان ڕۆمە و کوڕی موص کوڕی رازح کوڕی عەیص کوڕی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم. یەکیتر دەڵێت: کوڕی موص کوڕی رەغویل کوڕی عەیص کوڕی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم و بەوتەی دەستەیەك کوڕی موص کوڕی رەغویلە. دەڵێت: باوکی لەو کەسانە بوو کاتێك نەمرود ویستی ئیبراهیم بسوتێنێت، باوەڕی هێنا و ژنەکەی کە لەخەودا فەرمانی پێدرا، لێی بدات، کچی یەعقوب کوڕی ئیسحاقە بەناوی لیا. یەعقوب کچی خۆی کردبوە هاوسەری ئەو.

لەغیاس کوڕی ئیبراهیم دەگێڕنەوە کەوتی: ئیبلیس هاوسەری ئەییووبی بینی (لیا کچی یەعقوب) پێی وت: ئەی لیای راستگۆ و خوشکی راستگۆ. دایکی ئەییووب کچی لوت کوڕی هارانە.

دەڵێن: هاوسەری ئەییووب کە لەخەودا فەرمان بەئەییووب درا، لێی بدات، کچی ئەفرائیم کوڕی یوسف کوڕی یەعقوبە و هەموو منداڵەکانی شام لەنەوەکانی ئەییووبن.

لەوەهب کوڕی مونبە دەگێڕنەوە: ئیبلیس بیستی کەفریشتەکان صلاواتیان بۆ ئەیوب دەنارد چوونکە خواوەند یادی ئەوی دەکرد. رژدی پێبرد و داوای لەخواوەند کرد بەسەر ئەیوبدا زاڵی بکات تا لەدینەکەی پەشیمانی بکاتەوە. خواوەند ئەوی بەسەر ماڵی ئەییووب، نەك ئاوز و جەستەی، زاڵ کرد. شەیتان گەورەکانی خەڵکەکەی خۆی کۆکردەوە. ئەییووب هەزار بزن و چەندین شوانی لەشام بوو لەگەڵ پێنسەد جەریب زەوی و پێنسەد بەندە کەهەر بەندەیەك ژن و منداڵی هەبوو. کەرەستەکانی ئەوان بەکەر دەبرا چوونکە دوو و سێ و چوار یا پێنج، زیاتریان هەبوو.

کاتێگ ئیبلیس شەیتانە گەورەکانی کۆکردەوە، وتی: هەرچی زانست و هێزە، بەکاری ببەن چوونکە منیان بەسەر ئەییووبدا زاڵ کردووە و ماڵ و سامان

فیتنەیەکی گەورەیە کەپیاوان ناتوانن بەرگەی لەدەستدانی بگرن. هەرکام لەوان هێزی لەناو بردنی بەشێك لەسامانەکەی ئەییووبیی بوو. ئەوانی ڕەوانە کرد و هەموو ماڵ و سامانەکەی ئەویان بەفیڕۆدا. ئەییووب بەردەوام سوپاسی خواوەندی دەکرد و لەناوچوونی ماڵ و سامانی ئەوی لەپەرەستینی خواوەند دوور نەخستەوە. کاتێك ئیبلیس ئەمەی بینی، داوای لەخواوەند کرد، بەسەر منداڵەکانی ئەییووبدا زاڵی بکات. خواوەند ئەوی بەسەر مناڵەکانی ئەییووب، نەك ئاوز و جەستەی، زاڵ کرد و هەموو مناڵەکانی کوشت. دواتر وەك مامۆستا و فێرکاری مناڵەکانی ئەییووب، بریندار و سەرشکاو ڕۆشتە لای و ئەوەندە باسی بەلاً و زیانەکانی کرد. ئەییووب بێزار و دەستی بەگریان کرد. مشتێ خۆڵی هەڵگرت و کردی بەسەری خۆیدا. ئیبلیس رازی بوو چوونکە ئەییووبی بۆ ئەم کارە ناچار کرد.

دوای ئەوە ئەییووب تۆبە و دوای بەخشینی کرد. فریشتە پاسەوانەکان تۆبەی ئەویان بۆ ئاسمان بەرز کردەوە و پێش ئیبلیس کەوتن.

کاتێك زیانی ماڵ و مناڵ ڕێگەی پەرەستینی خواوەندی لەئەییووب نەگرت، ئیبلیس داوای لەخواوەند کرد بەسەر جەستەی ئەییووبدا زاڵی بکات. خواوەند ئەوی بەسەر جەستەی ئەییووبدا زاڵ کرد جگە لەزمان و ئاوز و دڵی.. ئیبلیس هات و ئەییووب لەسوجدەدا بوو. ڕۆشتە ناو لوتی و جەستەی چڵکی کرد. خەڵکی گوندەکە لەبەر بۆگەن ئەویان بۆ دەرەوەی گوندەکە دەرکرد. کەس جگە لەهاوسەرەکەی لێی نزیك نەدەکەوتەوە.

جیاوازی بۆچونەکانمان سەبارەت بەناو و نەژادی ژنەکەی ئەییووب باس کرد.

وەهب کوڕی مونبە دەڵێت: هاوسەری ئەییووب دەڕۆشتە لای و پێداویستیەکانی بۆ دەبرد. سێ کەس باوەڕیان بەدینی ئەییووب هێنابوو و کاتێك زیان و بەلاًکانی ئەویان بینی، پشتیان تێکرد و بوختانیان بۆ هەڵبەست بەلاًم لەدینەکەی پاشگەز نەبوونەوە. یەکیان بەلدد و ئەویتر ئەلیفز و سێیەمی ناوی صافر بوو. ئەوان ڕۆشتن و سەرکۆنەی ئەییووبیان کرد. کاتێك قسەکانی ئەوانی بیست، داوای هاوکاری لەخواوەند کرد و ناڵاًندی. خواوەند بەزەیی پیایدا هاتەوە

و زیانی لەسەر ئەو هەڵگرت و ماڵ و منداڵەکەی بۆ گەڕاندەوە زیاتر لەوەی جارانی. وتی: هەستە بەرێکەوە چوونکە ئێرە شوێن غوسلێکی فێنك و شیاوی خواردنەوەیە. خۆی شۆرد و روخساری لەجاران جوانتر بوو.

لەحەسەن دەگێڕنەوە: ئەییووب حەوت ساڵ و چەند مانگ گرفتاری دەرد و بەڵاکەی بوو بەڵام داوای لەخواوەند نەکرد بەڵای لێ دوور بخاتەوە. لەسەر زەوی کەس لای خواوەند لەئەییووب رێزدارتر نەبوو.

کاتێك دەستەیەك لەخەڵکان وتیان: ئەگەر پەروەردگار ئەییووبی دەویست، ئەم بەڵای بەسەردا نەدەهێنا. لەم کاتەدا ئەیوب لەخوا پاڕایەوە.

ئەمە بەشێکە لەداستانی ئەییووب. ئێمە بەسەرهاتی ئەییووبمان پێش یوسف خست لەبەر ئەوەی وتوویانە ئەو لەرۆژگاری یەعقوب پێغەمبەرایەتی دەکرد و دەڵێن تەمەنی ئەییووب نەوەد و سێ ساڵە و لەکاتی مەرگ لای حوملی کوڕی وەسیەتی کرد. خواوەند دوای ئەییووب، کوڕەکەی بشر کوڕی ئەییووبی کردە پێغەمبەر و بە ذی الکفل ناوی برد وفەرمانی پێدا پێشنیاری خواپەرەستی بەخەڵکان بکات. بشر هەموو تەمەنی لەشام بەسەر برد و کاتێك مرد، تەمەنی حەفتا و پێنج ساڵ بوو..

بشر لای عەبدانی کوڕی وەسیەتی کرد و خواوەند دوای ئەو شوعەیب کوڕی صەیفون کوڕی عەنقا کوڕی سابت کوڕی مەدیەن کوڕی ئیبراهیمی وەك پێغەمبەری خەڵکی مەدیەن ڕەوانە کرد.

سەبارەت بەنەژادی شۆعەیب بۆچوونەکان جیاوازە. شوێنکەوتەکانی تەورات بەم شێوەیە نەژادی باس دەکەن کەئاماژەم پێدا. بەڵام بەوتەی کوڕی ئیسحاق، شۆعەیب کوڕی میکائیل لەمناڵەکانی مەدیەنە. دەستەیەکی دیکە وتوویانە شۆعەیب لەمناڵەکانی ئیبراهیم نییە بەڵکو مناڵی یەکێك لەباوەڕدران بەئیبراهیمە کە لەکچی لوت چاوی بەدنیا هەڵهێنا. بەمشێوەیە دایەگەورێی شۆعەیب، کچی لوتە.

## وتار سەبارەت بە بەسەرهاتی شۆعەیب

دەڵێن: ناوی شۆعەیب یەترونە. ئاماژەمان بەنەژادی ئەودا. دەڵێن: شۆعەیب کوێر بوو.

لەسەعید کوڕی جوبەیر دەگێڕنەوە: سەبارەت بەوتاری خواوەند کەباسی بەسەرهاتی خەڵکی شۆعەیب دەکات و دەفەرمێت: ((و تۆ لەناو خۆمان بەلاواز دەبینین)) دەڵێت: ئەو کوێر بوو.

لەسوفیان دەگێڕنەوە: شۆعەیب خەتیبی پێغەمبەرانە و خواوەند ئەوی وەك پێغەمبەری خەڵکانی مەدیەن ڕەوانە کرد کەیارانی ئیکەن و ئیکە بەمانای دارستانی چڕە. کافر بوون و لەکێش و پێوانەکانیان کەم دەکردەوە و ماڵی خەڵکیان دەخوارد. خواوەند ڕۆژی فراوان و ژیانی خۆشی بەخەڵکی شۆعەیب بەخشیبوو هەرچەندە لەسەر کارە نەشیاوەکانی خۆیان بەردەوام بوون. شۆعەیب بەوانی دەوت:

((یا قوم اعبدوالله مالکم من اله غیره و لا تنقضوا المکیال و المیزان انی اراکم بخیر و انی اخاف علیکم عذاب یوم محیط.

واتاکەی: ئەی خەڵکینە، خواوەند بپەرستن چوونکە جگە لەو خوایەکتان نییە و پێوانەو کێش کەم مەکەنەوە چوونکە من بەباشی کاری ئێوە دەبینم و لەو ئازابەی بەسەر ئێوەدا دەبارێت، دەترسم.))

وتاری شۆعەیب و وەڵامی خەڵکەکەی بەوشێوەیە بوو کەخواوەند لەقورئاندا دەفەرمێت.

لەکوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە: هەر کاتێك پێغەمبەر(د.خ) باسی شۆعەیبی دەکرد، دەیوت: ((خەتیبی پێغەمبەران بوو و لەگەڵ خەڵکەکەی خۆی بەشێوەیەکی پاراو قسەی دەکرد و کاتێك سەرکێشی و ستەمکاری خەڵکەکەی درێژەی کێشا و بیرخستنەوەکانی شۆعەیب بۆ سزا خواییەکان کاریگەریان نەبوو، خواوەند مەبەستی ئەوەی کرد لەناویان ببات و ئازابی ڕۆژی سێبەری بۆ ڕەوانە کردن.

کوڕی عەباس سەبارەت بەئایەی قورئان بۆ سزای سێبەر، دەڵێت: خواوەند گەرمایەکی تاقەت پڕوکێنی ڕەوانە کرد کەهەناسەی گرتن. پەنایان بۆ ماڵەکان برد و گەرما گەیشتە ناو ماڵەکان و هەناسەی گرتن. لەماڵەکان پەنایان بۆ سارا برد و خواوەند هەورێکی ڕەوانە کرد کەسێبەری بۆ دروست کردن، فێنك بوونەوە و بانگی یەکیان کرد و کاتێك لەژێر هەورەکە کۆبوونەوە، خواوەند ئاگرێکی ڕەوانە کرد. ئەمە ئازابی ڕۆژی سێبەرە کەئازابێکی ئێجگار گەورەیە.

لەقتادە دەگێڕنەوە: شۆعەیب وەك پێغەمبەری دو نەتەوە ڕەوانە کردا. خەڵکەکەی خۆی دانیشتوی مەدیەن بوون و بەیارانی ئیکە بەناو بانگن. ئیکە دارە چڕەکانە و کاتێك خواوەند مەبەستی ئەوەی کرد سزایان بدات، گەرمایەکی سوتێنەری ڕەوانە وئازابی وەك هەور لەسەر سەری ئەوان جێگیر کرد. کاتێك هەورەکە لەوان نزیك کەوتەوە، بەهیوایی فێنك بوونەوە لەژێر هەورەکە کۆبوونەوە و ئاگر بەسەریاندا باری و مانای وتاری خواوەند کەدەفەرمێت: (ئازابی ڕۆژی سێبەریان پێبرا) ئەمەیە.

دەستەیەك لەزاناکان وتوویانە کە خەڵکی شۆعەیب یەکێك لەسنورەکانی خوایان بەزاند. خواوەند ڕۆژی ئەوانی زیاد کرد و دوبارە سنورێکی دیکەی خوایان بەزاند و خواوەند ڕۆژی فراوان کردن و بەم شێوەیە سنوورەکانی خوایان دەبەزاند. کاتێك خوا مەبەستی ئەوەی کرد لەناویان ببات، گەرمایەکی سوتێنەری ڕەوانە کرد کەئۆقرەیی لێ بڕیین و سێبەر و ئاو چارەی دەردی نەکردن. یەکیان ڕۆشت و لەژێر سێبەری هەورێك جێگەی گرت و ئارام بوویەوە. بانگی هاورێکانی خۆی کرد و هەموویان بەپەلە روویان تێکرد. کاتێك کۆبوونەوە، خواوەند ئاگری باراند و ئەمە ئازابی ڕۆژی سێبەرە.

لەزەید کوڕی معاویە دەگێڕنەوە: گەرمایەکی سوتێنەر ئارامیی لێ بڕیین و هەورێك وەك سێبەر هات وکاتێك لەژێر هەورەکەدا خەوتن، بوومەلەرزە روویدا.

لەزەید دەگێڕنەوە: خواوەند هەورێکی سێبەرداری بۆ ئەوان نارد و فەرمانی بەخۆردا هەموو شتەکانی سەرزەوی بسووتێنێت. هەموویان لەژێر سێبەری هەورەکە کۆبوونەوە و کاتێك کۆبوونەوە، خوا، سێبەری لەوان گرتەوە و خۆری

بەسەردا زاڵ کردن و هاوشێوەی کوولە لەناو تاوەدا سووتان.

زەید کوڕی سەلەم سەبارەت بەوتاری خواوەند لەزمانی خەڵکەکەی شوعەیب کەوتیان: نوێژ، تۆ ناچار دەکات ئێمە لەو کارەی باوکانمان دەیانکرد و ئێمەیش لەکار و ماڵ و سامانی خۆمان دەیکەن، دوور بخەیتەوە. دەڵێت: لەوشتانەی شوعەیب رێگەی لێدەگرتن، سووک کردنی کێشی درەمەکان بوو.

لەمحەممەد کوڕی قورەزی دەگێڕنەوە: هۆکاری ئازاب و سزای خەڵکی شوعەیب، بڕینی درەمەکان بوو.

## وتار سەبارەت بەیەعقوب و منالەکانی

دەڵێن و خوا باشتر دەزانێت کەئیسحاق کوڕی ئیبراهیم. دوای لەدایك بوونی عەیص و یەعقوب بۆ ماوەی سەد ساڵی دیکە ژیا و کاتێك مرد، تەمەنی سەد و شەست ساڵ بوو. کوڕەکانی (عەیص و یەعقوب) ئەویان لای گۆڕی باوکی (ئیبراهیم) لەکێڵگەی حەبرون بەخاك سپارد. تەمەنی یەعقوب کوڕی ئیسحاق سەد و حەفتا و چوار ساڵ درێژەی کێشا.

### گێڕانەوەی داستانی یوسف کوڕی یەعقوب

یوسف و دایکی، لەجوانیدا بەشێوەیەك بوون کەسی هاوشێوەی ئەوان نەبینراوە.

لەئەنس دەگێڕنەوە: پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی یوسف و دایکی جوان روخسار بوون و کاتێك دایکی راحیل، ئەوی هێنایە دنیا، یەعقوب خوشکەکەی بۆ سەرپەرەستی کردنی کوڕەکەی راسپارد.

درێژەی داستانەکە لەگێڕانەوەی موجاهید ئامارەی پێدراوە کەدەڵێت: یەکەم بەلاَ بەسەر یوسفدا هات، لەلایەن پوڕەکەیەوە (کچی ئیسحاق) بوو. ئەو منالی گەورەی ئیسحاق و پشتێنەکەی ئیسحاق بەو گەیشتبوو. هەرکەسێك خیانەتی لەو پشتێنە دەکرد، دەبووە مڵکی خاوەن پشتێنەکە و هەر کارێکی دەویست، لەگەڵ خیانەتکار ئەنجامی دەدا. کاتێك یوسف چاوی بەدنیا هەڵهێنا، یەعقوب ئەوی بەپوری سپارد و کاتێك یوسف گەورە و گەیشتە تەمەنی بلۆق و یەعقوب شەیدایی بوو، ڕۆشتە لای خوشکەکەی و وتی:

خوشکە، یوسف بەمن بسپێرە چوونکە یەك کاژێری لەدووری ئەو ناتوانم بژیم.

خوشکی وتی: سوێند بەخوا دەستبەرداری ئەو نابم.

یەعقوب وتی: سوێند بەخوا منیش دەستبەرداری نابم.

دواتر پورەکەی وتی: با چەند ڕۆژێك لای من بێت بۆ ئەوە تێر بەدڵ سەیری بکەم، ئەگەری هەیە ئارام ببمەوە.

کاتێك یەعقوب لای خوشکەکەی ڕۆشت، پشتێنەکەی هەڵگرت و لەژێر جلەکانەوە لەکەمەری یوسفی بەست و وتی: پشتێنەکەم ون کردووە، بزانن کێ هەڵیگرتووە.

کاتێك گەڕان، ئەویان لای یوسف دۆزیەوە. پوورەکەی وتی: سوێند بەخوا یوسف هی منە و چیم پێخۆش بێت لە گەڵ ئەو دەیکەم.

دەڵێت: کاتێك یەعقوب هات، خوشکەکەی داستانەکەی بۆ باس کرد.

یەعقوب وتی: ئەگەر ئەم کارەی کردووە، هی تۆیە و من ناتوانم هیچ کارێك بکەم.

پوورەکەی یوسفی لای خۆی هێشتەوە و یەعقوب نەیتوانی هیچ کارێك بکات تا خوشکەکەی مرد. مانای وتاری براکانی یوسف کەسەبارەت بەبنیامین وتیان: (ئەگەر ئەو دزی کردووە، پێشتریش براکەی دزی کردووە.) ئەمەیە.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: کاتێك براکان لەکاتی منداڵی یوسف، تامەزرۆیی زۆری باوکیان بۆ ئەو بینی، رژدیان پێبرد و بەیەکیان وت: یوسف و براکەی لای باوکم خۆشەویستترن و باوکمان لەگومڕاییدا دەژیت.

دواتر داستانی ئەو داستانی یەعقوب بەو شێوەیە بوو کەخواوەند لەقورئاندا باسی دەکات: داوایان لەباوکیان کرد تا یوسف هاوڕێ لەگەڵ ئەوان بۆ سارا بنێرێت بۆ ئەوەی گاڵتە و یاری لەگەڵ بکەن و بەڵێنیاندا بیپارێزن. یەعقوب وتی ناتوانێت بەرگەی دووری ئەو بگرێت و پێی وتن ئەگەری هەیە گورگ بیخوات. بۆ فریودانی باوکیان درۆیان کرد و یوسفیان لەگەڵ خۆیان برد و کاتێك ڕۆشتنە سارا، ئەویان خستە ناو چاڵەکە.

لەسەدی دەگێڕنەوە: یەعقوب، یوسفی لەگەڵ براکانی نارد و کاتێك گەیشتنە سارا، دوژمنایەتیان لەگەڵ ئەو دەستپێکرد. برایەك لێی دەدا و کاتێك پەنای بۆ ئەوی دیکەیان دەبرد، ئەویش لێی دەدا. ئەوەندەیان لێدا کە لەمردن نزیك

کەوتەوە و دەیوت: ئەی باوکە، بزانە کەئەم کەنیز زادانە (زادەی کەنیزن) چی لەکورەکەت دەکەن.

کاتێك لەکوشتن نزیك بوویەوە و یوسف هاواری دەکرد، یەهودا وتی: مەگەر پەیمانتان بەمن نەدا نەیکوژن. ئەویان بردە لای چاڵێك تا بیخەنە ناو چاڵەکە. بەڵام یوسف خۆی بەلێواری چاڵەکەوە هەڵواسی. دەستیان بەستەوە و کراسەکەیان دەرهێنا. یوسف وتی: برایان، کراسەکەم پێبدەن تا لەناو چاڵەکە لەبەرما بێت.

وتیان: لەهەتاو و مانگ و یانزە ئەستێرە داوا بکە ببنە هاودەمی تۆ.

وتی: شتی لەو شێوەم نەبینیوە.

ئەویان لەچاڵەکەدا هەڵواسی. کاتێك گەیشتە نیوەی چاڵەکە، فڕیاندایە خوار بۆ ئەوەی بمرێت. بەڵام چاڵەکە ئاوی تیابوو. کەوتە ناو ئاوەکە و پەنای بۆ تاشەبەردێك برد ولەسەری وەستا. کاتێك کەوتە ناو چاڵەکە، دەستی بەگریان کرد. بانگیان کرد. یوسف گومانی کرد کەبەزەییان پیای هاتۆتەوە و وەڵامی دانەوە. بەڵام ویستیان بەردێك بۆ ناو چاڵەکە فڕێبدەن تا بیکوژن، یەهودا رێگەی ئەم کارەی لێگرتن و وتی: پەیمانتان بەمنداوە، نەیکوژن. یەهودا خواردنی بۆ برد.، خواوەند ئاماژەی بەداستانی براکانی یوسف داوە کەشەوانە بەدەم گریانەوە گەڕانەوە بۆ لای باوکیان و وتیان: گورگ، یوسفی خوارد و باوك وتی:

((بل سولت لکم انفسکم امرا فصبر جمیل.

واتاکەی: بەمشێوە نییە، بەڵکو ناختان کارێکی گەورەی، بەچاکە نیشاندان وسەبر و خۆڕاگری شیاوی پێویستە.))

کاراوانێك هات و یوسفی لەچاڵەکە دەرهێنا. ئەو کەسەی لەچاڵەکە دەریهێنا، وتی: یا بشری هذا غلام.، واتاکەی: مژدە، ئەمە بەندەیەکە.

لەقتادە دەگێڕنەوە: چاڵەکە لەسەرزەمینی بیت المقدس بوو و شوێنکەی زانراوە. لەگێڕانەوەی سەدیدا هاتووە کەئەو کەسەی یوسفی لەچاڵەکە دەرهێنا وبانگی هاورێکەی خۆی کرد. ناوی (بشری) بوو و وتی: ئەی بشری!

هەروەها خواوەند دەفەرمێت: کاروانەکە وئەو کەسەی یوسفی لەچاڵەکە

دەرهێنا، ئەویان بەبەهایەکی کەم، کڕی و ئەویان لەناو کاڵاکانی خۆیان شاردەوە لەترسی ئەوەی نەکا بازرگانەکانی دیکە لەنرخەکەی ئاگادار ببنەوە وخوازیاری بەشداری کردن لەو مامڵەیەدا بن. براکانی یوسف بەکڕیارانیان وت: بیبەستنەوە نەکا، رابکات. لەمیسر ئەویان بۆ فرۆش دانا، دەیوت: کێ من دەکرێت. شا ئەوی کڕی. شا موسوڵمان بوو.

بەهایی یوسف کەم بوو. دەڵێن: ئەویان بەبیست درەم فرۆشت ودابەشیان کرد و دە کەس هەریەکی دو دەرمیان بەرکەوت. درەمەکان، تۆزقاڵێك بوون، نەکێشدار، چوونکە لەو رۆژگارەدا بەهایی درەمەکان لەرووی کێشیانەوە دیاری دەکرا. بەوتەیەك بەچوار درەم فرۆشتیان و بەوتەیەك بەهای یوسف بیست و دوو درەم بوو.

دەڵێت: ئەو کەسەی لەمیسر، یوسفی کڕی، مالك کوڕی دەعر کوڕی یوبب کوڕی عەفقان کوڕی مەدیان کوڕی ئیبراهیمی خەلیل بوو. کاتێك ئەوی کڕی، بەهاوسەرەکەی خۆی وت: رێزی لێ بگرە.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: ناوی کڕیارەکەی یوسف، قەتفیر وبەوتەیەك ئەتفیر کوڕی رۆحەیب بوو بەنازناوی عەزیز. خەزێنەکانی میسر لەدەستی عەزیزدا بوو و بەهەمان شێوە کە لەکوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە، پاشا، رەیان کوڕی وەلید یەکێك لەعەمالیق بوو، بەڵام کەسێکی دیکە دەڵێت: لەو کاتەدا شا و فیرعەونی میسر، زیان کوڕی سەروان کوڕی ئەراشە کوڕی قاران کوڕی عەمرۆ کوڕی عەملاق کوڕی لاوز کوڕی سام کوڕی نوح بوو.

دەستەیەك وتوویانە: سەرئەنجام ئەم پاشایە باوەڕی هێنا و شوێن دینەکەی یوسف کەوت. یوسف دوای ئەو زیندوو بوو. لەدوای ئەو قابوس کوڕی مەصعەب کوڕی معاویە کوڕی نەمیر کوڕی سەلواس کوڕی فاران کوڕی عەمرۆ کوڕی عەملاق کوڕی لاوز کوڕی سام کوڕی نوح، پاشایەتی گرتەدەست. کەسێکی بێ باوەڕ بوو. یوسف پێشنیاری خواپەرەستی پێکرد، بەڵام رازی نەبوو.

دەستەیەك لەشوێنکەوتەکانی تەورات وتوویانە، داستانی یوسف و ڕۆشتنی ئەو بۆ میسر بەمشێوەیە. ئەو حەفدەساڵی تەمەن بوو و سیانزە ساڵ لەماڵی

کڕیارەکەی خۆی مایەوە. کاتێك تەمەنی گەیشتە سی ساڵان، فیرعەونی میسر، وەلید کوڕی رەیان ئەوی کردە وەزیر و لەتەمەنی سەد و دە ساڵی چاوی لەجیهان بەست و لای براکەی یەهودا وەسیەتی کرد. لەوکاتەوەی لەیەعقوب دوور کەوتەوە تا ئەو کاتەی دوبارە لەمیسر ئەوی بینی، بیست و دوو ساڵی خایاند. یەعقوب و کەسەکانی بۆ ماوەی حەفدە ساڵ لەمیسر لای یوسف مانەوە. یەعقوب لای یوسف وەسیەتی کرد.

یەعقوب هاوڕێ لەگەڵ حەفتا کەس بۆ میسر ڕۆشت.

بەوتەی کوڕی ئیسحاق، ئەتفیر، کڕیارەکەی یوسف، بەهاوسەرەکەی خۆی (راعیل) وتبوو ریزی لێ بگرێت چوونکە ئەگەری هەیە سوودمان پێبگەیینێت یا وەك منالی خۆمان هەڵیبگرینەوە. هەروەها لەگێڕانەوەی کوڕی ئیسحاق ئاماژەی پێدراوە کەئەتفیر پیاوێك بوو، لەژنان نزیك نەدەکەوتەوە و ژنەکەی راعیل جوان روخسار و ماڵ و سامانی فراوانی لەبەردەستا بوو.

کاتێك یوسف، تەمەنی گەیشتە سی ساڵان، خواوەند حیکمەت و زانستی فێر کرد. موجاهید لەروونکردنەوەی ئایەی قورئان کەدەفەرمێت: حیکمەت و زانستمان پێ بەخشی، دەڵێت: ئاوز و زانست، پێش پێغەمبەری بوو.

کاتێك گەیشتە تەمەنی خۆی، خانەخوێکەی، راعیل ژنی ئەتفیر، ئەوی لەخۆی نزیك کردەوە و دەرگاکانی بەست و وەك دەڵێن، تایبەتمەندییە چاکەکانی یوسفی بژارد بۆ ئەوەی ئارەزووی ببزوێنێت.

لەسەدی دەگێڕنەوە: راعیل پێی وت:

یوسف، قژت چەندە جوانە.

یوسف وتی: یەکەم شتە لەجەستەی من هەڵدەوەرێت.

وتی: چاوەکانت چەندە جوانە.

وتی: یەکەم ئەندامی جەستەمە دەکەوێتە سەر خاك.

وتی: روخسارت چەندە جوانە.

وتی: خاك دەیخوات.

بەردەوام دەیوت تا ئەوەی ئارەزوومەندی خۆی کرد و مەبەستی نزیك

بوونەوەیان کرد. ڕۆشتنە ناو ماڵەکە و ژن دەرگاکانی داخست و یوسف ویستی دۆخینەکەی خۆی بکاتەوە، بەڵام روخساری یەعقوبی بینی کەوەستا بوو و پەنجەی بەدیان دەگەست و دەیوت: یوسف، لێی نزیك مەکەوەرەوە چوونکە کەسێکی وەك تۆتا لەژنان نزیك نەکەوێتەوە، وەك باڵندەی ئاسمانە وکەس هێزی ئەوی نییە. کاتێك لێی نزیك کەوتیتەوە، وەك باڵندەیەکیت دەکەوێتە سەرزەوی و ناتوانێت بەرگری لەخۆی بکات. کەسێکی وەك تۆ تا لەژنان نزیك نەبۆتەوە وەك گایەکی بەهێزە کەکاریان لێ نەکێشابێتەوە، بەڵام کاتێك نزیك بوویتەوە، وەك گایەك دەبیت کەبمرێت و مێرووەکان بڕۆنە ناو ڕەگ و ریشەی شاخەکانی و نەتوانێت بەرگری لەخۆی بکات. یوسف دۆخینەکەی بەستەوە و بەخێرایی ڕۆشت. راعیل خۆی پێگەیاند و پشتی کراسەکەی گرت و دڕاندی و لەجەستەی داکەنرا. یوسف بۆ لای دەرگاکە رایدەکرد.

لەکوڕی عەباسیان پرسی داستانی یوسف لەگەڵ راعیل تا کوێ درێژەی کێشا، وتی: راعیل خەوت و یوسف لەنێوان قاچەکانی دانیشت و دەستی بەداکەندنی جلەکانی کرد.

خواوەند مەبەستی ئەوکارەی لەسەری یوسف دوور خستەوە و بەڵگە و بورهانی خۆی نیشاندا. بەشێوەیەك دەستەیەك وتوویانە، بەڵگە و بورهانی خوا، وێنەی یەعقوبە کەپەنجەی خۆی دەگەست.

دەستەیەکی دیکە وتوویانە، لەسوچێکی ماڵەکەوە دەنگێك بەرزبوویەوە کەئایا زینا دەکەیت تا ببیتە ئەو باڵندەی کەپەڕەکانی هەڵوەرێت و بێ پەڕ بمێنێتەوە؟ دەستەیەکی دیکە وتوویانە: لەسەر دیوارەکە نوسراوێکی بینی: ولا تقربوا الزنا انه کان فاحشة و ساء سبیلا. واتاکەی: لەزینا نزیك مەبنەوە چوونکە کارێکی نەشیاو و قێزەونە.

کاتێك نیشانەکانی خواوەندی بینی، هەستا و بۆ لای دەرگاکە رایکرد تا لەمەبەستە خراپەکەی دوور بکەوێتەوە. راعیل بەدوایدا هات وپێش ئەوەی لەدەرگاکە بڕواتەدەر، خۆی پێگەیاند و کراسەکەی لەپشتەوە گرت و دڕاندی. لەو کاتەدا عەزیزی میسریان لەبەر دەرگاکە بینی (هاوسەری راعیل) کە لەگەڵ کوڕە

پوورەکەی دانیشتووە. ژنەکەی وتی: سزای ئەو کەسەی مەبەستی خراپی بەرابەر بەبنەماڵەکەی تۆ هەبێت، ئەوەیە بخرێتە زیندان یا ئازابێکی قورس ببینێت. یوسف دەیویست دەستدرێژی بکاتەسەر من، بەڵام ئەوم لەخۆم دوورخستەوە و کراسەکەیم دڕاند.

یوسف وتی: ئەو دەیویست و من رازی نەبووم و هەڵاتم. خۆی بەمن گەیاند و کراسەکەی دڕاندم.

کوڕی مامی راحیل وتی: ئەم درۆیە، بەکراسەکە ئاشکرا دەبێت. ئەگەر لەپێشەوە دڕابێت، ژنەکە راست دەکات و یوسف درۆزنە و ئەگەر کراسەکە لەپشتەوە دڕابێت، ژن درۆزنە و یوسف راست دەکات.

کاتێك کراسەکەیان هێنا و بینی لەپشتەوە دڕا، بەوتەی قورئان دەڵێت:

(( انه من کید کن ان کید کن عظیم. یوسف اعرض عن هذاو استغفری لذنبك انك کنت من الخاطبین.

واتاکەی: ئەمە فریوی ئێوەیە کەفریوەکەی ئێوە گەورەیە. یوسف چاوپۆشی لەمە بکە و ئەی ژن، داوای لێخۆش بوون لەگوناحەکەی خۆت بکە چوونکە تاوانباریت.))

لەنوق شامی دەگێڕنەوە: یوسف نەیویست هیچ بڵێت تا ئەو کاتەی ژنەکە وتی: سزای ئەو کەسەی مەبەستی خراپی بەرابەر بەکەسانی خۆی هەبێت، ئەوەیە بخرێتە زیندان یا ئازابێکی قورس بکێشێت.

یوسف تووڕە بوو و وتی: ئەو مەبەستی منی کرد.

سەبارەت بەو شایەتی کە لەکەسەکانی ژنەکە بوو و شایەتیدا، بۆچوونەکان جیاوازن. دەستەیەك دەڵێن: کوڕە پووری راعیل  ودەستەیەکی دیکە دەڵێن: مناڵێکی ناو لانکە بوو.

لەکوری عەباس دەگێڕنەوە: پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: چوار کەس لەمناڵیدا قسەیان کرد کەشایەتەکەی یوسف یەکێکە لەوان.

دەڵێن: شایەت، دڕانی کراسەکەی یوسف بوو.

موجاهید سەبارەت بەوتاری خواوەند کەدەفەرمێت، شایەتێك لەکەسەکانی

ژنەکە، شایەتیدا، دەڵێت: کراسەکە لەپشتەوە دڕا بوو و ئەمە خۆی شایەت بوو. کاتێك هاوسەری ژنەکە بینی، کراسەکە لەپشتەوە دڕاوە، بەهاوسەکەری خۆی وت: ئەمە لەفریوی ئێوەیە و فریوی ئێوەی ژن گەورەیە. دواتر بەیوسفی وت: لەدووبارە کردنەوەی ئەم قسە چاوبپۆشە کەتۆی لەخۆی نزیك کردەوە و لای کەس باسی مەکە. بەهاوسەرەکەی خۆی وت: داوای لێخۆشبوون بۆ گوناحەکەی خۆت بکە چوونکە تاوانبار تۆیت.

ژنانی میسر لەبەسەرهاتی ژنی عەزیزی میسر و یوسف ئاگادار بوونەوە و قسەیان لەوبارەوە کرد. ئەم ڕووداوە بەنهێنی نەمایەوە و وتیان: ژنی عەزیز داوای نزیك بوونەوەی لەنۆکەرەکەی خۆی کردووە و دەستی خۆشەویستی بۆ درێژ کردووە. کاتێك ژنی عەزیز ئەم قسانەی بیست، ئەوانی بانگێشت کرد و بەزمێکی ڕازاندەوە. پشتیەکانیان دانا و پاڵیان پێوەدا و کاتێك هاتن، خواردن و خواردنەوەی لەبەردەم دانان. میوەی بۆ دانان و کێرد بۆ قاش کردنی میوەکان.

درێژەی داستانەکە لەگێڕانەوەی موجاهید لەکوڕی عەباس ئاماژەی پێدراوە: ژنی عەزیز ئەم کارەی کرد و یوسفی لەدەرەوە دانا بوو. پێی وت تا بێتە ناو ژنەکان. یوسف هات و کاتێك ئەویان بینی، شەیدایی بون و دەستی خۆیان بەکێردەکان بڕی و گومانیان کرد میوە قاش دەکەن. وتیان: ئەمە مرۆڤ نییە، بەڵکو فریشتەیەکەی گەورەیە.

کاتێك بەمە کۆتایی هات و بەیەك بینین، دەستی خۆیان بڕی و ئاوزیان لەدەستدا و زانیان سەبارەت بەژنی عەزیز لەهەڵەدا بوون، وتی: ئەمە ئەو کەسەیە، سەبارەت بەو سەرکۆنەی من دەکەن. من ئەوم لەخۆم نزیك کردەوە، بەڵام ئەو دوای ئەوەی دۆخینەکەی خۆی کردەوە، خۆی بەدوور گرت.

دواتر بەوانی وت: ئەگەر ئەوەی دەیڵێم، ئەنجامی نەدات، دەڕواتە زیندان و ڕیسوا دەبێت. یوسف زیندانی هەڵبژارد تا ئەوەی گوناحی خوایی ئەنجام بدات. وتی: پەروەردگارا، زیندان، لەوەی داوای دەکەن، زۆر باشترە. داوای هاوکاری لەخواوەند کرد و وتی: پەروەردگارا، ئەگەر فریوی ئەوان لەمن دوور نەخەیتەوە، دەستەمۆیان دەبم و دەبمە یەکێك لەنەزانەکان. خواوەند ئاگاداری کردەوە

کەدۆعاکەی گیرا کردووە و فریوەکەیانی بەتاڵ کردۆتەوە و ئەوی لەئەنجامدانی گوناح دوور خستۆتەوە.

عەزیز، دوای ئەوەی دڕانی کراسەکەی و برینی دەستی ژنانی بینی و بێ گوناحی یوسفی بۆ سەلمێنرا، بۆچوونەکەی گۆڕا.

دەڵێن: هۆکاری گۆڕانی بۆچونی عەزیز ئەوە بوو کەراعیل، هاوسەرەکەی، پێی وت: ئەم کۆیلە عیبرانییە منی لەناو خەڵکان ریسوا کردووە وبەوان دەڵێت: من داوای نزیك بوونەوەم لێکردووە و من دەرفەتی قسە کردن و بەڵگە هێنانەوەم نییە، یا رێگەی ڕۆشتن بەمن بدە تا بەڵگەکانی خۆم باس بکە، یا ئەویش وەك من بخەرە زیندان.

خواوەند فەرمووی: دوای ئەوەی نیشانەکانیان بینی، بڕیاریاندا، بۆ ماوەیەك زیندانی بکەن.

دەڵێت: بۆ ماوەی حەوت ساڵ لەزینداندا مایەوە.

عێکرمە لەروونکردنەوەی (تا ماوەیەك) کە لەقورئاندا ئاماژەی پێدراوە، دەڵێت: یانی حەوت ساڵ.

کاتێك عەزیزی میسر یوسفی خستە زیندان، دووان لەخزمەتکارانی شا، فەرمانڕەوایی گەورەی میسر، وەلید کوڕی رەیان، لەگەڵ ئەو زیندانی کران. یەکیان لێپرسراوی خواردنی شا وئەوی دیکەیان شەرابداری پاشا بوو.

لەسەدی دەگێڕنەوە: شا لەنانەواکەی خۆی توڕە و ئەوی ڕەوانەی زیندان کرد. چوونکە بیستبووی دەیەوێت خواردنەکانی شا ژەهراوی بکات و شەرابداری بۆیە خستە زیندان چوونکە گومانی دەکرد هاودەستی نانەوایە و خواوەند دەفەرمێت: دوو گەنج لەگەڵ ئەو زیندانی کران.

کاتێك یوسف ڕۆشتە زیندان، وەك لەگێڕانەوەی سەدیدا ئاماژەی پێدراوە، وتی: دەتوانم، لێکدانەوە بۆ خەوەکان بکەم. یەکێك لەو دوگەنجە وتی: با ئەم کۆیلە عیبرانییە تاقی بکەینەوە. بێ ئەوەی خەویان بینیبێت، پرسیاریان لێکرد.

نانەوا وتی: (( انی ارانی احمل فوق راسی خبزا یأکل الطیر منه و قال الآخر انی ارانی اعصر خمرا نبئنا بتاویله انا نراك من المحسنین.

واتاکەی: خەوم بینی لەسەر سەرم نان دەبرم و مەلەکان لێی دەخۆن. ئەوی دیکەیان وتی: لەخەودا بینیم ترێ دەگووشم. لێکدانەوەی خەوەکانی ئێمە بکە چوونکە تۆ بەکەسێکی چاکەکار دەبینین.))

دەگێڕنەوە: لەزوحاکیان پرسی: مانای وتاری خواوەند کەدەفەرمێت: تۆ لەچاکەکاران دەبینین، چییە؟ وتی: کاتێك کەسێك لەزیندان نەخۆش دەکەوت، یوسف پەرەستاری لێدەکرد و ئەگەر نیازمەند بوایە، شتێکی بۆ کۆدەکردەوە. ئەگەر جێگەی کەسێك تەنگ دەبوو، شوێنی بۆ ئاوەلاٚ دەکرد. یوسف بەوانی وت: پێش ئەوەی خواردنتان بۆ بێنن تا بیخۆن، لێکدانەوە بۆ خەوەکەی ئێوە دەکەم. یوسف نەیویست، لەلێکدانەوەکەی خۆی ئاگاداریان بکاتەوە لەبەر ئەوەی وەلاٚم بۆ یەکێکیان ناخۆش بوو، وتی: ئەی هاورێیانی زیندان،ئایا خوا زۆرەکان باشترن، یا خوای تاق و تەنیا. ناوی یەکێك لەگەنجە زیندانییەکان موحەلیب بوو. ئەو بوو دەیووت لەسەر سەری خۆی نانی بینیوە. ناوی ئەوی دیکەیان بەنو بوو. ئەو دەیوت خەوی بینیوە کەترێ دەگوشێت. دوو زیندانییەکە پێداگریان کرد تا یوسف وتی: یەکیان شەراب بەخاوەنەکەی دەدات یانی ئەو کەسەی بینیبووی، شەراب دەگووشێت و ئەوی دیکەتان لەدار دەدرێت و مەلەکان سەری ئەو دەخۆن.

کاتێك لێکدانەوەی خەوەکەی بۆ کردن، وتیان: ئێمە خەومان نەبینیوە.

لەگێڕانەوەی عەبدالله‌دا هاتووە: دوو گەنجە زیندانییەکە ڕۆشتنە لای یوسف و خەوێکیان دروست کردبوو تا یوسفی پێ تاقی بکەنەوە. کاتێك لێکدانەوەی بۆ خەوەکەی ئەوان کرد، وتیان: ئێمە گاڵتەمان کرد.

وتی: کارێکە بڕیاری لەسەر دراوە.

دواتر بەبنوی وت: لای پاشاکەی خۆت ناوی من ببە و پێی بڵێ بەستەم منیان زیندانی کردووە. شەیتان ڕێگەی بیرهێنانەوی یوسفی لەبنو گرت.

لەگێڕانەوەی مالك کوڕی دیناردا هاتووە: کاتێك یوسف بەساقی وت: من بیری پاشا بخەرەوە، وەحی هات ئەی یوسف ئایا کەسێکی دیکە جگە لەمن دەکەیتە پشتیوان؟ ماوەی مانەوەی تۆ لەزیندان درێژ دەکەمەوە.

یوسف گریا و وتی: پەروەردگارا، بەلاٚی فراوان دڵی منی گیرۆدەی فەرامۆشی

کرد و قسەیەکم هێنایە سەرزمان.

عێکرەمە لەپێغەمبەر دەگێڕێتەوە: ئەگەر یوسف ئەو قسەی نەدەهێنایە سەرزمان و جگە لەخوا داوای هاوکاری لەکەس نەدەکرد، ئەو ماوە درێژە لەزیندان نەدەمایەوە.

لەوەهب دەگێڕنەوە: ئەییووب، بۆ ماوەی حەوت ساڵ بەڵای بەسەردا باری، یوسف حەوت ساڵ لەزینداندا بوو، بەخت نەصر بۆ ماوەی حەوت ساڵ ئازاری کێشا و حەوت ساڵ لەناو دڕندەکان بوو.

شای میسری خەوێکی بینی و ترسا.

لەسەدی دەگێڕنەوە: خەونێکی ترسێنەری نیشانی پاشای میسردا، حەوت مانگای قەڵەوی بینی کەحەوت لاغر ئەوانیان خوارد وحەوت لاسکی سەوز و حەوتی وشك. جادوگەر و کاهین و ئەستێرە ناسانی کۆکردەوە و خەوەکەی خۆی بۆ باس کردن.

وتیان: خەوی پەرێشانە وئێمە ناتوانین لێکدانەوە بۆ خەوە پەرێشانەکان بکەین.

ئەو گەنجەی لەزیندان رزگاری بوو، یانی بنو، دوای ماوەیەك لەبیر کردن، بیری یوسف کەوتەوە و وتی: من لێکدانەوە بۆ خەوەکەی ئێوە دەکەم، ڕەوانەم بکەن. ئەویان ڕەوانە کرد و ڕۆشتە لای یوسف و وتی: ئەی راستگۆ، سەبارەت بەحەوت مانگای قەڵەو کەحەوت لاغری بیخۆن و حەوت لاسکی سەوز و حەوتی وشك، بۆچونی خۆت بڵێ چوونکە پاشا ئەم خەوەی بینیوە.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە کەزیندان لەشاردا نەبوو. ساقی ڕۆشتە لای یوسف و وتی: سەبارەت بەحەوت مانگای قەڵەو بۆچوونی خۆت بڵێ.

لەقتادە دەگێڕنەوە: حەوت مانگای قەڵەو، حەوت ساڵ بەبەرەکەت ومانگا لەڕەکان، ساڵە وشك وبێ بەرەکەتەکان. حەوت لاسکە سەوزەکە و حەوتەکەی دیکە، وشکە ساڵییە بەبەرەکەتەکان و ساڵ بێ بەرەکەت وبێ بەرهەمەکان بوو. کاتێك یوسف لێکدانەوەی بۆ خەوەکە کرد، ساقی بۆ لای پاشا گەڕایەوە و لەلێکدانەوەکەی یوسف ئاگاداری کردەوە. پاشا زانی کەوتارەکەی راستە، وتی:

یوسف بۆ لای من بێنن. کاتێك نێردراو هات و ویستی یوسف بۆ لای پاشا ببات، یوسف وتی: بۆ لای پاشا بگەڕێرەوە و بپرسە: چیرۆکی ئەو ژنانەی دەستی خۆیان بڕی، چیبوو چوونکە پەروەردگاری من لەفریوی ئەوان ئاگادارە.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: ئەگەر یوسف ئەو ڕۆژە وپێش ئەوەی پاشا لە بەسەرهاتەکەی خۆی ئاگادار بکاتەوە، لەزیندان دەهاتەدەر، بەردەوام لەمێشکی عەزیزدا دەمایەوە و دەیوت: ئەمە ئەو کەسەیە مەبەستی خراپی لەژنەکەی من کرد.

کاتێك نێردراو بۆ لای پاشا گەڕایەوە، پاشا ژنانی کۆکردەوە ووتی: داستانی ئێوە چییە کەیوسفتان لەخۆتان نزیك کردەوە. ژنان بەهەمان شێوە کە لەگێڕانەوەی سەدی ئاماژەی پێدراوە، وتیان: خوا نەکات، ئێمە هەرگیز خراپەمان لەو نەبینیوە. بەلأن ژنی عەزیزی میسر پێی وتین کەئەوی لەخۆی نزیك کردۆتەوە و لەگەڵ ئەو ڕۆشتە ناو ماڵ. ژنی عەزیز وتی: ئێستا ڕاستیەکان دەرکەوت. من داوای نزیك بوونەوەم لێکرد. یوسف ڕاستگۆیە.

یوسف وتی: ئەم هاتوچۆی نێردراوانی پاشا بۆ لای ژنانە بەو مەبەستە بوو تا گەورەی من، ئەتفیر، بزانێت کە بەئامادە نەبوونی خۆی، خیانەتم لەهاوسەرەکەی ڕاعیل نەکردووە و خوا فریوی فریوکاران ڕێنوێنی ناکات.

کاتێك پاشا حاڵ و ئەمانەتی یوسفی زانی، وتی بیهێنن تا بیکەمە یەکێك لەکەسە نزیکەکانی خۆم. کاتێك هات و قسەی لەگەڵ کرد، وتی: تۆ چیتر لای ئێمە ئەمین و خاوەن هێزیت.

یوسف بەپاشای وت: خەزێنەکانی ئەم سەرزەمینە بەمن بسپێرە.

لەیونس دەگێڕنەوە: فیرعەون، جگە لەهەماری خواردنەکان، چەندین خەزێنەی دیکەی هەبوو و هەموی بەدەستی یوسف سپارد. هەروەها یوسفی وەك لێپرسراوی کاروباری تایبەت بەداوەری دەستنیشان کرد و بڕیارەکانی جێبەجێ دەکران.

لەکوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە: کاتێك یوسف بەپاشای وت: خەزێنەکانی ئەم سەرزەمینە بەمن بسپێرە. پاشا وتی: سپاردم. وەك دەڵێن: کارەکانی ئەتفیری بەو

سپارد و ئەتفیری لەسەر کار لابرد.. خواوەند دەفەرمێت: ((و كذالك مكنا ليوسف فی الارض يتبوا منها حيث يشاء نصيب برحمتنا من نشاء و لا نضيع اجر المحسنين.

واتاکەی: بەمشێوەیە، لەو سەرەزەمینە دەسەلأتمان بەیوسف بەخشی تا لەهەر شوێن و جیگەیەك بخوازێت، جێگیر بێت. بەخششی خۆمان بەهەر کەس بوێت، دەگەیینێن و پاداشتی چاکەکاران لەبیر ناکەین.))

دەڵێت: بیستوومە: ئەتەفیر لەو شەوانەدا مرد و شا راعیلی کردە هاوسەری یوسف و کاتێك ڕۆشتنە ژوور، یوسف پێی وت: ئەمە باشتر نییە لەوەی پێشتر داوات دەکرد؟

دەڵێن، راعیل لەوەلأمدا وتی: ئەی راستگۆ، سەرکۆنەی من مەکە چوونکە ژنێك بووم، بەو هەموو جوانییە و کەڵك وەرگرتن لەماڵ و سامانەکانی دنیا، هاوسەرەکەم کاری بەژنان نەبوو. تۆ جوان روخسار بوویت و دڵم بەهەمان شێوە کەدەزانی بەسەرمدا زاڵبوو.

دەڵێن: کاتێك یوسف لێی نزیك کەوتەوە، راعیل هێشتا کچ بوو. راعیل دو کوری بۆ یوسف هێنایە دنیا بەناوەکانی ئەفراییم و مەشا.

لەگێرانەوەی سەدیدا هاتووە: یوسف چاودێری کاروباری بازرگانی میسری دەکرد و مانای وتاری خواوەند کەدەفەرمێت: ((و كذلك مكنا ليوسف فی الارض يتبوا منها حيث يشاء.

واتاکەی: بەمشێوەیە لەو سەرزەمینە هێز و دەسەلأتمان بەیوسف بەخشی تا لەهەر شوێنێك دەخوازێت، جێگیر بێت.)) ئەمەیە.

کاتێك پاشا، خەزێنەکانی میسری بەیوسف سپارد، وتی: بەرهەمی ساڵە بەبەرەکەتەکان هەڵبگرن و دوای ئەم سالانە، وشکەساڵی وبیٚ بەرهەمی بڵاو بوویەوە و دیاری فەلەستین هەروەك شوێنەکانی دیکە گرفتاری ئەم بەلأیە بوو و بنەماڵەی یەعقوبیش ڕەنجی زۆریان پێبڕا.

بەهەمان شێوە کە لەگێرانەوەی سەدی ئاماژەی پێدراوە، یەعقوب مناڵەکانی

خۆی ڕەوانەی میسر کرد و بنیامین برای یوسفی لای خۆی هێشتەوە و کاتێك کوڕەکانی یەعقوب ڕۆشتنە لای یوسف، ئەوانی ناسییەوە بەڵام ئەوانی یوسفیان نەناسییەوە. کاتێك ئەوانی بینی، وتی: بۆ چ مەبەستێك هاتوون. ئاگادارم بکەنەوە چوونکە ئێوە دەناسم.

وتیان: دەستەیەك لەخەڵکانی شامین.

وتی: بۆچی بۆ ئێرە هاتوون؟

وتیان: هاتووین، خواردن و توێشو ببەین.

وتی: درۆ دەکەن، ئێوە سیخوڕن، چەند کەسن؟

وتیان: دەکەس.

وتی: ئێوە دەهەزار کەسن. هەر یەکێك بەرابەر بەهەزار کەس، داستانی خۆتان باس بکەن.

وتیان: براین و منداڵی پیاوێکی راستگۆ. ئێمە دوانزە کەس بووین و باوکمان برایەکی زیاتر لەهەموان خۆش دەویست. ئەو لەگەڵ ئێمە بۆ سارا هات و لەوێ کوژرا. ئەولای باوکم، لەهەمووان ئازیزتر و نازدارتر بوو.

وتی: دوای ئەو، باوکتان، کێی زیاتر لەهەمووان خۆش دەویست؟

وتیان: برایەکی بچوکی ئەو برایەمان.

وتی:چۆن دەڵێن باوکتان راستگۆیە و ئەو لەجێگەی براگەورەکە، برابچوکەکەی خۆش دەوێت. برا بچوکەکتان بێنن، تا بیبینم و ئەگەر نەیهێنن، لای من هیچتان دەست ناکەوێت.

وتیان: لەگەڵ باوکمان قسە دەکەین.

وتی: یەکتان وەك بارمتە بمێنێتەوە و بڕۆن. ئەوان شەمعونیان وەك بارمتە دانا.

لەکوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە: کاتێك یوسف سەختی و ڕەنجی خەڵکی بینی، بەشێوەیەکی بەرابەر سەیری کردن و زیاتر لەباری یەك وشتری بەکەس نەدا. کەس نەیدەتوانی باری دو وشتر وەربگرێت بەشێوەیەکی بەرابەر بەهەموانی بەخشی. براکانی وەك کەسانی دیکە هاتن تا لەمیسر خواردن و توێشوو

وەربگرن، یوسف ئەوانی ناسیەوە، فەرمانیدا تا یەکی باری وشترێك بەبراکانی بدەن وپێی وتن: براکەتان بێنن، تا باری وشترێکیش بەو بدەم و بارێکی زیاترتان بردبێتەوە مەگەر نابینن بەپێوانە بەخەڵکان دەبەخشم و بەکەس کەم نادەم. ئەگەر براکەی خۆتان نەهێنن، لای من هیچتان دەست ناکەوێت و لەسەرزەمینەکەی من برۆن. بەکەسانی خۆی وت کەلێپرسراوی دابەش کردنی خواردنییەکان بوون: کالآکانیان کە بۆ بەهای خواردنەکان هێناویانە، بیخە ناو بارەکانیان.

لەقتادە دەگێڕنەوە: یوسف وتی: کالآکانیان ((کەزیو بو) بخەنە ناو بارەکانیان. ئەو کارەیان کرد وبراکانی یوسف نەیانزانی.

کاتێك کوڕەکانی یەعقوب گەڕانەوە، بەهەمان شێوە کە لەگێڕانەوەی سەدیدا هاتووە، بەباوکی خۆیان وت:

باوکە، پاشای میسر ڕێزی لێگرتین، بەشێوەیەك ئەگەر یەکێك لەکوڕەکانی یەعقوب دەبوو، ئەو کارەی لەگەڵ نەدەکردین. شەمعونی بەبارمتە وەرگرت ووتی: براکەتان دوای مەرگی براکەیترتان، لای باوکتان خۆشەویستە، بهێنن چوونکە ئەگەر نەیهێنن، هیچ شتێك لەمنەوە بەئێوە ناگات.

یەعقوب وتی: ((هل آمنکم علیه الاکما امنتکم علی اخیه من قبل فالله خیر حافظا و هو ارحم الراحمین.

واتاکەی: مەگەر دەتوانم ئێوە بکەمە ئەمینی ئەو، هاوشێوەی ئەوەی لەسەر براکەی ئێوەم کردە ئەمین. پاراستنی خوا باشترە چوونکە خۆی ڕەحیمی ڕەحیمەکانە.))

بەکوڕەکانی خۆی وت: کاتێك ڕۆشتنە لای پاشای میسر، لەلایەن منەوە سلآوی بگەیێنن و بڵێن، باوکمان درود و سلآوت بۆ دەنێرێت و دۆعای بۆ کردیت کەرێزت لەئێمە گرت.

لەکوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە: براکانی یوسف بۆ لای باوکیان گەڕانەوە وشوێنەکەیان وەك دەستەیەك لەزاناکان باسی دەکەن، لەعەرەباتی فەلەستین لەچاڵاییەکانی شامدایە و دەستەیەکی دیکە وتوویانە لەئەولاج لەناوچەی شەغب، خوارتر لەحەمسی فەلەستینە. یەعقوب بیابان نشین بوو و وشتر و مەڕی بەخێو

دەکرد. کاتێك گەڕانەوە و وتیان: بەهەرکام لەئێمە زیاتر لەیەك وشتر باریان نەدا، براکەمان ڕەوانە بکە تا باری خۆی وەربگرێت و ئێمە پارێزگاری لیَ دەکەین.

کاتێك کوڕەکانی یەعقوب بارەکانی خۆیانیان کردەوە و بەهای خواردنەکەیان لەناو بارەکەدا بینی، بەباوکیان وت:

(( یا ابانا ما نبغی، هذة بضاعتنا ردت الیناو نمیر اهلنا و نحفظ اخانا و تزداد کیل بعیر.

واتاکەی: ئەی باوکە ئیتر چیمان دەوێت. ئەمە بەهای کالآکانی ئێمەیە کەبۆیان گەڕاندوینەوە. خواردن بۆ کەسەکانی خۆمان دەهێنین وپارێزگاری لەبراکەمان دەکەین و باری وشترێك زیاتر وەردەگرین.))

یانی باری وشترێك زیاتر لەبارەکانی خۆمان وەردەگرین.

لەگێڕانەوەی کوڕی جورەحیدا هاتووە: هەرکام لەوان باری وشترێکی وەردەگرت و بەباوکیان وت: براکەمان لەگەڵ ئێمە ڕەوانە بکە تا بارێکی زیاتر وەربگرین.

لەموجاهید دەگێڕنەوە: باری وشترێك، باری کەرێك بوو و لەهەندیَ شوێن، باری کەرێك بەبەرابەر لەگەڵ باری وشترێك دادەنێنن.

یەعقوب وتی: ((لن ارسله معکم حتی توتونی موثقا من الله لتاتیننی به الا ان یحاط بکم.

واتاکەی: هەرگیز ئەو لەگەڵ ئێوەدا ڕەوانە ناکەم تا بەناوی خواوەند پەیمانێك بەمن بدەن کەدەیگەڕێننەوە بۆ من مەگەر ئەوەی ناچار بکرێن.))

کاتێك سوێندیان خوارد، یەعقوب وتی: خوا شایەتی وتارەکەی ئێمەیە.

کاتێك ڕێگەیدا براکەیان لەگەڵیان بڕوات، پێشنیاری کرد هەموویان لەدەروازەیەکی شارەکەوە نەڕۆنە ناو شارەکە تا لەچاوی پیس بەدوور بن لەبەر ئەوەی هەموویان جوان چاك بوون، وتی: لەدرگا جۆراوجۆرەکانەوە بڕۆنە ناوشار. خواوەند لەمبارەوە دەفەرمێت: ((و لما دخلوا من حیث امرهم ابوهم ما کان یغنی من الله من شیء الا حاجة فی نفس یعقوب قضاها.

یانی: کاتێك لەو شوێنەوەی باوکیان پێشنیاری پێکردن، ڕۆشتنە ناو

شارەکە، لەبەر خوا هیچ سوودێکی بەوان نەدەگەیاند تەنیا ئارەزوویەکی ناخی یەعقوب بوو، کەهێنایە دی.))

کاتێك براکان گەیشتنە لای یوسف، براکەی خۆی برد کە لەیەك دایك و باوك بوون.

لەسەدی دەگێڕنەوە: کاتێك براکان ڕۆشتنە لای یوسف، براکەی خۆی ناسیەوە و لەنزیك خۆیەوە داینیشاند. ئەوانی بۆ ماڵێکی دیکە نارد و خواردن و پۆشاکی پێدان. کاتێك شەو داهات و جێگەیان ڕاخست، وتی: جێگەی دوو برا لای یەکەوە دابخەن. کاتێك بنیامین بەتەنیا مایەوە، یوسف وتی: ئەو لەگەڵ من دەخەوێت. خەوتن و یوسف تا بەیانی بۆنی دەکرد و بەخۆیەوە دەگووشی. روبیل بەخۆی وت، ئەگەر لەمە رزگارم بێت، ئیتر هاوشێوەی ئەمە نابینم.

لەگێڕانەوەی کوڕی ئیسحاقدا هاتووە: کاتێك کوڕەکانی یەعقوب ڕۆشتنە لای یوسف، وتیان: ئەمە براکەمانە کەوتت بیهێنە و هێنامان.

یوسف وتی: کارێکی چاکتان کرد و پاداشتتان پێدەبڕێت. دواتر وتی: دەبێت ڕێز لەئێوە بگرن. بانگی میوانداری کرد و وتی: بۆ هەر دوو پیاوێك ماڵێك تەرخان بکە و ڕێز و میوانداریان بکە. دواتر بەوانی وت: بەڵام ئەم پیاوەی هێناوتانە، کەسی لەگەڵ نییە و ئەو دەبەمە لای خۆم. لەگەڵ ئەو ڕۆشتە یەك ماڵ.

ئەوانی دوو بەدوو لەناو ماڵە جیاوازەکاندا جێگە کردەوە و براکەی لەگەڵ خۆی برد. کاتێك تەنیا بوون، وتی: من برای تۆم، من یوسفم. ئەوەی لەرابردودا لەگەڵ ئێمە کردوویانە، لەدڵ مەگرە، چوونکە خوا چاکەی لەگەڵ کردین. ئەوەی لای تۆ باسم کرد، لای ئەوان باسی مەکە.

خواوەند دەفەرمێت: (و لما دخلو علی یوسف اوی الیه اخاه قال انی انا اخوك فلاتبتئس بما کانوا یعلمون.

واتاکەی: کاتێك ڕۆشتنە لای یوسف، براکەی لای خۆی جێگە کردەوە و وتی من برای تۆم و لەو کارانەی ئەنجامیانداوە، نیگەران مەبە.))

کاتێك یوسف وشتری براکانی بار کرد و کاروباری ئەوانی ڕێکخست، وتی: ...ای پێوانەی خواردنەکان لەناو باری براکەی بنیامین دابنێن. کاتێك ڕۆشتن،

یەکێك بەکاروانەکەی وت کەئێوە، دزن.

لەکوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە: بەهەر کام باری وشترێکی بەخشی هەروەها بەبنیامینی برای. دواتر وتی تا پێوانەی شایی (دەڵێن لەزیو بوو) لەناو بارەکەی بنیامین دابنێن و کاتێك لەشار دوور کەوتنەوە، فەرمانیدا بیانگرن و بیانخەنە زیندان. یەکێك هاواری کرد، ئای کاروانییەکان، ئێوە دزن. نێردراوی یوسف بەوان گەیشت و وتی: مەگەر وەك میوان ڕێزمان نەگرتن و باری تەواومان پێنەبەخشین بەشێوەیەك لەگەڵ کەسانی دیکە ئەو کارەمان نەکردووە، مەگەر ئێوەمان لەماڵی خۆمان جێگە نەکردووە؟

وتیان: بۆنا، مەگەر چی ڕوویداوە؟

وتی: پێوانەی شاییان دزیوە و کەس جگە لەئێوە، بۆ ئەم کارە تۆمەتبار نییە.

وتیان: سوێند بەخوا نەهاتووین لەم سەرزەمینە خراپەکاری بکەین و دز نین.

بەوتەی موجاهید، چوارپێی کاروانەکە هەمووی کەر بوو.

نێردراوی یوسف جاڕیدا بوو: هەرکەس پێوانەکە بگەڕێنێتەوە، یەك باری پێدەبەخشرێت. کوڕەکانی یەعقوب وتیان: ئێمە دز نین. لەبەر ئەوەی بەهای بارەکان کەجاری یەکەم یوسف بۆی گەڕاندنەوە، هێنابوویان و وتیان: ئەگەر دز دەبووین، ئەو بەهایەمان بۆ نەدەگەڕاندنەوە. دەڵێن: چوونکە ئەوان ناسرابوون بەوەی هیچ کات دەستدرێژی ناکەنە سەر سامانی کەسانیتر، ئەم قسەیان هێنایە سەرزمان.

پێیان وترا، سزای ئەو کەسەی پێوانەکەی دزیوە، چی بێت؟

وتیان: شیاوە، تەسلیم خاوەنی پێوانەکە بکرێت تا بیکاتە کۆیلەی خۆی.

خواوەند دەفەرمێت: قالوا فماجزاوه ان کنتم کاذبین؟ قالوا جزاوه من وجد فی رحله فهو جزاوه..

واتاکەی: وتیان: ئەگەر درۆتان کردبێت، سزاکەی چی بێت. وتیان سزاکەی ئەو کەسەیە کە لەبارەکەی ئەودا دەدۆزرێتەوە.

یانی: ئەو بگرن بۆ خۆتان.

یوسف باری براکانی پێش باری براکەی خۆی گەڕا و سەرئەنجام پێوانەکەی

لەناو باری براکەی دەرهێنا.

لەقتادە دەگێڕنەوە: سەیری باری هەر کەسێکی دەکرد لەوەی ئەوی ترساندبوو، داوای لێخۆشبوونی دەکرد تا ئەوەی براکەی مایەوە کە لەهەموویان بچوکتر بوو، وتی: گومانم هەیە، ئەمە شتێکی هەڵگرتبێت.

وتیان: بەو شێوەیە و ئەوبێ تاوانە. بەڵام ئەوان دەیانزانی پێوانەکەیان لەکوێ داناوە و یوسف لەناو باری براکەی دەریهێنا.

خواوەند دەفەرمێت: ثم استخرجها من وعاء اخيه كذالك كدنا ليوسف ما كان لياخذ اخاه في دين الملك.

واتاکەی: سەرئەنجام لەناو باری براکەی دەریهێنا. بەمشێوەیە رێگە چارەمان بۆ یوسف دانا چوونکە لەئایینی پاشا مافی ئەوەی نەبوو، براکەی بۆ خۆی هەڵبگرێت.

یانی لەناو یاسا و فەرمانەکانی پاشای میسردا نەبوو، دزێك لەبەر دزی بکەنە کۆیلە، بەڵام بەو رێگە چارەی خواوەند بۆی دیاری کرد، براکانی بەتەسلیم کردنی ئەو رازی بون.

موجاهید بۆ روونکردنەوەی وتاری خواوەند دەڵێت: پاشا نەیدەتوانی براکەی هەڵبگرێت مەگەر بەهۆکارێك کەخوا کار ئاسانی بۆ و یوسف بەکاری برد. براکان وتیان: ئەگەر دزی کردووە، پێشتر جارێك براکەی دزی کردووە. مەبەستیان یوسف بوو.

دەڵێن: یوسف بتێکی باوەگەورێ و دایەگەورێی دزیبوو و شکاندبووی، لەبەر ئەمە خراپەی ئەویان باس دەکرد.

لەگێڕانەوەی کوڕی ئیسحاقدا هاتووە: یوسف بتی باوەگەورێی خۆی شکاند و لەسەر رێگە فڕیدا، لەبەر ئەمە سەرکۆنەیان دەکرد.

کوڕی ئیدریس لەباوکی دەگێڕێتەوە: رۆژێك کوڕەکانی یەعقوب لەسەر سفرە بوون. یوسف ئێسقانێکی شاردەوە و بۆ ئەم کارەی سەرکۆنەیان کرد و وتیان: ئەگەر دزی کردبێت، براکەی پێشتر دزی کردووە. یوسف ئەم قسەی لەدڵ گرت و بیری کردەوە: انتم شرمكانا و الله اعلم بما تصفون.

یانی: بارودۆخی ئێوە لەوە خراپترە و بۆ ئەو داستانەی باسی دەکەن، خوا زاناترە.

واتاکەی: ئەو درۆی بۆ بنیامینی هەڵدەبەستن. بەڵام هیچی بەوان نەوت.

لەسەدی دەگێڕنەوە: کاتێك پێوانە دزراوەکەیان لەناو باری بنیامین دەرهێنا، پشتیان شکا و وتیان: ئەی کوڕانی راحیل، بەردەوام لەئێوەوە زیان بەئێمە دەگات. کەی ئەم پێوانەیەت هەڵگرت؟

بنیامین وتی: بەردەوام لە ئێوەوە زیان بەکوڕەکانی راحیل دەگات. براکەمتان برد و لەسارادا کوشتتان. ئەو کەسەی درەمەکانی خستە ناو بارەکانی ئێوە، ئەم پێوانەیشی خستە ناو بارەکەی من.

وتیان: باسی درەمەکان مەکە چوونکە سەرکۆنەی ئێمە دەکەن.

کاتێك ڕۆشتنە لای یوسف، داوای پێوانەکەی کرد. بەپەنجە لێیدا و لەگوێی خۆی نزیکی کردەوە، وتی: ئەم پێوانەیە دەڵێت، ئێوە دوانزە پیاو بوون و برایەکی خۆتان برد و فرۆشتان.

کاتێك بینامین ئەمەی بیست، هەستا و سەری بۆ یوسف دانەواند، وتی: ئەی پاشا، لەپێوانەکە بپرسە بزانە براکەم لەکوێیە؟

یوسف بەپەنجە لەپێوانەکەیدا، وتی: براکەت زیندووە وئەگەری هەیە بیبینیت.

بنیامین وتی: هەرچیی پێتخۆشە، لەگەڵ ئێمە بیکە، چوونکە ئەگەر ئاگادار ببێتەوە، رزگارم دەکات.

یوسف ڕۆشتە ژوور و گریا. دەسنوێژی گرت و هاتەدەر. بنیامین وتی: ئەی پاشا دەمەوێت لەپێوانەکە بدەیت تا بەتۆ بڵێت کێ پێوانەکەی دزی و خستیە ناو بارەکەی من.

یوسف لەپێوانەکەیدا و وتی: پێوانەکە تووڕەیە و دەڵێت، تۆ بینیت من لەناو باری کێدابووم، چۆن دەپرسی کێ منی دزیوە.

دەڵێن: کوڕەکانی یەعقوب، لەکاتی تووڕەیی مەترسیدار دەبوون. روبیل تووڕە بوو و وتی: ئەی پاشا، سوێند دەدەم بەخوا، وازمان لێ بێنیت و گەرنە

بەشێوەیەك دەقیژنم کەهەموو ژنە دوو گیانەکانی میسر، منالەکانیان لەبار بچێت. مووی جەستەی روبیل گرژ و لەجلەکانییەوە هاتبوە دەر. یوسف بەکوڕەکەی خۆی وت: لای روبیل دانیشە و دەستی لیّ بدە. بەو شێوە بوو کاتێك یەکێك لەکوڕەکانی یەعقوب توڕە دەبوو، ئەگەر یەکێکی دیکە دەستی لێدەدا، توڕەیی نەدەما.

روبیل وتی: ئەمە کێیە، سوێند بەخوا لەم شارەدا یەکێك لەمنالەکانی یەعقوب دەژیت.

یوسف وتی: یەعقوب کێیە.

روبیل توڕە بوو، وتی: ئەی پاشا، بەمشێوەیە ناوی یەعقوب مەبە چوونکە ئەو هاورێی خوا، کوڕی قوربانی خوا، کوڕی خەلیلی خوایە.

یوسف وتی: کەواتە وتەکەی تۆ راستە.

دەڵێت: کاتێك یوسف براکەی خۆی زیندانی کرد و بەپێی قسەی براکانی بەسەریدا زالّ بوو و کاتێك بینیان هیچ رێگەیەك بۆ رزگاری ئەو نییە، ویستیان شتێکی پێبدەن بۆ ئەوەی بنیامین ئازاد بکەن. وتیان:

((یا ایها العزیز ان له ابا شیخا کبیرا فخذ احدنا مکانه انا نراك من المحسنین.

واتاکەی: ئەی پاشا، ئەو باوکێکی بەتەمەنی هەیە، یەکێك لەئێمە لەجیاتی ئەو بگرە چوونکە تۆ لەچاکەکاران دەبینین.))

کاتێك یوسف بەداوای براکانی رازی نەبوو، بیّ هیوا پەنایان بۆ سوچێك برد و کەس جگە لەخۆیان لەویّ نەبوو. گەورەکەیان روبیل و بەوتەی دەستەیەك شەمعون بوو، وتی: مەگەر نازانن باوکتان پەیمان و سوێندی خوایی لێوەرگرتون تا بنیامین تەندروست بگەڕێنینەوە مەگەر ئەوەی هێزی ئەو کارەمان نەبێت. پێشتر تاوانێکتان بەرابەر بەیوسف ئەنجامداوە. خواوەند لەگێڕانەوەی وتاری ئەو دەفەرمێت: ((فلن ابرح الارض حتی یأذن لی ابی او یحکم الله لی و هو خیر الحاکمین. ارجعوا الی ابیکم فقولوا یا ابانا ان ابنك سرق و ماشهدنا الا بما علمنا و ما کنا للغیب حافظین و اسئل القریة اللتی کنافیها و العیر اللتی اقبلنا فیها انا لصادقون

قال بل سولتلكم انفسكم فصبر جميل عسى الله ان يأتينى بهم جميعا انه هو العليم الحكيم. و تولى عنهم و قال يا اسفى على يوسف و ابيضت عيناه من الحزن فهو كظيم.

واتاکەی: هەرگیز لەم سەرزەمینە ناڕۆمەدەر تا باوکم ڕێگەی ئەو کارەم پێبدات یا خوا داوەریمان بۆ بکات چوونکە باشترینی داوەرەکانە. بڕۆنە لای باوکمان و بڵێن، ئەی باوکە، کوڕەکەت دزی کرد و ئێمە جگە لەوەی دەمانزانی شایەتی نادەین چوونکە دانای غەیب نین. لەو گوندەی لەوێ بووین و لەو کاروانەی لەگەڵیان هاتین، بپرسە چوونکە ئێمە ڕاستگۆین. وتی: ((بەمشێوەیە نییە)) بەڵکو ناختان کارێکی گەورە و گرانی بەشێوەیەکی چاکە نیشانی ئێوەدا کەشیاوە بۆ خۆڕاگری و سەبر. ئەگەری هەیە خوا بۆ منی بگەڕێنێتەوە چوونکە ئەو زانای فرەزانە. پشتی کردە ئەوان و وتی ئەی هاوار بۆ یوسف و چاوەکانی لەخەم سپی و لەخەم لێوانلێو بوو.

لەگێڕانەوەکەدا هاتووە: لەحەسەنیان پرسی: حەز و ئارەزووی یەعقوب بۆ کوڕەکەی چۆن بوو، وتی: وەك حەز و ئارەزووی حەفتا ژنی منالٌ مردوو.

وتیان: پاداشتەکەی چۆن بوو؟

وتی: بەئەندازەی سەد شەهید.

دەڵێت: هیچ کات گومانی خراپی لەخوا نەکرد.

لەتەڵحە کوڕی موصریفی یامی دەگێڕنەوە: دراوسێیەك ڕۆشتە لای یەعقوب کوڕی ئیسحاق و وتی: ئەی یەعقوب، بۆ وا تێکشکاوییت؟ مەگەر لەمردن نزیك بوویتەوە؟

یەعقوب وەڵامی دایەوە: تێکشانی من لەخەمی یوسفە.

خواوەند وەحی بۆنارد: ئەی یەعقوب، لای ئافرێنراوەکەی من، سکاڵات لەمن کرد؟

یەعقوب وتی: پەروەردگارا، هەڵەم کرد، بمبەخشە.

خواوەند فەرمووی: تۆم بەخشی.

دوای ئەوە کاتێك لێیان دەپرسی، دەیوت: لەخەم و ئازاری خۆم پەنا بۆ

خواوەند دەبەم و ئەو شتانە لەخوا دەزانم کەئێوە نایزانن.

لەحەسەن دەگێڕنەوە: ڕۆشتنی یوسف لای یەعقوب تا گەڕانەوەی بۆ لای، هەشتا ساڵی خایاند و لەم ماوەدا هیچ کات خەم لێی دوور نەکەوتەوە و بەردەوام دەگریا تا ئەوەی کوێر بوو.

هەروەها دەڵێت: سوێند بەخوا کەس لەسەر زەوی ئازیزتر لەیەعقوب نەبوو.

دوای ئەوەی یەعقوب بەمناڵەکانی کە لەمیسر گەڕابوونەوە، فەرمانیدا بۆ میسر بگەڕێنەوە و هەواڵی یوسف و براکەی بۆ بێنن. خواوەند لەگێڕانەوەی وتەکانی ئەو دەفەرمێت: ((اذهبوا فتحسسوا من یوسف و اخیه و لا تیئسوا من روح الله.

واتاکەی: بڕۆن و بەدوای یوسف و براکەیدا بگەڕێن و لەبەخشینەکانی خواوەند بێ هیوا مەبن.))

ئەوان گەڕانەوە بۆ میسر و ڕۆشتنە لای یوسف، وتیان: ((ایها العزیز مسنا و اهلنا الضر و جئنا ببضاعه مزجاة فاوف لنا الکیل و تصدق علینا ان الله یجزی المتصدقین.

واتاکەی: ئەی پاشا، ئێمە و کەسەکانمان هەژار بووین و کاڵایەکی کەم بایەمان لەگەڵ خۆمان هێناوە، پێوانەی تەواومان پێبدە وبەخشینەکانی خۆت بەئێمە ببەخشە چوونکە خوا پاداشتی بەخشەران دەداتەوە.))

کاڵا کەمباییەکەیان وەك دەڵێن ڕۆن و پەشم بوو. بەوتەیەك کاڵاکەیان کەمتر بوو لەوەی پێشتر هێنابوویان و داوایان لەیوسف کرد لێیان خۆش بێت و پێوانەی تەواویان هاوشێوەی دووجاری پێشوو پێدات، وتیان: ((فاوف لنا الکیل و تصدق علینا ان الله یجزی المتصدقین.

واتاکەی: پێوانەی تەواومان پێببەخشە چوونکە خوا پاداشتی بەخشەرەان دەداتەوە.))

وەك لەگێڕانەوەی سەدی ئاماژەی پێدراوە: ئەوەی وتیان: ((خێرمان پێبکە)) یانی درەمە خراپەکان لەچاکەکان جیامەکەرەوە. بەوتەیەك مەبەستیان ئەوە بوو کەبراکەمان بۆ بگەڕێنەرەوە چوونکە خواوەند پاداشتی بەخشەران دەداتەوە.

لەکوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە: کاتێك براکانی یوسف ئەم قسەیان کرد، یوسف پەرێشان و فرمێسك لەچاوی هاتەخوار و ئەوەی دەیشاردەوە، ئاشکرای کرد و وتی: دەزانن کاتێك نەزان بوون، چ بەلایەکتان بەسەر یوسف وبراکەیدا هێنا؟ مەبەستی ئەو جیابوونەوەیە بوو کە لەکاتی خستنە ناو چاڵی یوسف، لەنێوان ئەو و براکەی دروستیان کرد.

کاتێك براکانی ئەمەیان بیست، وتیان: تۆ یوسفیت؟

یوسف وتی: من یوسفم و ئەمەیش براکەمە. خوا منەتی خستە سەر ئێمە و کۆتایی بەجیابونەوەی ئێمە هێنا. هەرکەرس خۆپارێزی بکاتە پیشە و خۆڕاگر بێت، خواوەند پاداشتی چاکەکاران لەبیر ناکات.

لەسەدی دەگێڕنەوە: کاتێك یوسف بەوانی وت: من یوسفم و ئەمەیش براکەمە. داوای لێخۆشبوونیان کرد و وتیان: خواوەند تۆی هەڵبژارد و ئێمە گوناحکارین. یوسف بەوانی وت: هیچ ترسێکتان لەسەر نییە، خوا بتانبەخشێت چوونکە لەهەمووان بەخشندەترە.

کاتێك یوسف خۆی پێناساندن، پرسیاری حاڵی باوکی کرد.

هەروەها لەسەدی دەگێڕنەوە: یوسف وتی: باوکم دوای من چی کرد؟

وتیان: کاتێك بنیامینی لەدەستدا، لەتاو خەفەت کوێر بوو.

وتی: کراسەکەی من ببەن و بیخەنە سەر روخساری تا سۆمایی چاوانی بۆ بگەڕێتەوە و هەموو کەسەکانی خۆتان بێنن بۆ لای من.

کاتێك کاروانی کوڕەکانی یەعقوب بەرێکەوت، یەعقوب وتی: ئەمە بۆنی یوسفە.

لەباوکی ئەییووبی هوزەنی دەگێڕنەوە: کاتێك یوسف کراسەکەی خۆی بۆ یەعقوب نارد، با داوای مۆڵەتی کرد پێش ئەوەی مژدەکە بەیەعقوب بدەن، بۆنی یوسفی بۆ یەعقوب برد. یەعقوب وتی: ئەگەر بەدرۆزنم نەزانن، ئەمە بۆنی یوسفە.

هەروەها لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: کاتێ کاروانەکە بەرێکەوت، یەعقوب وتی: ئەمە بۆنی یوسفە. بەهۆی هەڵکردنی با، بۆنی یوسف لەدووری هەشت رۆژ رێگە بەیەعقوب گەیشت و یەعقوب وتی: ئەگەر بەدرۆزنم نەزانن، ئەمە بۆنی

یوسفە.

حەسەن دەڵێت: بیستوومە دووری نێوان ئەوان هەشتا فەرسەخ بوو. یوسف لەسەرزەمینی میسر و یەعقوب لەسەرزەمینی کەنعان و چەندین ساڵ لەدووری ئەوان تێپەڕی کردبوو.

کوڕی جورەیەح دەڵێت: بیستوومە لەو کاتەدا دووری نێوانیان هەشتا فەرسەخ بوو کەوتی: ئەمە بۆنی یوسفە. یوسف حەفتا و حەوت ساڵ پێشتر لێی جیاببوویەوە وئەوەی کەوتی: ئەگەر بەدرۆزنم نەزانن، مەبەستی ئەوەبوو ئەگەر بەنەزانم نەزانن و بەپیری و خڵەفاوی تۆمەتبارم نەکەن.

دەستەیەک لەمناڵەکانی لەوێ ئامادە بوون، وتیان: سوێند بەخوا سەبارەت بەیوسف و خۆشەویستی ئەو، لەگومڕایی کۆندا ماویتەوە.

کاتێك مژدەدەر، یانی نێردراوی یوسف، گەیشتە لای یەعقوب، هەواڵی زیندوو بوونی یوسفی پێدا.

دەڵێت ئەو کەسەی مژدەی بەیەعقوبدا، یەهوودا بوو.

لەسەدی دەگێڕنەوە: کاتێك یوسف وتی کراسەکە ببەن و بیخەنە سەر روخساری باوکم و هەموو کەسەکانی خۆتان بێنن، یەهوودا وتی: من بووم کراسی خوێناوی تۆم بۆ باوکم برد و پێم وت گورگ، یوسفی خوارد. ئێستا خۆم کراسەکە دەبەم و دەڵێم یوسف زیندوە و خۆشحاڵی دەکەم چوونکە ئەو رۆژە خەمبارەم کرد.

ئەو کەسەی مژدەی بەیەعقوبدا، یەهوودا بوو.

کاتێك یەهوودا کراسەکەی یوسفی هێنا و خستیە سەر روخساری یەعقوب، دوای کوێری، سۆمایی چاوانی بۆ گەڕایەوە و بەمناڵەکانی خۆی وت: مەگەر بەئێوەم نەوت، من ئەو شتانە لەخوا دەزانم کەئێوە نایزانن. چوونکە ئەو لەلێکدانەوەی خەونەکەی یوسف بینیبووی یانزە ئەستێرە و مانگ و هەتاو کوڕنوشی بۆدەبەن. ئەو دەیزانی و ئەوان نەیاندەزانی.

کوڕەکانی یەعقوب پێیان وت: باوکە بۆ گوناحەکانی ئێمە داوای لێخۆش بوون بکە چوونکە تاوانبارین.

یەعقوب وتی: ئەو کارە دەکەم. دەڵێن، ئەو کارەی تا کاتی بەیانی دواخست و بەوتەیەك لەشەوی هەینی داوای بەخشینی مناڵەکانی کرد.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەوەی یەعقوب وتی داوای لێخۆشبوونتان بۆ دەکەم، لەبەر ئەوە بوو چوونکە چاوەڕوانی هەینی دەکرد.

کاتێك یەعقوب و کوڕەکانی ڕۆشتنە لای یوسف، باوك و دایکی لای خۆی دانیشاند.

دەڵێن: پێش ئەوەی بڕۆنە ناو میسر، یوسفیان بینی، چوونکە یوسف بۆ پێشوازی ئەوان لەشار ڕۆشتبوویەدەر.

لەسەدی دەگێڕنەوە: هەموو کەسەکانی خۆیانیان برد و کاتێك لەمیسر نزیك کەوتنەوە، یوسف لەگەڵ پاشا قسەی کرد و لەگەڵ پاشا پێشوازیان لێکرد. کاتێك گەیشتنە میسر، یوسف وتی: وەرنە ناومیسر کەبەخواستی خوا پارێزراون. کاتێك ڕۆشتنە لای یوسف، دایك و باوکی لای خۆی دانیشاند.

لەفەرقەدی سەبخ دەگێڕنەوە: کاتێك کراسەکەی یوسفیان خستە سەرچاوی یەعقوب، سۆمای چاوی بەدەستهێنایەوە.

یوسف وتبووی: هەموو کەسەکانی خۆتان بێنن. یەعقوب وبراکانی یوسف هاتن و کاتێك یەعقوب نزیك کەوتەوە، یوسفیان ئاگادار کردەوە کە بۆ پێشوازی کردنی لەشار ڕۆشتەدەر. خەڵکی میسر هاوڕێیەتیان کرد چوونکە ئەویان بەگەورە دەزانی. کاتێك لەیەك نزیك بوونەوە، یەعقوب پیادە و پشتی بەدەستی یەکێك لەکوڕەکانی خۆی بەستبوو. کاتێك ئەسپەکان و خەڵکی میسری بینی، بەیەهوودای وت: ئەمە فیرعەونی میسرە.

یەهوودا وتی: نا ئەوە کوڕی تۆ یوسفە.

کاتێك نزیك کەوتنەوە، یوسف ویستی سڵاوی لیٚ بکات، بەڵام ڕێگەی لێگیرا چوونکە سڵاو کردن ماف و شیاوی یەعقوب بوو، وتی: سڵاو لەتۆ ئەی خەمڕەوێن.

کاتێك ڕۆشتنە میسر، یوسف دایك و باوکی لای خۆی دانیشاند.

سەبارەت بەو کەسانەی یوسف لای خۆی لەسەر تەخت داینیشاندن، بۆچوونەکان جیاوازە. دەستەیەکیان دەڵێن: یەکیان یەعقوب و ئەوی دیکەیان دایکی یانی راحیلّ بوو و دەستەیەك دەڵێن پوورەکەی لیا بوو چوونکە دایکی پێش ئەو زەمەنە چاوی لەدینا بەستبوو.

یەعقوب و دایکی و کورەکانی کڕنوشیان بۆ برد.

لەقتادە دەگێڕنەوە: درووود و سلاّوی خەڵکان بەو شێوە بوو کەکڕنوشیان بۆ یەك دەبرد.

یوسف بەباوکی وت: باوکە، ئەمە لێکدانەوەی خەوەکەی منە و خواوەند هێنایەدی.

لەسەلمانی فارسی دەگێڕنەوە: خەوەکەی یوسف تا ئەو کاتەی خەوەکەی هاتەدی، چلّ ساڵی خایاند. دەستەیەکی دیکە وتوویانە: هەشتا ساڵی خایاند.

لەحەسەن دەگێڕنەوە: کاتێك یوسف لەیەعقوب جیابوویەوە، تا ئەوکاتەی دووبارە یەکیان بینییەوە، هەشتا ساڵی خایاند. لەم ماوەدا خەم لەیەعقوب دوور نەکەوتەوە و فرمێسك لەچاوەکانی دەباری. لەسەر زەوی کەس ئازیزتر لەیەعقوب نەبوو لای خوا.

هەروەها لەحەسەن دەگێڕنەوە، کاتێك یوسفیان خستە ناو چاڵەکە، تەمەنی حەفدە ساڵ وکاتێك یەعقوبی بینییەوە، تەمەنی هەشتا ساڵ بوو. دوای ئەوە بۆ ماوەی بیست و سێ ساڵی دیکە ژیا و کاتێك مرد تەمەنی سەد و بیست و سێ ساڵ بوو.

دەستەیەك لەشوێنکەوتەکانی کتێب ووتویانە: یوسف حەفدە ساڵان بوو کە ڕۆشتە میسر. سیانزە ساڵ لەماڵی عەزیز مایەوە و کاتێك تەمەنی گەیشت بەسی ساڵ، فیرعەون پاشای میسر وەك وەزیر دەستنیشانی کرد. ناوی فیرعەون، رەیان کوڕی وەلید کوڕی سەروان کوڕی ئەراشە کوڕی قاران کوڕی عەمرۆ کوڕی عەملاق کوڕی لاوز کوڕی سام کوڕی نوح بوو. ئەم پاشایە باوەڕی بەخوا هێنا و دوای ئەوەی مرد، قابوس کوڕی مەصعەب کوڕی معاویە کوڕی نەمیر کوڕی سەلواس کوڕی قاران کوڕی عەمرۆ کوڕی عەملاق کوڕی لاوز کوڕی سام کوڕی نوح

پاشایەتی گرتەدەست. ئەو کافر و یوسف داوای لێکرد باوەڕ بەخوا بێنێت، بەڵام ڕازی نەبوو.

تەمەنی یوسف لەکاتی مەرگ، سەد و بیست ساڵ و وەسیەتی لای یەهوودای برای کرد. جیابوونەوەی یەعقوب لەیوسف بیست و دوو ساڵی خایاند و دوای ئەوەی لەگەڵ کەسەکانی خۆی ڕۆشتە میسر، بۆ ماوەی حەفدە ساڵ لەگەڵ یوسف ژیا و کاتی مەرگ، لای یوسف وەسیەتی کرد.

یەعقوب لەگەڵ حەفتا کەس بۆ میسر بەرێکەوت و لەکاتی مەرگ بەیوسفی وت، جەستەی ببات و لای گۆڕی باکی یانی ئیسحاق بەخاکی بسپێرێت. یوسف ئەو کارەی کرد و جەستەکەی برد و لەشام بەخاکی سپارد و بۆ میسر گەڕایەوە. یوسفیش وەسیەتی کرد دوای مردنی لای باوك و باوەگەورێکانی بەخاکی بسپێرن. موسا لەکاتی هاتنەدەرە لەمیسر، تابووتەکەی ئەوی لەگەڵ خۆی برد.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: بیستوومە و خوا دەزانێت کەماوەی دووری یوسف لەیەعقوب، هەژدە ساڵ بوو.

یەعقوب لەمیسر بۆ ماوەی حەفدە ساڵ لای یوسف مایەوە. دواتر خواوەند گیانی ئەوی بۆ لای خۆی گەڕاندەوە.

دەڵێت: یوسفیان لەناو سنوقێکی مەڕمەڕی لەشوێنێك لەناو ڕووباری نیل بەخاك سپارد و دەستەیەك وتوویانە: دوای باوکی بۆ ماوەی بیست و سێ ساڵی دیکە ژیا و کاتێك مرد، تەمەنی سەد و بیست ساڵ بوو.

دەڵێت: لەتەوراتدا ئاماژە بەتەمەنی یوسف دراوە کە سەد و بیست ساڵە.

یوسف دوو کوڕی بوو: ئەفرایین و مەنشاء. ئەفراییم، نوونی هێنایە دنیا و نوون کوڕی ئەفراییم، یوشەع کوڕی نوونی هێنایە دنیا کەهاوڕێی موسا بوو. مەنشاء، موسا کوڕی مەنیشای هێنایە دنیا. بەوتەیەك موسا کوڕی مەنشاء پێش موسا کوڕی عیمران، پێغەمبەر بوو. ئەو بوو بەدوای خزردا گەڕا.

## داستانی خزر و بەسەرهاتی ئەو لەگەڵ موسا وهاورێکەی، یوشەع کوڕی نوون

ئەبوجەعفەر دەڵێت: بەوتەی زۆربەی زاناکانی شوێنکەوتەی کتێب، خزر لەدەورانی فەرەیدون پاشا کوڕی ئەسقیان بوو و بەوتەیەك لەرۆژگاری موسا کوڕی عیمران.. بەوتەیەك هاورێی زولقەرنەیین بوو کە لەرۆژگاری ئیبراهیمی خەلیل دەژیا و لەکێشەی چاڵەکە، لەبەرژەوەندی ئەو داوەری کرد. ئەمە چاڵێك بوو، ئیبراهیم لەسارای ئەردەن بۆ مەڕەکانی خۆی هەڵیکەند و دەستەیەك لەخەڵکی ئەردەن. خۆیان بەخاوەنی چاڵەکە دەزانی. ئیبراهیم داوای داوەری لەزولقەرنەیین کرد ووەك وتوویانە، لەرۆژگاری گەڕانی زولقەرنەیین لەشارەکان، خزر هاورێیەتی دەکردولەگەڵ ئەو، بەئاوی حەیات(نەمری) گەیشت و لێی خواردەوە بەلاّم نەیزانی و زولقەرنەیین و هاورێکانیشی نەیانزانی و مانەوە و بەگومانی ئەوان هێشتا زیندووە.

دەستەیەك دەڵێن: خزر، لەنەوەکانی یەکێك لەشوێنکەوتەکانی ئیبراهیمە کەباوەڕی بەخواوەند هێنابوو ولەگەڵ ئیبراهیم بۆ سەرزەمینی بابل کۆچی کرد. ناوی بەلیا کوڕی مەلەکان کوڕی فالغ کوڕی عابر کوڕی شالخ کوڕی ئەرفەخشز کوڕی سام کوڕی نوحە. دەڵێن: باوکی پاشایەکی گەورە بوو.

بەوتەی دەستەیەك، زولەقەرنەیین کە لەدەورانی ئیبراهیم دەژیا، هەمان فەرەیدون کوڕی ئەسقیانە وخزر هاورێیەتی دەکرد.

لەعەبدالله کوڕی شوەزب دەگێڕنەوە: خزر لەمناڵەکانی فارسە و ئەلیاس لەمناڵەکانی ئیسرائیلە و سالأنە لەکاتی حەج چاویان بەیەك دەکەوێت.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: بیستوومە خواوەند یەکێك لەمناڵەکانی ئیسرائیلی کردە پاشای خۆیان کەناوی ناشیە کوڕی ئەموەصە. خواوەند، خزری وەك پێغەمبەری ئەوان ڕەوانە کرد و ناوی خزر، وەك ئەوەی وەهب کوڕی مونبە

ئاماژەی پێداوە، ئەورمیا کوڕی خەلقیایە و لەنەوەکانی هارون کوڕی عیمرانە.

لەم پاشایە کە کوڕی ئیسحاق باسی دەکات، تا فەرەیدون، هەزار ساڵە.

وتەی ئەو کەسەی دەڵێت خزر لەدەورانی فەرەیدون و زولەقەرنەیین و پێش موسا کوڕی عیمرانە، راستتر بەچاو دەکەوێت. مەگەر ئەوەی بەوتاری ئەو کەسانە رازی بین کەوتوویانە: ئەو هاورێ لەگەڵ زولقەرنەیین هاورێی ئیبراهیم لەئاوی ژیانی خواردەوە و لەسەردەمی ئیبراهیم بەپێغەمبەری نەگەیشت و لەدەورانی ناشیە کوڕی ئەموەص وەك پێغەمبەر هەڵبژێردرا، چوونکە ناشیە کوڕی ئەموەص کە بەوتەی کوڕی ئیسحاق پاشای منداڵەکانی ئیسرائیل بوو، لەدەورانی یەشتاسب کوڕی لەهراسب و لەبەشتاسب تا فەرەیدوون بەئەندازەیەك دوورە کەزاناکانی بەسەرهاتی رۆژگارە کۆنەکان دەزانن و لەکاتی باس کردنی رووداوەکانی سەردەمی بەشتاسب، ئاماژەی پێدەدەین.

وتەی ئەو دەستەی دەڵێن: خزر پێش موسا کوڕی عیمران بوو لەوتەکەی کوڕی ئیسحاق کە لەوەهب کوڕی مونبە دەگێڕێتەوە، راستترە، لەبەر ئەو گێرانەوەی ئەبی کوڕی کەعب کە لەپێغەمبەری دەگێڕێتەوە و دەڵێت: هاورێی زانای موسا کوڕی عیمران کەخواوەند فەرمانی پێدا بەدوایدا بگەڕێت خزری زیندوو بوو. ئەم فەرمانە کاتێك بەمووسا درا کەگومانی دەکرد کەس لەو زاناتر نییە. پێغەمبەر(د.خ) رووداوەکانی سەردەمی رۆژگارە کۆنەکان لەهەموو کەسێك باشتر دەزانێت.

سەعید دەڵێت، بەکوڕی عەباسم وت بەگومانی نوف، خزر هاورێی موسا نەبوو، وتی: ((دوژمنی خوا درۆدەکات. چوونکە ئەبی کوڕی کەعب لەپێغەمبەر دەگێڕێتەوە کەموسا لەگەڵ منداڵەکانی ئیسرائیل قسەی کرد و گفتوگۆ لەبارەی فرەزانترین کەس کرا و موسا وتی: من. خوا سەرکۆنەی کرد و پێی وت بۆ لەهەموان خۆی بەفرەزانتر دەزانێت و فەرمووی زاناتر لەهەموو خەڵکان بەندەیەکی منە کە لەنزیك ((مجمع البحرين)) نیشتەجێیە. موسا وتی: خواوەندا، چۆن بەدوای ئەودا بگەڕێم.

فەرمووی: ماسییەك هەڵبگرە و بیخەرە ناو سەلەیەك، لەهەر شوێنێك

ماسیەکەت ون کرد، بەندەکەی من لەوێیە.

موسا ماسییەکەی هەڵگرت و خستیە ناو سەلە و بەهاورێکەی خۆی وت: کاتێك ئەم ماسییە ون بوو، پێم بڵێ. لەکەنارەکانی دەریا ڕۆشتنە پێش تا گەشتنە سەر تاشەبەردێك و موسا خەوت. ماسی لەناو سەلەکە کەوتە جووڵەجوول هاتەدەر و کەوتە ناو دەریا.

دوای لەخەو هەستانی موسا، درێژەیان بەرێگەکەیاندا و موسا بەهاورێکەی خۆی وت: خواردن بێنە چوونکە لەم سەفەرەدا گرفتاری ڕەنج بووین. موسا نەدەکەوتە ڕەنج مەگەر ئەو کاتەی سنوری فەرمانە خواییەکانی دەبەزاند. هاورێکەی پێی وت:

((ارأیت اذ آوینا الی الصخری فانی نسیت الحوت و ما انسانییە الا الشیطان ان اذکرە و اتخذ سبیلە فی البحر عجبا.

واتاکەی: ئاگاداریت کاتێك پەنامان بۆ تاشەبەردەکە برد، ماسییەکەم لەبیر کرد و جگە لەشەیتان کەس بۆ لەبیر کردن ناچاری نەکردم وباسم نەکرد و ماسییەکە لەناو دەریا رێگەی خۆی گرتەبەر.))

موسا وتی: ((ذلك ما کنا نبغ فارتدا علی آثارهما قصصا.

واتاکەی: ئەمە ئەو شتەیە بەدوایدا دەگەڕایین و بەدوای شوێنپێکانی خۆیان گەڕانەوە.))

کاتێك گەیشتنە تاشە بەردەکە، کەسێکیان بینی کەخەوتووە و جل و بەرگی لەخۆیەوە ئالاندەوە. موسا سلاوی کرد. وەلامی دایەوە: لەزەوی ئێمە سلاو دەتوانێت لەکوێ بێت.

موسا وتی: موسام.

وتی: موسای منالەکانی ئیسرائیل.

وتی: بەڵێ.

وتی: ئەی موسا، ئەو شتانە دەزانم کەخواوەند فێری کردووم و تۆ نازانیت و تۆیش ئەو شتانە دەزانی کەخواوەند فێری کردوویت و من نازانم.

موسا وتی: هاوڕێیەتی تۆ دەکەم تا ئەوەی دەیزانی، فێرم بکەیت.

وتی: ئەگەر هاوڕێیەتی منت کرد، سەبارەت بەهیچ شتێك پرسیارم لێمەکە تا خۆم قسەی لەبارەوە بکەم.

لەکەناری دەریا درێژەیان بەرێگەدا. مەلەوانێك لەکەشتییەکەدا بوو و خزری ناسیەوە. ئەوی بەخۆڕایی سوار کرد. چۆلەکەیەك هات و لەسەر لێواری کەشتییەکە نیشتەوە. نووکی لەئاوەکە دەدا. خزر بەموسای وت:

زانستی من و تۆ بەبەراوەرد لەگەڵ زانستی خواوەند بەو ئەندازەیە کەئەم چۆلەکە لەئاوی دەریا هەڵیگرت.

کاتێك لەکەشتیەکەدا بوون، موسا بینی خزر بزمارێکی دەرکێشا وتەختەیەکی دەرهێنا. موسا پێی وت: ئێمەیان بەخۆڕایی سوار کرد و تۆ کەشتیەکەی ئەوان کون دەکەیت تا خەڵکەکەی بخنکێن؟ کارێکی ناڕەوات کرد.

خزر وتی: مەگەر نەموت ناتوانیت خۆڕاگر بیت.

موسا وتی: بۆ لەبیرکردنەکەم داوای بەخشین دەکەم.

دەڵێت: ئەمە یەکەم شت بوو موسا لەبیری کرد.

دواتر ڕۆشتن و منالێکیان بینی لەگەڵ منالەکانیتر سەرقاڵی یاری کردن بوو. خزر ئەوی گرت و کوشتی.

موسا پێی وت: یەکێکت بەناحەق کوشت. کارێکی ناڕەوات کرد.

خزر وتی: مەگەر نەموت ناتوانیت خۆڕاگر بیت.

ڕۆشتن و گەیشتنە گوندێك و داوای خواردنیان لەخەڵکەکەیکرد. کەس خواردن و خواردنەوەی پێنەدان. دیوارێکیان بینی ئەوەندەی نەمابوو بڕووخێت، خزر دیوارەکەی چاك کردەوە و موسا وتی: ئەوان میوانداری ئێمەیان نەکرد و جێیان پێنەداین، ئەگەر مەبەستی ئەوەت هەیە تا لەبەرابەر ئەم کارەت چاکەت لەگەڵ بکەن.

خزر وتی: ئێستا کاتی جیابوونەوەی من و تۆیە.

دەڵێت، پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: چەندە خۆش دەبوو ئەگەر خۆڕاگری دەکرد تا هەموو داستانەکە بگێڕێتەوە.

دەگێڕنەوە: کوڕی عەباس لەگەڵ حوڕ کوڕی قەیسی فەزاری سەبارەت بەخزر گفتوگۆیان دەکرد. کوڕی کەعب لای ئەوان تێپەڕی، کوڕی عەباس بانگی کرد و وتی: من و ئەم هاورێیەم سەبارەت بەهاورێکەی موسا کەبەدوای ئەودا دەگەڕا، گفتوگۆمان دەکرد، ئایا لەپێغەمبەر هیچت سەبارەت بەو بیستووە؟

ئەبی وتی: بەڵێ. ئەم داستانەی وت.

هەروەها لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: کاتێك موسا و خەڵکەکەی بەسەر میسردا زاڵ و لەوێ نیشتەجێ بوون، خواوەند وەحی نارد: خەڵکان لەرۆژەکانی خواوەند ئاگادر بکەرەوە، موسا لەگەڵ خەڵکەکەی قسەی کرد و ئەو نیعمەت وچاکیانەی بیرخستنەوە کەخواوەند پێی بەخشیبوون و دوژمنانی ئەوانی لەناو بردبوو و بەسەر زەویدا زاڵی کردببون. وتی: خواوەند لەگەڵ موسا، پێغەمبەری(د.خ) ئێوە قسەی کرد و منی کردە کەسێکی تایبەتی خۆی و خۆشەویستی خستە دڵی من. ئێوە هەرچیتان دەویست، پێی بەخشین و پێغەمبەرەکتان باشترین خەڵکی سەرزەوییە و ئێوە خوێنەرانی تەوراتن.

یەکێك لەمناڵەکانی ئیسرائیل وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، بەو شێوەیە تۆ باسی دەکەیت، بەلاّم ئایا لەسەر زەوی کەس فرەزانتر لەتۆ نییە.

موسا وتی: نە.

خواوەند جبرەئیلی بۆ لای موسا نارد: خواوەند دەفەرمێت: تۆ چووزانی زانستی خۆم بەکێ دەبەخشم. لای دەریا پیاوێکی لێیە و لەتۆ فرەزانترە.

کوڕی عەباس دەڵێت: مەبەستی خواوەند، خزر بوو.

موسا داوای لەخوا کرد خزری نیشان بدات.

خواوەند وەحی نارد: بۆ کەنار دەریا بڕۆ، ئەگەر ماسییەکت دۆزییەوە، هەڵیگرە و بیدە بەهاورێکەی خۆت، دواتر لەکەناری دەریا ملی ڕێگە بگرە بەر و کاتێ ماسییەکەتان ون کرد، بەندەکەی من لەوێ دەبینیت.

کاتێك سەفەرەکەی موسا درێژەی کێشا، پرسیاری ماسییەکەی لەهاورێکەی خۆی کرد. هاورێکەی کەنۆکەری بوو، وتی: کاتێك لەنزیك تاشەبەردەکە دانیشتبووین، ماسییەکەم لەبیر کرد. شەیتان لەبیری بردمەوە و بەتۆم نەوت.

ماسییەکەم بینی، لەدەریادا بەرێدا دەڕۆشت.

موسا سەریسوڕما و گەڕایەوە و کاتێك گەشتە تاشەبەردەکە، ماسیەکەی بینی کەدەڕۆشتە ناو دەریا. موسا بەدوایەوە بوو و بەداردەستەکەی خۆی لەئاوی دەدا بۆ ئەوەی ماسیەکە بگرێت. ماسی دەگەشتە هەر شوێنێك لەدەریا، ئاوەکەی وشکی دەکرد و دەبوو بەبەرد. سەرئەنجام ماسی گەیشتە یەکێك لەدوورگەکانی دەریا و موسا خزری لەوێ بینی. سلاوی لێکرد و خزر وتی: سلاو لەتۆیش بێت. بەلام کەی لەم زەمینەدا سلاو هەیە، تۆ کێیت؟

وتی: موسام.

وتی: هاورێی منالەکانی ئیسرائیل.

وتی: بەلێ.

خزر بەخێرهاتنی کرد و پرسی: بۆچی بۆ ئێرە هاتوویت؟

وتی: هاتووم تا زانایی خۆت فێری من بکەیت.

وتی: تۆ ناتوانی خۆڕاگر بیت.

موسا وتی: بەخواستی خوا وەك کەسێکی خۆڕاگر دەمبینیت و بەپێچەوانەی فەرمانەکانی تۆ ناجوولێمەوە.

دەلێت، پێکەوە ڕۆشتن و خزر وتی: هەر کارێکم کرد، سەبارەت بەو کارە پرسیار لەمن مەکە تا خۆم باسی بکەم. سوار کەشتی بوون تا بگەنە وشکایی. خزر هەستا و کەشتیەکەی کون کرد. موسا وتی: کەشتیەکەت کون کرد تا خەلکەکەی لەناو ببەیت؟ بەراستی کارێکی ناڕەوات کرد.... تا کۆتایی داستانەکە.

هەروەها لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: موسا لەخواوەندی پرسی: پەروەردگارا، کام یەك لەبەندەکانت لای تۆ خۆشەویستترە.

فەرمووی: ئەو بەندەی هیچ کات من لەبیر نەکات.

وتی: کام یەك لەبەندەکانی تۆ بۆ داوەری کردن شیاوترە.

فەرمووی: ئەوەی بەراستی داوەری بکات و شوێن هەوا و هەوەسی خۆی نەکەوێت.

وتی: کام یەك لەبەندەکانی تۆ زاناترە؟

فەرمووی: ئەوەی زانستی کەسانی دیکە بەزانستی خۆی زیاد بکات. وشەیەك بەدەست بێنێت ڕێنوێنی بکات یا ڕێگەی خراپەکاری لێبگرێت.

وتی: خواوەندا، ئایا لەسەر زەوی کەسی لەمن زاناتر، هەیە؟

فەرمووی: بەڵێ.

وتی: کێیە؟

فەرمووی: خزرە.

وتی: لەکوێ بەدوایدا بگەڕێم.

فەرمووی: لای تاشە بەردێك کەماسی لەوێ رابکات.

موسا بەرێکەوت..... تا کۆتایی داستانەکە.

خزر، موسای بۆ مجمع البحرین برد کەهیچ شوێنێکی جیهان بەئەندازەی ئەوێ، ئاوی فراوانتری لێ نییە. خواوەند مەلێکی ڕەوانە کرد کە بەنووکی ئاوی لەدەریا هەڵدەگرت. خزر بەموسای وت:

ئەم مەلە چەندە ئاو هەڵدەگرێت؟

وتی: زۆر کەم.

وتی: ئەی موسا، زانستی من وتۆ بەبەراوەرد لەگەڵ زانستی خوا، هاوشێوەی ئەو ئاوەیە کە ئەم مەلە هەڵیدەگرێت. ئەم قسەی بۆ هێنایە سەرزمان چوونکە موسا گومانی کردبوو کەس زاناتر لەو نییە. کاتێك موسا ئەو قسەی کرد، فەرمانی پێدرا، بەدوای خزردا بگەڕێت.

سەعید کوڕی جوبەیر دەڵێت: لای کوڕی عەباس دانیشتبووم، دەستەیەك لەشوێنکەوتەکانی کتێب (تەورات و ئەنجیل) لەوێ بوون. یەکیان وتی: ئەی باوکی عەباس، نوف کوڕی ژنی کەعب لەکەعب دەگێڕێتەوە: موسای پێغەمبەر(د.خ) کەبەدوای پیاوی زانادا گەڕا، موسا کوڕی مەنشاء بوو.

سەعید دەڵێت: کوڕی عەباس وتی: ((نووف وا دەڵێت)) وتم: بەڵێ، بیستم نووف وای دەوت.

وتی: سەعید خۆت بیستووتە؟

وتم: بەڵێ.

وتی: نووف درۆدەکات.

دواتر کوڕی عەباس لەئەبی کوڕی کەعب گێڕایەوە: پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: موسا پێغەمبەری منداڵەکانی ئیسرائیل وتی: خواوەندا، ئەگەر لەناو بەندەکانی تۆ کەسی لەمن زاناتر هەیە، پێم بناسێنە.

خواوەند فەرمووی: بەڵێ، لەناو بەندەکانم کەسێك هەیە و لەتۆ زاناترە.

دواتر باسی شوێنەکەی کرد و مۆڵەتی پێدا تا بەدوایدا بگەڕێت. موسا لەگەڵ هاوڕێکەی خۆی بەڕێکەوت و ماسیەکی پێبوو کەپێی وترا: لەهەر شوێنێك ئەم ماسیە زیندوو بوویەوە، پیاوی زانا لەوێ دەبینیت.

موسا لەگەڵ هاوڕێکەی خۆی بەڕێکەوت و ماسیەکەیان پێبوو. ئەوەندە ڕۆشتن تا هیلاك و شەکەت بوون. گەشتنە تاشەبەردێك و ئاو. ئاوەکە ئاوی ژیان بوو کەهەر کەس لێی دەخوارد، نەدەمرد.ئەگەر شتێکی مردوو لێی نزیك دەکەوتەوە، زیندوو دەبوویەوە. کاتێك دابەزین، ماسیەکە بەئاو گەیشت و زیندوو بوویەوە و ڕۆشتە ناو دەریا.

موسا پیاوی زانای بینی. لەموسای پرسی: بۆ هاتویتە ئەم سەرزەمینە؟

وتی: هاتووم تا لەزانایی تۆ فێر ببم.

وتی: تۆ ناتوانیت خۆڕاگر بیت. خزر ئەم خاڵەی لەغەیبەوە دەزانی، زیادی کرد: چۆن بۆ کارێك زانیارییت لەسەری نییە، دەتوانی خۆڕاگر بیت؟ یانی دادپەروەری لەرووی بینینی رواڵەت. ئەوغەیبەی من دەیزانم. نایزانیت.

موسا وتی: بەخواستی خوا، خۆڕاگر و نافەرمانی تۆ ناکەم هەرچەند شتی ناپەسەند ببینم.

وتی: هیچ پرسیارێك لەمن مەکە تا خۆم باسی بکەم.

لەکەناری دەریادا رێگەیان بڕی و چاوەڕوانی کەشتی بوون. کەشتییەك هات، تازە و بەهێز کەچاکترلەو کەشتیەیان نەبینیبوو. سوار کەشتییەکە بوون و کاتێك ئارامیان گرت و کەشتی بەرێکەوت، خزر چەکوشی دەرهێنا و لەلایەکی کەشتییەکە کونێکی دروست کرد. دواتر تەختەیەکی خستەسەر و پینەی کرد.

موسا وتی: کارێك قێزەونتر لەو کارەی تۆ نەبینراوە. کەشتییەکەت کون کرد بۆ ئەوەی خەڵکەکەی لەئاودا بخنکێن. کارێکی ناڕەوات کرد، ئەوان ئێمەیان سوار کرد و لەکەشتییەکە جێگەیان کردینەوە. هاوشێوەی ئەو کەشتییە لەدەریادا نەبینراوە، بۆ کونت کرد؟

خزر وتی: مەگەر نەموت، ناتوانیت خۆڕاگر بیت.

وتی: بۆ ئەم کارەم سەرکۆنەم مەکە.

کاتێك لەکەشتییەکە دابەزین، ڕۆشتن تا گەیشتنە گوندێك. چەندین منداڵیان بینی سەرقاڵی گەمە کردن بوون. منداڵێك لەناو ئەواندا دەبینرا، جوانتر لەو نەبینراوە. خزر ئەوی گرت و بەردێکی کێشا بەسەریدا و کوشتی.

دەڵێت: موسا کارێکی ناڕەوای بینی، نەیدەتوانی بێدەنگ بێت چوونکە منداڵێکی کەم تەمەن و بێ تاوانی کوشتبوو. وتی: کەسێکی بێ گوناحت کوشت، بەراستی کارێکی نەشیاوت کرد.

خزر وتی: مەگەر نەموت ناتوانیت خۆڕاگر بیت.

موسا وتی: ئەگەر ئیتر پرسیارم کرد، هاوڕێیەتی من مەکە.

ڕۆشتن تا گەیشتنە گوندێك. خەڵکەکەی ڕێگە و جێگەیان پێنەدان. دیوارێکیان بینی ئەوەندەی نەمابوو بڕوخێت. خزر هەستا و دیوارەکەی نۆژەن کردەوە. موسا لەکارەکەی ئەو وەڕز بوو، وتی: ئەگەر دەتویست دەتوانی بۆ ئەم کارەت کرێ وەربگریت.

خزر وتی: ئێستا کاتی جیابوونەوەی من و تۆیە. بەڵام هۆکاری کارەکانم بەتۆ دەڵێم. ((السفینة فکانت لمساکین یعلمون فی البحر فاردت ان اعیبها و کان و رائهم ملك یأخذ کل سفینة غصبا. کەشتی هی ئەو هەژارانە بوو لەدەریا کاریان دەکرد. ویستم عەیبی تیا دروست بکەم چوونکە لەسەر ڕێگەیان پاشایەکی ستەمکار بوو کەدەستی بەسەر هەموو کەشتییە چاکەکاندا دەگرت. کەشتییەکەم کون کرد تا بەستەم لێیان نەستێنرێت و بەهۆی ئەو کوونەی لەکەشتییەکەدا دروستم کرد، کەشتییەکە لەدەست ئەوپاشایە ڕزگاری بوو.

((و اما الغلام فكان ابواة مؤمنين فخشينا ان يرهقهما طغيانا و كفرا. فاردنا ان يبدلهما ربهما خيرا منة زكاة و اقرب رحما. اما الجدار فكان لغلامين يتيمين فى المدينة و كان تحتة كنزلهما و كان ابوهما صالحا فاراد ربك ان يبلغا اشدهما و يستخرجا كنزهما رحمة من ربك و ما فعلتة عن امرى ذلك تأويل مالم تستطع علية صبرا. ئەو کوڕە، باوك و دایكی باوەڕدار بوون، ترسام بەسەرکێشی و حاشا کردن ناچاریان بکات و مەبەستی ئەوەمان کرد خواوەند بەکوڕێکی باشتر وچاکتر پاداشتیان بداتەوە. دیوارەکە هی دوو کوری هەتیوی ئەم شارە و گەنجێکی ئەوان لەژێر ئەو دیوارەدایە. باوکیان پیاوێکی چاکەکار بوو. خواوەند ویستی گەشە بکەن و گەنجەکەی خۆیان دەربهێنن. فەرمانەکانی خواوەندە و من ئەم کارانەم لەخۆمەوە نەکرد. ئەمەیە ناوەڕۆکی ئەو شتانەی تۆ ناتوانیت بۆ زانینیان خۆڕاگر بیت.

کوڕی عەباس دەڵێت: ئەو گەنجەی لەژێر دیوارەکەدا بوو، تەنیا زانستە.

لەگێڕانەوەی عێکرەمە ئامازەی پێدراوە کە بەکوڕی عەباسیان وت: لەمگێڕانەوەیە هیچ ئامارەیەك بەهاورێکەی موسا نەدراوە. وتی: ئەو لەئاوی ژیانی خواردەوە و نەمری بەدەست هێنا. پیاوی زانا ئەوی گرت و بەکەشتییەك بەستیەوە و لەدەریادا بەرەڵای کرد وتا ڕۆژی پەسلان بەمشێوەیە دەسووڕێتەوە لەبەر ئەوەی نەدەبوو لەئاوی ژیان بخواتەوە، بەڵام ئەو خواردی.

لەقتادە دەگێڕنەوە: کاتێك خواوەند، دەریای قەڵشت و موسای لەدەست فیرعەونییەکان رزگاری بەخشی، موسا منداڵەکانی ئیسرائیلی کۆکردەوە و قسەی لەگەڵ کردن. وتی: ئێوە باشترین و زاناترینی خەڵکانی سەرزەوین و خواوەند دوژمنی ئێوەی لەناو بردووە و دەریای بۆ قەڵشتن و تەوراتی بۆ ئێوە ڕەوانە کردووە. پێی وترا، کەسێك هەیە کە لەهەمووی ئێوە زاناترە. موسا هاوریێ لەگەڵ هاورێکەی یوشەع کوڕی نوون بەرێکەوت و ماسیەکی خوێ لێدراویان لەگەڵ خۆیان برد. پێیان وترابوو، لەهەر شوێنێك ماسییەکەتان لەبیر کرد، پیاوی زانا دەبینن. ناوی خزرە. کاتێك گەیشتن، خواوەند گیانی بەماسیەکە بەخشی و ڕۆشتە ناو دەریا. بۆ هەر شوێنێك دەڕۆشت، ئاوەکە لەجووڵە دەکەوت.

لە پێغەمبەر(د.خ) دەگێڕنەوە: بۆیە بەخزریان دەوت، خزر، چوونکە لەسەر

پێستەیەکی سپی دانیشت، پێستەکە جوولا و سەوز دەرکەوت.

لەم گێڕانەوانەی لەپێغەمبەر و زاناکان ئاماژەمان پێدا، بۆمان سەلمێنرا، خزر پێش موسا و لەدەورانی ئەودا بووە. وتاری ئەوانەی گومان دەکەن ئەو، ئەرومیا کوڕی خەلقیایە راست نییە چوونکە ئەرومیا هاوڕۆژگاری بەخت نەصرە و لەموسا تا بەخت نەصر بەئەندازەیەك دووری هەیەن کەئاسان ناتوانین دیاری بکەین. لێرەدا ئاماژەمان بەداستانی خزردا لەبەر ئەوەی بەهەمان شێوەی وتوویانە، هاوڕۆژگاری فەرەیدوونە. بەپێی ئەم گێڕانەوانەی ئامارژەمان پێدا، لەدەورانی مەنوچێهر و پاشایەتی ئەودا بووە. پێغەمبەری موسا لەدەورانی پاشایەتی مەنوچێهردا بوو کەدوای فەرەیدوون لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت. هەموو گێڕانەوە و داستانەکان لەرۆژگاری ئیبراهیم تا داستانی خزر، لەدەورانی پاشایەتی بیوراسب و فەرەیدون بوو کەپێشتر ئامارژەمان بەپاشایەتی و تەمەنی ئەواندا.

## وتار سەبارەت بە پاشایەتی مەنوچێهر و رووداوەکانی رۆژگاری ئەو

دوای فەرەیدون کوڕی ئەسقیانی مانگادار، مەنوچێهر لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت. ئەو بەیەکێك لەنەوەکانی ئیرەج کوڕی فەرەیدون دەزانن. دەستەیەك گومانیان کردووە پارس لەبەر مەنوچێهر پێی دەڵێن پارس و بەهەمان شێوە کە ڕەچەڵەك ناسە فارسەکان دەڵێن: مەنوچێهر کوڕی کیارد کوڕی مەنشخوریز کوڕی مەنشخارەیغ کوڕی ویرەك کوڕی سروشەنگ کوڕی ئەرەك کوڕی بۆتك کوڕی فروشك کوڕی زشك کوڕی فرکوزەك کوڕی کوزەك کوڕی ئیرەج کوڕی فەرەیدون کوڕی ئەسقیانی مانگادارە.

بەگومانی دەستەیەك لەئاگرپەرستەکان، فەرەیدون لەگەڵ کوشك کچی ئیرەج کوڕی خۆی خەوت و کچێکی هێنایە دنیابەناوی فروکوشك. لەگەڵ فروکوشك خەوت و کچێکی هێنایە دنیا بەناوی زوشك و لەگەڵ زوشك خەوت و کچێکی هێنایە دنیا بەناوی فرزوشك و لەگەڵ فرزوشك خەوت و کچێك چاوی بەدنیا هەڵهێنا بەناوی بیتەك و لەگەڵ بیتەك خەوت و کچێك هاتە دنیا بەناوی ئەرەك و لەگەڵ ئەرەك خەوت و ئیزەك لەدایك بو ولەگەڵ ئیزەك خەوت و ویرەك هاتەدنیا و لەگەڵ ویرەك خەوت و مەنشخەرفاغ چاوی بەدنیا هەڵهێنا لەگەڵ کچێك بەناوی مۆسحێرك و مەنشخرفاغ لەگەڵ مۆسحێرك خەوت و مەنشخرنر لەدایك بوو لەگەڵ کچێك بەناوی مەنشر ئەروك و مەنشخرنر لەگەڵ مەنشر ئەروك خەوت و مەنوچێهر چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

دەستەیەك وتوویانە: شوێنی لەدایك بوونی ئەو دۆنباوەند و بەوتەی دەستەیەك شاری رەی بوو. کاتێك لەدایك بوو، مەنشخرنر و مەنشر ئەروك ئەویان شاردەوە چوونکە لەتوج و سلەم بۆ گیانی ئەو دەترسان. کاتێك مەنوچێهر گەورە بوو، ڕۆشتە لای فەرەیدونی باوەگەورێی. فەرەیدون نیشانەکانی گەورەیی لەودا بینی و هەموو ملك و سەرزەمینەکانی ئیرەجی بەودا و تاجی پاشایەتی ئیرەجی کردەسەر.

دەستەیەك لەشوێنكەوتەكانی هەواڵ گومانیان كردووە مەنوچێهر كوڕی مەنشخرنر كوڕی ئەفریقیس كوڕی ئیسحاق كوڕی ئیبراهیمە و دوای فەرەیدون پاشایەتی گرتەدەست. كاتێك پاشایەتی گرتەدەست، هەزار و نۆسەد و بیست و دوو ساڵ لەپاشایەتی كیومەرس تێپەڕیبوو. شێعری جەریر كوڕی عەتیە وەك بەڵگە دەهێننەوە كەناوەرۆكەكەی بەمشێوەیە:

و كوڕانی ئیسحاق، شێرە نێرەكان

كە قەڵغانی مەرگ هەڵدەگرن و زرێ دەپۆشن

كاتێك ڕەچەڵەك دیاری دەكەن

سێپەهبۆد لەخۆیان دەزانن

و كەسرا و هورموزان و قەیسەریش

كتێب و پێغەمبەری لەناو ئەواندا بوو

و لەئێستەخر و شووشتەر پاشایەتیان دەكرد

ئێمە و گەورەكانی فارس لەیەك باوكین

و لەپاشماوەكەی ناترسین

باوكی ئێمە خەلیلە و خواوەند پەروەردگاری ئێمەیە

و لەنیعمەتەكانی خواوەند رازین.

بەڵام فارسەكان حاشا لەم ڕەچەڵەكە دەكەن و جگە لەنەوەكانی فەرەیدون كەس وەك پاشا ناناسن و گومان دەكەن ئەگەر لەڕۆژگاری كۆن كەسێك جگە لەوان پاشایەتی گرتبێتەدەست، بەناڕەوا ئەو كارەی كردووە.

لەهوشام كوڕی محەممەد دەگێڕنەوە: توج و سەرەم دوای ئەوەی ئیرەجی برایان كوشت، سێسەد ساڵ پاشایەتی سەرزەویان كرد. دوای ئەوان مەنوچێهر كوڕی ئیرەج كوڕی فەرەیدون بۆ ماوەی سەد وبیست ساڵ پاشایەتی كرد. دوای ئەوەی نەوەی توجی تورك هێرشی كردەسەر و لەسەرزەمینی عێراق، دەرپەڕاند و دوانزە ساڵ بەمشێوە بوو. دواتر مەنوچێهر بەسەریدا سەركەوت و ئەوی لەسنورەكانی پاشایەتی خۆی دەرپەڕاند و بۆ ماوەی بیست و حەوت ساڵی دیكە پاشایەتی گرتەدەست.

مەنوچێهر دادپەروەر و چاکەکار بوو. یەکەم کەس بوو نەریتی کوێخای دانا. بۆ هەر گوندێك دێدارێکی دیاری کرد و خەڵکانی کردە بەندەی ئەو. جل و بەرگی بەندەکانی پێ پۆشین و بۆ فەرمان بردن ناچاری کردن.

دەڵێن: موسا کوڕی عیمران لەشەستەمین ساڵی پاشایەتی مەنوچێهر دەرکەوت.

لەهوشام دەگێڕنەوە: ئەو ڕۆژەی مەنوچێهر پاشایەتی گرتەدەست و تاجی لەسەرنا، وتی: ئێمە هێز بەشەڕکەرانی خۆمان دەبەخشین و بۆ تۆڵەی باوەگەورێکان و لەناو بردنی دوژمن ئامادەین. بەمەبەستی تۆڵەسەندنەوەی باوەگەورێی خۆی ئیرەج کوڕی فەرەیدون ڕووی لەسەرزەمینی تورکەکان کرد و توج کوڕی فەرەیدون و سەلەمی برای توجی کوشت و تۆڵەی سەند و گەڕایەوە.

ئەفراسیاب کوڕی فشەنگ کوڕی ڕۆستەم کوڕی تورك کەرەچەڵەکی تورکەکان بۆ ئەو دەگەڕێتەوە، کوڕی شەهراسب و بەوتەیەك کوڕی ئەرشەسب کوڕی توج کوڕی فەرەیدون و بەوتەیەك کوڕی فشەنگ کوڕی راشمین، شەست ساڵ دوای کوژرانی توج و سەرەم، شەڕی لەگەڵ مەنوچێهر کرد و لەتەبەرستان گەمارۆیدا.

ئەفراسیاب و مەنوچێهر ئاشتیان کرد کەتیری یەکێك لەپیاوەکانی مەنوچێر بەناوی ئەرشسیاتیر بەهەر کوێ بگات، تا ئەو شوێنە سنوری فەرمانڕەوایەتی مەنوچێهر بێت و بەزاندنی ئەو سنورە بەڕەوا نەزانن.

دەستەیەك ئەم ناوەیان کورت کردۆتەوە و دەڵێن: ئیرەش (ئارەش). ئەرشسیاتیر تیری خستە کەوان وبەرەڵای کرد. تیرەکەی لەتەبەرەستان تا ڕووباری بەڵخ گەیشت و لەوێ کەوتەخوار. ڕووباری بەڵخ بوو بەسنوری تورکەکان، کوڕەکانی توج و کوڕەکانی ئیرەج. بەهۆی تیرەکی ئارەشەوە شەڕی نێوان مەنوچێهر و ئەفراسیاب کۆتایی هات.

دەڵێن: مەنوچێهر لەصرات و دیجلە و روباری بەڵخ، چەندین ڕووباری گەورەی جیا کردەوە و بەوتەیەك ئەو بوو فوراتی گەورەی هەڵکەند و فەرمانی کشتوکاڵ و ئاوەدانی بەخەڵکاندا. تیرهاویشتنی وەك کارێکی شەڕکەران دەستنیشان کرد و سالاری ئەوان بەئارەش سپارد بەهۆی ئەو تیرەی هاویشتی.

دەڵێن: کاتێك سێ وپێنج ساڵ بەسەر پاشایەتی مەنوچێهر تێپەڕی کرد، تورکەکان دەستدرێژیان کردە سنورەکانی فەرمانڕەوایەتی ئەو. مەنوچێهر سەرکۆنەی خەڵکەکەی کرد و وتی: ئەی خەڵکینە، نەهاتونەتە دنیا چوونکە پیاوەتی بەئاوز و بەرگری کردن لەدوژمنە، تورکەکان دەستدرێژیان کردۆتە سەر سنورەکانی ئێوە لەبەر ئەوەی پشتتان کرۆدتە شەڕ. خواوەند ئەم پاشایەتیەی بەئێمەبەخشی تا تاقیمان بکاتەوە. ئەگەر سوپاسی بکەین. فراوانی دەکات و ئەگەر ناسوپاسی بکەین، سزامان دەبەخشێت. ئێمە بنەماڵەی شەرەف و گەورەیی و نیشانەی پاشایەتی خوایین. بۆ بەیانی، خۆتان بۆ شەڕ ئامادە بکەن.

وتیان: ئەو کارە دەکەین.

وتی: بڕۆن.

ڕۆژێکیتر، سەرانی وڵات و ئەشراف و گەورەکانی کۆکردەوە و سالارانی خەڵکەکەی کردە هاورێی ئەوان و موبیدی موبیدەکان لەتەنیشت کورسییەکەی خۆی جێگە کردەوە. لەسەر تەختەکەی دانیشت و گەورەکانی خەڵك بەپێوە وەستابوون.

وتی: دانیشن، من بەپێوە دەبم تا وتەکەم بەگوێی هەمووان بگات. دانیشتن.

مەنوچێهر وتی: ئەی خەڵکینە، ئافراندان تایبەتە بەئافرێنەر و سوپاس نیعمەتەکانی شیاو و ملکەچی کردنی پێویستە. ئەوەی دەبێت روو بدات، ڕوودەدات. ئافرێنراو، خوازیار بێت، یا خوازراو، لاوازە. کەس بەهێزتر لەئافرێنەر نییە وبەتواناتر لەهەمووان چوونکە مەبەستەکانی ئاشکرایە. ناتەواتر لەهەمووان کەسێکە لەژێر دەستی کەسێکی دیکەدا بێت. تێڕامان نوورە و بێ ئاگایی تاریکی و نەزانی گومڕایی. یەکەم ڕۆشت و بەناچاری دەبێت دوایین کەس پەیوەستی یەکەم کەس ببێت. پێش ئێمە یاسا و ڕێسایەك لەئارادا بووە و ئێمە ڕووناك کەرەوەی ئەو یاسا وڕێسایانەین. لاوەکی دوای ڕۆشتنی سەرەکی دەمێنێتەوە. خواوەند ئەم پاشایەتیەی بەئێمە بەخشی. سوپاسی دەکەین و داوای ڕێنوێنی وڕێنیشاندانی ڕاستەقینەی لێدەکەین. ماف پاشا لەسەر خەڵکان ئەوەیە فەرمانەکانی ئەنجام بدەن. چاکەخوازی بن و شەڕی دوژمنانی بکەن. خەڵکیش

مافیان لای پاشا هەیە. مافەکەیان ئەوەیە ڕۆژی ئەوان ببەخشێت چوونکە جگە لەوە سەرچاوەی ژیانیان نییە. دەبێت پاشا لەکارەکانی ئەوان بکۆڵێتەوە و ڕێگەی سازگاری لەگەڵ ئەوان بگرێتەبەر و زیاتر لەتوانایان کاریان لێ نەکێشێتەوە و ئەگەر زیانێکی ئاسمانی داباری و بەرهەمی ئەوانی کەم کردەوە، لەباج و خەراجی سەرشانیان کەم بکاتەوە و ئەگەر ڕووداوێك ڕوویدا، هاریکاریان بێت تا بتوانن دوبارە ئاوەدانی بکەنەوە و لەماوەیەك یەك یا دوو ساڵ بەرهەمەکانیان بگەیێنە ئاستی پێویست. سوپا بۆ پاشا وەك دو باڵی باڵندەیە چوونکە سوپا باڵی پاشایە ئەگەر پەرێك لەو باڵە کەم ببێتەوە، کێشە دروست دەبێت. پاشایەتیش بەمشێوەیە و بەباڵ و پەڕ سەقامگیر و بەهێزە. شا دەبێت سێ تایبەتمەندی هەبێت یەکەم ئەوەی ڕاستگۆ بێت و درۆنەهێنێتە سەرزمان و ڕەزیل نەبێت و لەکاتی تووڕەیی بەسەر خۆیدا زاڵ بێت چوونکە دەسەڵاتی لەدەستایە و دەستی بۆ کارەکان کراوەیە. باج و خەراج بەو دەگات و دەبێت ماڤ مسکێن و سوپا پشتگوێ ولەبیر نەکات. دەبێت بەخشندە بێت چوونکە بەمشێوەیە پاشایەتیەکەی بەردەوام دەبێت و لەلاوازی دوور دەکەوێتەوە. هەڵە لەبەخشین باشترە لەهەڵە لەسزادان. پاشا دەبێت لەو کارەی بەکوشتن و سزادان کۆتایی دێت، وردبێن بێت و کاتێك لەیەکێك لەکاربەردەستانی سکاڵا دەکەن، نابێت ڕێگەی سازگاری لەگەڵ ئەو بگرێتەبەر. دەبێت ڕووبەڕووی سکاڵاکەری بکاتەوە و ئەگەر ستەملێکراو توانی ماف وداواکەی بسەلمێنێت، تەسلیمی بکاتەوە و ئەگەر نەتوانێت، پاشا لەگیرفانی خۆی بیدات و ستەمکار بۆ چاکسازی لەخۆی و کارەکانی ناچار بکات.

ئەمە ماڤ ئێوەیە لای من. بزانن هیچ کات خوێنێك بەناڕەوا نارژێت کەمن لێی خۆش ببم. هەرکەس دەستێك بەناحەق ببڕیتەوە، نایبەخشم تا خاوەنەکەی دەیبەخشێت. ئەمە لەمنەوە فێر ببن. تورکەکان چاوی تەماحیان بڕیوەتە سەرزەمینەکەی ئێوە. پشتیوانی ئێمە بن چوونکە پشتیوانی لەخۆتان دەکەن. فەرمانم داوە کەرەستەی شەڕ بۆ ئێوە ئامادە بکەن. ڕاوێژ لەگەڵ ئێوە دەکەم. ئەم پاشایەتیە تەنیا بەناوی منەوەیە ئەگەر ملکەچی فەرمانەکانم بن، چوونکە پاشا کاتێك پاشایە فەرمانەکانی جێبەجێ بکرێت و ئەگەر دژایەتی بکەن، یەکێکە

لەئێوە نەك پاشا. هەر هەواڵێکی ناراستمان پێبگات، بێژەرەکەی بەراستگۆ نازانین تا دڵنیا نەبین و ئەگەر راست نەبێت، بێژەرەکەی سزا دەدەین. بزانن باشترین بەرگری تورەیی، خۆراگری و سەبر و پشت بەستن بەدڵنیا بوونە. هەرکەس لەشەڕی دوژمن بکوژرێت، هیوادارم بەهەشت ببێتەجێگەی. باشترینی کارەکان تەسلیم بون بەفەرمانەکانی خواوەند و پشت بەستن بەدڵنیایی و بەدەست هێنانی رەزامەندی ئەو و رازی بوون بەقەزای خوایە چوونکە هیچ کات ناتوانن خۆتانی لێ قوتار بکەن. دنیا سەفەرە و مەنزڵی سەرەکی شوێنێکی دیکە و کەرەستەکانی سەفەر بەقەرز وەرگیراوە.

چەندە دڵگیرە شوکری نیعمەتەکان و تەسلیم بوون بەئیرادەی ئافرێنەر. هەرکەس رێگەی دەرباز بوونی نەبێت، دەبێت تەسلیم بێت. ئەگەر بزانن سەرکەوتن لەلایەن خواوەیە، دڵنیابن سەرکەوتن بەدەست دێنن و ئەگەر نییەتتان پاك بێت، بەمەبەستەکەتان دەگەن. بزانن پاشایەتی جگە لەخۆڕاگری و نەهێشتنی دوژمن و گرتنی سنورەکان و دادپەروەری لەگەڵ ژێردەستەکان ناتوانێت بەردەوام بێت. چارەسەری ئێوە لای خۆتانە، دەرمانی دەرد خۆڕاگریە و فەرمان بەچاکەکاری و رێگرتن لەخراپە. هەموو هێزەکان تایبەتە بەخواوەند. لێکۆڵینەوە لەکاری ژێردەستەکانتان بکەن چوونکە خواردن و پۆشاکی ئێوە هی ئەوانە و ئەگەر بەشێوەیەکی دادپەروەرانە هەڵس و کەوتیان لەگەڵ بکەن، ئارەزووی بۆ ئاوەدان کردنەوە دەبزوێت و ئێوەیش باجی زیاترتان دەست دەکەوێت. بەڵام ئەگەر ستەم لەژێردەستەکانتان بکەن، ئارەزوویان بۆ ئاوەدان کردنەوە نامێنێت وزەویەکان بێ بەرهەم دەمێننەوە و بەم شێوەیە ئێوە باج و خەراجی کەمترتان دەست دەکەوێت. لەگەڵ ژێردەستەکان بەدادپەروەری هەڵس وکەوت بکەن، جۆگە و روبارەکان چاك بکەنەوە چوونکە خەرجی ئەو کارانە لەئەستۆی سوڵتاندایە تا وێرانتر نەبن. ئەوەی لەئەستۆی ژێردەستەکاندایە و لەئاوەدان و نۆژەن کردنەوەی ناتەوانن، لەخەزێنەی دەوڵەت بۆیان خەرج بکەن و لەکاتی کۆکردنەوەی بەرهەم، ساڵانە بەئەندازەی پێویست، لێیان وەربگرنەوە تا نەکەونە رەنجە و دژواریەوە.

ئەی موبیدی موبیدەکان، ئەمە قسە و فەرمانی منە، بیبیستن و جێبەجێی

بکەن.

دواتر وتی: خەڵکینە، بیستتان؟

وتیان: بەڵێ، چاکەت هێنایە سەرزمان و بەخواستی خواوەند فەرمانەکانت ئەنجام دەدەین.

دواتر فەرمانیدا و خواردنیان هێنا. خواردیان و خواردیانەوە و بەدەم سوپاس کردنەوە پاشایان بەجێهێشت. ماوەی پاشایەتی ئەو سەد و بیست ساڵی خایاند.

بەگومانی هوشامی کەلبی، رائێش کوڕی قەیس کوڕی صەیفی کوڕی سەبا کوڕی یەشحب کوڕی یەعرەب کوڕی قەحتان دوای یەعرەب کوڕی قەحتان کوڕی غامر کوڕی شالخ و براکانی، پاشایەتی یەمەنی لەدەستدا بوو. پاشایەتی ئەو لەرۆژگاری مەنوچێهر و ناوی حارسە. لەبەر ئەوەی پێی دەڵێن رائێش چوونکە لەگەڵ نەتەوەیەك شەڕی کرد و تالآنی دەستکەوت و بۆ یەمەن گەڕایەوە و لەبەر ئەمە پێی دەڵێن رائێش. ئەو لەهێند شەڕی کرد، کوشتاری کرد و ئەسیر و تالآنی زۆری دەستکەوت و بۆ یەمەن گەڕایەوە و لەوێوە هێرشی کردەسەر کوێستانی تەی، دواتر ئەنبار و موسڵ. سالاری سوپاکەی یەکێك لەهاوەلآنی بەناوی شیمر کوڕی عەتاف بوو. هێرشی کردە سەر ئازەربایەجان کە لەو کاتەدا لەژێر دەستی تورکەکاندا بوو. کەسانێکی زۆری کوشت و ئەسیری زۆری گرت و بەسەرهاتی شەڕەکانی خۆی لەسەر دوو بەرد نووسی کە لەدیاری ئازەربایەجان بەناوبانگە. ئەمرۆ ئەلقەیس لەمبارەوە شێعرێکی هۆنیوەتەوە بەم ناوەرۆکە:

ئایا پێی نەوتووی رۆژگار ناپایەدار و پەیمان شکێنە

و پیاوانی خوارد

زوریا کەخاوەنی دەشت و کێوەکان بوو

لەئەستێلکەکانی برد

پەنجەی بۆ زومنار درێژ کرد

و مەڕومالآتی بۆ زریَ پۆشەکان برد.

زومنار کەشاعیر باسی دەکرد، زومنار کوڕی رائێشە کەدوای باوکی لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت و ناوی ئەبرەهە کوڕی رائێشە.

دەڵێت: بۆیە پێی دەڵێن زومنار چوونکە هێرشی کردەسەر دیاری رۆژئاوا و لەرێگەی دەریاوە هەڵمەتی بۆ وشکایی برد و لەکاتی گەڕانەوە ترسی ئەوەی هەبوو سوپاکەی ون بکات. لەبەر ئەمە منارەیەکی دروست کرد تا رێگەکە بدۆزنەوە.

دەڵێت: بەگومانی خەڵکی یەمەن، ئەو کوڕەکەی خۆی عەبد کوڕی ئەبرەهەی لەم شەڕە بۆ دووردەستەکانی دیاری رۆژئاوا ڕەوانە کرد کەتالآنی دەستکەوت و ماڵی زۆر و نەسناسەکانی هێنا و بووە هۆی ترسانی خەڵك. خەڵك لێی ترسان و نازناوی (ذوالاذعار)ی پێبڕا، یانی خاوەنی ترسەکان.

دەڵێت: ئەبرەهە یەکێك لەپاشاکانی یەمەن بوو کەهێرشی کردە سەر زۆر ناوچەی جیهان.

من لێرەدا ئاماژەم باپاشاکانی یەمەندا لەبەر ئەوەی گومانیان کردووە پاشایەتی رائیش لەسەرزەمینی یەمەن لەدەورانی مەنوچێهردا بووە و پاشاکانی یەمەن دەستنیشاندەی پاشاکانی ئێران بوون و لەلایەن ئەوانەوە پاشایەتی ئەو وڵآتەیان دەکرد.

## وتار سەبارەت بەڕەچەڵەكی موسا كوڕی عیمران و گێڕانەوەی ڕووداوەكانی سەردەمی ئەو و مەنوچێهر

لەمحەممەدە كوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە: لاوی كوڕی یەعقوب نامە كچی كاری كوڕی یەشخری وەك هاوسەری خۆی هەڵبژارد و غەرشوون و مەرری و قاهسی هێنایە دنیا. قاهس، فاهی كچی مەسین كوڕی بەتویل كوڕی ئەلیاسی كردە هاوسەر و یەسهەر و مەردی هێنایە دنیا و یەسهەر شەمیت كچی بەتادیت كوڕی بەركیا كوڕی یەقسان كوڕی ئیبراهیمی كردە هاوسەر و عیمران و قارون چاویان بەدنیا هەڵهێنا و عیمران یەحیت كچی شەموئیل كوڕی بەركیا كوڕی یەقسان كوڕی ئیبراهیمی وەك هاوسەر هەڵبژارد و هارون و موسا چاویان بەدنیا هەڵهێنا.

كەسێكی دیكە جگە لەكوڕی ئیسحاق دەڵێت: تەمەنی یەعقوب كوڕی ئیسحاق سەد و حەفتا و چوار ساڵ درێژەی كێشا و لەتەمەنی هەشتا و نۆساڵی ئەو، لاوی چاوی بەدنیا هەڵهێنا ولەتەمەنی لاوی چل و شەش ساڵ تێپەڕی كەقاهس لەدایك بوو و قاهس یەسهەری هێنایە دنیا و یەسهەر عەمرەم كەعیمرانە. تەمەنی یەسهەر سەد و حەفتاو چوار ساڵە و لەساڵی شەستی تەمەنی عیمران چاوی بەدنیا هەڵهێنا و عیمران موسای هێنایە دنیا. دایكی موسا ناوی یوخابد و بەوتەیەك ئەناخیدە و هاوسەری صەفورا كچی یەترونە كەهەمان شۆعەیبی پێغەمبەرە.

موسا، جەرشون و ئیلیعازری هێنایە دنیا و چل و یەك ساڵە بوو كەترساو بەرەو مەدیەن بەڕێكەوت. ئەو پێشنیاری دینی ئیبراهیمی بەخەڵكان دەكرد و لەتەمەنی هەشتا ساڵی لەتوری سیناچاوی بەخواوەند كەوت. لەرۆژگاری موسا، فیرعەونی میسر، قابوس كوڕی مەصعەب كوڕی معاویە دووەم پاشای سەردەمی یوسف بوو و ژنی فیرعەون كچی موزاحیم كوڕی عوبەید كوڕی رەیان كوڕی وەلید، فیرعەونی یەكەمی میسرە و كاتێك وەحی بۆ موسا هات، زانی كە قابوس كوڕی مەصعەب مردووە و براكەی وەلید كوڕی مەصعەب كەیاخیتر و كافرتر لەبراكەی بوو، لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشتووە. موسا فەرمانی پێدرا هاوڕێ لەگەڵ هارونی برای وەك پێغەمبەر بۆ لای ئەو بەڕێكەوێت.

دەڵێن: وەلید دوای براکەی، ئاسیە کچی موزاحیمی وەك هاوسەر هەڵبژارد. عیمران بۆ ماوەی سەد وسی و حەوت ساڵ ژیا و لەتەمەنی حەفتا ساڵی ئەو، موسا چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

موسا و هارون پێشنیاری خواپەرەستیان بەفیرعەون کرد. موسا لەتەمەنی هەشتا ساڵی منداڵەکانی ئیسرائیلی لەمیسر بردەدەر و دوای تێپەڕین لەدەریا، رێگەی بیابانی گرتەبەر وبۆ ماوەی چل ساڵ لەویٚ نیشتەجێ بوون تا ئەوەی لەگەڵ یوشەع کوڕی نوون لەویٚ کۆچیان کرد. کاتی لەدایك بوونی موسا تا ئەو کاتەی لەبیابان کۆچی دوایی کرد، سەد و بیست ساڵە.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: یوسف مرد و پاشاکەی رەیان کوڕی وەلید مرد و فیرعەونەکانی عەمالیق، پاشایەتی میسریان گرتەدەست. خواوەند منداڵەکانی ئیسرائیلی لەویٚ زیاد کرد. کاتێك یوسف مرد، وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا، ئەویان لەناو تابوتێکی مەڕمەڕی لەناو روباری نیل بەخاك سپارد. منداڵەکانی ئیسرائیل لەژێردەستی فەرمانی فیرعەونەکاندا بوون و شوێنکەوتەکانی دینی ئیسلام تەنیا یوسف و یەعقوب و ئیسحاق و ئیبراهیم بوون. لەرۆژگاری وەلید کوڕی مەسعەب، خواوەند موسای وەك پێغەمبەر(د.خ) بۆ لای ئەو رەوانە کرد کەفیرعەونێکی ستەمکارتر و سەرکێشتر لەو نەبینراوە و ئازار وئەشکەنجەی منداڵەکانی ئیسرائیلی دەدا و بیٚ بەزەییانە هەڵس و کەوتی لەگەڵ ئەوان دەکرد، ئازاری دەدان و بۆ کاری زۆرملیٚ ناچار و بۆ ئەنجامدانی دابەشی دەکردن. دەستەیەکی بۆ بیناسازی و دەستەیەکی بۆ کشتوکاڵ ناچار دەکرد. هەموو منداڵەکانی ئیسرائیل سەرقاڵی ئەنجامدانی کارەکانی فیرعەون بوون، هەر کەس کاری نەدەکرد، جەزیەی دەدا. بەهەمان شێوە کەخواوەند دەفەرمێت: (( بۆ کاری زۆرملیٚ و ئازاب بینین ناچاری کردن)). بەڵام لەسەر دینەکەی خۆیان مانەوە و دەستیان لیٚ هەڵنە گرت. فیرعەون هاسەرێکی لەمنداڵەکانی ئیسرائیل دیاری کرد کەناوی ئاسیە کچی موزاحیمە. لەژنە چاکەکارەکانی رۆژگار بوو. تەمەنی فیرعەون درێژ بوویەوە و منداڵەکانی ئیسرائیل لەژێر دەستی ئەودا بوون و لەدەستی ئەو ڕەنج و مەینەتی زۆریان پێبڕا. کاتێك خواوەند مەبەستی رزگاری ئەوانی کرد و موسا گەشتە تەمەنی پێویست، وەك پێغەمبەر(د.خ) هەڵیبژارد.

دەڵێت: کاتێك زەمانی موسا نزیك کەوتەوە، ئەستێرەناسەکانی فیرعەون ڕۆشتنە لای و وتیان: ئێمە لەناو زانستەکەی خۆمان دەیبینین کەبەم زاونە زادەیەك لە منالەکانی ئیسرائیل دێت و پاشایەتی لەدەستی تۆ دەردێنێت و دەست بەسەر دەسەلاتەکەی تۆدا دەگرێت و دینەکەت دەگۆڕێت. کاتێك ئەم قسەیان کرد، فەرمانیدا تا هەموو منالە کوڕەکانی منالەکانی ئیسرائیل بکوژن و کچەکان بهێڵنەوە. هەموو ماماکانی ولاتەکەی خۆی کۆکردەوە و وتی: هەرکوڕێك لە منالەکانی ئیسرائیل لەدایك بوو، بیکوژن. ئەم کارەیان کرد و کوڕە گەورەکانیشیان کوشت. ژنە دووگیانەکانیان ئەشکەنجە دەدا تا منالەکانیان لەبار ببەن.

موجاهید دەڵێت: بیستوومە کەوتی قامیش بێنن و بیقڵشن تا وەك تیغ بڕەڕ بێت و لای یەك ریزیان بکەن و ژنە دووگیانەکانی منالەکانی ئیسرائیل بخەنە سەر ئەوان تا قاچیان ببڕێت. ژنی دووگیان منالەکەی دەخستە ژێر قاچ و بەپێ دەیشێلا تا قاچی لەبڕین و رووشانەکانی قامیش بپارێزێت. لەم کارەدا زێدەڕۆیی کرد و ئەوەندەی نەمابوو منالەکانی ئیسرائیل لەناو ببات.

قبتیەکان پێیان وت: ئەو خەڵکەکەی کەدەتوانن کرێکاری بکەن، لەناوت برد و رەگەزی ئەوانت نەهێشت. فەرمانیدا تا ساڵێك کوڕەکان بکوژن و ساڵی داهاتوو نەیانکوژن. هارون لەو ساڵەدا لەدایك بوو کەکوڕەکانیان نەدەکوشت و موسا لەو ساڵەی کەکوڕەکانیان دەکوشت. هارون یەك ساڵ لەموسا گەورەترە.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: فیرعەون لەخەودا بینی ئاگرێك لەبیت المقدسەوە هات و هەموو ماڵەکانی میسری گرتەوە و قبتیەکانی سوتاند و منالەکانی ئیسرائیلی هێشتەوە و ماڵەکانی میسری وێران کرد. ساحیر و جادووگەرانی کۆکردەوە و لێکدانەوەی خەوەکەی خۆی لەوان پرسی. وتیان: لەو شارەی منالەکانی ئیسرائیل لەوێوە هاتوون، یانی بیت المقدس پیاوێك دەردەکەوێت و لەناوچوونی میسر لەسەر دەستی ئەو دەبێت.

فیرعەون وتی: هەر کوڕێك لە منالەکانی ئیسرائیل لەدایك بێت، بیکوژن و کچەکان بهێڵنەوە و بەقیبتیەکانی وت: کۆیلەکانی خۆتان بێنن و کارە گلاوەکان بەمنالەکانی ئیسرائیل بسپێرن. کاری کۆیلەکانیان بە منالەکانی ئیسرائیل سپارد و کۆیلەکانی خۆیانیان هێنا و خواوەند دەفەرمێت:

((ان فرعون علا في الارض و جعل اهلها شيعا يستضعف طائفة منهم يذحج ابنائهم و يستحي نسائهم.

واتاکەی: فیرعەون لەو سەرزەمینە بالآدەست بوو و خەڵکی بۆ چەندین چین دابەش کرد کەدەستەیەك لەوانی بەریسوا لەقەڵەم دەدا و کوڕەکانی سەردەبڕین و ژنەکانیانی بەزیندووی نەدەهێشتەوە.

زادەکانی منداڵەکانی ئیسرائیل کوژران و وردەکانیان نەگەشتنە تەمەنی گەورەیی و مەرگ لەناو پیرەکان بڵاو ببوویەوە و بەرەو نەمان دەڕۆشتن. سەرانی قیبت ڕۆشتنە لای فیرعەون و وتیان: ئەم خەڵکە گرفتاری مەرگ ومیر بوون و ئەوەندەی نەماوە کاری ئەوان بکەوێتە ئەستۆی نۆکەرەکانی ئێمە. باشترە کوڕەکانیان نەکوژیت.

فەرمانیدا تا ساڵێك کوڕەکان بکوژن و ساڵێکی دیکە نەیانکوژن. هارون لەو ساڵەی کوڕەکانیان نەدەکوشت، چاوی بەدنیا هەڵهێنا و موسا لەو ساڵەی کوڕەکانیان دەکوشت. دایکی موسا دووگیان بوو. کاتێك ڕۆژی لەدایك بوونی موسا نزیك کەوتەوە، خەمباری تەنگی پێهەڵچنی. خواوەند وەحی پێکرد:

((أن ارضعيه فاذا خفت عليه فالقيه في اليم و لا تخافي و لا تحزني انارادوه اليك و جاعلوه من المرسلين. واتاکەی: شیری پێبدە و کاتێك لەگیانی ئەو ترسایت، بیخەرە ناو دەریا و مەترسە و خەم مەخۆ چوونکە ئێمە بۆ تۆی دەگەڕێنینەوە و دەیکەین بەیەکێك لەپێغەمبەرەکان))

کاتێك لەدایك بوو، شیری پێدا. دارتاشێکی بانگ کرد و صنوقێکی دروست کرد کە لەناوەوە دەکرایەوە. موسای خستە ناو سنوقەکە و خستیە ناو دەریا و بەخوشکەکەی خۆی وت: بەدوایدا برۆ. ئەو، سنوقەکەی بینی لەگەڵ شەپۆلەکانی دەریا بەرز و نزم دەبوویەوە تا ئەوەی لەنزیك ماڵی فیرعەون لەناو دارەکان وەستایەوە. کەنیزەکانی هاوسەری فیرعەون بەمەبەستی جل شۆرین هاتنە ئەو شوێنە و سنوقەکەیان بینی. ئەویان بردە لای ئاسیە چوونکە گومانیان دەکرد زێر و زیوی تیایە. کاتێك ئاسیە موسای بینی، خۆشەویستی ئەو کەوتە دڵیەوە و کاتێك فیرعەون زانی، مەبەستی کوشتنی ئەوی کرد. ئاسیە قسەی لەگەڵ کرد و ڕێگەی نەدا بیکوژێت بەڵام وتی: دەترسم لە منداڵەکانی ئیسرائیل و ئەو کەسە بێت بۆ لەناوچوونی ئێمە راسپێردراوە. خواوەند فەرمووی: بنەماڵەی فیرعەون ئەویان

هەڵگرتەوە تا ببێتە هۆکاری خەم و پەژارەی ئەوان.

ویستیان دایەنێك بۆ موسا بگرن بەڵام مەمکی هیچ ژنێکی نەدەگرت. ژنان خوازیار بوون شیری پێبدەن و بەمشێوەیە خۆیان لەفیرعەون نزیك بکەنەوە بەڵام مەمکی ئەوانی نەدەگرت. خواوەند دەفەرمێت:

((و حرمنا علیه المراضع فقالت هل ادلکم علی اهل بیت یکفلونه لکم و هم له ناصحون.

واتاکەی: شیری دایکەکانی دیکەمان پێشتر بۆ ئەو حەرام کرد. پوورەکەی وتی: ئایاماڵێکتان نیشان بدەم تا سەرپەرەستی ئەو بگرنە ئەستۆ و چاکەخوازی ئەو بن.))

ئەویان گرت و وتیان: تۆ ئەم کوڕە دەناسیت، بنەماڵەی ئەومان نیشان بدە.

وتی: نایناسم بەڵام وتم وچاکەخوازان شایەتن. کاتێك دایکی موسا، هات، مەمکی ئەوی گرت. ئەوەندەی نەمابوو بڵێت ئەمە مناڵی منە. بەڵام خواوەند ڕێگەی ئەو کارەی لێگرت. خواوەند دەفەرمێت:

(( ان کادت لتبدی به لولان ان ربطنا علی قلبها لتکون من المومنین.

واتاکەی: ئەگەر دڵی ئەومان بەهێز نەدەکرد تا باوەڕدار بێت، ئەوەندەی نەمابوو بەسەرهاتەکەی ئاشکرا بکات.))

ناویان نا موسا لەبەر ئەوەی لەناو ئاو و دار دۆزیانەوە. ئاو لەزمانی قیبتی یانی (مو) و دار یانی (سا). خواوەند دەفەرمێت: ئەومان بۆ دایکی گەڕاندەوە تا بەرچاوی روون و خەمبار نەبێت.

فیرعەون موسای وەك مناڵی خۆی هەڵگرتەوە. ئەویان بەکوڕی فیرعەون ناودەبرد. کاتێك گەورە بوو، دایکی ئەوی نیشانی ئاسیەدا و بردی بۆ لای فیرعەون و پێی وت: بیگرە ئامێز کەهۆکاری بەرچاو روونی تۆیە.

فیرعەون وتی: هۆکاری بەرچاو ڕوونی تۆیە نەك من.

کوڕی عەباس دەڵێت: ئەگەر وتبوی هۆکاری بەرچاو روونی منە، باوەڕدار دەبوو، بەڵام نەیوت. کاتێك فیرعەون، موسای گرت، موسا ریشی ئەوی گرت و هەڵیکەند. فیرعەون وتی: جەلادەکان بانگ بکەن. ئەمە ئەو کەسەیە بەدوایدا دەگەڕێین.

ئاسیە وتی: مەیکوژن، ئەگەری هەیە سوودی بۆ ئێمە هەبێت یا وەك مناڵی

خۆمان هەڵیبگرینەوە. ئەو منداڵە و نەزان. ئەم کارەی لەرووی منداڵیەوە کرد. دەزانی هیچ کام لەژنانی میسر بەئەندازەی من خشڵ و زێرو زیوی نییە. من زێر و ئاگر دەخەمە بەردەستی ئەو، ئەگەر زێر و یاقووتی هەڵگرت، نەزان نییە و دەبێت بکوژرێت بەڵام ئەگەر ئاگری هەڵگرت، منداڵە و نەزان و پێویستە نەکوژرێت. یاقوتەکەیان خستە بەردەستی موسا و تەشتێك ئاگریش. جبرەئیل هات و ئاگرەکەی خستە دەستی موسا و بۆ دەمی برد. خواوەند لەگێڕانەوەی داستانی موسا کەچیتر لەوەدوا زمانی دەگیرا، دەفەرمێت: ((زمان گیرانەکەی من چارەسەر بکە تا خەڵك لەقسەکانم تێبگەن.)) بەمشێوەیە مەترسی لەسەر موسا نەما.

کاتێك موسا گەورە بوو. سوار چوارپێ تایبەتەکانی فیرعەون دەبوو، هاوشێوەی ئەو جل و بەرگی لەبەر دەکرد و ئەویان بەموسا کوڕی فیرعەون ناودەبرد.

رۆژێك فیرعەون سوار بوو، موسا لەوێ نەبوو و دواتر هات. وتیان: فیرعەون سوار بووە. بەدوای ئەو بەرێکەوت و لەکاتی خەوی نیمەڕۆ گەیشتە شاری مەنف. لەنیمەڕۆدا گەیشتە ئەوێ و بازارەکان داخرابوون. کەس لەناو کۆڵانەکاندا نەبوو. خواوەند دەفەرمێت:

((و دخل المدینة علی حین غفلة من اهلها و وجدفیها رجلین یقتتلان. هذا من شیعته و هذا من عدوه فاستغاثه الذی من شیعته علی الذی من عدوه فوکزه موسا فقضی علیه قال هذا من عمل الشیطان انه عدو مفضل مبین. قال رب انی ظلمت نفسی فاغفر لی فغفر له انه هو الغفور الرحیم. قال رب بما انعمت علی فلن اکون ظهیرا للمجرمین. فاصبح فی المدینة خائفا یترقب فاذا الذی استنصره بالامس یستصرخه.

واتاکەی: لەکاتی بێ ئاگایی خەڵك ڕۆشتە ناو شارەکە و لەوێ دو پیاوی بینی شەڕیان دەکرد. یەکیان لەشوێنکەوتەکانی ئەو وئەوی دیکەیان لەدوژمنەکانی بوو. شوێنکەوتەکەی دژی دوژمنەکەی داوای هاوکاری لێکرد. موسا مشتێکی لێدا و گیانی لێسەند و وتی: ئەمە کاری شەیتان بوو چوونکە ئەو دوژمنێکی گومراکەرە بەئاشکرا. وتی: پەروردگارا، من ستەمم لەخۆم کرد، لەمن خۆشبە و خواوەند ئەوی بەخشی چوونکە مێهرەبان و رەحیمە. وتی: پەروەردگارا، بۆ رێز گرتن لەو نیعمەتەی بەمنت بەخشی، پشتیوانی لەستەمکاران ناکەم. لەشارەکان شەو و رۆژەکانی بەترس

بەسەر دەبرد و لەناکاو ئەوەی دوێنی داوای هاوکاری لێدەکرد. لەهاوکاری کردنی ئەو خۆی بەدوور دەگرت. موسا پێی وت: تۆ بەئاشکرا گومڕاییت. دواتر مەبەستی ئەوەی کرد هاوکاری بکات و کاتێك موسای بینی کەدێتە پێش و مەبەستی ئەو شەڕ لەگەڵ ئەو کەسە بوو شەری لەگەڵ ئیسرائیلیەکە دەکرد. بەلاّم ئیسرائیلیەکە لەموسا دەترسا چوونکە بەتوندی لەگەڵی ئاخاوت و گومانی کرد. ئەو دەکوژێت، وتی: یا موسا اترید ان تقتلنی کما قتلت نفسا بالامس ان ترید الا ان تکون جبارا فی الارض و ما ترید ان تکون من المصلحین.

واتاکەی: ئەی موسا، مەگەر دەتەوێت من بکوژیت بەهەمان شێوە کەدوێنیٚ کەسێکت کوشت و دەتەوێت لەم سەرزەمینە ستەمگەر بیت و ناتەوێت لەچاکەخوازان بیت.))

موسا دەستبەرداری بوو، قیبتی ڕۆشت و ئاشکرای کرد کەموسا کەسێکی کوشتووە. فیرعەون بەدوایدا گەڕا و وتی: بیهێنن چوونکە کەسی داوا کراوە.

ئەوانەی بەدوای موسادا دەگەڕان. وتیان، لەکوێرە ڕێگەکان بەدوای ئەودا بگەڕێن چوونکە موسا گەنجە و ڕێگەکان ناناسێت. ئەو پیاوە هات و پێی وت:

(( ان الملاء یاتمرون بك لیقتلوك فاخرج فخرج منها خائفا یترقب قال رب نجنی من القوم الظالمین.

واتاکەی: گەورەکان سەبارەت بەتۆراوێژ دەکەن تا بتکوژن. بڕۆدەر چوونکە من چاکەخوازی تۆم.))

بەشێوەیەکی ترساو و نیگەران لەو شارە ڕۆشتەدەر و وتی: پەروەردگارا، من لەدەستی ستەمکاران ڕزگار بکە.

کاتێك موسا لەکوێرەڕێگاکان سەرگەردان بوو، فریشتەیەك سوار لەسەر ئەسپ هات و ڕمێکی بەدەستەوە بوو. کاتێك موسا ئەوی بینی، لەترسا کوڕنوشی بۆ برد. فریشتە وتی: کوڕنوش مەبە و بەدوای مندا وەرە. بەدوای فریشتەدا بەرێکەوت و ئەوی بۆ سەر ڕێگەی مەدیەن ڕێنوێنی کرد. موسا کەبەرەو مەدیەن دەڕۆشت، وتی:

((عسی ربی ان یهدینی سواء السبیل.

واتاکەی: ئەگەری هەیە پەروەردگار من بۆ ناوەڕاستی ڕێگە ڕێنوێنی بکات.))

فریشتە ئەوی تامەدیەن برد.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: فیرعەون و ژێر دەستەکانی سەبارەت بەو بەڵێنەی خواوەند بەئیبراهیمیدا بوو کەپێغەمبەران و پاشاکان لەمناڵەکان و نەوەکانی ئەو دەبەن. گفتوگۆیان کرد. یەکیان وتی: مناڵەکانی ئیسرائیل چاوەڕوانن و لەهاتنەدی ئەو رۆژە گومانیان نییە. گومانیان کرد یوسف کوڕی یەعقوب، ئەو پاشایە خواوەند بەڵێنی دابوو و کاتێك مرد، وتیان: خواوەند بەڵێنی لەم چەشنەی بەئیبراهیم نەدابوو.

فیرعەون وتی: بۆچوونی ئێوە چییە؟

دەڵێت: راوێژیان کرد و هاوڕا بوون تا پیاوانێکی شمشێر بەدەست ڕەوانە بکەن و لەناو مناڵەکانی ئیسرائیل بگەڕێن و لە هەرشوێنێك مناڵێکی کوڕیان بینی، بیکوژن. کاتێك بینیان پیرەکانی ئیسرائیل بەئەجەلی خوایی دەمرن و مناڵەکانیان سەردەبڕن، وتیان: ئەوەندە ناخایەنێت مناڵەکانی ئیسرائیل لەناو دەچن و لەناوچوونی ئەوان دژواری خۆمانی بەدواوە دێت. لەبەر ئەمە ساڵێك هەموو مناڵە کوڕەکانیان دەکوشت و ساڵێکی دیکە نەیاندەکوشت تا کەم تەمەنەکان گەورە ببن و شوێنی گەورەکان بگرنەوە. بەمشێوەیە نە بەو ئەندازە زۆر دەبن کەزۆربونیان ببێتە هۆکاری نیگەرانی و نە لەناو دەچن. بڕیارایان لەسەر ئەم بۆچوونە یەکی گرت.

دایکی موسا لەساڵی نەکوژرانی مناڵەکان هاروونی هێنایە دنیا و کاتێك ساڵی کوشتن نزیك بوویەوە، بەموسا دوگیان بوو. خەمباری تەنگی پێهەڵچنی چوونکە زیاد لەرادە مناڵەکەی ناو سکی خۆش دەویست. خواوەند وەحی پێکرد کەمەترسە و خەمبار مەبە چوونکە ئەو بۆ تۆ دەگەڕێنینەوە و دەیکەین بەپێغەمبەر. کاتێك لەدایك بوو، بیخەرە ناوسنوق و فڕێدە ناودەریا. کاتێك موسا لەدایك بوو، ئەو کارەی کرد کەخواوەند فەرمانی پێدابوو. کاتێك مناڵەکە لەبەرچاوی نەما. بەهاندانی شەیتان بەخۆی وت: چ کارێك بوو لەگەڵ کوڕەکەی خۆم کردم، ئەگەر لای خۆم دەکوژرا و کفنم دەکرد و بەخاکم دەسپارد، باشتر بوو لەوەی بەدەستی خۆم بیکەمە خواردنی ئاژەڵە دەریاییەکان.

ئاو سنوقەکەی برد بۆ ئەو شوێنەی کەنیزەکانی فیرعەون ئاویان هەڵدەگرت. سنوقەکەیان گرتەوە و ویستیان بیکەنەوە. یەکیان وتی: زێروزیو لەناو ئەم سنوقەدایە و ئەگەر ئێمە بیکەینەوە هاوسەری فیرعەون باوەڕ ناکات کەچیمان تیا

بینیوە. ئەویان بەهەمان شێوە برد و تەسلیمی هاوسەری فیرعەونیان کرد. کاتێك سنوقەکەی کردەوە، منالێکی بینی و خۆشەویستی منالەکە کەوتە دڵیەوە بەشێوەیەك پێشتر کەسی بەو ئەندازەیە خۆش نەدەویست.

دایکی موسا تەنیا بیری لەموسا دەکردەوە. کاتێك جەلادەکان بەسەرهاتی منالی ناو سنوقەکەیان بیست، شمشێر بەدەست هاتنە لای ژنەکەی فیرعەون تا بیکوژن. هاوسەری فیرعەون بەجەلادەکانی وت: بڕۆن چوونکە ئەمە ژمارەی منالەکانی ئیسرائیل فراوان ناکات. من دەڕۆمە لای فیرعەون تا بەمنی ببەخشێت. ئەگەر بەخشی چاکەی لەگەڵ کردوم و ئەگەر فەرمانی کوشتنیدا، سەرکۆنەی ئێوە ناکەم. کاتێك موسای بردە لای فیرعەون، وتی: دەبێتە هۆی بەرچاو روونی من و تۆ.

فیرعەون وتی: بەرچاو روونی تۆ نەك من.

پێغەمبەر(د.خ) لەکاتی گێڕانەوەی ئەم داستانە فەرمووی: سوێند بەخوایەی جگە لەو خوایەك نییە، ئەگەر فیرعەون هاوشێوەی ژنەکەی خۆی رازی دەبوو کەببێتە هۆکاری بەرچاو روونی ئەو، خواوەند ئەوی وەك هاوسەرەکەی رێنوێنی دەکرد بەلاّم خواوەند لەم نیعمەتە بێ بەشی کرد.

هاوسەری فیرعەون هەموو ژنە شیردەرەکانی دەوروبەری خۆی کۆکردەوە تا دایەنێك بۆ موسا هەڵبژێرن. هەر ژنێك دەهات، موسا مەمکی ئەوی نەدەگرت تا ئەوەی ژنی فیرعەون ترسا ئەگەر شیر نەخوات، بمرێت. هاوسەری فیرعەون خەمبار بوو. فەرمانیدا ئەویان بردە بازار و شوێنی کۆبوونەوەی ژنان بەو هیوایەی دایەنێك بۆ ئەو بدۆزنەوە بەلاّم موسا مەمکی کەسی نەگرت.

بەرەبەیان موسا بەخوشکەکەی خۆی وت: بگەڕێ و بزانە ئایا هەواڵێك لەموسا دەبیستیت یا نە، ئایا کوڕەکەم زیندووە یا ماسیەکانی دەریا خواردوویانە. بەڵێنەکەی خواوەندی لەبیر کردبوو. خوشکەکەی بەشێوەیەك کەس نەزانێت، چاودێری بارودۆخی موسای دەکرد. کاتێك دایەنیان دەستنەکەوت، وتی: دەتانەوێت بنەماڵەیەکتان پێ بناسێنم تا پەرەستاری بکەن و چاکەخوازی بن.

ئەویان گرت و وتیان: لەکوێوە دەزانێت چاکەخوازی ئەو دەبن مەگەر منالەکە دەناسیت، گومانیان لا دروست بوو.

وتی: چاکەخوازی و مێهرەبانی ئەوان لەچاوەڕوانی ئەوان لەپاشایە. ئەویان ئازاد

کرد و ڕۆشتە لای دایکی موسا و ئاگاداری کردەوە. دایکی موسا هات. کاتێك موسایان خستە باوەشی. مەمکی گرت و شیری خوارد تا تێر بوو. مژدەدەر ڕۆشتە لای ژنی فیرعەون و پێی ڕاگەیاند کەدایەنێکیان بۆ موسا دۆزیوەتەوە. کەسی ڕەوانە کرد و دایکی موسا هات و کاتێك کرداری ئەوی بینی. وتی: لای من بمێنەرەوە و شیر بەمناڵەکەم بدە چوونکە هەرگیز کەسم وەك ئەو خۆش نەویستووە.

دایکی موسا وتی: ناتوانم ماڵ و مناڵەکانم بەجێ بێڵم تا لەناو بچن. ئەگەر دەخوازیت، بیدە بەمن تا لەگەڵ خۆم بیبەم و پەرستاری بکەم. دایکی موسا کەبەڵێنەکەی خواوەندی بیرکەوتەوە بەداواکەی هاوسەری فیرعەون ڕازی نەبوو چوونکە دڵنیا بوو خواوەند بەڵێنەکەی دەباتەسەر. هەمان ڕۆژ لەگەڵ کوڕەکەی بۆ ماڵەوە گەڕایەوە.

خواوەند موسای گەورە کرد و بۆ ئەوەی دیاری کردبوو، پاراستی. مناڵەکانی ئیسرائیل لەناو شارەکە بەردەوام لەستەم و زۆرداری پەنایان بۆ ئەو دەبرد. کاتێك گەورە بوو، هاوسەری فیرعەون بەدایکی موسای وت: دەمەوێت بیبینم.

دایکی موسا ڕۆژێکی دیاری کرد تا موسای نیشان بدات. ژنی فیرعەون بەکەنیز و خزمەتکارەکانی خۆی وت. دەبێت هەرکام لەئێوە دیارییەك بەکوڕەکەی من بدات. من یەکێك دەنێرم تا بزانم ئێوە چی دەکەن.

کاتێك موسا لەماڵی دایکی هاتەدەر، تا گەشتتە لای هاوسەری فیرعەون، بەردەوام دیاری و خەلاتی وەردەگرت و کاتێك گەیشتە لای هاوسەری فیرعەون، ڕێزی لێگرت و ڕەزامەندی بەروخسارییەوە دەرکەوت، شەیدای بوو و وتی: بیبەن بۆ لای فیرعەون، تا ڕێزی بگرێت. کاتێك ئەویان بردە لای فیرعەون وخستیانە ئامێزی، موسا ریشی فیرعەونی گرت و هەڵیکەند.

یەکێك لەدوژمنانی خوا وتی: مەگەر نازانی خواوەند بەڵێنی بەئیبراهیم داوە کەتۆ لەناو دەبات. جەلادەکان بانگ بکە تا بیکوژن. هاوسەری فیرعەون بەراکردن هات و وتی: سەبارەت بەم مناڵەی بەمنت بەخشیوە، چ مەبەستێك هەیە؟

فیرعەون وتی: مەگەر نازانی گومان دەکات من لەناو دەبات؟

ژن وتی: کارێك بکە تا ڕاستییەکان ئاشکرا ببێت. ئاگر و خشڵ و زێڕ لەو نزیك بکەرەوە. ئەگەر خشڵ و زێڕی هەڵگرت ئاشکرا دەبێت ئاوزی هەیە و ئەگەر ئاگرەکەی

هەڵگرت، بزانە ئاوزی نییە و ناتوانێت جیاوازی نێوان ئەوان هەست پێبکات. کاتێك ئاگر و زێڕیان لەموسا نزیك کردەوە، ئاگرەکەی هەڵگرت و لەترسی ئەوەی نەکا دەستی بسوتێت، لێیان وەرگرت. هاوسەری فیرعەون وتی: بینیت. خوا مەبەستی فیرعەونی گۆڕی چوونکە دەیوست فەرمانەکانی خۆی سەبارەت بەو جێبەجێ بکات.

کاتێك موسا گەورە بوو، هیچ یەك لەبنەماڵەی فیرعەون نەیاندەتوانی ستەم لە منداڵەکانی ئیسرائیل بکەن یا بۆ کاری زۆرەملێ ناچاریان بکەن و بەمشێوەیە ئیسرائیلیەکان بەهێز بوون. ڕۆژێك موسا لەناو شاردا دەسوڕایەوە و دوو کەسی بینی شەڕیان دەکرد. یەکیان ئیسسرائیلی وئەوی دیکەیان فیرعەونی. ئیسرائیلی دژی فیرعەونییەکە داوای هاوکاری لەموسا کرد. موسا توڕە بوو. ئیسرائیلیەکە دەیزانی هەڵس و کەوتی موسا لەگەڵ منداڵەکانی ئیسرائیل چۆنە. کەس جگە لەدایکی موسا نەیدەزانی و گومانیان دەکرد ئەو کارانەی دەیکات لەچاکەکاری خۆیەوە سەرچاوە دەگرێت. بەڵام خواوەند موسای لەنهێنەکەی خۆی ئاگادار کردبوویەوە.

موسا هێرشی کردە سەر فیرعەونییەکە و ئەوی کوشت و جگە لەخوا و ئیسرائیلیەکە کەس نەیبینی. کاتێك موسا پیاوەکەی کوشت، وتی: ئەمە کاری شەیتان بوو چوونکە دوژمنێکی گومڕاکەرە. دواتر وتی: خوایە بمبەخشە چوونکە ستەمم لەخۆم کرد. خواوەند ئەوی بەخشی چوونکە بەخشندە و میهرەبانە.

موسا لەشارەکەدا ترسا و نیگەران دەسوڕایەوە. چەند کەسێك ڕۆشتنە لای فیرعەون و وتیان: منداڵەکانی ئیسرائیل یەکێك لەفیرعەونەکانیان کوشت. تۆڵەی ئێمە بستێنە و ڕێگە مەدە ئەو کارانە ئەنجام بدەن.

فیرعەون وتی: بکوژ و شایەتەکان بێنن چوونکە ڕەوا نییە بێ شایەت، داوەری بکەین.

بەیانی ئەو ڕۆژە کەبەدوای بکوژ و شایەتدا دەگەڕان، بەڵام کەسیان دەستنەکەوتبوو، موسا پیاوی ئیسرائیلی بینی لەگەڵ فیرعەونییەك شەڕی دەکرد و دژی فیرعەونییەکە داوای هاوکاری لەموسا کرد. موسا کە لەکاری دوێنێی خۆی پەشیمان ببویەوە، لەوەی دەیبینی بێزار و توڕە بوو. دەستی درێژ کرد تا لەفیرعەونییەکە بدات و بەپیاوی ئیسرائیلی وت: بەراستی تۆ بەئاشکرا گومڕاییت.

ئیسرائیلی موسای بینی هاوشێوەی دوێنێ کەفیرعەونییەکەی کوشت، تووڕەیە. ترسا لەوەی موسا مەبەستی کوشتنی ئەو بکات بەڵام موسا مەبەستی لێدانی فیرعەونییەکەی کرد. پیاوی ئیسرائیلی ترسا و پەنای بۆ فیرعەونییەکە برد و وتی: ئەی موسا دەتەوێت من بکوژیت بەهەمان شێوە کەدوێنێ کەسێکت کوشت. بۆیە ئەم قسەی هێنایە سەرزمان چوونکە گومانی دەکرد موسا مەبەستی کوشتنی ئەوی هەیە. لەیەك خۆش بوون و فیرعەونی بۆ لای کەسەکانی خۆی گەڕایەوە و سەبارەت بەوتەی پیاوی ئیسرائیلی گفتوگۆی کرد. فیرعەون جەلادەکانی ڕەوانە کرد. موسا لەسەر شارێکاندا بەرێدا دەڕۆشت. بەدوایدا دەگەڕان و دەترسان نەیدۆزنەوە. یەکێك لەهاوەڵانی موسا هات و زووتر لەوان خۆی بەموسا گەیاند و ئاگاداری کردەوە.

سەدی دەڵێت، کاتێك موسا گەیشتە مەدیەن، دەستەیەکی بینی ئاویان هەڵدەگرت.

لەسەعید کوڕی جوبەیر دەگێڕنەوە: موسا لەمیسرەوە مەبەستی مەدیەنی کرد کەهەشت شەو ڕێگەیە. دەیانوت ڕێگەکە هاوشێوەی بەسرە تا کوفەیە. خواردنی تەنیا گەڵای دارەکان بوو. بەپێخاوسی ڕێگەی دەبڕی و کاتێك گەیشت، پێست بەقاچییەوە نەما.

سەدی دەڵێت: لەوێ دوژنی بینی مەڕەکانی خۆیان لەئاوەکە دور خستبویەوە. وتی: داستانی ئێوە چییە؟

وتیان: ((لا نسقی ((حتی یصدر الرعاء و ابوناشیخ کبیر).

واتاکەی: ئاو ناگرین تا شوانەکان مەڕەکانی خۆیان ببەنەوە چوونکە باوکی ئێمە پیرە پیاوێکی بەتەمەنە.

موسا بەزەیی بەواندا هاتەوە و لەچاڵاوەکە نزیك کەوتەوە. تاشەبەردێك لەلێواری کانیاوەکە بوو. دەستەیەك لەخەڵکی مەدیەن بەمەبەستی ئاو گرتن کۆببونەوە. ئاوی بۆ ئەوان گرت و مەڕەکانیان ئاودا و بەخێرایی گەڕانەوە. پاشماوەی ئاوی کانییەکەیان بەمەڕومالاتەکان دەدا. موسا لەژێر سێبەری دارێك دانیشت و وتی: ((ربی انی بما انزلت الی من خیر فقیر))

واتاکەی: خواوەندا، نیازمەندم بۆ ئەو خواردنەی بۆم بنێری.

سەدی دەڵێت. کاتێك دوو کچەکە بەخێرایی بۆ لای باوکیان گەڕانەوە، پرسیاری

لێکردن و ئەوان لەبەسەرهاتەکەی موسا ئاگاداریان کردەوە. یەکێك لەوانی بەدوای موسادا ڕەوانە کرد. بەشێوەیەکی شەرمن بەرێگەدا دەڕۆشت و دەیوت: باوکم داوای تۆی کردووە تا پاداشتی هاوکاری کردنی ئێمەت بداتەوە. موسا هەستا و وتی: بڕۆین. کچەکە پێش موسا بەرێگەدا دەڕۆشت. باهەڵیکرد و موسا دواوەی کچەکەی بینی وپێی وت: لەدوای منەوە ڕێگە ببڕە و ئەگەر ڕێگەکە بەهەڵە ڕۆشتم، پێم بڵێ. کاتێك گەیشتە لای پیاوە پیرەکە و داستانەکەی بۆ باس کرد، وتی: مەترسە چوونکە لە نەتەوەی ستەمکار ڕزگارت بووە.

یەکێك لەکچەکان وتی: باوکە بەکرێی بگرە، چوونکە باشترین کەسە دەتوانیت بەکرێی بگریت لەبەر ئەوەی ئەمین و بەهێزە. ئەو کچە بوو موسای بۆ لای باوکی ڕێنوێنی کرد.

پیرەپیاو وتی: بەهێزی ئەو کاتێك دەرکەوت کەتاشە بەردی سەر چاڵەکەی هەڵگرت، بەلاّم بەڵگەی ئەمین بوونی ئەو چییە؟

کچی وتی: لەپێشیەوە بەرێگادا دەڕۆشتم و نەیویست نەزەری حەرام لەمن بکات و وتی لەدوایەوە ڕێگە ببڕم. پیرە پیاو وتی:

((انی اریدان اتکحت احدی ابنتی هاتین علی ان تاجرنی ایما الا جلین قضیت و الله علی ما نقول وکیل.

واتاکەی: دەمەوێت یەکێك لەدوو کچەکەی خۆم بکەمە هاوسەری تۆ و بۆ من کار بکەیت. بڕیارەکەمان ئەوەی دەبێت تاماوەیەك لای من بەسەر بەریت و خوا شایەتی وتارەکەی ئێمەیە.))

کوڕی عەباس دەڵێت: ئەو کچەی بوو بەهاوسەری موسا، ئەوەبوو ڕێگەی ماڵەوەی نیشاندا. پیرەپیاو بەیەکێك لەکچەکانی خۆی وت داردەستێکی بۆ بێنێت. داردەستەکە فریشتەیەك لەروخساری پیاو پێیدابوو. کاتێك کچەکە داردەستەکەی هێنا و پیرەپیاو سەیری کرد، وتی: داردەستێکی دیکە بێنە. ئەوی فرێدا و ویستی داردەستێکی دیکە هەڵبگرێت و جگە لەو داردەستە بەدەستیەوە نەدەهات. بەردەوام دەڕۆشت و دەهات و تەنیا ئەو داردەستەی دەهێنا. کاتێك موسا داردەستەکەی بینی، هەڵیگرت و مەڕوماڵاّتی بۆ لەوەرگە برد.

پیرەپیاو پەشمیان بوویەوە و وتی: ئەمە ئەمانەت بوو. ڕۆشت و بەموسا

گەیشتەوە و پێی وت: داردەستەکەم بدەرەوە.

موسا وتی: ئەمە داردەستی منە. شەڕیان کرد و دواتر لەسەر ئەوە رێککەوتن یەکەم پیاو کەدەیبینن، بیکەنە داوەر لەنێوان خۆیان. فریشتەیەك لەرێگاوە هات و لەنێوان ئەوان داوەری کرد ووتی: داردەستەکە بخەنە سەرزەوی، هەرکەس هەڵیگرێت، هی ئەوە. پیرەکە ویستی هەڵیگرێت، بەڵام نەیتوانی. موسا هەڵیگرت و پیرەپیاو داردەستەکەی پێبەخشی. موسا بۆ ماوەی دە ساڵ شوانی بۆ کرد.

لەشۆعەیبی جەبایی دەگێڕنەوە: ناوی دوکچەکە لیا و صەفورە بوو. ژنەکەی موسا، صەفورە کچی یەترون کاهینی مەدیەن بوو.

لە باوکی عوبەیدە دەگێڕنەوە: ئەو کەسەی موسای بەکرێ گرت، یەترون برازای شۆعەیبی پێغەمبەر بوو.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: ئەو کەسەی موسای بەکرێ گرت، یەسرا فەرمانڕەوای مەدیەن بوو.

سەدی دەڵێت: کاتێك موسا ماوە دیاریکراوکەی بەسەر برد. لەگەڵ هاوسەرەکەی خۆی ڕۆشت. زستان بوو و رێگەی ون کرد. روناکیەکی بینی و گومانی کرد ئاگرە. بەڵام نووری خواوەند بوو. بەکەسەکانی خۆی وت: ((امکثوانی آنست نار اللعلی آتیکم منها بخبر او جذوة من النار لعلکم تصطلون. فلما اتاها نودی من شاطیء الواد الایمن فی البقعه المبارکه من الشجره ان یا موسا انی انا الله رب العالمین. و ماتك بیمینك یا موسا. قال هی عصای اتوکاء علیها و اهش بها علی غنمی ولی فیها مآرب اخری. قال القها یا موسا. فالقها فاذاهی حیة تسعی فلما رآها تهتز کانها جان ولی مدبرا و لم یعقب، یا موسا اقبل و لاتخف انك من الآمنین. اسلك یدك فی جیبك تخرج بیضاء من غیر سوء و اضمم الیك جناحك من الرهب فذانك برهانان من ربك الی فرعون و ملائه انهم کانوا قوما فاسقینه. قال رب انی قتلت منهم نفسا فاخاف ان یقتلون. و اخی هارون هوا افصح منی لسانا فارسله معی مرداً یصدقتنی انی اخاف ان یکذبون. قال سنشد عضدك باخیك و نجعل لکما سلطانا فلایصلون الیکما بایاتنا انتما و من اتبعکما الغالبون. ((فاتیاه فقولا انا رسولا ربك)).

واتاکەی: بمێننەوە، ئاگرم بینی. ئەگەری هەیە هەواڵێك لەو یا بڵێسەی ئاگر بێنم

تا گەرم ببنەوە. کاتێك گەیشتە لای ئاگرەکە، لەلای راستەوە، لەشوێنی پیرۆز، لەو دارە، بانگی کرا، ئەی موسا: من خۆمم، خواوەندی تاقانە، پەروەردگاری جیهانیان. ئەی موسا، ئەوە چییە لەدەستی راستی تۆدایە؟ وتی: ئەوە داردەستەکەی منە. پشتی پێدەبەستم و بەهاوکاری داردەستەکەم بۆ مەڕەکانم گەڵای دارەکان دەتەکێنم و نیازەکانی خۆمی پێ بەراوەردە دەکەم. وتی: ئەی موسا، فڕێی بدە. فڕیدا و لەناکاو بوو بەمارێك و دەخزی و دەڕۆشت. کاتی بینی دەجوولێت، وەك بڵێی مارێکە، ترساو پشتی تێکرد ئاوری بۆ دواوە دایەوە. ئەی موسا مەترسە چوونکە ئەمانت پێ بەخشراوە. دەستت بۆ گیرفانت ببە، تا بێ هۆکار، سپی بێتەدەر و بۆ نەهێشتنی ئەم ترسە دەستی خۆت بخەرە کەلەکەت چوونکە ئەم دوو بەڵگەیە لەلایەن پەروەردگارەوە، بۆفیرعەون و گەورەکانی ئەوە چوونکە دەستەیەکی ستەمکارن. وتی: پەروەردگارا، یەکێك لەوانم کوشتووە و دەترسم بمکوژن. هارونی برام لەمن زمان پاراوترە. ئەو بۆ هاوکاری من ڕەوانە بکە تا پشت راستم بکاتەوە دەترسم بەدرۆزنم بزانن. وتی: بازوی تۆ بەبراکەت بەهێز دەکەین و ئێوە بەهۆی ئایەکانی خۆمانەوە ئارام دەکەینەوە تا دەستیان بەئێوە نەگات. ئێوە و هەر کەسێك شوێنی ئێوە بکەوێت، سەرکەوتوون.))

ڕۆشتنە لای فیرعەون و وتیان: ئێمە دوپێغەمبەری ڕۆژگاری تۆین.

لەوەهب کوڕی مونبەی یەمەنی دەگێڕنەوە: کاتێك موسا ماوەی دیاریکراوی بەسەر برد، هاتەدەر و مەڕوماڵاتەکەی خۆی پێش خۆیدا. ئاگرگرەیەك و داردەستێك کەڕۆژانە مەڕەکانی پێ لێدەخوڕی و کاتێك شەو دادەهات، بەئاگرگرە، ئاگری دەکردەوە. هاورێ لەگەڵ هاوسەر و مەڕەکانی لەدەوری ئاگرەکە شەویان دەکردە ڕۆژ وکاتێك ڕۆژ دادەهات، بەرێدەکەوت. پشتی بەداردەستەکەی دەبەست. داردەستەکەی دولقی بوو.

لەکوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە: کەعب الاخبار هاتە مەککە و عەبدالله کوڕی عەمرۆ کوڕی عاص لەوێ بوو. کەعب وتبووی سێ پرسیاری لێ بپرسن و ئەگەر وەڵامەکانی زانی، زانایە: ئەوە چییە لەبەهەشتا بوو و خواوەند بۆ خەڵکانی ناردە سەرزەوی. یەکەم شت لەسەر زەوی دروست بوو، چی بوو و یەکەم دار کە لەسەر زەوی روێنرا کامەیە.

کاتێك لە عەبدالله‌یان پرسی، وتی:

ئەوەی لەبەهەشتا بوو و خواوەند بەزەوی بەخشی، حجر الاسودە.

ئەوەی یەکەم جار لەسەر زەوی دەرکەوت، بەرەهوتی یەمەنە وگیانی کافرەکان لەویٚ کۆدەبێتەوە.

یەکەم دار کە لەسەر زەوی روێنرا، ئەو دارە بوو موسا داردەستەکەی خۆی لەلقەکانی ئەو دارە بڕی.

کاتێك ئەم وەڵامانەیان بەگوێی کەعب گەیاند، وتی: ئەم پیاوە راست دەکات. سوێند بەخوا ئەو زانایە.

دەڵێت: کاتێك ئەو شەوەهات کەموسا دەبوو بەپێغەمبەر، ڕێگەی ون کرد و نەیزانی بەکام لادا دەبێت بڕوات. ئاگرگرەی خۆی هەڵگرت تا ئاگر بکاتەوە بۆ ئەوەی لەگەڵ کەسەکانی شەو لەو شوێنەدا بەسەر ببات و شارەزای ڕێگەکە ببێتەوە. بەڵام ئاگرگرە، ئاگری نەکردەوە. بێزار بوو. لەدوورەوە ئاگرێکی بینی و بەکەسەکانی خۆی وت:

((امکثوانی آنست نرا لعلی آتیکم منها بخبر او جذوة من النار لعلکم تصطلون.

واتاکەی: من ئاگرێکم بینی، ئەگەری هەیە هەواڵێك لەو ئاگرە یا ئاگر بێنم تا خۆتان گەرم بکەنەوە)).

ڕۆشت و گەیشتە نزیك دارێك. کاتێك نزیك کەوتەوە، دارەکە ڕۆشت و کاتێك ڕۆشتنی دارەکەی بینی، گەڕایەوە. ترسا، کاتێك گەڕایەوە، دارەکە هاتە پێش. لەدارەکەوە دەنگێك بەرز بوویەوە و کاتێك دەنگەکەی بیست، ئارامی گرت و خواوەند فەرمووی: ئەی موسا، پێلاوەکانت داکەنە چوونکە لەسەرزەمینی پیرۆزی (طوی)دایت.

موسا پێلاوەکانی داکەند. خواوەند فەرمووی: ئەی موسا ئەوە چییە لەدەستی راستی تۆدایە؟ وتی: داردەستەکەمە و پشتی پێدەبەستم و مەڕەکانمی پیٚ دەبەم بۆ لەوەڕگە.

فەرمووی: ئەی موسا، فڕیبدە.

داردەستەکەی فڕێدا و بوو بەمارێك وبەرێگەدا دەڕۆشت و دو لقی داردەستەکە ببوو بەدەمی مارەکە. پشتی مارەکە دەجوولاٚ و دانی لەدەمدا بوو. بەو شێوە بوو

کەخواوەند دەیویست.

موسا سەرپیسوڕما و گەڕایەوە. خواوەند بانگی کرد ئەی موسا وەرە پێش و مەترسە. داردەستەکە بۆ شێوەی یەکەمی دەگۆڕم و کاتێك موسا گەڕایەوە، فەرمووی: هەڵیگرە و مەترسە و دەستی خۆت بکە بەدەمیا. موسا دەستی بەقۆلی کراسەکەی داپۆشی چوونکە لەمارەکە دەترسا. دەنگەکە پێی وت: کراسەکە لەقۆڵت وەکە. لایبرد و دەستی خستە ناو دەمی مارەکە ودووبارە بوو بەداردەست و دەستی لەناو لقەکانیدا بوو بەهەمان شێوە کەهەمیشە داردەستەکەی هەڵدگرت.

دواتر خواوەند فەرمووی: دەستی خۆت بۆ گیرفانت ببە. دەستی برد و سپی هاتەدەر.

موسا پیاوێکی لووت قنج، قژ لوول و باڵابەرز بوو. دەستی بۆ گیرفانی برد و دەریهێنا کەهاوشێوەی بەفر سپی بوو. دوبارە دەستی بۆ گیرفانی برد و دەریهێنا و بۆ شێوەی یەکەمی گۆڕابوو. خواوەند فەرمووی: ئەمە دونیشانەی خواوەندە. بۆلای فیرعەون و خەڵکەکەی برۆ چوونکە خەڵکێکی ستەمکارن.

وتی: خواوەندا، کەسێکم لەوانم کوشتووە و دەترسم بمکوژن. براکەم لەمن زمان پاراوترە، ئەو لەگەڵ من رەوانە بفەرموو تا وتەکانی من بێنێتە سەرزمان و ئەوان تێبگەیێنێت.

خواوەند فەرمووی:

((سنشد عضدك باخيك و نجعل لكما سلطانا فلايصلون اليكما باياتنا انتما و من اتبعكما الغالبون.

واتاکەی: بازووی تۆ بەبراکەت بەهێز دەکەین و بەهۆی نیشانەکانی خۆمان ئارامی بەئێوە دەبەخشین تا دەستیان بەئێوە نەگات.))

سەدی دەڵێت: موسا بۆ لای کەسەکانی خۆی گەڕایەوە و لەگەڵ ئەوان رێگەی میسری گرتەبەر. لەکاتی شەودا گەیشتە ئەوێ و بوو بەمیوانی دایکی خۆی. ئەوانی نەدەناسی، شەو بوو. ئەوان نانیان دەخوارد و موسا لەسووچێکی ماڵەکە دانیشت. هارون هات و کاتێك ئەوی بینی، سەبارەت بەو پرسیاری لەدایکی کرد، دایکی وتی: میوانە؟

کاتێك دانیشتن و گفتوگۆیان دەست پێکرد، هارون پرسی: تۆ کێیت؟

وتی: موسام. هەستان و یەکیان لەئامێز گرت. کاتێك یەکیان ناسییەوە، موسا بەهارونی وت: لەگەڵ من بۆ لای فیرعەون بەرێکەوە چوونکە خواوەند ئێمەی ڕەوانە کردووە.

هارون وتی: ملکەچ و گوێڕایەڵم.

دایکیان هەستا و وتی: سوێندتان دەدەم بەخوا، بۆ لای فیرعەون نەڕۆن چوونکە ئێوە دەکوژێت.

ئەوان گوێیان نەگرت و شەوانە ڕۆشتن و گەشتنە بەردەرگای فیرعەون. لەدەرگایاندا. فیرعەون ترسا و درگاوانەکان پرسیان. فیرعەون وتی: کێیە لەم کاتەی شەو تەقە لەدەرگا دەدات؟ درگاوان سەیری کرد و قسەی لەگەڵ کرد.

موسا وتی: من نێردراوی پەروەردگاری جیهانیانم.

درگاوان ترساو ڕۆشتە لای فیرعەون و وتی: پیاوێکی شێتە وگومان دەکات نێردراوی پەروەردگاری جیهانە.

فیرعەون وتی: ڕێگەی نیشانبدە.

موسا هات و وتی: من نێردراوی خواوەندم، منداڵەکانی ئیسرائیل لەگەڵ من ڕەوانە بکە.

فیرعەون ئەوی ناسیەوە و وتی: ((الم نربك فینا و لیدا و لبثت فینا من عمرك سنین. و فعلت فعلتك التی فعلت و انت من الکافرین. قال فعلتها اذاوانا من الضالین. ففررت منکم لما خفتم فوهب لی ربی حکما و جعلنی من المرسلین. و تلك نعمة نمنها علی ان عبدت بنی اسرائیل. قال فرعون و ما رب العالمین. قال رب السموات و الارض و ما بینهما ان کنتم موقنین. قال لمن حوله الا تستمعون. قال ربکم و رب آبائکم الاولین. قال ان رسولکم الذی ارسل الیکم لمجنون. قال رب المشرق و المغرب و ما بینهما ان کنتم تعقلون. قال لئن اتخذت آلها غیری لا جعلنك من المسجونین. قال اولو جئتك بشئی مبین. قال فأت به ان کنت من الصادقین فالقا عصاه فاذا هی ثعبان مبین.

واتاکەی: فیرعەون وتی: مەگەر کاتێك منداڵ بوویت، تۆمان لای خۆمان پەروەردە نەکرد و ساڵەکانی تەمەنت لەناو ئێمەدا بەسەر نەبرد. مەگەر ئەو کارە جوانەیشت ئەنجام نەدا ((ڕاکێشانی ڕیشی فیرعەون)) و مەگەر لەناسوپاسەکان نەبوویت.

موسا وتی: ئەو کارەم کاتێك کرد، رێگەی راستم نەدەزانی و چوونکە لەئێوە ترسام، هەڵاتم. پەروەردگار فرەزانی پێبەخشیم و منی کردە یەکێك لەپێغەمبەران مەگەر ئەوە نیعمەتە، منەتەکەی بەسەر مندا دەنێیت کەمناڵەکانی ئیسرائیلت کردۆتە کۆیلە.

فیرعەون وتی: پەروەردگاری جیهانیان کێیە؟

موسا وتی: پەروەردگاری ئاسمان و زەمین و ئەوەی لەناو ئەواندایە ئەگەر باوەڕدارن.

فیرعەون بەکەسانی دەورووبەری خۆی وت: مەگەر نابیستن؟

موسا وتی: پەروەردگاری ئێوە پەروەردگاری باوکانی ئێوەیە.

فیرعەون وتی: بێ گفتوگۆ، ئەو پێغەمبەری ڕەوانەیان کردووە، شێتە.

موسا وتی: پەروەردگاری ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و ئەوەی لەنێوان ئەواندایە، ئەگەر تێبگەن.

فیرعەون وتی: ئەگەر جگە لەمن کەسێکی دیکە بەخواوەند بزانیت، زیندانیت دەکەم.

موسا وتی: ئەگەر مۆجیزەیەك دیار و ئاشکرا نیشانی تۆ بدەم؟

فیرعون وتی: ئەگەر راست دەکەیت، مۆجیزەکەت نیشان بدە.

موسا داردەستەکەی فرێدا و دەستبەجێ بوو بەئەژدیها.

مار دەمی کردەوە، لێوی خوارەوی لەسەر زەوی دانا و لێوی سەرەوەی لەسەر دیواری کۆشکەکە. بەرەو لای فیرعەون ڕۆشت. کاتێك فیرعەون مارەکەی بینی، هەستا و خۆی پیس کرد. پێشتر هیچ کات خۆی پیس نەکردبوو. هاواری کرد: ئەی موسا، مارەکە بگرە، من باوەڕم بەتۆ هێنا و مناڵەکانی ئیسرائیل لەگەڵ تۆدا ڕەوانە دەکەم. موسا مارەکەی گرت و دوبارە بوو بەداردەست. دواتر دەستی خۆی بۆ گیرفانی برد و بەسپیەتی هێنایەدەر.

موسا لای فیرعەون گەڕایەوە. بەڵام فیرعەون نەیویست باوەڕ بێنێت و مناڵەکانی ئیسرائیل لەگەڵ ئەودا بنێرێت. بەخەڵکەکەی خۆی وت:

(( یا ایها الملاء ما علمت لکم من آله غیری فاوقدلی یاهامان علی الطین فاجعل لی صرحا لعلی اطلع آله موسی.

واتاکەی: ئەی گەورەکانی من، جگە لەخۆم خوایەك بۆ ئێوە ناناسم. ئەی هامان، بۆ من ئاگرێك لەسەر گڵ بکەرەوە و بینایەك بەرزم بۆ دروست بکە. تا بڕۆمە سەر ئەگەری هەیە خواوەندی موسا ببینم.))

کاتێك بورجەکەیان دروست کرد، سەرکەوت، فەرمانی بەتیرهاوێژێکدا و تیرێکی بۆ ئاسمان هاویشت. تیرەکە گەڕایەوە و خوێناوی بوو. فیرعەون وتی: خواوەندی موسام کوشت.

قتادە لەرونکردنەوەی ئایەی قورئان کەسەبارەت بەوتار فیرعەون دەفەرمێت: ئەی هامان ئاگریك لەسەر گڵ پێبکە)) دەڵێت: یەکەم کەس بوو ئاگری سور کردەوە و بورجی پیێ دروست کرد.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك خواوەند موسای وەك پێغەمبەر(د.خ) ڕەوانە کرد، بەرێکەوت تا گەیشتە میسر و لەگەڵ هارون لەبەر دەرگای فیرعەون وەستان. داوای مۆڵەتی چوونەژوورەوەیان دەکرد و وتیان: ئێمە نێردراوانی خواوەندی جیهانین. مۆڵەتمان لەم پیاوە بۆ وەربگرن. وەك دەڵێن بۆ ماوەی دوو ساڵ دەڕۆشتنە بەردەرگای ماڵی فیرعەون. کەس بوێری ئەوەی نەبوو فیرعەون لەکاری ئەوان ئاگادار بکاتەوە. تا ئەوەی قەشمەرەکەی فیرعەون کەگەمەی دەکرد و دەبوە هۆکاری پێکەنینی ئەو، پێی وت: ئەی پاشا، پیاوێك لەبەر دەرگای تۆیە و قسەیەکی سەیر دەهێنێتە سەرزمان و گومان دەکات جگە لەتۆ خوایەکی دیکەی هەیە.

فیرعەون وتی: بیهێنن.

موسایان بۆ لای فیرعەون برد. هارون هاوڕێیەتی دەکرد. داردەستەکەی لەدەستابوو. کاتێك لەبەرابەر فیرعەون وەستا، وتی: من نێردراوی خواوەندی جیهانم. درێژەی داستانەکە لەگێڕانەوەی کوڕی ئیسحاق بەو شێوەیە کەپێشتر ئامارژەمان پێدا. لەکۆتایی گفتوگۆکە موسا داردەستەکەی فرێدا و بوو بەئەژدیهایەکی گەورە. رایان کرد و فیرعەون لەسەر تەختەکەی هاتەخوار و موسای سوێنددا. موسا دەستی بۆ گیرفانی برد و سپی وەك بەفر هاتەدەر. دواتر دەستی بۆ گیرفانی بردەوە و داردەستەکەی گرت. فیرعەون دەستی خستە سەرسکی. وەك دەڵێن پێنج شەش رۆژ تێپەڕی و ئەو هاوشێوەی خەڵکان دەستی بەئاو نەگەیاند و دڵخۆش بوو بەوەی دەڵێن هاوشێوەی کەسانی دیکە نییە.

وەهب کوڕی مونبە دەڵێت: فیرعەون بۆ بیست و چەند ڕۆژ بەردەوام بۆ دەست بەئاو گەیاندن هاتوچۆی دەکرد، ئەوەندەی نەمابوو بمرێت. بەخەڵکەکەی خۆی وت:

ئەمە جادووگەرێکی زانایە، سەبارەت بەو چی دەڵێن؟

یەکێك لەکەسانی باوەڕداری فیرعەون بەناوی حەبرەك وتی:

((أتقتلون رجلا ان يقول ربي الله و قد جائكم بالبينات

واتاکەی: پیاوێك دەکوژن لەبەر ئەوەی دەڵێت: پەوەردگاری من خوای تاقانەیە. لەکاتێکدا چەندین بەڵگەی ڕوونی لەلایەن خواوەندەوە نیشاندان.))

ئەوانی لەئازاب و سزای خوایی ترساند و وتی:

(( ياقوم لكم الملك اليوم ظاهرين في الارض فمن ينصرنا من بأس الله ان جائنا قال فرعون ما اريكم الاما اراى و ما اهديكم الاسبيل الرشاد. و قال الملاء من قومه ارجه و اخاء و ابعث في المدائن حاشرين يأتوك بكل سحار عليم.

واتاکەی: ئەی خەڵکینە، ئێوە پاشایەکتان هەیە و بەسەر ئەم سەرزەمینەدا زاڵن، ئەگەر سزایی خوایی بگات، کێ لەبەرابەر ئەوە هاوکاریمان دەکات.

فیرعەون وتی: تەنیا بۆچوونی خۆم نیشاندان و تەنیا بۆ ڕێگەی ڕاست ڕێنوێنیتان دەکەم.

فیرعەونییەکان وتیان: ئەولەگەڵ براکەی رابگرە و لێپرسراوانی کۆکردنەوە بۆ شارەکان ڕەوانە بکە تا هەموو جادووگەرە شارەزاکان لای تۆ کۆبکەنەوە))

یانی داوای هاوکاری لەجادووگەران بکە چوونکە لەناو ئەوان کەسانێك دەبینی دەتوانن هاوشێوەی کارەکانی ئەوان ئەنجام بدەن. موسا کاتێك هێز و توانایی خوایی نیشانی ئەواندا، لەگەڵ هارون هاتەدەر. فیرعەون کەسەکانی خۆی بۆ شارەکانی وڵاتەکەی خۆی ڕەوانە کرد و لەهەر شوێنێك جادوگەرێکیان بینی، هێنایان. وەك بیستوومە و خوا زاناترە، دەڵێن، بیست و پێنج هەزار جادووگەری کۆکردەوە. فیرعەون پێی وتن: جادوگەرێك هاتۆتە لای ئێمە وهەرگیز هاوشێوەی ئەومان نەبینیوە. ئەگەر بەسەر ئەودا زاڵ بن، ڕێزتان لێدەگرم و لەخۆمتان نزیك دەکەمەوە.

وتیان: ئەگەر بەسەر ئەودا سەرکەوتین، ئەو پاداشتەمان دەبێت؟

وتی: بەڵێ.

وتیان: کاتێك دیاری بکە تا ئێمە و ئەوان یەك ببینین.

سەرکردەی ئەو جادوگەرانی فیرعەون ڕووبەڕووی موسای کردنەوە، چوار کەس بوون. سابوور و عادوور و حەتحەت و موصەفا. ئەوان بوون کاتێك هێز و توانایی خوایان بینی، باوەڕیان هێنا و هەموو جادوگەرانی دیکە بەدوای ئەوان، باوەڕیان هێنا.

فیرعەون کەسی بۆ لای موسا ڕەوانە کرد:

((فاجعل بيننا و بينك موعد الا نخلفه نحن و لا انت مكانا سوى. قال موعدكم يوم الزينه و ان يحشر الناس ضحى. فتولى فرعون فجمع كيده ثم اتى. فاجمعوا كيدكم ثم ائتوا صفاوقد افلح اليوم من استعلى.

واتاکەی: لەنێوان ئێمە و خۆت لەشوێنێکی دیاریکراو، کاتێك دیاری بکە کەسەرپێچی ناکەین. وتی: کاتی دیاریکراو، ڕۆژی ڕازاندنەوەیە کەخەڵك لەکاتی نیمەڕۆ کۆدەبنەوە.))

فیرعەون ڕۆشت و فێڵی خۆی کرد و گەڕایەوە. وتی: فێڵی خۆتان ئامادە بکەن چوونکە لەو ڕۆژەدا هەر کەس سەرکەوێت، ڕزگاری دەبێت.

بیست و پێنج هەزار جادووگەر ڕیزیان بەست. جادووگەران تەناف و داردەستەکانی خۆیانیان لەدەستدا بوو. موسا لەگەڵ براکەی هات و پشتی بەداردەستەکەی خۆی بەستبوو. گەیشتە لای جادووگەران و فیرعەون لەناو کەسەکانی خۆی دانیشتبوو و سەرانی وڵاتەکەی هاورێیەتیان دەکرد. موسا بەجادووگەرانی وت:

((ويلكم لاتفترو اعلى الله كذبا فسيسحتكم بعذاب و قد خاب من افترى.

واتاکەی: هاوار لەئێوە، درۆ بۆ خواوەند هەڵمەبەستن چوونکە بەئازابێکی کوشندە لەناوتان دەبات و هەر کەس درۆ هەڵبەستێت، بێهیوا دەبێت.))

جادووگەران بەیەکیان وت:

((ان هذان لساحران يريدان ان يخرجكما كم من ارضكم بسحرهما و يذهبا بطريقتكم المثلى. يا موسى اما نا تلقى و اما ان تكون اول من القى. قال بل القوا فاذا حبالهم و عصيهم يخيل عليهم من سحرهم انها تسعى.

واتاکەی: ئەوانە دوو جادووگەرن و دەیانەوێت بەجادووی خۆیان ئێوە

لەسەرزەمینەکەتان دەرپەڕێنن و ئایینە چاکەکانی ئێوە لەناو ببەن. وتیان: ئەی موسا تۆ سەرەتا فڕیدەدەیت یا ئێمە دەست پێبکەین. وتی: ئێوە فڕیبدەن. ئەوسا لەکاریگەری جادووکەیان وایان بەرچاو کەوت کەتەناف و داردەستەکانیان بەرێگەدا دەڕوات.))

جادووگەران بەجادووی خۆیان چاوی موسا وفیرعەون و هەموو خەڵکانیان زەق کرد. جادووگەران داردەست و تەنافەکانی دەستیان فڕێدا. مارەکان هاوشێوەی کێوەکان کەدۆڵەکانیان پڕ کردۆتەوە، کەڵەکە بوون. موسا ترسا و وتی: ئەوان داردەستیان پێبوو، بوو بەمار، داردەستەکەی من، جیاواز لەداردەستی ئەوان نییە. خواوەند وەحی نارد:

((ان لق مافی یمینك تلقف ما صنعوا کید ساحر و لا یفلح الساحر حیث انی.

واتاکەی: ئەوەی لەدەستی راستی تۆدایە، فڕیبدە، تا ئەوەی دروستیان کردووە، قووتی بدات، تەنیا جادوویەکیان بەرز کردۆتەوە و جادووگەر لەهەر شوێنێك بێت، رزگاری نابێت.))

موسا دڵخۆش بوو. داردەستەکەی فڕێدا و هەموو تەناف و داردەستی جادووگەرانی یەك لەدوای یەك خوارد بەشێوەیەك یەك دانە لەوان لەو شوێنەدا نەمایەوە.

موسا داردەستەکەی دووبارە بەدەستەوە گرت و جادووگەران کوڕنوشیان برد و ((قالوا آمنا رب هارون و موسی. قال آمنتم له قبل ان اذن لکم انه لکبیر کم الذی علمکم السحر فلا قطعن ایدیکم و ارجلکم من خلاف و لا صلبنکم فی جذوع النخل و لتعلمن اینا اشد عذابا و ابقی. قالوالن نؤثرك علی ما جائنا من البببنات و الذی فطرنا فاقض ما انت قاض، انما تقضی هذه الحیوة الدنیا انا آمنا بربنا لیغفرلنا خطایانا و ما اکرهتنا علیه من السحر و الله خیر و ابقی.

واتاکەی: وتیان: باوەڕمان بەخوا هارون و موسا هەیە.

فیرعەون وتی: بۆ پێش ئەوەی رێگەتان پێبدەم، باوەڕتان بەوان هێنا؟ ئەو گەورەی ئێوەیە و جادووی فێر کردوون، دەست و پێتان بەپێچەوانەوە دەبڕمەوە و بەقەدی دارخورماکانەوە هەڵتان دەواسم بۆ ئەوەی بزانن ئازاب و سزای کام یەك لەئێمە دژوارتر و پایەدارترە.

وتیان: هەرگیز تۆ پێش خواوەندی ئەو مۆجیزانە و ئەو کەسەی ئافرێنەرمانە، ناخەین، هەرکارێك پێت خۆشە ئەنجامی بدە چوونکە تەنیا دەسەلاتت بەسەر ژیانی ئەم دنیایەدا هەیە. ئێمە باوەڕمان بەخوا هێناوە تا لەگوناحەکانمان خۆش ببێت کە لەڕێگەی جادووگەری و بێزاریەوە ئێمەت بۆ ئەنجامدانی ناچار دەکرد چوونکە خواوەند باشتر و هەمیشەییترە.))

دوژمنی خواوەند، بەزێنرا بەلام لەسەر کوفر و ناباوەڕی خۆی پێداگری و حاشای لەنیشانەکانی خوا دەکرد و سەرئەنجام گیرۆدەی وشکەسالی و تۆفان بوو.

سەدی دەلێت: بەلا خواییەکان کەخەلکی فیرعەون گرفتاری بوون، پێش ئەوە بوو موسا و جادووگەران کۆببنەوە. کاتێك تیرەخوێناوییەکە بۆ فیرعەون گەڕایەوە و وتی خوای موسام کوشت، خواوەند تۆفانی ڕەوانە کرد و بارانی باراند و هەموو شتێکی نوقم کرد. وتیان: ئەی موسا داوا لەخواوەند بکە، ئەم بەلایە لەسەر ئێمە هەلبگرە تا باوەڕتان پێ بێنین و منالەکانی ئیسرائیل لەگەل تۆدا ڕەوانە بکەین. خواوەند زیانی لەسەر ئەوان هەلگرت و کشتوکالیان بووژایەوە. وتیان: چەندە باش بوو باران باری. خواوەند کوولەی ڕەوانە کرد و بەرهەمی کشتوکالی ئەوانی خوارد. داوایان لەموسا کرد تا خوا زیانیان لەسەر هەلبگرێت. موسا پاڕایەوە و خواوەند زیانی لەسەر ئەوان هەلگرت بەلام بەرهەمی ئەوتۆیان نەمابوو. وتیان: باوەڕ ناهێنن چوونکە بەرهەمی کشتوکالی ئەوتۆمان نەماوە. خواوەند ئەسپێی ڕەوانە کرد و هەموو شوێنێکی پڕ کرد. دەڕۆشتە ناو جل و بەرگی کەسەکان و دەیگەستن. سەرقالی نان خواردن بوون، دەفرەکانیان پڕدەبوو لەئەسپێ. یەکیان بەگەچ و خشت ستونێکی خلیسکی دروست دەکرد و خواردنەکانی لەسەرەوە دادەنا. کاتێك بەمەبەستی خواردن دەڕۆشت، خواردنەکەی دەبینی پڕ بووە لەئەسپێ. بەلایەکی گەورەتر لەئەسپێیان نەبینیوە. ئەمە ئەو سزایە خواوەند لەقوڕئاندا ئاماژەی پێداوە.

خەلکی فیرعەون داوایان لەموسا کرد لەخواوەند بپاڕێتەوە بۆ ئەوەی زیانەکەیان لەسەر هەلبگرێت و باوەڕ بێنن. کاتێك خواوەند زیانی لەسەر ئەوان هەلگرت، باوەڕیان نەهێنا و خواوەند، خوێنی ڕەوانە کرد. بەشێوەیەك ئیسرائیلیەك و قیبتیەك لەیەك شوێن ئاویان هەلدەگرت، ئاوی قیبتیەکە خوێن و ئاوی ئیسرائیلیەکە وەك خۆی. داوایان لەموسا کرد تا ئەو زیانەیان لەسەر هەلبگرێت و باوەڕ بێنن. زیانیان

لەسەر نەما و باوەڕیان نەهێنا بەهەمان شێوە کەخواوەند دەفەرمێت:

((و لقد اخذنا آل فرعون بالسنين و نقص من الثمرات لعلهم يرجعون.

واتاکەی:فیرعەونییەکانمان گیرۆدەی وشکەساڵی و قاتوقڕی و بێ بەرهەمی کرد تا بگەڕێنەوە و باوەڕ بێنن.))

دواتر خواوەند وەحی بۆ موسا و هارون ڕەوانە کرد بۆ ئەوەی بەنەرمی قسە لەگەڵ فیرعەون بکەن ئەگەری هەیە بەمشێوەیە ئاگادار ببێتەوە و لەخواوەند بترسێت. ڕۆشتنە لای فیرعەون و موسا پێی وت: ئایا دەتەوێت گەنجی (بێ پیر بوون) و پاشایەتی بێ کۆتایی بەتۆ ببەخشم و چێژی جووت بوون و خواردنەوە و سواریت هەبێت و وکاتێك بمریت، بڕۆیتە ناو بەهەشت.؟

ئەم قسانە کاریگەری لەسەر دڵی فیرعەون دانا، وتی: ڕازیم. با هامان بێت.

کاتێك هامان هات، پێی وت: ئەم پیاوە هاتە لای من.

هامان وتی: کێ؟

فیرعەون پێشتر بەجادووگەر ناوی دەبرد بەڵام ئەو ڕۆژە نەیوت جادووگەر، بەڵکو وتی: موسا.

هامان وتی: چی پێ وتی؟

فیرعەون قسەکانی موسای بۆ باس کرد.

هامان وتی: چۆن وەڵامت دایەوە؟

وتی: وەڵامم نەدا وتم با هامان بێت و ڕاوێژی لەگەڵ بکەم.

هامان ئەوی بەلاواز لەقەڵەمدا و وتی: چاوەڕمانی زیاترم لەتۆ بوو. دەتەوێت دوای ئەوەی خواوەند بوویت و دەیانپەرەستیت، ببێتە بەندەیەك کەخوا دەپەرەستێت؟

فیرعەون هاتەدەر و وتی: من خواوەندی تاقانەی ئێوەم. دووری وتەکەی ئەو کەدەڵێت: تەنیا خۆم بەخوای ئێوە دەزانم و وتارەکەی کەدەڵێت: من خواوەندی تاقانەی ئێوەم، چڵ ساڵە.

بەخەڵکەکەی خۆی وت: موسا جادووگەرێکی زانایە ودەیەوێت بەجادووی خۆی ئێوە لەدینەکەتان پەشیمان بکاتەوە. بۆچوونی ئێوە چییە؟

وتیان: خۆی و براکەی ڕابگرە و نێردراوان ڕەوانە بکە تا هەموو جادووگەران

لەسەراسەری ولآت کۆبکەنەوە.

موسا سالاری جادووگەرانی بینی و وتی: ئەگەر بەسەر تۆدا زاڵ ببم، باوەڕ دێنیت و شایەتی دەدەیت، ئەوەی باسی دەکەم، راستییە؟

جادووگەر وتی: بەڵێ، بەلآم بەیانی جادوویەك نیشانی تۆدەدەم هیچ جادوویەك گەورەتر لەوە نەبێت. سوێند بەخوا ئەگەر بەسەر مندا سەرکەوتیت، باوەڕت پێدێنم و شایەتی دەدەم تۆ لەسەر راستیت.

فیرعەون سەیری ئەوانی دەکرد. خواوەند لەگێڕانەوەی وتاری ئەو دەفەرمێت:

((هذالمکر مکرتموه فی المدینة اذا لتقیتما لتتظاهر لتخرجوا منها اهلها فقالوا یا موسا اما ان تلقی و اما ان تکون نحن اول من القی فقال لهم موسی القو.

واتاکەی: ئەمە فریوێکە لەشاردا بیرتان لێکردۆتەوە تا خەڵکەکەی دەربەرێنن. وتیان: ئەی موسا سەرەتا تۆ داردەستەکەی خۆت فڕدەدەیت. یا ئێمە ئەو کارە بکەین؟ وتی: سەرەتا ئێوە فڕیبدەن.))

جادووگەران تەناف و داردەستەکانی خۆیانیان فڕێدا. سی و چەند هەزار کەس بوون، هەموویان تەناف و داردەستیان پێبوو. کاتێك فڕیاندا، چاوی کەسەکانیان جادوو کرد و هۆش وبیری ئەوانیان نەهێشت. موسا ترسا. خواوەند وەحی بۆ نارد: مەترسە و ئەوەی لەدەستی راستتدایە، فڕێبدە تا ئەوەی دروستیان کردووە، لەناو ببات.

موسا داردەستەکەی فڕدا و هەموو مارەکانی خوارد. کاتێك ئەمەیان بینی، کوڕنوشیان برد و وتیان:

((آمنا برب العالمین رب هارون و موسا قال فرعون لا قعطن ایدیکم و ارجلکم من خلاف و لا صلبنکم فی جذوع النخل.

واتاکەی: باوەڕمان بەخوای موسا و هارون هەیە.

فیرعەون وتی: دەست وپێتان (چەپ و راست)، دەبڕمە و بەقەدی دارخورماکانەوە هەڵتاندەواسم.))

ئەوانی کوشت و دەست و پێی ئەوانی بڕی. بەوتەی کوڕی عەباس، وتوویانە: خواوەندا سەبرمان پێببەخشە و هاوشێوەی موسوڵمانەکان بمانمرێنە.

دەڵێت: لەسەرەتای ڕۆژ جادووگەر بوون و لەکۆتاییەکانی ڕۆژ. موسوڵمان.

بەختی مناڵەکانی ئیسرائیل بەرز بوویەوە و خەڵکی فیرعەون، پێیان وت:

((اتذر موسى و قومه ليفسدوا في الارض و يذرك و آلهتك.

واتاکەی: بۆ موسا و خەڵکەکەی پشت گوێ دەخەیت تا لەم سەرزەمینە خراپەکاری بکەن و تۆ و خواکانت پشتگوێ بخەن.))

خواکانی ئەو، بەهەمان شێوە کوڕی عەباس دەڵێت، گاکان بوون. کاتێك گایەکی جوانتری دەبینی، فەرمانی پەرەستینی ئەوی دەردەکرد و گایەکی بۆ پەرەستینی ئەوان دەستنیشان دەکرد.

دوای ئەوەی خواوەند فەرمانی بەموسادا مناڵەکانی ئیسرائیل لەمیسر بباتەدەر، فەرمووی: بەندەکانی من لەشەودا ببە چوونکە شوێنیان دەکەون.

موسا فەرمانی بە مناڵەکانی ئیسرائیلدا تا بۆ ڕۆشتنەدەر لەمیسر خۆیان ئامادە بکەن. وتی: زێڕ و زیو لەقیبتیەکان بەقەرز وەربگرن. پێی وتن: هیچ کەسێك باسی ڕۆشتنی خۆی نەکات و تا بەرەبەیان لەناو ماڵەکان بمێننەوە. هەرکەس هاتەدەر، ناوی موسا یا عەمرۆ بێنێتە سەرزمان. فەرمانیدا هەرکەس لەماڵ هاتەدەر، بەدەستی خوێناوی لەدیواری ماڵەکەی وێنەیەك بکێشێت تا ئاشکرا ببێت بەرێکەوتووە. خواوەند هەموو زینازادەکانی (مناڵە ناشەرعیەکان) قیتبی کە لەمناڵەکانی ئیسرائیل بوون، بۆ ئەوان گەڕاندەوە و بەپێچەوانەیشەوە. موسا وتی:

((ربنا انك اتيت فرعون و ملئه زينه و اموالا في الحيوة الدنيا، ربنا ليضلوا عن سبيلك ربنا اطمس على اموالهم و اشدد على قلوبهم فلا يؤمنوا حتى يروا العذاب الاليم.

واتاکەی: تۆ بەفیرعەون و گەورەکانی خەڵکەکەی، لەم دنیایە، زێڕ و زیوت بەخشیوە تا خەڵکان لەسەر ڕێگەی ڕاست گومڕا بکەن، پەروەردگارا، دارایی ئەوان لەناو ببە و دڵیان ڕەق بکە تا باوەڕ نەهێنن تا ئەو کاتەی ئازابێکی گشتگیر و بەئازار، بەسەریاندا دەبارێت.))

سەدی دەڵێت: موسا دۆعای کرد و هارون وتی ئامین. خواوەند فەرمووی: دۆعاکەی ئێوە گیرا دەکەم.

دەڵێن مەبەست لە لەناوچونی دارایی ئەوان سووك و کەم بایی بوونی درەم و

دینارەکانیانە. خواوەند فەرمووی خۆراگر بن. لەگەڵ خەڵکەکەی خۆیان هاتنەدەر و مەرگ لەناو قیبتیەکان بڵاوبوویەوە و منالی یەکەمی هەموو خەڵکان مرد و سەرقاڵی بەخاك سپاردنی ئەوان بوون و شوێن منالەکانی ئیسرائیل نەکەوتن. موسا لەکۆتایی منالەکانی ئیسرائیل ڕێگەی دەبڕی و هارون لەپێشیانەوە.

موسا هاوڕێ لەگەڵ شەشسەد هەزار شەڕکەر هاتەدەر. تەمەن بیست ساڵەکانیان هەژمار نەکرد لەگەڵ شەست ساڵەکان کەپیر و پەککەوتە بوون. تەنیا ساڵەکانی نێوان ئەم دوو ساڵەیان بژارد. فیرعەون شوێنیان کەوت. هامان لەپێشەوەی سوپاکەدا بوو. ئەو لەگەڵ هەزار هەزار و حەوتسەد هەزار ئەسپ (کەتەنانەت یەك مایینیان لەناودا نەبوو) بەرێکەوت. خواوەند لەگێڕانەوەی بارودۆخەکە دەفەرمێت: (( فارسل فرعون فی المدائن حاشرین ان هولاء لشرذمة قلیلون و انهم لنا لغائظزن. و انا لجمیع حاذرون. فاخرجناهم من جنات و عیون و کنوز و مقام کریم. کذلك و اورثنا بنی اسرائیل. فاتبعوهم مشرقین فلما تراء الجمعان قال اصحاب موسی انالمدر کون. واتاکەی: فیرعەون لێپرسراوانی کۆکردنەوەی بۆ شارەکان ڕەوانە کرد، ئەوان دەستەیەکی کەمن و بوونەتە هۆی توڕە بونی ئێمە و ئێمە هەمووان ئامادە و تەیارین. لەباخەکان و سەرچاوەکان و گەنجەکان و جێگەکانی خۆیان ئەوانمان هێنایەدەر و ئەوانمان بە منالەکانی ئیسرائیلدا. لەبەرەبەیاندا شوێنیان کەوتن و کاتێك ڕووبەڕوی یەکبوونەوە، هاوەڵانی موسا وتیان، ئێمەیان گرت.

((قالوا اوذینا من قبل ان تأتینا و من بعد ما جئتنا قال عسی ربکم ان یهلك عدوکم و یستخلفکم فی الارض فینظر کیف تعلمون.

واتاکەی: وتی: ئیسرائیلیەکان بەموسایان وت، پێش ئەوەی بێی بۆ لای ئێمە و دوای ئەوەی هاتیت، ئازارمان پێبڕا. وتی: ئەگەری هەیە پەروەردگار، دوژمن لەناو ببات و ئێوە بکاتە جێگری ئەوان لەو سەرزەمینە و بزانێت کردارەکانی ئێوە چۆن دەبێت.))

هارون ڕۆشتە پێش و لەدەریاییدا، بەڵام دەریا قەڵشتی نەبرد. موسا هات و بەناوی باوکی خالید بانگی دەریای کرد. لەدەریاییدا و قەڵشتی برد. هەرلایەکی هاوشێوەی کێوێکی گەورە بوو. منالەکانی ئیسرائیل ملی ڕێگەیان بڕی. دوانزە ڕێگە

لەدەریاکەدا بوو و هەر نەوەیەك لەرێگەیەکەوە ڕۆشتن. رێگەکە دیواری هەبوو. هەریەك لەنەوەکان وتیان: هاورێیانی ئێمە کوژران. کاتێك موسا ئەمەی بینی و بیستی، داوای لەخواوەند کرد تا قەڵشتەکان کۆبکاتەوە هاوشێوەی تاق . یەکتریان دەبینی تا هاتنەدەر.

دوای ئەوە، فیرعەون و سوپاکەی نزیك کەوتنەوە. کاتێك فیرعەون دەریای بینی، وتی: مەگەر نابینن، دەریا لەمن ترسا و رێگەی بۆ من کردەوە تا بەدوژمنەکانم بگەمەوە و بیانکوژم. کاتێك فیرعەون گەیشتە سەرەتای رێگەکە، سوپاکەی نەیانویست، بڕۆنە ناو دەریا. جبرەئیل سوار مایینێك هات و ئەسپەکان بەدوای یەك شوێن مایینەکە کەوتن. کاتێك یەکەم کەس لەسوپاکەی فیرعەون دەیویست لەئاوەکە بێتەدەر و دوایین کەسیان دەیویست بڕواتە ناو ئاوەکە، خواوەند فەرمانی بەدەریادا تا بیانگرێت و هەڵیانلوشێت. جبرەئیل قوڕی لەدەریا هەڵگرت و دەمی فیرعەونی پێپڕکرد. فیرعەون کاتێك دەخنکا، وتی: آمنت انه لا اله الا الذی آمنت بەبنو اسرائیل و انا من المسلمین.

واتاکەی: رازیم بەوەی خوایەك جگە لەخوای منداڵەکانی ئیسرائیل نییە کەباوەڕیان پێی هێناوە. من یەکێکم لەملکەچەکان. خواوەند میکائیلی ڕەوانە کرد تا سەرکۆنەی بکات و بڵێت:

((الان وقد عصیت قبل و کنت من المفسدین.

واتاکەی: ئێستاکە؟ تۆ کەپێشتر گوناحکاریت دەکرد و لەخراپەکاران بویت.))

جبرەئیل بەپێغەمبەری وت: ئەی محەممەد، هەرگیز کەسم وەك دوو کەس بەدوژمن نەزانیوە کەیەکیان جنۆکە بوو، یانی ئیبلیس ئەو کاتەی نەیویست کوڕنوش بۆ ئادەم ببات و ئەویتریان فیرعەون کەوتی: من خواوەندی تاقانەی ئێوەم. ئەگەر دەتبینی، قوڕم هەڵگرت و دەمیم پڕکرد لەبەر ئەوەی نەکا وشەیەك بێنێتە سەرزمان و خواوەند بەزەیی پێیایدا بێتەوە.

منداڵەکانی ئیسرائیل وتیان فیرعەون نەخنکاوە و ئێستاکە دەگات و دەمانکوژێت. موسا پاڕایەوە و فیرعەون لەگەڵ سێسەد و بیست هەزار کەس هاتەدەر وهەموویان دەست وپێیان بەزنجیر بەسترابوویەوە. منداڵەکانی ئیسرائیل گرتیان و دەستیان بەبڕینی ئەندامەکانی کرد. خواوەند لەقورئاندا دەفەرمێت:

((فالیوم ننجیك ببدنك لتكون لمن خلفك آیة.

واتاکەی: ئێستا جەستەت بۆ شوێنی بەرز، بڵند دەکەین تا بۆ ئەو کەسەی شوێن تۆ دەکەوێت، وانەیەك بێت.))

کاتێك مەبەستی ڕۆشتیان کرد، ڕووبەڕووی بیابانێك بوونەوە و نەیانزانی بۆ کوێ بڕۆن. موسا گەورەی منداڵەکانی ئیسرائیلی کۆکردەوە و وتی: بۆ وای لێهات؟

وتیان: کاتێك یوسف لەسەرەمەرگدا بوو، پەیمانی لەبراکانی وەرگرت لەمیسر نەڕۆن تا ئەو کاتەی ئەو لەگەڵ خۆیان دەبەن. ئەمە کێشەکەیە.

وتی: گۆڕی یوسف لەکوێیە؟. نەیاندەزانی.

موسا هەستا و هاواری کرد: سوێندتان دەدەم بەخوا، هەرکەس شوێنی گۆڕی یوسف دەزانێت، پێم بڵێت و هەر کەس نازانێت ، وتارەکەی من نەبیستێت. لەنێوان دوو کەسەوە دەڕۆشت و هاواری دەکرد. کەس دەنگی ئەوی نەدەبیست. سەرئەنجام پیرێژنێك بیستی و وتی: ئەگەر گۆڕی یوسفت نیشان بدەم، هەرچی بخوازم، پێمدەبەخشیت؟

موسا رازی نەبوو، وتی: دەبێت لەخواوەند بپرسم. خواوەند، فەرمانی پێدا، هەرچی دەخوازێت، پێی ببەخشە و بەڵێنی لێوەربگرە. پیرێژن وتی: دەمەوێت لەهەر ژوورێکی بەهەشت کەدابەزیت، لەگەڵ تۆبم.

موسا وتی: رازیم.

پیرێژن وتی: پیرێکی پەککەوتەم و ناتوانم بەرێگەدا برۆم. موسا ئەوی هەڵگرت و کات گەیشتنە نزیك رووباری نیل، پیرێژن وتی: گۆڕی یوسف، لەناو ئاوەکەدایە، داوا لەخواوەند بکە تا ئاو لەسەر گۆڕەکە لا بیات.

موسا لەخوا پاڕایەوە. ئاو لەسەر گۆڕەکە نەما. پیرێژن وتی: گۆڕەکە هەڵبدەرەوە.

ئەم کارەی کرد و ئێسقانی یوسفی هەڵگرت. بەمشێوەیە رێگەی منداڵەکانی ئیسرائیل کرایەوە.

((فسارو افأتوا علی قوم یعکفون علی اصنام لهم قالوا یا موسا اجعل لنا الها کما لعم قال انکم قوم تجهلون. ان هولاء منبر ماهم فیه و باطل ما کانوا یعلمون.

واتاکەی: لای خەڵکانێك تێپەڕین کەبتە دەسکردەکانی خۆیانیان دەپەرەست. وتیان: ئەی موسا، خوایەکی هاوشێوەی ئەوانمان بۆ دروست بکە چوونکە ئەوانیش

خوایان هەیە. وتی: ئێوە دەستەیەکی نەزانن. شێوەی ئەم خەڵکە شیاوە بۆ لەناوچوون و ئەو کردەوانەی ئەنجامی دەدەن، ناڕەوایە.))

بەڵام گێڕانەوەی کوڕی ئیسحاق بەمشێوەیە: خواوەند چەندین ئایە و مۆجیزەی نیشانی خەڵکاندا و فیرعەونی بەبەلاً و زیانەکان گرفتار کرد چوونکە دوای کاری جادووگەران باوەڕی نەهێنا. سەرەتا تۆفانی ڕەوانە کرد، دواتر کوولە، ئەسپێ، قرپۆك، لەکۆتاییەدا خوێن کەهەمووی نیشانەکانی خوا بوون.

سەرەتا تۆفانی ڕەوانە کرد و ئاو سەرزەوی داپۆشی و نەیاتوانی کشتوکاڵ بکەن. برسیەتی تەنگی پێهەڵچنین، وتیان: ئەی موسا، لەخوای خۆت بپاڕێرەوە، چوونکە ئەگەر بەلاًمان لەسەر هەڵبگرێت، باوەڕ دێنین و منداڵەکانی ئیسرائیل لەگەڵ تۆ ڕەوانە دەکەین. موسا لەخوا پاڕایەوە و زیانی لەسەر ئەوان هەڵگرت بەلاًم بەڵێنەکەی خۆیان نەبردە سەر.

خواوەند کوولەی ڕەوانە کرد. دارەکانیان خوارد و بەوشێوەی باسی دەکەن، بزماری ئاسنینی دەرگاکانیشان دەخوارد. ماڵەکان دارمان. دوبارە بەموسایان وت لەخوا بپارێتەوە. موسا پاڕایەوە و خواوەند زیانی لەسەر هەڵگرتن، بەلاًم بەڵێنەکەی خۆیان نەبردە سەر.

خواوەند، ئەسپێی نارد. وەك دەڵێن بەموسا وترا، بڕواتە لای تەپۆڵکەیەك و بەداردەستەکەی خۆی لێیبدات. موسا ڕووی لەتەپۆڵکەیەکی بەرز کرد و بەداردەستەکەی خۆی لێیدا. هەمووی بوو بەئەسپێ و بەسەر ماڵ و خواردنییەکاندا زاڵبوون. خەو و ئارامی لەوان گرتەوە و کاتێك زۆریان بۆهات، وتەکانی خۆیان لەگەڵ موسا دووبارە کردەوە. موسا، لەخوا پاڕایەوە و زیانی لەسەر ئەوان هەڵگرت بەلاًم بەڵێنەکەی خۆیان نەبردە سەر.

خواوەند، قرپۆکەکانی نارد و ماڵ و خواردنو دەفرەکانیان پڕبوو لەقرپۆك. کەس جل و بەرگ، خواردن یا دەفری هەڵنەدەگرت مەگەر ئەوەی پڕ بوو لەقرپۆك. کاتێك لەگیانی خۆیان بێزار بوون، ڕۆشتنە لای موسا و وتەکانی پێشوویان هێنایە سەرزمان. موسا لەخوا پاڕایەوە و زیانی لەسەر ئەوان هەڵگرت بەلاًم دووبارە بەڵێنەکەی خۆیان نەبردەسەر.

خواوەند خوێنی نارد. ئاوی فیرعەونییەکان بوو بەخوێن. ئەو ئاوەی لەچاڵاو یا

کانی هەڵیاندەگرت، خوێن بوو.

لەکوڕی کەعبی قورەزەی دەگێڕنەوە: ژنێك لەفیرعەونییەکان دەڕۆشتە لای ژنێك لەمناڵەکانی ئیسرائیل و دەیوت، ئاوم پێبدە. لەگۆزەکەی خۆی ئاوی پێدەدا بەڵام لەدەفرە؟ ی ئەودا دەبوو بەخوێن. هەندێ کات دەیانوت، ئاو بکەرە ناو دەمی و لەناو دەمیدا دەبوو بەخوێن. حەوت ڕۆژیان بەمشێوەیە بەسەر برد. بەموسایان وت: لەخواوەند بپارێرەوە تا زیانمان لەسەر هەڵبگرێت. دواتر باوەڕ دێنین و مناڵەکانی ئیسرائیل لەگەڵ تۆدەنێرین. کاتێك زیانیان لەسەر نەما، بەڵێنەکەی خۆیان نەبردەسەر.

خواوەند فەرمانی بەرێکەوتنی بەموسادا. ئاگاداری کردەوە خۆی وخەڵکەکەی ڕزگار دەکات بەڵام فیرعەون و سوپاکەی لەناو دەبات. موسا نفرینی خەڵکی فیرعەونی کرد تا سامانەکانیان بەفیڕۆ چێت.

خواوەند، سامانی (دارخورماکان، کۆیلە، خواردن) ئەوانی کردە بەرد و ئەمە یەکێك لەو نیشانانە بوو، نیشانی فیرعەونیدا.

محەممەد کوڕی کەعبی قورەزی دەڵێت: عومەر کوڕی عەبدولعەزیز، لەمنی پرسی، نۆ نیشانە کەخواوەند نیشانی فیرعەونیدا، کامانەن؟ وتم: تۆفان، کوولە، ئەسپێ، قرپۆکەکان و خوێن و داردەستی موسا و دەستی موسا و بەفیرۆچوونی سامانەکانیان.

عومەر وتی: چۆن زانیت، بەفیرۆچوونی سامانەکان یەکێك لەنیشانەکانی خواوەند بوو؟

وتم: موسا نفرینی کرد و هارون وتی ئامین. خوا سامانی ئەوانی کردە بەرد.

وتی: زانست دەبێت بەمشێوەیە بێت. داوای کیسەیەکی کرد. چەندین شت لەسامانە بەفیرۆچووەکانی تیا بوو کەعەبدولعەزیز کوڕی مەروان لەکاتی فەرمانڕەوایی کردنی میسر لەپاشماوەی ماڵ و سامانی فیرعەونییەکان بەدەستی هێنابوو. لەناویاندا هێلکەی بێ توێکڵی دوو لەت دەبینرا کەبەرد بوو. گوێزی بێ توێکڵ لەشێوەی بەرد نۆك و ماش لەشێوەی بەرد. هەروەها لەیەکێك لەدانیشتووانی شامی نیشتەجێی میسر دەگێڕنەوە: دارخورمام بینی ببوو بەبەرد. مرۆڤێکم بینی گومانم کرد مرۆڤە، بەڵام کۆیلەیەك بوو ببوو بەبەرد.

خواوەند دەفەرمێت:

((ولقد آتينا موسى تسع آيات بينات فسئل بنى اسرائيل اذ جائهم فقال له فرعون انى لا ظنك يا موسى مسحورا، قال لقد علمت ما انزل هولاء الارب السموات و الارض بصائر اواني لاضنك يا فرعون مثبورا.

واتاکەی: نۆ مۆجیزەی ئاشکرامان بەموسادا. لەکوڕی منداڵەکانی ئیسرائیل بپرسە ئەو کاتەی هات و فیرعەون پێی وت: ئەی موسا، تۆ بەجادوو کراو دەزانم. وتی: دەزانی ئەم مۆجیزانە تەنیا خواوەندی ئاسمان و زەویەکان ڕەوانەی کردووە و ئەی فیرعەون، تۆ بە لەناوچوو دەبینم.))

لەعورە کوڕی زوبەیر دەگێڕنەوە: کاتێك خواوەند فەرمانی بردنی منداڵەکانی ئیسرائیلی بەموسادا، فەرمانیدا گۆری یوسفیش لەگەڵ خۆی ببات تا لەزەوی پیرۆز بەخاکی بسپێرێت. موسا پرسیاری شوێنی گۆڕی یوسفی کرد و کەس نەیدەزانی مەگەر پیرێژنێك لە منداڵەکانی ئیسرائیل. وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، من شوێنەکەی دەزانم، ئەگەر لەگەڵ خۆتم ببەیت و لەسەرزەمینی میسر بەجێم نەهێڵیت، شوێنەکەی نیشانی تۆ دەدەم.

موسا وتی: رازیم.

موسا فەرمانی بەمنداڵەکانی ئیسرائیلی دابوو بەرەبەیانی بەرێکەون. داوای لەخواوەند کرد تا هەڵاتنی خۆر دوا بخات بۆ ئەوەی لەکاری هەڵگرتنی گۆڕی یوسف تەواو ببێت. خواوەند ئەو کارەی کرد. پیرێژن لەگەڵ ئەو بەرێکەوت و گۆڕی یوسفی لەناو ڕووباری نیل نیشاندا. موسا دەریهێنا. لەناو سنوقێکی مەڕمەڕیندا بوو. سنوقەکەی لەگەڵ خۆی برد.

عوروە دەڵێت: لەبەر ئەمەیە جوولەکەکان مردوەکانی خۆیان لەهەموو شوێنێکەوە، بۆ سەرزەمینی پیرۆز دەبەن.

لەکوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە: موسا بەفەرمانی خواوەند بەمنداڵەکانی ئیسرائیلی وت: لەفیرعەونییەکان کەل و پەل و جل و بەرگ و زێر و زیو بەقەرز وەربگرن وکاتێك لەناوچوون، سامانەکانیان بۆ ئێوە دبێت. کاتێك فیرعەون بۆ شوێنکەوتنی موسا و منداڵەکانی ئیسرائیل، جاڕیدا، یەکێك لەو دروشمانەی بۆ هاندانی خەڵك بەکاری دەبرد ئەوەبوو: بەباشیان نەدەزانی تەنیا خۆیان بڕۆن، بەڵکو سامانی ئێوەیشیان

لەگەڵ خۆیان برد.

لەعەبداللە کوڕی شەداد دەگێڕنەوە: فیرعەون هاوڕێ لەگەڵ حەفتا هەزار ئەسپی ڕەش شوێن موسا کەوت. ئەمە جیاوازە لەئەسپە ئەبڵەقەکانی سوپاکەی. موسا ڕۆشت تا گەیشتە دەریا. ڕێگەیان نەبوو، فیرعەون و سوپاکەی لێیان نزیک کەوتنەوە. کاتێك هەردوو لای یەکتریان بینی، هاوەڵانی موسا وتیان: پێیمان گەشتنەوە.

موسا وتی: هەرگیزن پێمان ناگەن چوونکە پەروەردگار لەگەڵمدایە ورێنوێنیم دەکات. خوا، بەڵێنی پێداوم و بەڵێنەکانی ئەو درۆی تیا نییە.

لەمحەممەد کوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە: خواوەند وەحی بەدەریا کرد کاتێك موسا بەداردەستەکەی خۆی لەتۆیدا، قەڵشت بەرە. دەریا لەترسی وەحی خواوەند و چاوەڕوانی بەردەوام هەڵبەز و دابەزی دەکرد. خواوەند وەحی بەموسا کرد، بەداردەستەکەی خۆت لەدەریا بدە. موسا ئەو کارەی کرد. هێزی خواوەند کەبەموسای بەخشیبوو، لەداردەستەکەدا بوو. دەریا قەڵشتی برد. هەر لایەکی هاوشێوەی کێوێکی گەورە بوو.

خواوەند دەفەرمێت: ((اضرب لهم طريقا في البحريبسا لا تخاف در كاولا تخشى.

واتاکەی: بۆ ئەوان لەدەریا ڕێگەیەکی وشکایی بدۆزەرەوە، و لەگرتنی دوژمنان، نەبترسە و نەبتۆقە.))

کاتێك ڕێگەی وشکایی دەرکەوت، موسا و منداڵەکانی ئیسرائیل بەڕێکەوتن و فیرعەون و سوپاکەی بەدوای ئەواندا.

لەعەبداللە کوڕی شەداد دەگێڕنەوە: کاتێك منداڵەکانی ئیسرائیل ڕۆشتنە ناو دەریا و هیچ کەس لەوان نەمایەوە، فیرعەون سوار لەسەر ئەسپێك هات و لەلێواری دەریاکە وەستا. ئەسپەکەی لەترسا توانای ڕۆشتنە پێشی نەبوو. جبرەئیل سوار لەسەر مایینێك هات و لێی نزیك کەوتەوە و دواتر ملی ڕێگەکەی گرتەبەر. ئەسپەکەی فیرعەون بەدوایدا ڕۆشت. کاتێك سوپاکە بینیان فیرعەون ڕۆشتۆتە سەر ڕێگاکە، بەدوای ئەودا بەڕێکەوتن. جبرەئیل لەپێش فیرعەونەوە بوو و میکائیل سوار لەسەر ئەسپێك لەدوای سوپاکەوە ڕێگەی دەبڕی و ئەوانی بۆ پێشەوە دەبرد و دەیوت: پەیوەستی فیرعەون بن. کاتێك جبرەئیل لەدەریاکە هاتەدەر، کەس لەبەردەمی نەبوو کاتێك میکائیل ڕۆشتە ناو دەریاکە، کەس لەپشت سەریەوە نەبوو. دەریا بۆ

شێوەی یەکەمی خۆی گۆڕا و کاتێك فیرعەون لاوازی خۆی و بەهێزی خواوەندی بینی، باوەڕی هێنا، بەڵام سوودی نەبوو.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: جبرەئیل هاتە لای پێغەمبەر(د.خ) و وتی: ئەگەر منت دەبینی! قوڕم دەکردە دەمی فیرعەون لەترسی ئەوە نەکا بەزەیی خواوەند بیگریتەوە..

دەڵێن: ئەگەر خواوەند جەستەی ئەوی نەدەهێنایەدەر بۆ ئەوەی بیناسنەوە، دەستەیەك گومانیان لا دروست دەبوو.

کاتێك منداڵەکانی ئیسرائیل لەدەریا پەڕینەوە، خەڵکانێکی بت پەرەستیان بینی، وتیان:

(( یا موسی اجعل لنا آلها کما لهم آلهة. قال انکم قوم تجلون ان هولاء متبر ما هم فیه و باطل ما کانوا یعلمون، قال اغیر الله ابغیکم لها و هو فضلکم علی العالمین.

واتاکەی: ئەی موسا، بۆ ئێمەیش خوایەك دروست بکە وەك ئەوان کەخوایان هەیە. وتی: ئێوە دەستەیەکی نەزانن. شێوازی ئەم خەڵکە شیاوە بۆ لەناوچوون و ئەو کردەوانەی ئەنجامی دەدەن، فیڕۆ و ناڕەوایە. چۆن بۆ ئێوە جگە لەخوای تاقانە کە لەپێشی هەموو خەڵکانی بەئێوە بەخشیوە، خوایەك دیاری بکەم.))

دەڵێت: کاتێك خواوەند فیرعەون و سوپاکەی لەناو برد، بەڵێنی سی شەوی لەموسا وەرگرت.

سەدی دەڵێت: دوای ئەوە جبرەئیل هاتە لای موسا تا بیبات بۆ لای خوا. سوار لەسەر ئەسپێك بوو، سامری ئەوی بینی و سەریسوڕما. دەڵێن: ئەسپی ژیان بوو و کاتێك سامری بینی، وتی: ئەمە ئەسپێکی سەیرە. لەخۆڵی سمی ئەسپەکەی هەڵگرت. موسا ڕۆشت و هارونی وەك جێگری خۆی لەسەر منداڵەکانی ئیسرائیل دەستنیشان کرد. سی شەو لای خوا مایەوە و دواتر خواوەند بەدە ڕۆژی دیکە تەواوی کرد.

هارون بە منداڵەکانی ئیسرائیلی وت: تالآنی بۆ ئێوە ڕەوا نییە و زێروزیوی قیبتیەکان تالآنییە. هەموویان کۆبکەنەوە و چاڵێك هەڵکەنن و زێڕ و زیوەکان چاڵ بکەن. ئەگەر موسا گەڕایەوە و حەلآلی کرد، هەڵیانبگرن وگەرنە لەناو چاڵەکەدا دەمێنێتەوە. زێڕ و زیوەکانیان لەچاڵێکدا کۆکردەوە. سامری هات و خۆڵەکەی کرد

بەسەریاندا. خواوەند لەزێر و زیوەکان گوێرەکەیەکی دروست کرد کەدەنگی هەبوو.

منالّەکانی ئیسرائیل کاتەکەی موسایان بژارد. شەویان وەك رۆژ هەژمار دەکرد و کاتێك بیست رۆژ تێپەڕی، گوێرەکەکە هاتەدەر و کاتێك بینیان، سامری وت: ئەمە خوای ئێوە و خوای موسایە کە لەبیری کردووە.

یانی خوای خۆی لێرە بەجێهێشتوە و لەشوێنێکی دیکە بۆی دەگەڕێت.خەڵکان دەستیان بەپەرەستینی گوێرەکەکە کرد. گوێرەکە دەنگی هەبوو و بەرێگەدا دەڕۆشت.

هارون پێی وتن: ئەی منالّەکانی ئیسرائیل، گوێرەکە هۆکاری تاقیکردنەوەی ئێوەیە و خواوەندی ئێوە رەحمانە. بەلاّم هارون و هاوەلاّنی شەریان لەگەڵ گوێرەکە پەرەستەکان نەکرد.

موسا بۆ بینینی خواوەند ڕۆشت تا قسەی لەگەڵ بکات. کاتێك خواوەند قسەی لەگەڵ فەرموو:

((قال له ما اعجلك عن قومك يا موسا، قال هم اولاء على اثرى و عجلت اليك رب لترضى، قال فانا قد فتنا قومك من بعدك و اضلهم السامرى.

واتاکەی: ئەی موسا، بۆ بەخێرایی پێش خەڵکەکەی خۆت کەوتیت؟ وتی: ئەوان شوێنکەوتەی منن. بەپەلە هاتم تا رەزامەند بیت، ئەی پەروەردگار. وتی: دوای تۆ خەڵکەکەتتمان تاقیکردەوە و سامری ئەوانی گومڕا کرد.

کاتێك لەداستانەکە ئاگادار بوویەوە، وتی: پەروەردگارا، سامری وتی گوێرەکەکە وەك خواوەند بناسن بەلاّم کێ رۆحی پێبەخشی.

پەروەردگار فەرمووی: من.

وتی: کەواتە تۆ گومڕات کردن؟

کاتێك پەروەردگار لەگەڵ موسا قسەی کرد، مەبەستی بینینی خواوەندی کرد، وتی:

(( رب ارنى انظر اليك قال لن ترانى و لكن انظر الى الجبل فأن استقر مكانه فسوف ترانى.

واتاکەی: پەروەردگارا، خۆتم نیشان بدە تا بتبینم.

خواوەند فەرمووی: هەرگیز من نابینیت. بەڵام سەیری ئەو کێوە بکە، ئەگەر لەشوێنەکەی خۆی مایەوە، ئەگەری هەیە بتوانی من ببینیت.))

فریشتەکان دەوری کێوەکەیان گرت و ئاگر دەوری فریشتەکان، لەدەوری ئاگر، فریشتەکان بوون و دوبارە لەدەوری فریشتەکان ئاگر. خواوەند خۆی نیشانی کێوەکەدا.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: رووناکی خواوەند بەئەندازەی سەری یەك پەنجە بوو، کێو شلەژا و موسا بێهۆش کەوت و تا ئەو کاتەی خواوەند مەبەستی کرد، بێهۆش بوو. کاتێك هاتەهۆش، وتی: خوایە، پاکی تۆ دێنمە سەرزمان و بۆ لای تۆ دەگەڕێمەوە و باوەڕداری یەکمینم. یانی یەکەم باوەڕداری مناڵەکانی ئیسرائیل.

خواوەند فەرمووی:

((یاموسی انی اصطفیتك علی الناس برسالاتی و بکلامی فخذ ما اتیتك و کن من الشاکرین و کتب له فی الالواح من کل شیئی موعظة و تفصیلا لکل شیئی فخذها بقوة وء امر قومك یأخذوا باحسنها.

واتاکەی: ئەی موسا، تۆم بۆ پێغەمبەری و قسەکردنی خۆم لەناو خەڵك هەڵبژارد، ئەوەی بەتۆم بەخشیوە، وەریبگرە و لەسوپاسوگوزاران بە. بۆ ئەو، لەناو لەوحەکان لەهەر جۆرە ئامۆژگاریەکمان تۆمار کرد و هەموو شتەکانمان روونکردەوە و وتمان، بەتوندی بیانپارێزە و فەرمان بەخەڵکەکەی خۆت بدە بەجوانی بیپارێزن.))

دوای ئەوە کەس نەیدەتوانی سەیری روخساری موسا بکات و بەردەوام روخساری بەپارچەیەك دادەپۆشی.

موسا لەوحەکانی هەڵگرت و خەمبار و تووڕە بۆ لای خەڵکەکەی خۆی گەڕایەوە.

(( قال یا قوم الم یعد کم ربکم وعد احسنا. افطال علیکم العهد ام اردتهم ان یحل علیکم غضب من ربکم فاخلفتم موعدی. قالوا ما اخلفنا موعدك بملکنا و لکنا حملتا اوزارا من زینة القوم فقذ فناها فکذلك القی السامری. فاخرج لهم عجلا جسدا له خوار فقالوا هذا آلهکم اله موسی فنسی. افلایرون الا یرجع الیهم قولا و لا یملك لهم ضراو لانفعا. و لقد قال لهم هارون من قبل یا قوم انما فتنتم به و ان ربکم الرحمن فاتبعونی و اطیعوا امری. قالوا لن نبرح علیه عاکفین حتی یرجع الیناموسی. قال یا هرون ما منعك اذرأیتهم ضلوا الا تتبعن افعصیت امری. قال یا بن ام لا تأخذ بلحیتی و لا براسی

انی خشیت ان تقول فرقت بین بنی اسرائیل و لم ترقب قولی. قال فما خطبك یا سامری. قال بصرت بما لم یبصروا به فقبضت قبضة من اثر الرسول فنبذتها و كذلك سولت لی نفسی. قال فاذهب فان لك فی الحیوة ان تقول لامساس و ان لك موعد الن تخلفه و انظر الی الهك الذی ظلت علیه عاكفا لنحرقنه ثم لننسفنه فی الیم نسفا.

واتاكەی: ئەی خەڵكینە، مەگەر پەروەردگار، بەڵێنی چاكەی پێ نەدابوون، مەگەر ئەم ماوە لای ئێوە درێژ بوو یا ویستان توڕەیی خوا بەسەر ئێوەدا داباریێت وا سەرپێچی پەیمانەكەی منتان كرد.

وتیان: ئێمە بەئیرادەی خۆمان سەرپێچی پەیمانەكەی تۆمان نەكرد بەڵام كاڵا و بارەكانمان لەزێر و زیوەكانی فیرعەون هەڵگرتبوو كەخستمانە ناو ئاگر. هەروەها سامریش ئەو كارەی كرد و بۆ ئەوان گوێرەكەیەكی دروست كرد كەدەنگی گوێرەكەی هەبوو. وتیان: ئەمە خوای ئێوە و خوای موسایە و باوەڕی پشتگوێ خست. مەگەر نەیاندەبینی كەگوێرەكە قسەیان لەگەڵ ناكات و هیچ سوود و زیانێكیان پێ ناگەیەنێت.

هارون پێشتر بەوانی وتبوو ئەی خەڵكینە، گوێرەكە پەرەستی ئێوەی فریوداوە، پەروەردگار تەنیا خواوەندی رەحمانە. شوێن من بكەون و فەرمانەكانم جێبەجێ بكەن.

وتیان: ئێمە گوێرەكەكە دەپەرەستین تا ئەو كاتەی موسا دەگەڕێتەوە.

موسا وتی: ئەی هارون، كاتێك بینیت ئەوان گومڕا بوون، چی بووە رێگری ئەوەی سەرپێچی من بكەیت، بۆ فەرمانەكانی منت ئەنجام نەدا؟

وتی: ئەی كوڕی دایكم، ریش و سەری من بگرە. دەترسام بڵێیت دوبەرەكی و ئاژاوەت لەناو منداڵەكانی ئیسرائیل دروست كرد و وتاری منت پشتگوێ خست.

موسا وتی: ئەی سامەری، داستانی تۆچییە؟

وتی: ئەوەی ئەوان نەیانبینی، بینیم و لەشوێنی پێی فریشتەی نێردراو، مشتێك خۆڵم هەڵگرت و كردمە ناو قاڵبی گوێرەكە چوونكە ناخم بەو شێوەی نیشاندام.

وتی: بڕۆ بەشی تۆ لەژیان ئەوەیە بڵێیت دەستم لێ مەدەن. و كاتێك كەهیچ كات پشتگوێی ناخەن. سەیری خواكەت بكە كەخزمەتیت دەكرد كەچۆن دەیسوتێنین و

لەدەریادا بڵاوی دەکەینەوە.

گوێرەکەکەی گرت و کوشتی، سوتاندی و فڕیدایە ناو دەریا و بەهەموو دەریاکان گەیشت. دواتر موسا وتی لەئاوی دەریا بخۆنەوە و خواردیانەوە و هەرکەس گوێرەکەکەی خۆش دەویست، زێڕ دەکەوتە سەر سمێڵی. خواوەند دەفەرمێت:

((واشربوا فی قلوبکم العجل بکفرهم فلما سقط فی ایدی بنی اسرائیل حین جاء موسی وراوا انهم قدضلوا قالوا لئسن لم یرحمنا ربنا و یغفر لنا لنکونن من الخاسرین.

واتاکەی: کاتێك پەشیمان بوونە و زانیان گومڕا بوون. وتیان ئەگەر پەروەردگار بەخشینەکانی خۆی بەئێمە نەبەخشێت و لێمان خۆش نەبێت لەزیانکاران دەبین.))

خوا نەیویست بەتۆبەی مناڵەکانی ئیسرائیل رازی ببێت مەگەر بەشەڕ کەهاورن و کەسەکانی لەکاتی گوێرەکە پەرەستی لێی بێزار بوون.

موسا وتی: (( یا قوم انکم ظلمتم انفسکم باتخاذکم العجل فتوبوا الی بارئکم فاقتلوا انفسکم.

واتاکەی: ئەی خەڵکینە، ئێوە بەگوێرەکە پەرەستی ستەمتان لەخۆتان کرد، بۆ خواوەند بگەرێنە و یەکتر کوشتار بکەن.))

ئەوانەی گوێرەکەیان پەرەستیبوو و ئەوانەی نەیانپەرەستیبوو، بەشمشێر کەوتنە گیانی یەك. هەر کەس لەهەر دوولا کەکوژرا، شەهید بوو. کوژرا لەناو خەڵکانی زیادی کرد بەشێوەیەك ئەوەندەی نەمابوو لەناو بچن. وەك دەڵێن: حەفتا هەزار کەس کوژرا.

موسا و هارون لەخوا پاڕانەوە و وتیان: پەروەردگارا، مناڵەکانی ئیسرائیل لەناوچون، ئەوانی دیکە بپارێزە.

خواوەند فەرمانیدا چەکەکانیان دابنێن و بەتۆبەکەی ئەوان رازی بوو. هەرکەس کوژرا، وەك شەهید هەژمار کرا و ئەوانەی مانەوە، کەفارەی کوژراوەکان بوون. خواوەند بە مناڵەکانی ئیسرائیلی دەفەرمێت: خواوەند بەتۆبەکەی ئێوە رازی بوو چوونکە ئەو تۆبەوەرگر و میهرەبانە.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: سامری پیاوێکی خەڵکی باجرما بوو و لەنەتەوەی گوێرەکە پەرەستەکان. حەزی لەگوێرەکە پەرەستی دەکرد و لەناو مناڵەکانی ئیسرائیل بەریا خۆی وەك باوەڕدار نیشاندەدا. موسا بۆ بینینی خواوەند ڕۆشت و

هارون پێی وتن: ئێوە لەکەڵ و پەل و زێر و زیوی فیرعەونییەکان باری گوناحتان لەگەڵ خۆتان هێناوە. لەوانە خۆتان پاك بکەنەوە چوونکە گلاون. ئاگری هەڵکرد و وتی: هەموو زێر و زیو و کەل و پەلی فیرعەونییەکان بخەنە ناو ئاگرەکەوە. خەڵك رازی بوون. کاتێك زێر و زیوەکان لەناو ئاگرەکە لەناوچوو، سامری کەشوێنپێی ئەسپەکەی جبرەئیلی بینیبوو، خۆڵی لەشوێنی سمی ئەسپەکە هەڵگرت، لەچاڵەکە نزیك کەوتەوە و بەهارونی وت: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوەی لەدەستمدایە، فڕیبدەم.

هارون وتی: بەڵێ. گومانی کرد وەك کەسانی دیکە زێر و زیو یا کەل و پەلی هێناوە.

سامری خۆڵی کرە ناو ئاگرەکە و وتی: ببە بەگوێرەکە.

بەهەمان شێوە بوو ئەو دەیخواست، سامری وتی: ئەمە خوای ئێوە و خوای موسایە.

خەڵك دەستیان بەپەرەستینی گوێرەکەکە کرد. خۆشیان دەویست و هیچیان بەهاوشێوەی ئەو نەدەزانی. خواوەند فەرمووی: لەبیری کرد یانی ئیسلامی پشتگوێ خست. مەبەست سامریە. خواوەند دەفەرمێت:

((افلایرون الا یرجع الیهم قولا و لا یملك لهم ضرا و لا نفعا.

واتاکەی: مەگەر نەیاندەبینی گوێرەکە هیچ قسەیەك لەگەڵ ئەوان ناکات و سوود و زیانی بۆ ئەوان نییە.))

دەڵێت: ناوی سامری موسا کوڕی زەفەرە. بۆ سەرزەمینی میسر کۆچی کرد و بوو بەیەکێك لەمناڵەکانی ئیسرائیل.

کاتێك هارون گوێرەکە پەرەستی خەڵکی بینی، وتی:

((یا قوم انما فتنتم بەوان ربکم الرحمن فاتبعونی و اطیعوا امری. قالوا لن نبرح علیه عاکفین حتی یرجع الینا موسی.

واتاکەی: ئەی خەڵکینە، گوێرەکە پەرەستی فریوی داون. پەروەردگاری ئێوە تەنیا خوای رەحمانە، شوێنکەوتەی من بن و فەرمانەکانم جێبەجێ بکەن.))

وتیان: ئێمە پەرەستشی دەکەین تا ئەو کاتەی موسا دەگەڕێتەوە. هارون و هاوەڵانی کەفریوی ئەو فێڵەیان نەخوارد، مانەوە و گوێرەکە پەرستان سەرقاڵی پەرەستینی گوێرەکە بوون. هارون دەترسا ئەگەر لەگەڵ باوەڕداران شەڕی ئەوان

بکات، موسا پێی بڵێت: دووبەرەکی و ئاژاوەت لەناو منداڵەکانی ئیسرائیل دروست کرد و وتەکانی منت پشتگوێ خست چوونکە گوێرایەڵ و ملکەچی فەرمانەکانی موسا بوو و لێی دەترسا.

کاتێك موسا منداڵەکانی ئیسرائیلی لەدەریا پەڕاندەوە، نیازمەندی ئاو بوون. موسا بۆ خەڵکەکەی خۆی داوای ئاوی کرد. فەرمانی پێدرا بەداردەستەکەی خۆی لەبەرد بدات کەدوانزە کانی لێ هەڵقولا. هەرنەوەیەك کانییەکی تایبەت بەخۆی هەبوو. ناسییانەوەو ئاویان لێخواردەوە.

کاتێك خواوەند لەگەڵ موسا ئاخاوت، موسا مەبەستی بینینی ئەوی کرد و داوای لەخواوەند کرد تا بیبینێت. خواوەند فەرمووی: ((انظر الى الجبل. واتاکەی: سەیری ئەم کێوە بکە)).

کاتێك موسا گەڕایەوە بۆ لای خەڵکەکەی خۆی و گوێرەکە پەرەستەکانی بینی، لەوحەکانی فرێدا. وەك دەڵێن زومورودی سەوز بوو.

کوڕی عەباس دەڵێت: لەلەوحەکان بۆ موسا ئامۆژگاری و شیکردنەوە و هەموو شتێك و ڕێنوێنی و ڕەحمەت نوسرا بوو. کاتێك لەوحەکانی فرێدا، خوا شەش لەسەر حەوتی گەڕاندەوە بۆ خۆی و یەك لەسەر حەوتی بەجێهێشت. خواوەند فەرمووی: لەنوسخەکەیدا ڕێنوێنی بوو و ڕەحمەت بۆ ئەو کەسانەی لەپەروەردگاری خۆیان دەترسن.

دواتر موسا فەرمانی سوتاندنی گوێرەکەکەی دەرکرد و خۆڵەمێشەکەیان کردە ناو دەریا.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: لەدەستەیەك لەشوێنکەوتەکانی کتێبم بیست کەمەبەست لەسوتاندنی گوێرەکەکە، شکاندنییەتی و لەتەکانیان فرێدایە ناو دەریا. خوا زاناترە.

موسا حەفتا کەس لەچاکەکارانی خەڵکەکەی هەڵبژارد و وتی: بۆ لای خوا بگەڕێنەوە و پەشیمان بوونەوەی خۆتان دەربڕن و داوای تۆبە بۆ کەسانی دیکەیش بکەن. ڕۆژو بگرن و خۆتان و جل وبەرگتان پاك و خاوێن ڕابگرن. لەکاتێکی دیاریکراوی خوایی ئەوانی بۆ توری سینا برد. موسا تەنیا بەمۆڵەت وەرگرتن سەردانی ئەو شوێنەی دەکرد. ئەو حەفتا کەسە دوای ئەوەی فەرمانەکانی موسایان ئەنجامدا، هاوڕێ لەگەڵ ئەو بۆ پێشگای خوا ڕۆشتن و وتیان: داوا لەخواوەند بکە تا

قسەکانی ببیستین. موسا رازی بوو و کاتێك لەکێوەکە نزیك کەوتنەوە، ستونێکی هەور هات و هەموو کێوەکەی داگرت. موسا ڕۆشتە پێش و چووە ناو هەورەکە و بەخەڵکەکەی وت: نزیك ببنەوە.

کاتێك موسا لەگەڵ خواوەند قسەی دەکرد، لەسەر روخساری نوورێك دەردەکەوت و کەس نەیدەتوانی سەیری بکات. لەبەر ئەمە بەپارچەیەك روخساری خۆی داپۆشی تا ڕۆشتنە ناو هەورەکە و کورنوشیان برد و بیستیان خواوەند لەگەڵ موسا قسە دەکات. لەفەرماندان بۆ ئەنجامدانی کاری چاکە و ڕێگرتن لەخراپە و کاتێك گفتوگۆکە کۆتایی هات، هەورەکە لەسەر موسا نەما و بۆ لای کەسەکانی خۆی گەڕایەوە. پێیان وت: باوەڕ ناهێنین تا ئەو کاتەی خواوەند ببینین. هەورتریشقەیەك هات و هەموویانی کوشت. موسا لەخوا پاڕایەوە و وتی: خواوەندا، باشتر بوو پێشتر ئەوان و منت لەناو دەبرد. ئەوان نەزانیان کرد بەڵام ئایا هەموو منداڵەکانی ئیسرائیل بەکاری نەزانەکانیان لەناوبچن. ئەمە دەبێتە هۆکاری لەناوچوونی ئەوان چوونکە حەفتا پیاوی چاکەکارم هەڵبژارد. ئێستا کاتێك بگەڕێمەوە و کەس لەگەڵ مندا نەبێت، چۆن باوەڕ بەمن دێنن؟ بەردەوام لەخوا دەپاڕایەوە تا دووبارە خواوەند گیانی پێبەخشینەوە. موسا داوای لەخواوەند کرد تا بەتۆبەی منداڵەکانی ئیسرائیل بۆ پەرەستینی گوێرەکەکە رازی ببێت. خواوەند فەرمووی: نا، تا ئەو کاتەی یەکتر کوشتار بکەن.

دەڵێت: منداڵەکانی ئیسرائیل وتیان: بۆ ئەنجامدانی فەرمانی خواوەند خۆڕاگری دەکەینە پیشە. موسا وتی: ئەو کەسانەی گوێرەکەیان نەپەرەستیبوو، ئەو کەسانە بکوژن کەگوێرەکەیان پەرەستیبوو. لەبەر دەمماڵەکان دانیشتن و خەڵکان شمشێریان لەناو ئەواندا سووڕاند و کوشتاریان دەستپێکرد. موسا گریا، ژن و منداڵەکان ناڵاندیان و داوای بەخشینی ئەوانیان کرد. خواوەند ئەوانی بەخشی و بەموسای وت شمشێر لەناو ئەوان هەڵبگرێت.

بەڵام لەگێڕانەوەی سەدیدا هاتووە: ڕۆشتنی موسا بۆ پێشگای خواوەند لەگەڵ حەفتا کەس لەچاکەکارانی خەڵکەکەی دوای ئەوە بوو تۆبەی منداڵەکانی ئیسرائیل وەرگیرا چوونکە دوای داستانی تۆبەی خەڵکان دەڵێت: خواوەند بەموسای فەرموو کەسانێك لە منداڵەکانی ئیسرائیل بێنێت تا لەپێشگای خواوەند بۆ خەڵکەکەیان

داوای بەخشین بکەن. کاتێکی دیاری کرد و موسا حەفتا کەسی لەخەڵکەکەی خۆی هەڵبژارد و ئەوانی برد تا داوای لێخۆش بوون بکەن. کاتێك گەشتنە شوێنی دیاریکراو، وتیان: باوەڕ بەتۆ ناکەین تا روخساری خواوەند ببینین، تۆ کە قسەی لەگەڵ دەکەیت، نیشانمان بدە. هەورەتریشقە لێی دان و مردن. موسا گریا و پاڕایەوە و وتی: خواوەندا کاتێك بۆ لای منداڵەکانی ئیسرائیل بگەڕێمەوە چۆن بڵێم تۆ چاکەکارانی ئەوانت کوشت ئەگەر دەتوانی پێشتر ئەوان و منت لەناو دەبرد، ئایا ئێمە لەبەر کردەوەی نەزانەکانمان لەناو دەبەیت؟ خواوەند وەحی بۆ نارد: ئەم حەفتا کەسە لەو کەسانە بوون کەگوێرەکەیان دەپەرەستی. موسا وتی:

(( ان هی الا فتنتك تضل بها من تشاء و تهدی، انت و لینا فاغفرلنا و ارحمنا و انت خیر الغافرین. و اکتب لنا فه هذه الدنیا حسنه و فی الاخره انا هدنا الیك.

واتاکەی: ئەمە تاقیکردنەوەی تۆیە کەهەر کەسێك بخوازێت، بەوە هۆیەوە گومڕایی دەکەیت و هەرکەس بخوازیت، ڕێنوێنی پێدەبەخشیت. سەروەری ئێمە تۆیت، لێمان خۆشبە و بەزەییت بەئێمەدا بێتەوە چوونکە لەهەموو بەخشەرەکان گەورەتر و باشتریت. بۆ ئێمە لەم دنیا و لەو دنیا چاکە دیاری بکە چوونکە ئێمە بۆ لای تۆ گەڕاوینەتەوە.))

خواوەند گیانی پێبەخشینەوە و یەك یەك زیندوو بوونەوە. چاویان بەیەك کەوت کەچۆن زیندوو دەبنەوە، وتیان: ئەی موسا تۆ داوای هەرچی لەخواوەند بکەیت، پێت دەبەخشێت، داوای لێبکە ئێمە بکاتە پێغەمبەر. موسا پاڕایەوە و خواوەند ئەوانی کردە پێغەمبەر و بەهەمان شێوە دەفەرمێت: ئێوەمان دوای مەرگی خۆتان وەك پێغەمبەر هەڵبژارد.

موسا فەرمانیدا خەڵکەکەی بەرەو سەرزەمینی ئەریحا بڕۆن کەسەرزەمینی بیت المقدسە. بەرێکەوتن و کاتێك نزیك کەوتنەوە، موسا دوانزە سالاری لەناو نەوەکانی ئیسرائیل ڕەوانە کرد تا هەواڵی ستەمکارانیان بۆ بێنن. یەکێك لەستەمکاران بەناوی عاج ئەوانی بینی. هەردوانزەیانی گرت و خستیە ناو بارەکەی خۆیەوە. باری چیلکەی پێبوو، ئەوانی بردە لای ژنەکەی و پێی وت: سەیری ئەم خەڵکە بکە، دەخوازن لەگەڵ ئێمە بجەنگن. هەموویانی لەبەردەم ژنەکەی هەڵرژاند و وتی:

((بەقاچم پان و پلیشیان بکەمەوە؟))

ژنەکەی وتی: نا، ڕێگەیان بدە بڕۆن و ئەوەی بینیویانە، بۆ خەڵکەکەیانی باس بکەن. عاج ئەوانی ئازاد کرد. کاتێك هاتنەدەر، بەیەکیان وت: ئەگەر بە منداڵەکانی ئیسرائیل بڵێین، پشت دەکەنە پێغەمبەر. ئەم هەواڵە بانهێنی بێت و تەنیا دو پێغەمبەرەکەی خوای لێ ئاگادار بکەنەوە. پەیمانیان بەست ئەم هەواڵە وەك نهێنی لەناویاندا بمێنێتەوە.

کاتێك گەڕانەوە، دەکەس لەوان پەیمانەکەی خۆیان شکاند و ئەوەی لەعاجیان بینیبوو، خەڵکیان لێ ئاگادار کردەوە. دووانەکەی دیکە هەواڵەکەیان بڵاو نەکردووە و تەنیا بەموسا و هارونیان وت.

خواوەند لەگێڕانەوەی داستانەکەی ئەوان دەفەرمێت:

((و لقد اخذالله میثاق بنی اسرائیل و بعثنا منهم اثنی عشر نقیبا. فقال لهم موسی یا قوم اذکروا نعمه الله علیکم اذجعل فیکم انبیاء و جعلکم ملوکا و آتاکم ما لم یؤت احدا من العالمین. یا قوم ادخلوا الارض المقدسه التی کتب الله لکم و لا ترتدوا علی ادبارکم فتنقلبوا خاسرین. قالوا یا موسی ان فیها قوما جبارین و انا لن ندخلها حتی یخرجوا. منها فان یخرجوا منها فانا داخلون. قال رجلان من الذین یخافون انعم الله علیهما ادخلوا علیهم الباب.

واتاکەی: خواوەند پەیمانی لەمنداڵەکانی ئیسرائیل وەرگرت و لەوان دوانزە کەسمان وەك چاودێر دەستنیشان کرد. موسا بەوانی وت: ئەی خەڵکینە، بیری نیعمەتەکانی خواوەند بکەنەوە چوونکە پێغەمبەران لەناو ئێوەدا هەڵدەبژێرێت و ئێوە کردۆتە ئازادە و ئەو شتانەی پێبەخشیون بەهیچ کەسێکی ڕۆژگاری نەبەخشیوە. ئەی خەڵکینە، بڕۆنە ناو ئەم سەرزەمینە پاکە کەخواوەند بۆ ئێوەی دیاری کردووە. پاشەکشێ مەکەن چوونکە دەچنە ریزی زیانکاران.))

وتیان: ئەی موسا دەستەیەك لەناباوەڕان لەو سەرزەمینەدا دەژین. ئێمە ناڕۆینە ناو ئەو سەرزەمینە تا ئەوان نەیێنەدەر. ئەگەر ئەوان بەجێیان هێشت، ئێمە دەڕۆینە ناوی. دوو پیاو لەوان لەخواترس بوون و خوا بەخشینەکانی خۆی پێبەخشیبوون، وتیان: لەم دەروازەوە بڕۆنە ناو شار.

ئەو دوو کەسەی هەواڵەکەیان بەنهێنی هێشتەوە، یوشع کوڕی نوون هاوسەفەری

موسا لەسەفەری بینینی خزر و ئەوی دیکەیان کالوب کوڕی یوفەنا بوو.

دەڵێن کالووب کوڕی یوفەنا زاوای موسا بوو.

موسا وتی:

((رب انی لا املك الا نفسی و اخی فافرق بیننا و بین القوم الفاسقین. قال انها محرمة علیهم اربعین سنه یتیهون فی الارض.

واتاکەی: پەروەردگارا، من دەسەڵاتم تەنیا بەسەر خۆم و براکەمدا هەیە. جیاوازی لەنێوان ئێمە و یاخیەکان دابنێ. وتی: ئەم دیارە تا چل ساڵ لەوان حەرامە و لەسەر زەوی سەرگەردان بەرێگەدا دەڕۆن.))

کاتێك خەڵك سەرگەردانی بیابان بوون، موسا پەشیمان بوویەوە. ئەو خەڵکەی ملکەچی بوون، هاتن و وتیان: ئەی موسا چیت لەگەڵ ئێمە کرد؟ کاتێك پەشیمان بوویەوە، خواوەند وەحی بۆ نارد: خەمی نەتەوەی دووڕوو و ریاکار مەخۆ.

خەڵك وتیان: ئەی موسا، لێرە ئاومان نییە و خواردن لەکوێ بەدەست بێنین. خواوەند (من و سلوی) بۆ دەناردن. سلوی مەلێکە، هەرکەسێك دەیگرت، ئەگەر قەڵەو بوایە، سەری دەبڕی و گەرنە بەرەڵای دەکرد و کاتێك قەڵەو دەبوو دەگەڕایەوە بۆ لای.

وتیان: ئەم خواردن و ئاو، بەڵام سێبەرمان نییە؟ خواوەند بەهۆی هەورەکانەوە سێبەری بۆ دروست کردن.

وتیان: سێبەرمان هەیە، بەڵام جل و بەرگمان نییە؟ جل و بەرگی ئەوان وەك منداڵەکان گەورە دەبوو و نەدەدڕا. خواوەند لەمبارەوە دەفەرمێت: ((وظللنا علیهم الغام و انزلنا علیهم المن و السلوی.

واتاکەی: هەورمان کردە سایەوانی ئەوان و (من و سلوی)مان بۆ رەوانە کردن.))

هەروەها دەفەرمێت: ((و اذ استسقی موسی لقومه فقلنا اضرب بعصاك الحجر فانفجرت منه اثنتا عشره عینا قد علم کل اناس مشربهم.

واتاکەی: اتێك موسا بۆ خەڵکەکەی داوای ئاوی دەکرد و وتمان داردەستەکەی خۆت لەبەرد بدە، دوانزە کانی لێ هەڵقولا کەهەردەستەیەك ئاویان لەکانی خۆیان دەخواردەوە.))

خەڵك وتیان: (( یاموسا لن نصبر علی طعام و احد فادع لنا ربك یخرج لنا مما تنبت الارض من بقلها و قثائها و فومها و عدسها و بصلها قال اتستبد لون الذی هو

ادنی بالذی هو خیر اهبطوا مصرا فان لکم ما سألتم.

واتاکەی: ئەی موسا، ئێمە ناتوانین تەنیا بەیەك خۆراك ژیان بەسەر ببەین، داوا لەپەروەردگار بکە تا ئەوەی لەسەر زەوی دەڕوێت، لەخەیار و سەوزی و گەنم و ماش و پیاز بۆ ئێمە بڕوێنێت. وتی: چۆن خراپتر بەباشتر دەگۆڕنەوە. بڕۆنە شارێك تا ئەو شتانەی باسی دەکەن، دەستان کەوێت. ))

کاتێك لەبیابان هاتنەدەر، من و سلوی نەما و دوای ئەوە شتەکانی دیکەیان دەخوارد.

موسا ڕووبەڕوی عاج بوویەوە. موسا دەگەز بەرز بوویەوە و داردەستەکەی کێشا بەقولاپەی پێی عاج و کوشتی. داردەستەکەی دەزەراع و باڵای موسا دەزراع بوو.

لەنووف دەگێڕنەوە: باڵای عاج هەشسەد زەراع بوو و باڵای موسا دە زەراع. داردەستەکەی دەزەراع و دەزەراع بەرز بوویەوە و گەیشتە قولاپەی پێی و لێیدا. عاج کەوت و مرد. بوو بەپردێك کەخەڵك بەسەریدا دەڕۆشتن.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: ((جەستەی عاج، پردی ڕووباری نیل بوو))

دەڵێن: عوج سێ هەزار ساڵ ژیا.

## ئاماژەدان بەمەرگی موسا کوڕی عیمران و هارون کوڕی عیمران

لەکوڕی مەسعود و دەستەیەك لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) دەگێڕنەوە: خواوەند وەحی بەموسا کرد: دەمەوێت هارون بمرێنم. ئەو بۆ فلاَن کێو ببە. موسا و هارون بەرەو کێوەکە ڕۆشتن و دارێکیان بینی هەرگیز هاوشێوەی نەبینراوە. ماڵێك لەوێ بوو و تەختەیەك لەناو ماڵەکەدا، لەسەر تەختەکە راخەرێك بوو بەبۆنی خۆش و کاتێك هارون ماڵەکەی بینی، پەسندی کرد و بەموسای وت: حەز دەکەم لەسەر ئەو تەختە بخەوم.

موسا وتی: بخەوە.

وتی: دەترسم خاوەن ماڵەکە بێت و توڕە ببێت.

موسا وتی: مەترسە، خاوەن ماڵەکە قسە ناکات، بخەوە.

وتی: تۆیش لەگەڵ من بخەوە بۆ ئەوەی ئەگەر خاوەن ماڵەکە هات، لەهەر دووکمان توڕە ببێت.

کاتێك خەوتن، مەرگ بەسەر هاروندا داباری و کاتێك زانی، بەموسای وت: فریوتدام. کاتێك گیانیدا، ماڵەکە بەرز بوویەوە و دارەکە دیار نەما. تەختەکە بۆ ئاسمان ڕۆشت. کاتێك موسا بۆ لای منالەکانی ئیسرائیل گەڕایەوە و هارونی لەگەڵدا نەبوو، وتیان: موسا هارونی کوشت چوونکە خۆشەویستی منالەکانی ئیسرائیل و موسا رژدی پێدەبرد. ئەم قسەیان بۆیە هێنایە زمان چوونکە هارون نەرمتر لەموسا هەڵس وکەوتی لەگەڵ منالەکانی ئیسرائیل دەکرد و موسا توڕە بوو.

کاتێك موسا لەوتاری ئەوان ئاگادار بوویەوە، وتی: هاوار لەئێوە، ئەو برام بوو، چۆن دەتوانم بیکوژم. کاتێك ئەم قسەیان دووبارە کردەوە، وەستا و دوو رەکعەت نوێژی خوێند و لەخوا پاڕایەوە کەتەختەکەی بۆ سەر زەوی دابەزاند. تەختەکەیان لەنێوان ئاسمان و زەوی بینی و باوەڕیان بەوتەکانی موسا کرد.

موسا لەگەڵ یوشەع کوڕی نوون بەرێگەدا دەڕۆشت و مارێکی ڕەش لەسەر رێگەکەیان دەرکەوت. کاتێك یوشەع مارەکەی بینی. گومانی کرد رۆژی هەستانەوەیە. خۆی بەموساوە لکاند و وتی: ئەگەر رۆژی هەستانەوە بێت با

بەموساوە لکابێتم. موسا خۆی داشارد و کراسەکەی لەدەستی یوشەعدا مایەوە. کاتێك یوشەع کراسەکەی هێنایەوە، منداڵەکانی ئیسرائیل ئەویان گرت و وتیان: پێغەمبەری خوات کوشت؟

وتی: سوێند بەخوا نەمکوشتووە، بەڵکو خۆی لەمن داشارد.

باوەڕیان بەوتەکانی نەکرد و ویستیان بیکوژن. یوشەع وتی: ئەگەر باوەڕ بەمن ناکەن، سێ ڕۆژ مۆڵەتم پێبدەن. لەخوا پاڕایەوە و ئەو کەسانەی پاسەوانی ئەو بوون، خەویان بینی و لەخەودا پێیان وترا یوشەع موسای نەکوشتووە، بەڵکو ئێمە گەڕاندومانەتەوە بۆ ئاسمان. یوشەعیان ئازاد کرد. هیچ کەس لەوانەی نەیانویست لەگەڵ موسا بڕۆنە ناو گوندی ستەمکاران، زیندوو نەمایەوە و سەرکەوتنی نەبینی.

لەکوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە: موسا لەمەرگ بێزار و خواوەند مەبەستی ئەوەی کرد مەرگ لەبەرچاوی ئەودا شیرین و لەژیان بێزاری بکات. پێغەمبەری بەیوشەع کوڕی نووندا کەشەو و ڕۆژ هاتوچۆی دەکرد و موسا پێی دەوت: ئەی پێغەمبەری خوا، خوا چی پێی فەرمووی؟

یوشەع وەڵامی دەدایەوە: ئەی پێغەمبەری خوا، مەگەر ئەو چەند ساڵەی هاودەمی تۆ بووم، هەرگیز پرسیم خواوەند چی بەتۆ فەرموو. مەگەر ئەوەی خۆت دەست پێبکەیت و قسە بێنیتە سەرزمان. بەمشێوەیە هیچی بەموسا نەدەوت. کاتێك موسا ئەمەی بینی، لەژیان بێزار و خوازیاری مەرگ بوو.

لەوەهب کوڕی مونبە دەگێڕنەوە: موسا لەسایەوانێکدا ژیانی بەسەر دەبرد و لەدەفرێکی بەردین نان و ئاوی دەخوارد و دوای خواردن وەك ئاژەڵ سەری بۆ لای دەفرە بەردینەکە دەبرد و ئاوی دەخواردەوە. ئەمە لەبەر لەخۆ بووردنی ئەو لەپێشگای خوادا بوو چوونکە بەهۆی قسە کردن لەگەڵ موسا ڕێزی پێبەخشیبوو.

هەروەها دەڵێت: سەبارەت بەمردنی ئەو بەم شێوە دەگێڕنەوە: ڕۆژێك بۆ کارێکی گران لەسایەوانەکەی هاتەدەر و کەس ئاگای لێ نەبوو. لای دەستەیەك لەفریشتەکان تێپەڕی کەگۆڕیان هەڵدەکەند. ئەوانی ناسیەوە و لێیان نزیك کەوتەوە. وەستا و بینی گۆڕێکیان هەڵکەندووە و هەرگیز جوانتر و ڕازاوەتر لەو گۆڕە نەبینراوە. لەسەرسەوزیدا وێنەی نەبوو. بەفریشتەکانی وت: ئەم گۆڕە هی کێیە؟

وتیان: ئەو بەندەی لای خوا ئازیزە.

وتی: ئەم بەندەیە لای خوا زۆر ئازیزە چوونکە تا ئێستا شوێن خەو و جێگەیەکی لەوشێوەم نەبینیوە.

ئەمە لەکاتی سەرەمەرگی ئەودا بوو.

فریشتەکان وتیان: ئەی صفی الله، دەخوازیت ئەمە گۆڕی تۆ بێت.

وتی: دەخوازم.

وتیان: برۆ لەوێ بخەوە، بیر لەخوا بکەرەوە و بەهێواشی هەناسە بکێشە.

موسا لەگۆڕەکەدا خەوت. بیری لەخوا دەکردەوە و بەهێواشی هەناسەی لێدەدا. خواوەند گیانی گرت و فریشتەکان گۆڕەکەیان داپۆشی. موسا خۆپارێزی دنیا و ئارەزومەندی بارەگایی خوایی بوو.

لە باوکی هورەیرە دەگێڕنەوە: پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: فریشتەی مەرگ بەئاشکرا دەهاتە لای خەڵکان تا ئەو کاتەی موسا شەقەزللەی لێدا و چاوی کوێر کرد. فریشتە بۆ لای خوا گەڕایەوە و وتی: پەروەردگارا. بەندەکەی تۆ، چاوی منی کوێر کرد. ئەگەر لای خوا ئەزیز نەدەبوو، بەتوندی هەڵس و کەوتی لەگەڵ دەکرد.

خواوەند فەرمووی: بۆ لای بەندەکەم، موسا، بگەڕێرەوە و بڵێ دەستی بخاتە سەر پێستی گایەك. بەئەندازەی هەر موویەکی ژێر دەستی یەك ساڵ تەمەنی درێژ دەکەمەوە، سەرپشکی بکە لەوەی تەمەنی درێژ بێت یا هەر ئێستاکە گیانی تەسلیم بکات.

فریشتەی مەرگ بۆ لای موسا گەڕایەوە و ئەوی سەرپشك کرد.

موسا وتی: دوای تەمەنی درێژ چی دەبێت؟

فریشتەی مەرگ وتی: مەرگ.

موسا وتی: ئێستا باشترە.

دەڵێت: شتێکی پێدا کەبۆنی کرد و گیانی سەند. دوای ئەوە، فریشتەی مەرگ بەنهێنی دەڕواتە لای کەسەکان.

لەعەمرۆ کوڕی مەیمون دەگێڕنەوە: هارون و موسا هەردووکیان لەبیابان مردن.

هارون پێش موسا مرد. پێکەوە لەناو ئەشکەوتێك پیاسەیان دەکرد و هاورن لەوێ مرد. موسا ڕۆشتە ناو گۆڕەکەی وبۆ لای منداڵەکانی ئیسرائیل گەڕایەوە، وتیان: چی روویدا.

وتی: مرد.

وتیان: درۆدەکەیت، کوشتووتە، لەبەر ئەوەی ئێمە خۆشمان دەویست.

هارون خۆشەویستی منالەکانی ئیسرائیل بوو. موسا لەدەرگای خواوەند پاڕایەوە و لەکرداری منالەکانی ئیسرائیل سکالای کرد. خواوەند وەحی بۆنارد: ئەوان بۆ لای گۆڕی هارون ببە و من زیندووی دەکەمەوە تا پێیان بڵێت خۆی مردووە و تۆ نەتکوشتووە.

دەڵێت: ئەوانی بۆ لای گۆڕی هارون برد و هاواری کرد: ئەی هارون! هارون لەگۆڕەکەی هاتەدەر و موسا وتی: من تۆم کوشتوە؟

هارون وتی: سوێند بەخوا نە، خۆم مردم.

وتی: بۆ گۆڕەکەی خۆت بگەڕێرەوە. خەڵك گەڕانەوە.

تەمەنی موسا سەد و بیست ساڵ درێژەی کێشا. دەساڵی لەسەردەمی پاشایەتی فەرەیدون و سەد ساڵی لەسەردەمی پاشایەتی مەنوچێهر. ساڵەکانی پێغەمبەری ئەو، لەو کاتەوەی وەك پێغەمبەر ڕەوانە کرا تا ئەو کاتەی مرد، لەدەورانی پاشایەتی مەنوچێهردابوو.

خواوەند دوای موسا، یوشەع کوڕی نوون کوڕی ئەفراییم کوڕی یوسف کوڕی یەعقوب کوڕی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیمی وەك پێغەمبەر هەڵبژارد و فەرمانی پێدا بەرەو ئەریحا بەرێکەوێت و لەگەڵ ستەمکارانی ئەو سەرزەمینە شەڕ بکات.

زاناکانی کۆن، لەمبارەوە بۆچونیان جیاوازە کە: گرتنی ئەریحا لەسەر دەستی کێ ڕوویدا و یوشەع کەی بۆ ئەو سەرزەمینە ڕۆشت، ئایا لەژیانی موسادا بوو، یا دوای مردنی ئەو؟

دەستەیەك وتوویانە: دوای مردنی موسا و مردنی هەموو ئەو کەسانەی نەیانویست لەگەڵ موسا بڕۆنە ناو سەرزەمینی ئەریحا لەکاتێکدا خواوەند فەرمانی شەڕی دژی ستەمکاران ڕەوانە کردبوو. یوشەع فەرمانی پێدرا بەرەو ئەریحا بەرێکەوێت.

دەڵێن: هارون و موسا هەردوکیان لەبیابان مردن و لەبیابان نەڕۆشتنەدەر.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: کاتێك موسا بەخواوەندی وت: خوایە، من تەنیا دەسەلاتم بەسەر خۆم و براکەمدا هەیە، ئێمە لەخراپەکاران جیابکەرەوە)) خواوەند

فەرمووی: سەرزەمینی پیرۆز بۆ ماوەی چل ساڵ لەوان حەرام بێت و لەسەر زەوی سەرگەردان بن.

دەڵێت: ڕۆشتنە بیابان. ئەوانەی ڕۆشتنە بیابان و ساڵەکانی تەمنیان لەبیست تێپەڕی کردبوو، لەویٚ مردن. موسا لەبیابان مرد و یوشەع و پاشماوەی خەڵکان بۆ شەڕی ستەمکاران بەرێکەوتن. یوشەع دەستی بەسەر شارەکەدا گرت.

لەقتادە دەگێڕنەوە: خواوەند فەرمووی: شاری ستەمکاران بۆ ماوەی چل ساڵ لەوان حەرام بێت. نەیانتوانی بڕۆنە ناو شارەکە و نیشتەجیٚ بن. چل ساڵ بەمشێوەیە تێپەڕی و وەك وتوویانە موسا لەماوەی ئەم چل ساڵەدا مرد و جگە لەمناڵی مناڵەکانی ئیسرائیل و ئەو دو پیاوە رازدارە کەس نەڕۆشتە ناو بیت المقدس.

لەگێڕانەوەی سەدیدا هاتووە: دوای چل ساڵ خواوەند، یوشەع کوڕی نوونی وەك پێغەمبەر(د.خ) هەڵبژارد. ئەو، بەمناڵەکانی ئیسرائیلی وت کەپێغەمبەرە و خوا، فەرمانی شەڕ لەگەڵ ستەمکارانی پێداوە. بەیعەتیان لەگەڵ کرد و قسەکانی ئەویان بەراست زانی. ستەمکارانی شکستدا و مناڵەکانی ئیسرائیل ڕۆشتنە ناو شارەکە. خەڵکانێکی زۆریان کوشت. بەشێوەیەك بوو کەدەستەیەك لەمناڵەکانی ئیسرائیل لەدەروی یەکێك لەوان بوون و لەگەردنیان دەدا، بەلاّم نەیاندەبڕی.

دەستەیەك وتوویانە: ئەریحا لەسەردەستی موسا گیرا و یوشەع ئالاّداری سوپاکەی بوو.

لەکوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە: کاتێك مناڵەکانی ئەو خەڵکەی لەشەڕ لەگەڵ ستەمکاران هاوریٚ لەگەڵ موسا خۆیان بەدوور گرت، گەورە بوون و باوکانیان مردن و چل ساڵ سەرگەردانی بیابان بەسەر چوو، موسا ئەوانی برد و یوشەع کوڕی نوون و کەلاب کوڕی یوفەنا هاورێیەتیان دەکرد. دەڵێن کەلاب کوڕی یوفەنا، هاوسەری مریەم کچی عیمران و خوشکی موسا و هارون بوو. گەیشتنە سەرزەمینی کەنعان. بەلعەم کوڕی باعور پیاوی ناوداری ئەو سەرزەمینە بوو. خوا زانستێکی پێبەخشیبوو. ئەو ناوی گەورەی خواوەندی دەزانی. کاتێك بەو ناوە لەخوا دەپاڕایەوە، دۆعاکەی گیرادەبوو و داوای هەرچی دەکرد، دەستی دەکەوت.

لەسالم باوکی نەصر دەگێڕنەوە: کاتێك موسا ڕۆشتە سەرزەمینی مناڵەکانی

کەنعان، بەلعەم لەبالعە، یەکێك لەگوندەکانی بەلقای شام، نیشتەجێ بوو. کاتێك منداڵەکانی ئیسرائیل گەیشتن، خەڵکی بەلعەم ڕۆشتنە لای و وتیان: موسا کوڕی عیمران هاوڕێ لەگەڵ منداڵەکانی ئیسرائیل هاتووە تا ئێمە لەسەرزەمینەکەمان دەرپەڕێنێت و سەرزەمینی ئێمە بەمنداڵەکانی ئیسرائیل ببەخشێت و ئێمە (نەتەوەکەی تۆ) بێجێگە بمێنینەوە. تۆ پیاوێکی دۆعاکانت گیرا دەبێت، بڕۆدەر و نفرینیان بکە.

بەلعەم وتی: هاوار لەئێوە، ئەو پێغەمبەری خوایە و فریشتەکان هاوڕێیەتی دەکەن، چۆن بڕۆم و نفرینی بکەم، لەکاتێکدا شارەزایی کاروباری خواییم.

وتیان: ئێمە جێگەمان نییە وپێداگریان کرد و لاڵانەوە تا فریوی خوارد و سوار کەرەکەی خۆی بوو و بەمەبەستی سەرکەوتن بەسەر ئەو کێوەی دەیڕوانییە سەر سوپاکەی منداڵەکانی ئیسرائیل، ملی ڕێگەی گرتەبەر. ناوی کێوەکە حەسبانە. کەرەکە دوای کەمێك ڕۆشتن، خەوت، بەلعەم دابەزی و لەکەرەکەیدا تا ناچاری کرد هەستێت. سواری بوو و ماوەیەکی کەم بەرێگەدا ڕۆشت و دووبارە خەوت. دابەزی و دوبارە لەکەرەکەیدا و بۆ ڕۆشتن ناچاری کرد. بەلعەم سەرکەوت و دوای بڕینی بەشێك لەرێگەکە، کەرەکە دووبارە خەوت، دوبارە دابەزی و لەکەرەکەیدا. خواوەند مۆڵەتیدا و کەر قسەی لەگەڵ کرد تا نیشانەکانی خوایی بەئاشکرایی ببینێت، وتی: هاوار لەتۆ بەلعەم، بۆ کوێ دەڕۆیت؟ مەگەر فریشتەکان نابینی ڕێگە لەڕۆشتنی من دەگرن، ئایا دەڕۆیت نفرینی پێغەمبەری خوا و باوەڕداران بکەیت.

بەلعەم دووبارە لەکەرەکەیدا و خواوەند ڕێگەی کەرەکەی کردەوە و بەرێکەوت تا ئەو کاتەی لەسەر کێوەی حەسبان دەیڕوانییە سەر سوپاکەی منداڵەکانی ئیسرائیل. بەلعەم، نفرین کردنی دەست پێکرد، هەر نفرینێکی دەکرد، ڕووبەرووی خەڵکەکەی خۆی دەکرایەوە و کاتێك بۆ خەڵکەکەی خۆی دەپاڕایەوە. خوا زمانی ئەوی لەبەرژەوەندی منداڵەکانی ئیسرائیل دەسوڕاند.

خەڵکەکەی وتیان: دەزانی چی دەکەیت، دۆعا بۆ ئەوان و نفرینی ئێمە دەکەیت.

وتی: دەسەڵاتم نییە، فەرمانی خواوەند بەمشێوەیە. زمانی درێژ و کەوتە سەر سنگی، بەوانی وت: ئێستاکە، ئەم دنیا و ئەو دنیام لەدەستچوو، تەنیا ڕێگەی فریو و فێڵ ماوەتەوە و دەبێت ئەو ڕێگەیە بگرینەبەر. ژنان برازێننەوە و کالاکانیان

پێبدەن وبۆ ئوردوگای ئەوان ڕەوانەیان بکەن تا بیفرۆشن وپێیان بڵێن هیچ ژنێك خۆی لەوپیاوەی داوای لێدەکات، بەدوور نەگرێت چوونکە ئەگەر یەك پیاو لەوان زینا بکات، بەڵایان بەسەردا دەبارێت.

ئەو کارەیان کرد و کاتێك ژنان ڕۆشتنە ناو ئوردوی منداڵەکانی ئیسرائیل، یەکێك لەژنە کەنعانییەکان بەناوی کەسبی کچی صولا کەباوکی سالاری خەڵکەکەی خۆی بوو. چاوی بەیەکێك لەگەورەی منداڵەکانی ئیسرائیل. زەمری کوڕی شەلوم، سالاری نەوەی شەمعون کوڕی یەعقوب کوڕی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم کەوت. زەمری شەیدایی جوانی ژنەکە بوو. دەستی گرت وبردی بۆ لای موسا، وتی: گومان دەکەم بڵێیت ئەمە بۆ تۆ حەرامە.

موسا وتی: بەڵێ، بۆ تۆ حەرامە، نزیکی لەگەڵ مەکە.

وتی: سوێند بەخوا لەمبارەوە فەرمانەکانی تۆ جێبەجێ ناکەین. ژنەکەی بردە خێوەتەکەی خۆی و لەگەڵی خەوت.

خواوەند تاعوونی بۆ منداڵەکانی ئیسرائیل ڕەوانە کرد.

فەنحاص کوڕی عیزار کوڕی هارون کاروبارەکانی موسای رادپەڕاند. پیاوێکی بەهێز و چوارشانە بوو. کاتێك زەمری کوڕی شەلوم ئەو کارەی کرد، لەوێ نەبوو. تاعوون لەناو منداڵەکانی ئیسرائیل بلاّو بوویەوە. داستانەکەیان بۆ گێڕایەوە، ڕمەکەی خۆی هەڵگرت و ڕۆشتە ناو خێوەتەکەی فەنحاص. ژن و پیاوەکە پێکەوە خەوتبوون. ئەوانی بەڕم پێکەوە دووری. ڕمەکەی دەرهێناو هاتەدەر. ڕمەکەی خستە سەرشانی. کۆتایی ڕمەکەی خستە سەرکەلەکەی و نووکی ڕمەکەی خستە ژێر چەناکەی. ئەو یەکەم کوڕی عیزار بوو. بەردەوام دەیوت: خوایە هەرکەس سەرپێچی فەرمانەکانی تۆ بکات، ئەو بەلاّی بەسەردا دێنین.

تاعوون لەسەر خەڵکان هەڵگیرا. دەستەیەك لەمنداڵەکانی ئیسرائیل بەهۆی تاعوونەوە لەناو چوون. ژمارەی مردوەکان بەتاعوون لەو کاتەوەی زەمری ژنەکەی برد تا ئەو کاتەی فەنحاص ئەوانی کوشت، حەفتا هەزار کەس بوو. ئامارەیان بەکەمتر لەبیست هەزار کەسیش داوە کە لەیەك کاتژمێری ڕۆژ مردن. لەبەر ئەمە، منداڵەکانی ئیسرائیل، هەر کاتێك قوربانی دەکەن، شان و کەلەکە و چەناکە بەمنداڵەکانی فەنحاص کوڕی عیزار کوڕی هارون دەدەن چوونکە دوای کوشتنی

زەمری، رمەکەی بەو شێوەیە گرت. یەکەم بەرهەم و منالّیش تایبەتە بەمنالّەکانی فەنحاص چوونکە یەکەم منالّی عیزارە.

سەبارەت بەبەلعەم کوڕی باعور، خواوەند ئەم ئایەی بۆ پێغەمبەر(د.خ) ڕەوانە کرد:

((واتل علیهم نبا الذی آتینا آیاتنا فانسلخ منها فاتبعه شیطان فکان من الغاوین، و لو شئنا لرفعناه بها و لکنه اخلد الی الارض و اتبع هویه فمثله کمثل الکلب ان تحمل علیه یلهث، اوتتر که یلهث، ذلك مثل القوم الذین کذبوا بآیاتنا فاقصص القصص لعلهم یتفکرون.

واتاکەی: داستانی ئەو کەسەی نیشانەکانی خۆمانمان فێرکرد و گومڕا بوو. شەیتان شوێنی کەوت و ڕۆشتە ریزی گومڕاکان، ئەگەر دەمانویست بەهۆی ئەم نیشانانەوە هەڵماندەگرت بەلاّم ڕووی لەپەستی کرد و شوێن هەوا و هەوەسی خۆی کەوت. داستانی ئەو داستانی سەگە، ئەگەر پەلاماری بدەیت، دەقوولێنێت و ئەگەر گوێی پێنەدەیت، دەوەڕێت. ئەمە داستانی ئەو خەڵکەیە حاشایان لەنیشانەکانی ئێمە کرد. ئەم هەواڵەیان بۆ بخوێنەرەوە، ئەگەری هەیە تێفکرن.

یانی کاتێك ڕووداوێك لەناو منالّەکانی ئیسرائیل ڕوویداوە و لەتۆیان شاردۆتەوە، ئەگەر بۆ ئەوانی بگێڕییتەوە ئەگەری هەیە تێفکرن و بزانن ئەم هەواڵەی رابردوو پێغەمبەرێك دەیگێڕێتەوە کە هەواڵەکانی لەئاسمانەوە پێدەگات.

خواوەند یوشەع کوڕی نوونی لەگەڵ منالّەکانی ئیسرائیل بەرەو سەرزەمینی ئەریحا ڕەوانە کرد. ڕۆشتنە ناو شارەکە و ستەمکارانی نیشتەجێی ئەو شارەیان کوشت. شەو نزیك دەبوویەوە، ترسی ئەوەیان لەسەر بوو ئەگەر شەو دابێت، پاشماوەی ستەمکاران بەسەریاندا سەرکەون. داوای لەخواوەند کرد خۆر نەشارێتەوە. خواوەند ئەو کارەی کرد تا هەموو ستەمکاران لەناوچوون.

موسا هاوریێ لەگەڵ منالّەکانی ئیسرائیل ڕۆشتە ناو سەرزەمینی ئەریحا وتا ئەو کاتەی خواوەند ویستی، ژیانی کرد. دواتر خواوەند ئەوی بۆلای خۆی گەڕاندەوە. کەس لەمرۆڤەکان شوێنی گۆڕەکەی ئەو نازانن.

لەگێڕانەوەی سەدیدا هاتووە: یوشەع کوڕی نوون، دوای مەرگی موسا، بۆ شەڕی

ستەمكاران بەرێكەوت. خواوەند دوای چل ساڵ، یوشەع كوڕی نوونی وەك پێغەمبەر ڕەوانە كرد. ئەوی كردە لێپرسراوی شەڕ لەگەڵ ستەمكاران. یەكێك لەمناڵەكانی ئیسرائیل بەناوی بەلعەم كەناوی گەورەی خوای دەزانی و ناباوەڕ بوو. ڕۆشتە لای ناباوەڕان و وتی: لەمناڵەكانی ئیسرائیل، مەترسن. من، كاتێك بۆ شەڕی ئەوان بەرێكەون، نفرینیان دەكەم تا لەناو بچن. داوای هەر شتێكی كرد، پێیان بەخشی بەلآم نەیتوانی لەگەڵ ژنان بخەوێت، چوونكە زیاد لەرادە گەورە بوون. سوار لەسەر مێچكەكەرەكەی خۆی نزیك دەكەوتەوە. ئەوە كەخواوەند سەبارەت بەو دەفەرمێت: ((و اتل علیهم......))

یوشەع بۆ شەڕ لەگەڵ ستەمكاران بەرێكەوت. بەلعەم لەگەڵ ستەمكاران هات. سوار لەسەر مێچكەكەرەكەی خۆی بوو. ویستی مناڵەكانی ئیسرائیل نفرین بكات بەلآم هەر كاتێك نفرینی مناڵەكانی ئیسرائیلی دەكرد، زمانی بۆ خەڵكە ستەمكارەكە دەگۆڕا. ستەمكاران وتیان: نفرینی ئێمە دەكەیت؟ دەیوت: مەبەستم مناڵەكانی ئیسرائیلە. كاتێك گەشتە دەروازەی شارەكە، فریشتەیەك، كلكی كەرەكەی گرت. بەلعەم بۆ پێشەوەی دەبرد، بەلآم كەرەكە نەدەجولآ. كاتێك زۆری لەكەرەكەدا، كەر كەوتە قسە و وتی: شەو بەهاوكاری من لەگەڵ ژنان نزیك دەكەویتەوە و ڕۆژ سوار من دەبیت. هاوار لەمن لەدەست تۆ، ئەگەر توانای ڕۆشتنم دەبوو. دەڕۆشتم بەلآم ئەم فریشتەیە كلكی گرتووم.

یوشەع لەرۆژی هەینی، شەرێكی قورسی لەگەڵ ستەمكاران كرد. كاتێك شەو داهات و هەتاو خۆی شاردەوە و شەممە داهات، دۆعای كرد و بەهەتاوی وت: تۆ ملكەچی فەرمانەكانی خواییت، منیش بەهەمان شێوە، خوایە، هەتاو بگەرێنەرەوە. هەتاو گەڕایەوە و ئەو ڕۆژە یەك كاژێر لەرۆژەكانی دیكە درێژتر بوو. دەستیان بەكوشتاری ئەوان كرد. دەستەیەك لەمناڵەكانی ئیسرائیل لەدەوری كەسێكیان كۆدەبوونەوە و لەگەردنیان دەدا، بەلآم سەریان نەدەپەڕاند.

تالآنییەكانیان كۆكردەوە، یوشەع فەرمانی كۆكردنەوەی تالآنییەكانیدا و هەموویانی سوتاند. وتی: ئەی مناڵەكانی ئیسرائیل، لەگەڵ من بەیعەت بكەن. بەیعەتیان كرد و دەستی كەسێك بەدەستیەوە لكا. یوشەع وتی: چیت لایە، بیهێنە. ئەو پیاوە، سەری گایەكی لەزێر ڕازاوە بەیاقوتی هێنا كە لەتالآنییە ڕفێنراوەكان بوو.

یوشەع سەری گاکە و پیاوەکەی وەك قوربانی دانا. ئاگر هات و هەردووکیانی سوتاند.

شوێنکەوتەکانی تەورات دەڵێن: هارون و موسا لەبیابان مردن. خواوەند دواس موسا وەحی بۆ یوشەع کوڕی نوون کرد و فەرمانی پێدا لەئەردەنەوە بەرەو سەرزەمینی بەڵێندراو بەرێکەوێت. یوشەع لەم کارەدا هەوڵیدا و کەسانێکی بۆ سەرزەمینی ئەریحا ڕەوانە کرد تا هەواڵەکانی بۆ بێنن. هاوریێ لەگەڵ سنوقی پەیمان بەرێکەوت تا لەئەردەن تێپەڕی. خۆی و هاوەڵانی لەرووبار ڕێگەیەکیان دۆزیەوە و ۆ ماوەی شەش مانگ گەمارۆیان خستە سەر ئەریحا. لەمانگی حەوتەم فوویان کرد بەکەڕەناکاندا و خەڵکان بەیەکجار و بەیەك دەنگ هاواریان کرد. دیواری شارەکە داڕما و تالآنییەکان کرد. هەموو کالآکانی شارەکەیان سووتاند جگە لە زێڕ و زیو و دەفرە مسین و ئاسنینەکان کە بەخەزێنەیان سپارد. یەکێك لەمناڵەکان شتێکی ڕفاند. خواوەند لێیان توڕە بوو. لەتێکشکان نزیك بوونەوە. یوشەع پاڕایەوە و خواوەند وەحی بۆنارد تاتیروپشك لەناو مناڵەکانی ئیسرائیل بکات. ئەوکارەی کرد و بەناوی پیاوە خیانەتکارەکە دەرچوو. بەڵگەی تاوانی ئەویان لەماڵەکەی هێنایەدەر. یوشەع، بەردبارانی کرد و هەموو سامانەکەی سووتاند و شوێنەکەیان بەخیانەت پیشە ناوبرد لەبەر ئەوەی ناتەوان بوو و تا ئێستا ئەو چاڵە بەچاڵی ناتەوان ناو دەبەن.

دوای ئەوە، یوشەع، مناڵەکانی ئیسرائیلی بەرەو پاشای عابی و خەڵکەکەی برد. خواوەند لەکاروباری جەنگ ڕێنوێنی کردن. فەرمانی بەیوشەعدا بۆسەیان بۆ بنێتەوە. ئەو کارەی کرد و بەسەر عابیدا سەرکەوت. پاشاکەی هەڵواسی و شارەکەی سوتاند و دوانزە هەزار ژن و پیاوی کوشت. خەڵکی عەما و جەبعون، فێڵیان لەیوشەع کرد تا ئەمانی پێبەخشین و کاتێك لەفریوەکەیان ئاگادار بوویەوە، نفرینی کردن کە بۆهەمیشە ئاوکێش و کۆڵە چیلکە ببەن. ئەو بەلآیان بەسەر هات. نفرینی کرد کەپاشای ئورشەلیم لەبارق سواڵ بکات.

دواتر پاشاکانی ئەرمانی کەپێنج کەس بوون، کەسیان بۆ لای یەکتر ڕەوانە کرد و دژی جەبعون کۆبوونەوە. خەڵکی جەبعون داوای هاوکاریان لەیوشەع کرد. هاوکاری کردن و پێنج پاشاکەی کوشت. ئەوانی بۆدۆڵی حوران دوورخستەوە و خواوەند بەردی سەهۆڵینی (تەرزە) بەسەردا باراندن. سەهۆڵ زیاتر لەشمشێری مناڵەکانی

ئیسرائیل، لەوانی کوشت. یوشەع داوای لەهەتاو کرد تا بمێنێتەوە و داوای لەمانگ کرد لەجووڵە بکەوێت تا پێش ئەوەی شەممە بگات. تۆڵە لەدوژمنەکانی بکاتەوە. پێنج پاشاکە رایان کرد ولەئەشکەوتێك خۆیان حەشاردا. یوشەع فەرمانیدا و دەرگای ئەشکەوتەکەیان بەست و بەمشێوەیە لەتۆڵەسەندنەوە رزگاری بوو. دواتر فەرمانیدا و پاشاکانیان هێنایەدەر، ئەوانی کوشت و هەڵیواسین. دواتر دایگرتن و لەناو ئەشکەوتەکە فڕیدان.

شوێن پاشاکانی دیکەی شام کەوت و سی و یەك پاشای لەناو برد. ئەو زەویانەی دەستی بەسەردا دەگرت، بەکەسانی دەبەخشی.

یوشەع مرد و لەکێوی ئەفراییم بەخاك سپێردرا. دوای ئەو، نەوەی یەهوودا و نەوەی شەمعون، شەڕیان لەگەڵ کەنعانییەکان کرد. ژنانیان ئەسیر کرد و دەهەزار کەسیان لەوان لەبازق کوشت. پاشای بازقیان گرت و پەنجە گەورەی دەستی و پەنجە گەورەی قاچیان بڕییەوە. پاشا وتی: حەفتا پاشای پەنجەبڕ. لەژێر سفرەکەی من نانیان کۆدەکردەوە و ئێستاکە گرفتاری سزایی خوایی بووم. پاشای بازقیان بۆ ئورشەلیم برد و لەوێ مرد.

منداڵەکانی یەهوودا لەگەڵ کەنعانییەکانی دیکە شەڕیان کرد و دەستیان بەسەر سەرزەمینەکەی ئەواندا گرت. تەمەنی یوشەع سەد و بیست و شەش ساڵ درێژەی کێشا و لەکاتی مردنی موسا تا کاتی مردنی، بۆ ماوەی بیست و حەوت ساڵ کاروبارەکانی منداڵەکانی ئیسرائیلی هەڵدەسووڕاند.

دەڵێن: یەکەم پاشای یەمەن لەدەورانی موسا کوڕی عیمراندا بوو. ئەو لەحەمیر بوو بەناوی شەمیر کوڕی ئەملول. ئەو بوو بناغەی شاری زەفاری لەیەمەن داڕشت و عەمالیقی لەیەمەن دەرپەڕاند.

شەمیر کوڕی ئەملول لەدەستنیشاندەکانی پاشاکانی ئێران بوو کەفەرمانڕەوایی یەمەن و سنورەکانی دەورەبەری دەکرد.

بەگومانی محەممەد کوڕی هوشامی کەلبی، دوای کوشتاری یوشەع، دەستەیەك لەکەنعانییەکان مانەوە و ئەفریقیس کوڕی قەیس کوڕی صەیفی کوڕی سەبا کوڕی کەعب کوڕی زەید کوڕی حەمیر کوڕی سەبا کوڕی یەشجب کوڕی یەعرب کوڕی قەحتان، کاتێك بەرەو ئەفریقیە دەڕۆشت و لای ئەوانەوە تێپەڕی، لەکەنارەکانی

شامەوە ئەوانی لەگەڵ خۆی بۆ ئەفریقیە برد و دەستی بەسەر ئەو سەرزەمینەدا گرت. جەرجیر پاشای ئەفریقیەی کوشت و پاشماوەی کەنعانییەکانی لەوێ نیشتەجێ کرد.

دەڵێت: ئەوان بەربەرەکانن و لەبەر ئەوە پێیان دەڵێن بەربەر چوونکە ئەفریقین بەوانی وت: ((چەندە بەربەرە)) یانی ((زۆربڵەن)). لەوەدوا بە بەربەرەکان ناویان بردن.

دەڵێت: صەنهاجە و کەتامەی بەربەر لەخەڵکی حەمیر بوون و تا ئێستا ماونەتەوە.

## وتار سەبارەت بەقاروون کوڕی یەسهەر کوڕی قاهس

قاروون کوڕە مامی موسا بوو.

لەباوکی جورەیح دەگێڕنەوە: قاروون لەخەڵکی موسا و کوڕە مامی ئەو یانی کوڕی یەسهەر بوو.

باوکی جورەیح دەڵێت: قاروون کوڕی قاهس بوو. موسا کوڕی عورمەر کوڕی قاهس و عورمەر بەعەرەبی پێی دەڵێن عیمران.

لەکوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە : یەسهەر کوڕی قاهیس، شەمیت کچی ساویب کوڕی بەرکیا کوڕی یەقسان کوڕی ئیبراهیمی وەك هاوسەر هەڵبژارد و عیمران و قاروونی هێنایە دنیا. قاروون مامی موسا و کوڕی عیمران بوو.

بەڵام زاناکانی کۆنی ئۆمەت و شوێنکەوتەکانی تەورات و ئینجیل وتەکانی باوکی جورەیح پشتراست دەکەنەوە.

لەئیبراهیم دەگێڕنەوە: قاروون لەخەڵکی موسا و کوڕە مامی ئەو بوو.

لەقتادە دەگێڕنەوە: قاروون لەخەڵکی موسا و کوڕە مامی بوو.

ئەویان بەنوورانی ناودەبرد چوونکە زۆر جوان بوو. بەڵام دوژمنی خوا دووڕوویی کردە پیشە بەهەمان شێوە کەسامری ئەو کارەی کرد و خواوەند لەناوی برد.

لەمالك کوڕی دینار دەگێڕنەوە: موسا کوڕی عیمران کوڕە مامی قاروونە و خواوەند سامانی فراوانی بەقاروون بەخشیبوو بەهەمان شێوە کەخواوەند دەفەرمێت: ((و آتیناه من الکنوزما ان مفاتحه لتنوء بالعصبة اولی القوة.

واتاکەی: ئەوەندە گەنجمان پێبەخشی کەهەڵگرتنی کلیلیەکانی لەئەستۆی دەستەی پیاوە بەهێزەکاندا بوو.)))

خەیسەمە دەڵێت: لەئینجیلدا باسی کراوە کلیلەکانی قاروون باری شەست ئێستری تەوێڵ سپی بوو. هەر کلیلێك تەنیا بەئەندازەی یەك پەنجە و هەر کلیل تایبەت بەگەنجێك بوو.

لەباوکی ساڵح دەگێڕنەوە: کلیلی خەزێنەکانی قاروون باری چل ئێستر بوو.

هەروەها لەخەیسەمە دەگێڕنەوە: کلیلەکانی قاروون لەپێست بوو، هەر کلیلێك

بەئەندازەی یەك پەنجە و هەر کلیلێك تایبەت بەگەنجێك و هەموویانی باری شەست ئێستر تەوێڵ سپی دەکرد. کاتێك خواوەند مەبەستی زیان گەیاندن بەقاروونی کرد، قاروون بەفراوانی سامانەکەی ستەمی لەخەڵکان کرد.

دەڵێن: ستەم و یاخیگەری قاروون ئەوە بوو کەبستێکی بەجل و بەرگەکانی خۆی زیاد کرد. خەڵکەکەی ئامۆژگاریان کرد و لەستەمکاری و یاخیگەری دووریان خستەوە، وتیان: ئەوەی خوا پێی بەخشیوە، لەرێگەی خوادا خەرجی بکات و سەرپێچی لەفەرمانەکانی خواوەند نەکات. خواوەند سەبارەت بەو دەفەرمێت:

(( اذ قال له قومه لا تفرح ان الله لا يحب الفرحين. و ابتغ فيما آتاك الله الدار الاخرة و لا تنس نصيبك من الدنيا و احسن كما احسن الله اليك و لا تبغ الفساد في الارض ان الله لا يحب المفسدين.

واتاکەی: خەڵکەکەی پێیان وت لەخۆبایی مەبە چوونکە خوا بەفیرۆدەرانی خۆش ناوێت. بەهۆی ئەو نیعمەتەکانی خواوەند پێی بەخشیوە، بەدوای جیهانێکی دیکەدا بگەرێ و بەشی خۆت لەم دنیا لەبیر مەکە. بەهەمان شێوە کەخوا چاکەی لەگەڵ تۆ کردووە، چاکە بکە و لەم سەرزەمینە بەدوای خراپەکاریدا مەڕۆ چوونکە خوا خراپەکارانی خۆش ناوێت.))

مەبەست لەوەی بەشی خۆت لەم دنیایە لەبیر مەکە ئەمەیە: لەبیری مەکە لەم جیهانە توێشوێك بۆ ئەو جیهانە پاشەکەوت بکەیت.

وەڵامی قاروون لەرووی نەزانی و لەخۆبایی بوون بەبەخشینەکانی خواوەند بەو شێوەیە کەخواوەند لەگێڕانەوەی وتارەکەی ئەو دەفەرمێت:

((انما اوتيت ما اوتيت على علم عندي. واتاکەی: ئەم ماڵە بەهۆی زانستی خۆم کۆکراوەتەوە.))

خواوەند بۆ بەدرۆ خستنەوەی وتاری ئەو دەفەرمێت: ((اولم يعلم ان الله قد اهلك من قبله من القرون من هو اشد منه قوة و اكثر جمعا.

واتاکەی: مەگەر نەیزانی خوا لەنەوەکانی پێشتر کەسانێکی لەناو برد کە لەهێزدا لەو بەهێزتر و لەساماندا لەو ساماندارتر بوون.))

ئەگەر بەو شێوە دەبوو، خواوەند سامانی دنیای بەکەسانێك دەبەخشی کەلێیان

ڕازی و خاوەن سامانەکانی لەناو دەبرد.

بەڵام ئامۆژگاری و ئاگادار کردنەوە، ئەوی لەنەزانی و شانازی کردن بەماڵ و سامانەکەی دوور نەخستەوە و لەسەرکێشیەکانی خۆیدا ڕۆچوو. بەشکۆ و مەزنی تەواو خۆی نیشانی خەڵکان دەدا. سوار ئەسپێکی زین ئەرخەوانی دەبوو. جل و بەرگی زەردی دەپۆشی، سێسەد کەنیز و چوارهەزار کەس لەهاوەڵانی بەهەمان جل و بەرگەوە هاوڕێیەتیان دەکرد. بەوتەیەك هاوڕێکانی ئەو حەوت هەزار کەس بوون.

لەموجاهید دەگێڕنەوە: قاروون سوار ئەسپە سپییە زین ئەرخەوانییەکان دەبوو. بەمشێوەیە خۆی نیشانی خەڵکان دەدا. خۆی و کەسەکانی جل وبەرگی زەردیان لەبەر دەکرد. خەڵکان کەشکۆ و گەورەیی ئەویان بینی، ئارەزوویان کرد و وتیان: (( یا لیت لنا ما اوتی قارون انه لذوحظ عظیم.

واتاکەی: خۆزگەی ئێمەیش، ئەوەمان دەبوو کەقاروون هەیەتی چوونکە ئەو شانسێکی گەورەی هەیە.))

خواناسەکان حاشایان لەم قسە وبەئارەزوومەندانیان وت: لەخوا بترسن و فەرمانەکانی ئەو جێبەجێ مەکەن، خۆتان لەخراپەکان بەدوور بگرن چوونکە باوەڕداران پاداشتێکی گەورە چاوەڕێیان دەکات.

وەك یاخیان گەردنکێشی کرد و لەسەرکێشیەکانی خۆی ڕۆچوو. خواوەند لەسەر سامانەکەی ئەو خێر و خێراتی دیاری و ناچاری کرد ئەو پارەیە بدات. کاتێك فەرمانە خواییەکانی پشتگوێ خست، سزایی خوایی گەیشت و بوو بەوانەیەك بۆ داهاتووان.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: کاتێك زەکات پێویست کرا. قاروون ڕۆشتە لای موسا و ڕێککەوتن تا لەهەر هەزار دینار یەك دینار و لەهەر هەزار درەم یەك درەم لەهەر هەزار شت یەك شت بدات. یاوتی لەهەر هەزار بزنێك یەك بزن بدات.

ئەبوجەعفەری تەبەری دەڵێت: من لەمەدا گومانم هەیە.

قاروون گەڕایەوە بۆ ماڵ و حسێبی کرد. زانی دەبێت سامانێکی فراوان بدات. مناڵەکانی ئیسرائیلی کۆکردەوە و وتی: ئەی مناڵەکانی ئیسرائیل، موسا فەرمانی چەندین کاری پێکردن و فەرمانەکانی ئەوتان جێبەجێ کرد. بەڵام ئێستا دەیەوێت دەست بەسەر ماڵ و سامانی ئێوەدا بگرێت.

وتیان: تۆگەورە و سالاری ئێمەیت، هەر فەرمانێك بدەیت، ئەنجامی دەدەین.

قاروون وتی: فەرمان دەدەم فلاَن رووسپی بێنن و برە پارەیەکی بدەنیَ و موسا تۆمەتبار بکەن.

ژنەکەیان بانگ کرد وپارەیان پێدا تا تۆمەت بخاتە پالَ موسا.

قارون رۆشتە لای موسا و وتی: خەلَکی تۆ کۆبوونەوە تا بۆ چاکە و خراپە ئامۆژگاریان بکەیت.

موسا هاتە لای خەلَك کە لەزەویەکی پان و بەرین کۆببونەوە، وتی: ئەی منالَەکانی ئیسرائیل، هەرکەس دزی بکات، دەستی دەبڕین، هەرکەس تۆمەتی ناڕەوا هەلَبەستێت، هەشتا قامچی لێدەدەین و هەرکەس زینا بکات و ژنی نەبێت، سەد قامچی و ئەگەر زینا بکات و ژنی هەبێت، قامچی لێدەدەین تا دەمرێت یا بەردبارانی دەکەین.

ئەبو جەعفەر دەلَێت: لەمەدا گومانم هەیە.

قاروون بەموسای وت: تەنانەت ئەگەر تۆیش بیت.

وتی: تەنانەت ئەگەر منیش بم.

وتی: منالَەکانی ئیسرائیل گومان دەکەن زینات لەگەلَ فلاَن کەس کردووە.

وتی: ژنەکە بێنن، ئەگەر وایوت، قسەکەی ئێوە راستە.

کاتێك هات، موسا پێی وت: فلاَن کەس!

وتی: بەلَیَ.

وتی: من ئەو کارەم لەگەلَ کردوویت کەئەمانە باسی دەکەن.

وتی: نا، درۆیان کرد، بەلاَم پارەیان بەمندا تا بلَێم ئەو کارەت کردووە.

موسا لەناو خەلَکەکەی کورنوشی برد و خواوەند وەحی نارد: فەرمان بەزەوی بدە.

موسا وتی: ئەی زەوی، ئەمانە بگرە. زەوی قاچی ئەوانی گرت.

وتی: ئەی زەوی بیانگرە.

زەوی تاڕانی ئەوانی گرت.

وتی: ئەی زەوی بیانگرە و زەوی تا گەردنی ئەوانی گرت. ئەوان دەپاڕانەوە و دەیانوت: ئەی موسا، ئەی موسا.

دوبارە وتی: ئەی زەوی بیانگرە.

زەوی ئەوانی قووتدا.

خواوەند وەحی بۆ موسا نارد: بەندەکانی من هاوار لەتۆ دەکەن و دەڵێن ئەی موسا، ئەی موسا و تۆ بەزەییت بەواندا نەهاتەوە، ئەگەر لەمن دەپاڕانەوە، دۆعاکەیانم گیرا دەکرد.

دەڵێت: ئەوەی خواوەند دەفەرمێت: (بەڕازاندنەوە، خۆی نیشانی خەڵك دەدا) بەو شێوەبوو کەسوار ئەسپە زین ئەرغەوانییەکان دەبوون و جلەکانیان بەخەنە رەنگ دەکرد. ئەوانەی خوازیاری ژیانی دنیا بوون، وتیان: یا لیت لنا مثل ما اوتی قارون انه لذوحظ عظیم. و قال الذین اوتوه العلم و یلکم ثواب الله خیر لمن آمن و عمل صالحا و لا یلقاها الا الصابرون. فخسفنا به و بداره الارض فما کان له من فئه ینصرونه من دون الله و ما کان من المنتصرین. و اصبح الذین تمنوا مکانه بالامس یقولون و یکان الله یبسط الرزق لمن یشاء من عبادة و یقدر لولا ان من الله علینا لخصف بنا و یکانه لا یفلح الکافرون. تلك الدار الاخرة نجعلها للذین لا یریدون علوا فی الارض و لا فسادا و العاقبة للمتقین.

واتاکەی: خۆزگە ئێمەیش ئەوەی بەقاروونیان داوە، دەمانبوو چوونکە ئەو شانسێکی گەورەی هەیە. ئەو کەسانەی زانستیان بوو، وتیان: هاوار لەئێوە پاداشتی خوایی بۆ ئەو کەسانەی باوەڕیان هێناوە و کرداری چاکە ئەنجام دەدەن، شیاوتر وباشترە و تەنیا خۆڕاگران ئەو پاداشتەیان دەست دەکەوێت. قاروونمان لەگەڵ ماڵەکەی بەچەقی زەویدا بردەخوار و دەستەیەکی نەبوو تا لەبەرابەر خواوەند هاوکاری بکەن و ناتوانن هاوکاری بکەن.))

ئەو کەسانەی پێشتر ئارەزوی جێگە وسامانی ئەویان دەکرد، رۆژێکی دیکە بەردەرام دەیانوت، هاوار، وەك بڵێی خوا رۆژی هەرکام لەبەندەکانی خۆی کەبیەوێت فراوان دەکات یا لێی دەستێنێتەوە. ئەگەر خوا چاکەی لەگەڵ ئێمە نەدەکرد، زەوی ئێمەیشی قووتدەدا. وەك بڵێی کافرەکان رزگاریان نابێت. ئەو دنیامان بۆ ئەو کەسانە داناوە کە لەسەر زەوی سەرکێشی و یاخیگەری ناکەنە پیشە و سەرئەنجامی چاکە تایبەتە بەخۆپارێزان.

گێڕانەوەیەك لەکوڕی عەباس لەبەر دەستایە بەم ناوەرۆکە وجیاوازییە: دوای

ئەوەی منداڵەکانی ئیسرائیل گرفتاری وشکەساڵی و قاتوقڕی بوون، ڕۆشتنە لای موسا و پێیان وت: لەخواوەند بپاڕێرەوە.

دەڵێت: موسا بۆیان پاڕایەوە. خواوەند فەرمووی: ئەی موسا سەبارەت بەکەسانێك قسە لەگەڵ من دەکەیت کەگوناحەکانیان لەنێوان من و ئەوان تاریکی دروست کردووە، لەتۆ پاڕانەوە، بەڵام وەڵامت نەدانەوە، ئەگەر لەخۆم دەپاڕانەوە، دۆعاکانیانم گیرا دەکرد.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: قاروون لەخەڵکەکەی موسا و کوڕە مامی بوو. موسا داوەری بەشێکی منداڵەکانی ئیسرائیلی دەکرد و قاروون داوەری بەشەکەی دیکە.

دەڵێت: قاروون داوای ژنێکی لەش فرۆشی کرد. پارەیەکی پێدا تا موسا بەزینا کردن تۆمەتبار بکات.

ڕۆژێك منداڵەکانی ئیسرائیل کۆببونەوە، قارون هات و وتی: ئەی موسا، سزای ئەو کەسەی دزی، بکات چییە؟

وتی: دەستی ببڕدرێتەوە.

وتی: تەنانەت ئەگەر تۆیش بیت.

وتی: تەنانەت ئەگەر منیش بم.

وتی: سزای کەسی زیناکار چییە؟

وتی: بەردباران.

وتی: تەنانەت ئەگەر تۆیش بیت.

وتی: تەنانەت ئەگەر منیش بم؟

وتی: تۆ زینات کردووە؟

وتی: هاوار لەتۆ، لەگەڵ کێ؟

وتی: فلان کەس

موسا داوای ژنەکەی کرد و وتی: بەو کەسەی تەوراتی ناردوە، سوێندت دەدەم، ئایا وتەکەی قارون راستە؟

ژن وتی: ئێستا کەسوێندتدام، شایەتی بۆ بێگوناحی تۆ دەدەم، تۆ پێغەمبەری خوایت، بەڵام دوژمنی خوا، پارەی پێدام تا بەو کارە تۆمەتبارت بکەم.

موسا کوڕنوشی برد و خواوەند وەحی بۆ نارد: سەر بەرز بکەرەوە، فەرمانم

بەزەویدا ملکەچی فەرمانەکانی تۆ بێت.

موسا وتی: زەوی بیانگرە؟

زەوی تا ڕانی ئەوانی گرت.

قارون وتی: ئەی موسا!

موسا وتی: بیانگرە. زەوی تا سینەی ئەوانی گرت.

قارون وتی: ئەی موسا.

موسا وتی: بیانگرە. زەوی ئەوانی قووتدا.

خواوەند وەحی بۆ موسا نارد: ئەی موسا، داوای هاوکاری لەتۆ کرد، هاوکاریت نەکرد، ئەگەر داوای هاوکاری لەمن دەکرد، هاوکاریم دەکرد.

لەزەید کوڕی جودعان دەگێڕنەوە: عەبدالله کوڕی حارس لەماڵ هاتەدەر و لەئەیوان دانیشت. ئێمەیش لەدەوری ئەو دانیشتین. سەبارەت بەسلێمان کوڕی داوود قسەی کرد و چەند ئایەیەکی قوڕئانی خوێندەوە.

ئەوسا گفتوگۆ سەبارەت بەسلێمانی کۆتایی پێهێنا و وتی: قارون لەخەڵکی موسابوو. سەرکێشی کرد و خاوەنی چەندین گەنج بوو. خوا فەرمووی: وتبووی ئەم گەنجەم بەهۆی زانایی خۆمەوە کۆکردۆتەوە. دوژمنایەتی موسای کرد و ئازاری پێگەیاند. موسا لەبەر پەیوەندی خزمایەتی لێی خۆش دەبوو.

قاروون ماڵێکی دروست کرد. درگارکانی لەزێڕ و لەسەر دیواری ماڵەکەی وەرەقە زێڕینەکانی هەڵواسی. منداڵەکانی ئیسرائیل، شەو و ڕۆژ دەڕۆشتنە لای. خواردنی پێدەدان. قسەیان بۆ دەکرد تا پێیکەنێت. کەسێکی بەدوای ژنێکی لەشفرۆشی بەناوبانگی ئیسرائیلی ڕەوانە کرد. کاتێك ژنەکە هات، وتی: دەتەوێت ماڵ و سامانی دنیاییت پێببەخشم و لەگەڵ ژنەکانی خۆم لەیەك جێگە کۆت بکەمەوە بەڵام لەجیاتی ئەوە کاتێك منداڵەکانی ئیسرائیل لای من کۆدەبنەوە، بڵێ: ئەی قارون بەموسا بڵێ، واز لەمن بێنێت؟

کاتێك قارون دانیشت و دەستەیەك لە منداڵەکانی ئیسرائیل هاتن، کەسی نارد و ژنەکە هات و لای قارون وەستا. خواوەند مەبەستی دڵی ئەو گۆڕی و بۆ تۆبە ناچاری کرد و بەخۆی وت: تۆبەیەکی باشتر لەمەم دەست ناکەوێت کەئازاری پێغەمبەری خوا نەدەم و دوژمنی خوا تاوانبار بکەم. وتی: قارون ماڵ و سامانی بەمن بەخشی و

لەگەڵ ژنەکانی خۆی لەیەك جێگە کۆی کردمەوە بەو مەرجەی لەبەرچاوی خەڵکان بڵێم: بۆ بەموسا ناڵێیت واز لەمن بێنێت، بەڵام دەرفەتێکی باشترم لەمە بۆ تۆبە کردن دەست ناکەوێت کە ئازاری پێغەمبەر(د.خ) نەدەم و دوژمنکەی بڕەنجێنم.

کاتێك ژن قسەی کرد، قاروون شڵەژا و سەری شۆڕ کرد. بێدەنگ مایەوە و زانی زیانی پێگەیشتوە. وتاری ئەو ژنە بڵاو بوویەوە وبەگوێی موسا گەیشت. موسا توڕە بوو، دەسنوێژی گرت، دۆعای کرد و پاڕایەوە و وتی: پەروەردگارا، دوژمنی تۆ مەبەستی ئازادانی منی کردووە و ویستی ریسوای ناو خەڵکانم بکات. خوایە، من بەسەر ئەودا زاڵ بکە.

خواوەند وەحی پێکرد، فەرمان بەزەوی بدە چوونکە فەرمانم پێداوە ملکەچی تۆ بێت. موسا ڕۆشتە لای قارون. کاتێك گەیشت، قاروون، مەترسی لەروخساری موسادابینی، وتی: ئەی موسا، بەزەییت بەمندا بێتەوە.

موسا وتی: ئەی زەوی، بیانگرە.

ماڵی قاروون لەرزی و خۆی و هاورێکانی تا قولاپەیان لەزەوی چەقی.

دوبارە موسا وتی: زەوی بیانگرە.

ماڵی قاروون لەرییەوە و خۆی و هاوەڵانی تا ڕانیان لەزەوی چەقی. قارون بەردەوام دەگریا و دەیوت موسا بەزەییت بەمندا بێتەوە.

موسا وتی: زەوی بیانگرە.

ماڵەکە لەڕییەوە. قاروون و داروودەستەکەی تا کەلەکەیان لەزەوی چەقی. دەگریان و دەپاڕانەوە.

موسا وتی: زەوی بیانگرە.

قارون و ماڵەکەی بەزەویدا ڕۆشتنە خوار.

دەڵێن: وەحی هات ئەی موسا چەندە بێ بەزەییت، سوێند بەگەورەیی خۆم، ئەگەر لەمن دەپاڕایەوە، دۆعاکەیم گیرا دەکرد.

لەکوڕی عیمرانی جوونی دەگێڕنەوە: وەحی بۆ موسا هات کەدوای تۆ، زەوی ناکەمە ملکەچی فەرمانەکانی هیچ کەسێك.

لەقتادە دەگێڕنەوە: قاروون، هەر ڕۆژە و بەئەندازەی یەك باڵا لەزەویدا ڕۆدەچێت. بەردەوام دەڕواتە خوار و تا ڕۆژی کۆتایی ناگاتە کۆتاییەکەی.

کاتێك سزای خوایی بەسەر قاروندا داباری، ئەو کەسانەی ئامۆژگاریان کردبوو، سوپاسی نیعمەتەکانی خوایان کرد وئەوانەی ئارەزویان دەکرد وەك ئەو ساماندار بن، لەئارەزوەکەی خۆیان پەشیمان بوونەوە و هەستیان بەهەڵەی خۆیان کرد. خواوەند لەگێڕانەوەی وتاری ئەوان دەفەرمێت: (( و یکان الله یبسط الرزق لمن یشاء من عبادة و یقدر لو لا ان من الله علینا.

واتاکەی: هاوار. خواوەند، رۆژی هەرکام لەبەندەکانی بخوازێت فراوان دەکات و هەر کەس بیەوێت، لێی وەردەگرێتەوە. ئەگەر خوا چاکەی لەگەڵ نەدەکردین، ئێمەیش بەزەویدا دەڕۆشتینە خوار.))

چاکەی خواوەند ئەوە بوو زیانی قارون و دارودەستەکەی لەو کەسانە دوور خستەوە کەئارەزوویان دەکرد هاوشێوەی قاروون بن وگەرنە ئەوانیش وەك قاروون و کەسەکانی بەزەویدا دەڕۆشتنە خوار.

خواوەند، موسا و باوەڕدارانی منداڵەکانی ئیسرائیل و هاورێی موسا، یوشەع کوڕی نوونی لەمەترسی و زیان و بلاَّکان رزگار کرد و دوژمنەکانی خۆی سزادا کەقارون و هامان و فیرعەون و کەنعانییەکان بوون، لەبەر ئەوەی ستەم و یاخیگەری و سەرپێچی کردن لەفەرمانەکانی خواوەندیان کردە پیشە. ئەوان بوونە وانەیەك بۆ خەڵکان و سامان و ماڵ و هێز، فریایان نەکەوت لەبەر ئەوەی حاشایان لەنیشانەکانی خوا دەکرد و لەزەوی خراپەیان بلاَّو دەکردەوە و بەندەکانی خوایان بۆ بەندایەتی کردنی خۆیان ناچار دەکرد.

پەنا دەبەین بۆ خوا لەو کردارانەی دەبنە هۆی توڕەیی خوا.

ئەبوزەر لە پێغەمبەر(د.خ) دەگێڕێتەوە: یەکەم پێغەمبەری منداڵەکانی ئیسرائیل موسا و دواییینیان عیسا کوڕی مریەم بوو.

دەڵێت، وتم: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، لەناو صەحیفەکانی موسا چی نووسرابوو؟

فەرمووی: ئامۆژگاری بوو وەك ئەمە: سەرم سوڕماوە لەوەی باوەڕی بەجەهەننەم هەیە، بەلاَّم پێدەکەنێت. سەرم سوڕماوە لەوەی باوەڕی بەمەرگ هەیە و رەزامەندی نیشان دەدات. سەرسوڕماوە لەوەی باوەڕی بەلێپرسینەوەی رۆژی کۆتایی هەیە بەلاَّم کرداری چاکە ئەنجام نادات.

دوای مەرگی موسا، یوشەع کوڕی نوون تا ئەو کاتەی مرد، بۆ ماوەی بیست و

حەوت ساڵ کاروبارەکانی منداڵەکانی ئیسرائیلی هەڵدەسووڕاند کە بیست ساڵی لەرۆژگاری پاشایەتی مەنوچێهر و حەوت ساڵی لەرۆژگاری پاشایەتی ئەفراسیابدا بوو.

ئێستا باسی پاشای ئێرانی بابل دەکەین کەدوای مەنوچێهر لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت.

## وتار سەبارەت بە پاشای پارسی بابل دوای مەنوچێهر

باسمان کرد کەراستی مێژوو لەماوەی تەمەنی پاشاکانی ئێران دەتوانین بناسینەوە.

کاتێك مەنوچێهر پاشا کوڕی مەنشخورنەر کوڕی مەنشخور ئەربەغ، مرد، فراسیات کوڕی فشەنك کوڕی ڕۆستەم کوڕی تورك دەستی بەسەر برخنیارس و وڵاتی فارسەکاندا گرت. وەك وتوویانە، هاتە بابل و زۆربەی کاتەکانی ژیانی لەبابل و مێهرگانی قەزەق بەسەر برد و وێرانی زۆری لەوڵاتی فارسەکان دروست کرد.

دەڵێن: کاتێك بەسەر وڵاتی فارسەکان زاڵبوو، وتی: ((بۆ لەناو بردنی خەڵکان پەلە بکەین)). ستەمکاری ئەو فراوان و ئاوەدانییەکانی خەنارس وێران بوون، کارێز و رووبارەکان کوێر بوونەوە و لەپێنجەم ساڵی پاشایەتی ئەو، خەڵك گرفتاری قاتوقڕی هاتن تا ئەو کاتەی لەوڵاتی فارسەوە بەرەو سنوری تورکەکان بەرێکەوت.

لەم ساڵانەدا ئاو کەمی کرد، بەرهەمی دارەکان کەم بوویەوە و خەڵك گیرۆدەی زیان بوون تا ئەو کاتەی ((زوو)) کوڕی تەهماسب دەرکەوت. دەستەیەك زوو بەزاب کوڕی تەهماسفان ناو دەبەن. دەستەیەکی دیکە بەزاغ، دەستەیەك بەراسب کوڕی تەهماسب کوڕی کانجۆ، کوڕی زاب کوڕی ئەرفس کوڕی هرانسف کوڕی وندنگ کوڕی ئەرەنگ کوڕی بودخوش کوڕی مسو کوڕی نەورزەر کوڕی مەنوچێهر ناوی دەبەن.

دایکی زوو کوڕی مادول کچی وامن کوڕی وازرگا کوڕی قود کوڕی سەلەم کوڕی فەرەیدونە.

دەڵێن: تەهماسب لەرۆژگاری پاشایەتی مەنوچێهر کە بۆ شەڕی ئەفراسیاب راسپێردرابوو، خیانەتی کرد و پاشا توڕە و مەبەستی کوشتنی ئەوی کرد. گەورەکانی وڵات سەبارەت بەبەخشینی ئەو گفتوگۆیان لەگەڵ پاشا کرد. کاتێك کەسێك لەبەر ئەنجامدانی تاوان حوکمی سزای بەسەر دادەسپێنرا، گەورە و بچوك جیاوازی نەدەکرد و ئەمە لەبەر دادپەروەی مەنوچێهر بوو. بەداوای گەورەکانی وڵات رازی نەبوو و وتی: ئەمە دەبێتە هۆکاری لاوازی دین بەڵام ئەگەر سوورن لەسەر بەخشینی، پێویستە لەوڵاتەکەی مندا نەمێنێتەوە. ئەوی لەسنوری فەرمانڕەوایەتی خۆی دەرکرد. تەهماسب بەرەو وڵاتی تورکەکان ڕۆشت و لەسنوری وامن نیشتەجێ

بوو.

کچی وامن لەکۆشکدا زیندانی بوو چوونکە ئەستێرە ناسان وتبوویان ئەو کچە کوڕێك دێنێتەدنیا و وامن دەکوژێت. تەمهاسب فێڵی کرد و ژنەکەی لەکۆشکەکە بردەدەر. ژن، بەزوو دووگیان بوو. کاتێك ساڵەکانی سزادانی تەهماسب کۆتایی هات، مەنوچێهر ڕێگەی پێدا بەرەو خەنارس، وڵاتی پارسەکان، بگەڕێتەوە. تەمهاسب مادولی بەفرت و فیڵ لەوڵاتی تورکەکانەوە بۆ وڵاتی فارسەکان هێنا. کاتێك مادول گەیشتە شاری ئێرانکەرد، زووی هێنایە دنیا.

دەڵێن: زوو، لەناو شەڕەکانی ئێران لەگەڵ تورکەکان، وامن باوەگەورێی خۆی کوشت و فراسیاتی لەوڵاتی فارسەکان دەرپەڕاند. زاڵبوونی فراسیات بەسەر وڵاتی فارسەکان و بابل دوای مەرگی مەنوچێهر تا ئەوکاتەی لەلایەن زوو کوڕی تەهماسب بۆ تورکستان دوورخرایەوە، دوانزە ساڵی خایاند.

دەڵێن: دەرکردنی فراسیات لەوڵاتی فارسەکان لەرۆژی ئەبان لەمانگی ئابان بوو. عەجەم ئەم رۆژەیان کردە جەژن چوونکە لەشەڕ و ستەمی فراسیات رزگاریان ببوو. دوای نەورۆز و مێهرەگان سێیەم جەژنی ئێرانییەکانە.

زوو، پاشایەکی پەسند و مسکێن نەواز بوو. فەرمانیدا تا هەموو وێرانییەکانی فراسیات لەوڵاتی خەنارس و بابل ئاوەدان بکەنەوە و قەلا خاپوورەکان نۆژەن و چاڵ و کارێزەکان هەڵبکەننەوە. ئاوە ڕۆشتوەکان بگەڕێننەوە وکاروبارەکانی لەجاران باشتر و چاکتر کرد. بۆ ماوەی حەوت ساڵ خەراجی لەسەر خەڵك هەڵگرت و لەرۆژگاری ئەو وڵاتی فارسەکان ئاوەدان بوویەوە. ئاو فراوان و خەڵکان لەخۆشیدا بوون.

ئەو لەعێراق رووبارێکی هەڵکەند و ناوی نا زاب. فەرمانیدا لەهەر دوولای رووبارەکە شارێك دروست بکەن کەپێی دەڵێن شاری کۆن. ئەو شارەی کردە ویلایەتێك و بەزەواجی ناوی برد و بۆ سێ ناوچە دابەشی کرد: زابی سەرو و زابی ناوەڕاست و زابی خواروو. فەرمانیدا تۆوی گوڵ و گیاکان لەکوێستانەوە بێنن و لەوشارە بیڕوێنن.

یەکەم کەس بوو خواردنە جۆراوجۆرەکانیان بۆ ئامادە کرد. یەکەم کەسە شلە جۆراوجۆرەکان لەسەر سفرەکەی بینرا. لەتالانییە بەدەست هاتووەکان لەسوپای

تورکەکان، بەشی سوپاییەکانی دیاری کرد.

کاتێك زوو، پاشایەتی گرتەدەست و تاجی لەسەر نا، وتی: هەموو وێرانییەکانی فراسیاتی جادووگەر ئاوەدان دەکەینەوە. ئەو گرشاسب کوڕی ئەسرەت کوڕی سەهم کوڕی نەریمان کوڕی تورەك کوڕی شیراسب کوڕی ئەروشسب کوڕی توج کوڕی فەرەیدون پاشای کردە وەزیر و یاریدەدەری خۆی. دەستەیەك لەرەچەڵەك ناسانی فارسی وتوویانە ئەو گرشاسب کوڕی ئەساس کوڕی تەهموس کوڕی ئەشك کوڕی نێرس کوڕی رەحر کوڕی دورسرو کوڕی مەنوچێهر پاشا بوو.

دەڵێن: زوو و گەرشاسب لەپاشایەتیدا شەریك بوون. بەڵام زووکوڕی تەهماسب پاشا و گرشاسب وەزیر و یاریدەدەری ئەو بوو.

گرشاسب یەکێك بوو لەگەورەکانی فارس بەڵام پاشایەتی پێنەبرا. دەورانی پاشایەتی ئەو تا کاتی مردن، وەك دەڵێن، سێ ساڵی خایاند.

### دوای ئەو کەیقوباد پاشایەتی گرتەدەست

کەیقوباد کوڕی زاغ کوڕی بوحناه کوڕی مەسوو کوڕی نەوزەر کوڕی مەنوچێهرە. کەیقوباد، فرەنك کچی نەدسای کردە هاوسەر کەکچی یەکێك لەگەورەکانی تورکە. بۆ کەیقوباد، کەی ئەفنە و کەی کاووس و کەی ئەرش و کیبە ئەرش و کیفاشین و کیمەی هێنایە دنیا کەپاشاکان و باوکی پاشاکان.

دەڵێن: کەیقوباد کاتێك پاشایەتی گرتەدەست و تاجی لەسەرنا، وتی: ئێمە دیاری تورکەکان وێران دەکەین و بۆ ئاوەدان کردنەوەی دیاری خۆمان تێدەکۆشین.

ئەو ئەندازەی ئاوی جۆگەکان و سەرچاوەکانی بەمەبەستی ئاویاری زەوییەکان دیاری و ناو و سنوری ویلایەتەکانی تۆمار کرد. خەڵکی بۆ کشتوکاڵ هاندا و دە یەکی بەرهەمی زەمینی بۆ خەرجیەکانی سوپا هەڵگرت.

دەڵێن: کەیقوباد لەئارەزوو بۆ ئاوەدان کردنەوەی وڵات و پاراستنی وڵاتەکەی لەدوژمن و داگیرکاری دوژمنان هاوشێوەی فیرعەون بوو. هەروەها دەڵێن: پاشاکانی کیانی و نەوەکانیان لەمناڵەکانی ئەون. لەنێوان کەیقوباد و تورکەکان و نەتەوەکانی دیکە چەندین شەڕ روویداوە. کەیقوباد لەنێوان سنوری فارسەکان و سنوری تورکەکان لەنزیك رووباری بەڵخ نیشتەجێ بوو تا رێگر بێت لەدەست درێژی تورکەکان بۆ سەر سنوری فارسەکان. خوا زاناترە.

## وتار سەبارەت بە منداڵەکانی ئیسرائیل

لەئێستادا سەبارەت بە منداڵەکانی ئیسرائیل وسالاری ئەوان دوای یوشەع کوڕی نوون و ئەو رووداوانەی لەرۆژگاری زوو و کەیقوباد بەسەر ئەواندا هات، دەدوێین.

شارەزایانی مێژووی رابردووان وکاروباری نەتەوەکان بۆچوونیان جیاواز نییە لەسەر ئەوەی دوای یوشەع کوڕی نوون، سالاری منداڵەکانی ئیسرائیل لەدەستی کالب کوڕی یوفەنا و دوای ئەو حەزقیل کوڕی بوزی بوو کەپێیان دەوت کوڕی عەجوز.

لەکوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە: لەبەر ئەوە بە حزقیل کوڕی بوزیان دەوت کوڕی عەجوز، چوونکە دایکی لەتەمەنی پیری داوای منداڵی لەخواوەند کرد و خواوەند حزقیلی پێبەخشی و لەبەر ئەمە بەکوڕی عەجوز ناویان دەبرد. ئەم ئایەی قورئان سەبارەت بەخەڵکەکەی ئەوە کەخواوەند دەفەرمێت:

((الم تر الى الذين خرجوا من ديارهم و هم الوف حذر الموت.

واتاکەی: مەگەر ئەوانەی لەترسی مەرگ دیاری خۆیانیان بەجێهێشت نەتبیستوە کەهەزاران کەس بوون.))

لەوەهب کوڕی مونبە دەگێڕنەوە: دەستەیەك لە منداڵەکانی ئیسرائیل گرفتاری بەلاّ و زیانەکانی رۆژگار ببون. سکالاّیان لەبارودۆخی خۆیان کرد و وتیان: خۆزگە دەمردین و رزگارمان دەبوو. خواوەند وەحی بۆ حەزقیل نارد کە خەڵکەکەی تۆ لەبەلاّ و زیان سکالاّ و ئارەزوویان کرد بمرن و رزگاریان بێت. بەمردن ئاسودە نابن مەگەر ئەوەی گومان بکەن من دوای مەرگ ئەوان زیندووو ناکەمەوە. ئێستا برۆ فلاّن شوێن چوونکە ئەو چوارهەزار کەسە مردوون.

وەهب دەڵێت: ئەو کەسانە بوون خواوەند ئایەی الم تر الى الزين خرجوا من ديارهم ی سەبارەت بەوان رەوانە کرد. برۆ و بانگیان بکە. باڵندەکان و درندەکان ئێسقانی مردوەکانیان بلاّو کردبوویەوە. حەزقیل ئەوانی بانگ کرد و وتی: ئەی ئێسقانە رزاوەکان، بەفەرمانی خواوەند یەکبگرنەوە. ئێسقانەکانی هەر کەسێك یەکیان گرت. دوای ئەوە وتی ئەی ئێسقانەکان بەفەرمانی خواوەند بەگۆشت

داپۆشرێن. ئێسقانەکان بەگۆشت داپۆشران و جوولاًنەوە. حەزقیل وتی: ئەی گیانەکان بەفەرمانی خواوەند بۆ جەستەکان بگەرێنەوە. بەفەرمانی خواوەند هەموویان هەستان و وتیان الله اکبر.

کوڕی مەسعود دەڵێت: داستانی خەڵکی حەزقیل بەو شێوەیە: ئەوان لەگوندی داوردان ژیانیان بەسەر دەبرد کەپێش شاری واستە. تاعون لەویّ بلاّوبوویەوە و زۆربەی دانیشتووانەکەی رایان کرد و لەدەرەوەی شار دابەزین. ئەوانەی مانەوە، زۆربەیان مردن. ئەوانەی رایانکردبوو، تەندروست رزگاریان بوو. کاتێك تاعون کۆتایی هات گەرانەوە و ئەوانەی لەگوندەکە مابوونەوە، وتیان: ئەوان لەئێمە دوورئەندێشتر بوون، ئەگەر ئێمەیش وەك ئەوان دەرۆشتینەدەر، زیانمان بەرنەدەکەوت. ئەگەر جارێکی دیکە تاعون بلاّو ببێتەوە، وەك ئەوان لەگوندەکە دەرۆینەدەر. جارێکی دیکە تاعون هات و ئەوان رایان کرد. سی و چەند هەزار کەس بوون و هەموویان لەیەك شوێن کۆبونەوە کەدۆڵێکی بەربلاّو بوو. فریشتەیەك لەخوارەوەی دۆڵەکە و فریشتەیەك لەسەرەوەی دۆڵەکە هاواریان کرد، بمرن و هەموویان مردن. جەستەکانیان رزا و حەزقیلی پێغەمبەر لای ئەوان تێپەری. کاتێك جستە رزاوەکانی ئەوانی بینی، وەستا و ئەندێشەی لەژیانی ئەوان کردووە. وەحی هاتە خوار: ئەی حەزقیل دەتەوێت نیشانی تۆی بدەین چۆن ئەوان زیندووو دەکەینەوە؟

وتی: بەڵیّ. لەدەسەلاّتی خوا بۆ مردنی ئەوان سەریسوڕما بوو.

وەحی هاتەخوار: بڵیّ: وتی: ئەی ئێسقانە رزاوەکان بەفەرمانی خواوەند یەکبگرنەوە، ئێسقانەکان یەکیانگرتەوە و ئێسکەپەیکەرەکان دروست بوو. دواتر خواوەند وەحی نارد: ئەی ئێسقانەکان بەفەرمانی خواوەند بەگۆشت داپۆشرێن. گۆشت و خوێن و جل و بەرگەکانی کاتی مردن لەبەریان کرایەوە. دوای ئەوە وەحی هات: ئەی جەستەکان بەفەرمانی خواوەند هەستن و هەموویان هەستان.

لەموجاهید دەگێڕنەوە: کاتێك مردووەکان هەستان، وتیان: ((سبحانك ربنا و بحمدك لا اله الا انت)) بۆ لای خەڵکەکەی خۆیان گەرانەوە و شوێنەواری مەرگ بەروخساریانەوە دیار بوو. هەر جل و بەرگێکیان لەبەر دەکرد هاوشێوەی کفن تۆزاوی دەبوو. دواتر لەکاتی دیاریکراودا مردن.

سالمی نەصری دەڵێت: ڕۆژێك عومەر نوێژی دەکرد و دوو جوولەکە لەپشت سەریەوە بوون. یەکیان بەوەی دیکەی وت: ئەمە خۆیەتی؟

کاتێك عومەر نوێژەکەی تەواو کرد، وتی: ئەم قسەی کردتان، ئەوە خۆیەتی، یانی چی؟

وتیان: ئێمە لەکتێبەکەی موسادا بینیومانە کەسێك دێت هاوشێوەی حەزقیل مۆجیزەی پێدەبەخشن و بەفەرمانی خواوەند مردووەکانی زیندوو کردەوە.

عومەر وتی: ئێمە لەکتێبەکەی خۆماندا ناوی حەزقیل نابینین و کەس جگە لەعیسا کوڕی مریەم مردوەکانی زیندووو نەکردووە.

وتیان: مەگەر لەکتێبی خوا نابینیت کەدەفەرمێت: چەندین پێغەمبەری دیکەمان ڕەوانە کردووە بەڵام ئاماژەمان بەداستانەکانی ئەوان نەداوە.

عومەر وتی: بۆنا.

جوولەکەکان وتیان: داستانی زیندوو کردنەوەی مردووەکان بەو شێوەیە: تاعوونێك لەناو منداڵەکانی ئیسرائیل بڵاو بوویەوە و دەستەیەك لەوان شارەکەیان بەجێهێشت و کاتێك یەك میل دوور کەوتنەوە، خواوەند ئەوانی مراند و دیوارێکیان بەدەوری ئەواندا دروست کرد. کاتێك ئێسقانەکانیان ڕزا، خواوەند حەزقیلی وەك پێغەمبەر(د.خ) ڕەوانە کرد: لای ئەوان وەستا و فەرموودەکانی خواوەندی هێنایە سەرزمان. خواوەند ئەوانی زیندوو کردەوە و ئایەی الم تر الى الذين خرجوا من ديارهم، سەبارەت بەوان هاتۆتەخوار.

لەکوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە:هەڵاتنی خەڵکی حەزقیل لەتاعوون یا نەخۆشیەکی دیکە بوو کەخەڵکانی دەکوشت و ئەوان لەترسی مردن هەڵاتن. هەزاران کەس بوون. لەسەرزەمینێك دابەزین و خواوەند فەرمانی مردنی ئەوانی ڕەوانە کرد و هەموویان مردن. خەڵك بەدەوری ئەوان دیوارێکیان دروست کرد تا لەدڕندەکان بیانپارێزن لەبەر ئەوەی زۆر بوون و دفن کردنیان دژوار بوو. ڕۆژگارەکان تێپەڕین و ئێسقانەکان ڕزین. حەزقیل کوڕی بوزی لای ئەوان تێپەڕی و لەداستانی ئەوان سەریسوڕما. بەزەیی بەواندا هاتەوە. وەحی هاتەخوار: ئایا حەز دەکەیت خواوەند ئەوان زیندوو بکاتەوە؟ وتی: بەڵێ. وەحی هاتە خوار کەبڵێ ئەی ئێسقانە ڕزاوەکان هەرکام بۆ جەستەی خاوەنی خۆتان بگەڕێنەوە. حەزقیل قسەکانی خواوەندی هێنایە سەرزمان و

ئێسقانەکان یەکیانگرتەوە.دواتر وەحی هاتە خوار: ئەی گۆشت و دەمار و پێست، ئێسقانەکان داپۆشن. دەڵێت: سەیری دەکرد و ئێسقانەکان دەمار و دواتر بەگۆشت دوای ئەوە بەپێست و موو داپۆشران تا ئەوەی ئافراندنی ئەوان تەواو بوو بەلاّم هێشتا بیٚ گیان بوون.

دواتر لەخوا پاڕایەوە تا گیانیان بۆ بگەڕێنێتەوە. کاتێك هاتەخۆ، خەڵکەکە دانیشتبوون و سبحان الله یان دەوت.

ئاماژەیان بەکاتی مانەوەی حەزقیل لەناو منالّەکانی ئیسرائیل نەداوە.

کاتێك خواوەند حەزقیلی مراند، روداوەکان لەناو منالّەکانی ئیسرائیل فراوان بوو. پەیمانی خوایان شکاند و روویان کردە بتپەرەستی. خواوەند ئەلیاس کوڕی یاسین کوڕی فەنخاص کوڕی عیزار کوڕی هارون کوڕی عیمرانی وەك پێغەمبەر بۆ لای منالّەکانی ئیسرائیل رەوانە کرد.

محەممەد کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك خواوەند گیانی حەزقیلی گرت و لەناو منالّەکانی ئیسرائیل چەندین رووداوی گەورە روویاندا و پەیمانی خوایان شکاند و دەستیان بەپەرەستینی بتەکان کرد. خواوەند ئەلیاسی وەك پێغەمبەر رەوانە کرد. پێغەمبەرانی دوای موسا بۆ بوژاندنەوەی تەوراتی لەبیرکراو. رادەسپێردران. ئەلیاس لەدەورانی یەکێك لەپاشاکانی منالّەکانی ئیسرائیل بوو بەناوی ئەحاب. ناوی ژنەکەی ئەزبل بوو. پاشا پێغەمبەری ئەلیاسی پشتراست کردەوە و ئەلیاس کاروبارەکانی بۆ رێکدەخست. منالّەکانی دیکەی ئیسرائیل بتێکیان هەبوو بەناوی بەعل و لەجیاتی خوا دەیانپەرەستی.

دەڵێت: لەدەستەیەك لەشارەزایانی مێژوو بیستومە: بەعل ژنێك بوو و لەجیاتی خواوەند دەیانپەرەست.

خوا بەمشێوەیە داستانی ئەلیاس بۆ محەممەد دەگێڕێتەوە:

(( وان الیاس لمن المرسلین. اذقال لقومه الاتتقون. اتدعون بعلاوتذرون احسن الخالقین، الله ربکم و رب آباؤکم الاولین.

واتاکەی: ئەلیاس لەپێغەمبەرەکان بوو. کاتێك بەخەڵکەکەی خۆی وت: بۆ ناترسن؟ ئایا بەعل دەپەرەستن و ئافرێنەری خۆتان پشتگویٚ دەخەن، خواوەندی تاقانە پەروەردگاری ئێوە وپەروەردگاری باوکانی کۆنی ئێوەیە.))

ئەلیاس پێشنیاری خواپەرەستی پێدەکردن و جگە لەپاشا کەس بەپێشنیارەکەی ڕازی نەبوو. چەندین پاشا لەشام دەژیان و هەرکام پاشایەتی سنوورێکیان دەکرد. ئەو پاشای ئەلیاسی لەگەڵدا بوو، ڕۆژێك پێی وت: سوێند بەخوا ئەم کارەی تۆ بەبێهۆ دەزانم چوونکە فلأن و فلأن ( ئامارژەی بەدەستەیەك لەپاشاکانی منالەکانی ئیسرائیلدا کە لەجیاتی خواوەند بتیان دەپەرەست) وەك ئێمە دەخۆن و دەخۆنەوە و پاشایەتی دەکەن و ژیان بەخۆشی و کامەرانی دەبەنەسەر لەکاتێکدا کردووەکانی ئەوان بەگومانی تۆ فیڕۆیە، هیچ کێشەیەکیان لەدنیا نییە و ئێمە لەوان گەورەتر و لەپێشتر نین.

دەڵێن و خوا زاناترە، ئەلیاس وتی: انا الله و مووی سەر و جەستەی بەرز بوویەوە، ڕەدی قسەکانی پاشای دایەوە و ئەوی بەجێهێشت. ئەو پاشایەیش هاوشێوەی ئەوانی دیکە دەستی بەپەرەستینی بتەکان کرد. ئەلیاسی وتی: خواوەندا، منالەکانی ئیسرائیل لەسەر بتپەرەستی پێداگری دەکەن، نیعمەتەکانی خۆت لەوان بگرەوە.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: خواوەند وەحی پێکرد، کاروباری تایبەت بەڕۆژی ئەوان بەتۆ دەسپێرم تا لەمبارەوە فەرمانی خۆت دەربکەیت.

ئەلیاس وتی: خوایە بارانیان لێبگرەوە.

سێ ساڵ باران نەباری و مەڕومالأت خزۆك و خشۆك و گەڕۆك و دار لەناوچوون و خەڵك کەوتنە تەنگانەوە. ئەلیاس کاتێك نفرینی کردن، لەمنالەکانی ئیسرائیل خۆی شاردەوە، چوونکە لەگیانی خۆی دەترسا. لەهەر شوێنێك دەبوو، ڕۆژییەکەی دەگەیشت. کاتێك لەماڵێك یا لەژوورێك بۆنی نان دەهات، دەیانوت: ئەلیاس بۆ ئێرە هاتووە. بەبیانوی گەڕان بەدوای ئەو، کێشەیان بۆ دانیشتووانی ماڵەکە دروست دەکرد.

ئەلیاسی پێغەمبەر پەنای بۆ ماڵی ژنێك لەمنالەکانی ئیسرائیل برد کەکوڕێکی نەخۆشی بوو بەناوی ئەلیەسع کوڕی ئەختوب. ژن پەنایدا و کەسی ئاگادار نەکردەوە. ئەلیاس لەخوا پاڕایەوە تا خواوەند شیفای کوڕەکەی بدات. کوڕەکەی چاك بوویەوە و بوو بەشوێنکەوتەی ئەلیاس. باوەڕی پێهێنا و بۆهەموو شوێنێك لەگەڵی دەڕۆشت.

ئەلیاس پیر و ئەلیەسع گەنجێکی تازە پێگەیشتوو بوو. دەڵێت: خواوەند وەحی بۆ ئەلیاس رەوانە کرد: بارانت لە منالەکانی ئیسرائیل گرتەوە و جگە لەوان خەڵکانێکی دیکەی بێ گوناحت لەچوارپێ و باڵندە و خزۆک و خشۆك کەمەبەستی لەناو بردنی ئەوانمان نەبوو، لەگوناحی منالەکانی ئیسرائیل بەرەو کوشتن برد.

ئەلیاس وتی: خواوەندا، رێگەم پێدە بۆ ئەوان بپارێمەوە و لەو بەڵایەی گرفتارن پێی، ئاسوودەیان بکەم، ئەگەری هەیە دەست لەپەرەستینی بتەکان هەڵبگرن و پەشیمان ببنەوە. خواوەند رازی بوو. ئەلیاس بۆ لای منالەکانی ئیسرائیل ڕۆشت و وتی: ئێوە گرفتاری بەلاّ و ڕەنج بوون و باڵندە و خزۆك و خشۆك و دارەکان بەگوناحی ئێوە لەناوچوون. کاری ئێوە فێڕۆ و نارەوایە و ئەگەر دەتانەوێت بزانن و ئاگادار بن کەخواوەند لەئێوە توڕەیە و بانگەوازەکەی من راستە. بتەکانی خۆتان بێنن کە بەگومانی ئێوە لەخواوەند بەتواناتر و باشترن، ئەگەر نیازەکانی ئێوەی هێنایە،ی، وتاری ئێوە راست و ڕەوایە و ئەگەر نەیتوانی هیچ کارێك بۆ ئێوە ئەنجام بدات، وتارەکەتان فێڕۆ و ناڕاستە و دەست لەپەرەستینی ئەوان هەڵبگرن. ئەوکات من لەخوا دەپارێمەوە تا زیان و بەلاّ لەسەر ئێوە هەڵبگرێت و ڕۆژی ئێوە فراوان بکات.

خەڵك وتیان: دادپەروەرییە. بتەکانیان هێنا و لێیان پاڕانەوە کەدۆعاکانیان گیرا نەبوو و زانیان وتارەکەیان ناڕاست و کردەوەکانیان نارەوایە. وتیان: ئەی ئەلیاس، ئێمە لەناو دەچین، دۆعامان بۆ بکە.

ئەلیاس لەخواوەند پاڕایەوە تا زیانیان لەسەر هەڵبگرێت وباران ببارێت. هەورێك وەك قەڵغان لەدەریاوە هات. خەڵك بینیان. هەورەکانی دیکە لەدەوری کۆبونەوە و بارانیان باراند. زەوی زیندووو بوویەوە و بەلاّ لەسەر خەڵکان هەڵگیرا.

بەلاّم خەڵك دەستیان لەبتپەرەستی هەڵنەگرت و زیاتر لەجاران پێداگریان لەسەر پەرەستینی بتەکان کرد.

کاتێك ئەلیاس کوفری ئەوانی بینی، لەخوا پاڕایەوە تا گیانی بستێنێت تا لەدەست خەڵکەکەی رزگاری ببێت. خواوەند وەحی پێکرد: فلاّن ڕۆژ بۆ فلاّن شوێن برۆ. هەر شتێك هات، لەسەری دانیشە و مەترسە. ئەلیاس ڕۆشت و ئەلیەسع هاورێیەتی دەکرد. کاتێك گەیشتە شاری بەڵێن پێدراو، ئەسپێکی ئاگرین هات و لەبەردەم ئەلیاس وەستا. ئەلیاس سواری بوو و ئەلیەسع بانگی کرد: ئەلیاس،

ئەلیاس، من چیبکەم؟ ئەمە دوایین پەیوەندی ئەوان بوو. خوا باڵی بەئەلیاسدا و جل و بەرگی نووری لەبەر کرد. چێژی خواردن و خواردنەوەی لەو گرتەوە و لەگەڵ فریشتەکان فڕی. مرۆڤێکی - فریشتەیەکی زەمینی—ئاسمانی بوو.

بەوتەی وەهب کوڕی مونبە دوای ئەلیاس، ئەلیسەع بوو بەپێغەمبەری مناڵەکانی ئیسرائیل و تا ئەو کاتەی خواوەند ویستی، ژیا و دواتر مرد. ڕووداوەکان ڕویاندا و گوناحەکان گەورە بوون. سنوقی پەیمان لەدەستی منالەکانی ئیسرائیلدا بوو کەنەوە دوای نەوە وەك میرات بۆیان دەمایەوە. ئارامی لەناو سنوقەکەدا بوو و پاشماوەی میراتی بنەماڵەی موسا و بنەماڵەی هاروون. هەر کاتێك ڕووبەڕوی دوژمنێك دەبوونەوە، سنوقەکەیان دەبردە پێش و خواوەند شکستی بەدوژمنان دەهێنا.

بەهەمان شێوە کەدەستەیەك لەزاناکانی منالەکانی ئیسرائیل ئاماژەیان پێداوە، ئارامی سەری پشیلەیەکی مردوو بوو و کاتێك لەناو سنوقەکە وەك پشیلە دەیمیاواند، لەسەرکەوتن دڵنیا دەبوون و سەرکەوتنیان بەدەست دەهێنا.

پاشایەکیان هەبوو بەناوی ئیلاف. خوا کێوەکەی ئەوانی لەئیلای، پیرۆز کردبوو. دوژمن نەدەڕۆشتنە ئەوێ و لەوێ پێویستیان بەهیچ نەبوو. وەك وتوویانە خۆڵیان لەسەر بەردێك کۆدەکردەوە و تۆویان دەپرژاند و بەئەندازەی ڕۆژی ساڵ بەرهەمیان کۆدەکردەوە. لەیەك دار بەندازەی یەك ساڵ ڕۆنیان دەگرت.

کاتێك دیاردە تازەکان دەرکەوتن و پەیمانی خوایان پشتگوێ خست، دوژمنێك ڕووبەڕوویان بوویەوە. وەك هەمیشە سنوقەکەیان بردە پێش و شەڕیان دەستپێکرد تا سنوقەکەیان لەدەستدا. کاتێك ئەم هەواڵە بەئیلاف گەیشت کە منالەکانی ئیسرائیل سنوقەکەیان لەدەستداوە، ملی خوار و لەتاو خەمی سنوقەکە مرد. کاروباریان پەرێشان و دووبەرەکی کەوتە ناویان و دوژمن بەسەریاندا زاڵبوو. منال و ژنەکانی لەوان سەندەوە و بەپەرێشانی و دوبەرەکی ژیانیان بەسەر دەبرد. هەندێ کات لەگومراییدا ڕۆدەچوون و خواوەند یەکێکی بەسەر ئەواندا زاڵ دەکرد تا لەناویان ببات و هەندێ کات پەشیمان دەبوونەوە و تۆبەیان دەکرد و خواوەند بەلای دوژمنی لێ دوردەخستنەوە تا ئەو کاتەی خواوەند تالووتی کردە پاشایان و سنوقی پەیمانەکەی بۆ گەڕاندنەوە.

لەمردنی یوشەع تا پاشایەتی ئەو و گەڕانەوەی پێغەمبەری بۆ شەموئیل کوڕی

بالی چوارسەد و شەست ساڵە کەهەندێ کات کاروباری خەڵك لەدەستی دادوەران و سالارەکاندا بوو و هەندێ کات لەدەست کەسانێتر کە بەسەر ئەواندا زاڵ ببون.

یەکەم کەس بەسەر ئەواندا زاڵ بوو پیاوێك بوو لەخەڵکی لوت بەناوی کوشان و مناڵەکانی ئیسرائیلی رسوا و لاواز کرد. دواتر برا بچوکەکەی کالب کوڕی قنس، مناڵەکانی ئیسرائیلی لەدەستی ئەو رزگار کرد. وەك وتوویانە بۆ ماوەی چل ساڵ سالاری خەڵکەکەی خۆی بوو.

دواتر پاشایەك بەناوی عەجلون بەسەریاندا زاڵبوو و دواتر پیاوێك لەنەوەکانی بنیامین بەناوی ئەهودشەل دەست کوڕی جیرا رزگاری کردن و بۆ ماوەی هەشتا ساڵ سالاری خەڵکەکەی بوو.

ئەوسا پاشایەك لەکەنعانییەکان بەسەریاندا سەرکەوت بەناوی یافین و بۆ ماوەی بیست ساڵ فەرمانڕەوایەتی مناڵەکانی ئیسرائیل کرد. دوای ئەوە پێغەمبەرێکی ژن بەناوی دەبورا رزگاری کردن و پیاوێك بەناوی باراق بۆ ماوەی چل ساڵ لەلایەن ئەو ژنەوە کاروبارەکانی تایبەت بە مناڵەکانی ئیسرائیلی هەڵدەسووڕاند.

دواتر دەستەیەك لەمناڵەکانی لوت کەشوێنی نیشتەجێ بوونیان سنورەکانی حیجاز بوو بەسەر ئەواندا سەرکەوتن و بۆ ماوەی حەوت ساڵ فەرمانڕەوایەتیان کرد. پیاوێك لەمناڵەکانی نەفتالی کوڕی یەعقوب بەناوی جەدعون کوڕی بواش رزگاری کردن و چل ساڵ کاروبارەکانی ئەوانی راپەڕاند و دوای جەدعون کوڕەکەی ئەبی موڵك سێ ساڵ سالاری خەڵکەکەی بوو. دوای ئەبی موڵك، تولَغ کوڕی خاڵی ئەبی موڵك و بەوتەیەك کوڕە پووری ئەو، بیست و سێ ساڵ کاروبارەکانیان راپەڕاند.

دوای تولَغ، پیاوێك لە مناڵەکانی ئیسرائیل بەناوی یائیر بۆ ماوەی بیست و دو ساڵ سالاری خەڵکەکەی گرتەدەست.

دواتر مناڵەکانی عەمون کەدەستەیەك لەخەڵکی فەلەستین بوون، بۆ ماوەی هەژدە ساڵ بەسەریاندا سەرکەوتن.

دواتر یەکێك لە مناڵەکانی ئیسرائیل بەناوی یەفتح بۆ ماوە شەش ساڵ جڵەوی کاروبارەکانی گرتەدەست و دوای ئەو بەجشون لە مناڵەکانی ئیسرائیل ماوەی حەوت ساڵ سالاری کرد. دوای ئەو، ئالون، بۆ ماوەی دە ساڵ، کیرون کەدەستەیەك بەعێکرون ناوی دەبەن. بۆ ماوەی هەشت ساڵ کاروبارەکانیان هەڵدەسووڕاند.

دوای ئەوان، خەڵك وپاشاكانی فەلەستین بۆ ماوەی چل ساڵ جڵەوی كاروبارەكانی مناڵەكانی ئیسرائیلیان گرتەدەست. دواتر، شەمشون لەمناڵەكانی ئیسرائیل، بۆ بیست ساڵ سالاری گرتەدەست. دوای شەمشون وەك وتوویانە دە ساڵ بێ سالار بوون. دواتر، عالی كاهین كاروبارەكانی راپەڕاند و لەدەورانی ئەو سنوقەكە كەوتە دەست خەڵكی غەزە و عەسقەلان.

كاتێك چل ساڵ لەدەورانی عالی كاهین تێپەڕی، خواوەند شەموئیلی وەك پێغەمبەر رەوانە كرد. وەك وتوویانە ماوەی دە ساڵ بۆ راپەڕاندنی كاروبارەكان هاوكاری ئەوی كرد و كاتێك بەهۆی گوناح و سەرپێچی كردن لەفەرمانەكانی خواوەند، گرفتار و ریسوا ببوون، داوایان لەشەموئیل كرد پاشایەكیان بۆ دیاری بكات تا شان بەشانی ئەو لەرێگەی خوادا شەڕ بكەن. شەموئیل قسەی لەگەڵ كردن وخواوەند لەقورئاندا ئاماژەی پێداوە.

## وتار سەبارەت بەشەموئیل و تالوت و جالوت

داستانی شەموئیل کوڕی بالی بەوشێوەیە: کاتێك دەورانی بەلاَ و زیانەکانی منالّەکانی ئیسرائیل درێژ بوویەوە و پاشا بێگانەکان ئەوانیان ریسوا و لاواز و بەسەر دیار و سەرزەمینەکەیان زالّبوون وپیاوەکانیان کوشت و منالّەکانی ئەسیر و سنوقی پەیمانیان برد کەئارامی وپاشماوەی میراتی بنەمالّەی موسا و بنەمالّەی هارونی تیا بوو، داویان لەخواوەند کرد پێغەمبەرێکیان بۆ رەوانە بکات تاکاروبارەکانیان رێکبخات.

سەدی دەلّێت: منالّەکانی ئیسرائیل لەگەلّ عەمالقە کەپاشاکەیان جالووت بوو، شەڕیان کرد و عەمالقە بەسەر منالّەکانی ئیسرائیلدا سەرکەوتن. باجیان خستنەسەر و تەوراتیان لیّ سەندن. منالّەکانی ئیسرائیل داویان لەخوا کرد تا پێغەمبەرێکیان بۆ رەوانە بکات تا شان بەشانی ئەو شەڕ لەگەلّ دوژمنان بکەن. نەوەی پێغەمبەرەکان لەناو چبوو. تەنیا یەك ژنی دوگیان مابوویەوە. ئەویان گرت و لەمالّێك دایاننا لەترسی ئەوەی نەکا کچی هەبێت و بەکوڕێك بیگۆڕێتەوە چوونکە دەیزانی منالّەکانی ئیسرائیل ئارەزومەندی بینی ئەو منالّەن ئەگەر کوڕ بێت. ژن لەخوا پاڕایەوە تا کوڕێکی پێببەخشێت. کوڕێکی هێنایەدنیا و ناوی نا شەمعون، یانی: خواوەند دۆعاکەی منی بیست. کوڕەکە گەورە و لەبیت المقدس بۆ فێربوونی تەورات ناچاری کرد. پیرێك لەزاناکانی خەلّك، سەرپەرەستی کردنی ئەوی گرتەدەست و بەکوڕی خۆی ناوی برد. کاتێك کوڕەکەی گەیشتە تەمەنی بلّوق و زەمانی پێغەمبەری ئەو نزیك کەوتەوە، جبرەئیل هات و کوڕەکە لەتەنیشت پیرەزاناکەوە خەوتبوو. پیرەکە کەسی بەئەمینی ئەو نەدەزانی. جبرەئیل بەدەنگی پیرەکە وتی: ئەی شەموئیل!

کوڕەکە ترسا و هەستا و بەپیری وت: باوکە، منت بانگ کرد؟

پیر نەیویست بلّێت نا، لەبەر ئەوەی کوڕەکە نەترسێت. وتی: کوڕم برۆ بخەوە.

کوڕ خەوت و جبرەئیل جارێکی دیکە بانگی کرد. کوڕ هاتە لای پیرەکە و وتی بانگی منت کرد؟.

وتی: برۆ بخەوە و ئەگەر جارێکی دیکە بانگم کردی، وەلاَمم بدەرەوە.

جاری سێیەم جبرەئیل خۆی نیشاندا و وتی: بۆ لای خەلّکەکەی خۆت برۆ و

پەیامی خواوەند بەجێبێنە چوونکە خواوەند تۆی وەك پێغەمبەری ئەوان هەڵبژارد.

کاتێك شەمعون بۆ لای خەڵکەکەی خۆی ڕۆشت، بەدرۆزنیان زانی و وتیان: بۆ پێغەمبەرایەتی پەلەت کرد، باوەڕت پێ ناکەین، ئەگەر راست دەکەیت پاشایەك دیاری بکە تا لەرێگەی خوادا شەڕ بکات و نیشانەی پێغەمبەری تۆبێت.

شەمعون وتی: ((هل عسیتم ان کتب علیکم القتال الا تقاتلوا قالو او مالنا الا نقاتل فی سبیل الله و قد اخرجنا من دیارنا و ابنائنا.

واتاکەی: ئەگەری هەیە کارگوزار بۆ ئێوە دیاری بکرێت. و شەڕ نەکەن؟ وتیان: ئێمە کە لەمناڵ و ژن و دیاری خۆمان دورکەوتوینەتەوە. چۆن شەڕ ناکەین.))

لەخواوەند پاڕایەوە و خوا داردەستێکی بۆ نارد کەدرێژیەکەی بەئەندازەی باڵای پیاوێك کەدەبوا ببێتە پاشای خەڵکەکەی و بە مناڵەکانی ئیسرائیلی وت: ئەندازەی باڵای بەئەندازەی ئەم داردەستەیە.

خەڵکانیان بەداردەستەکە ئەندازە گرت کەس نەبوو مەگەر پیاوێکی ئاوکێش کە بەکەرەکەی خۆی ئاوی دەکێشا. پیاوەکە کەرەکەی خۆی ون کردبوو و بەدوایدا دەگەڕا. کاتێك ئەویان بینی، بەداردەستەکە ئەندازەی باڵایان گرت. باڵای بەئەندازەی داردەستەکە بوو، پێغەمبەرەکەیان وتی: خواوەند تالوتی وەك پاشای ئێوە دەستنیشان کرد.

خەڵك وتیان: هەرگیز دروی هاوشێوەی ئەمەت نەهێناوەتە سەرزمان، ئێمە لەنەوەی پاشاکانین و ئەو نا، سامانی نییە تا بەهۆی سامانەوە شوێنی بکەوین.

پێغەمبەرەکەیان وتی: ((ان الله اصطفاه علیکم وزادة بسطة فی العلم و الجسم.

واتاکەی: خواوەند ئەوی لەناو ئێوە هەڵبژارد و زانست و جەستەیەکی گەورەی پێدا.))

وتیان: ئەگەر راست دەکەیت، نیشانەیەك بۆ پاشایەتی ئەو بێنە.

وتی: (( ان آیة ملکه ان یاتیکم التابوت، فیه سکینة من ربکم و بقیة مما ترك آل موسی و آل هارون.

یانی: نیشانەکەی ئەو ئەوەیە سنوقەکە دێت بۆ لای ئێوە کەئارامی لەپەروەردگار و پاشماوەی میراتی بنەماڵەی موسا و بنەماڵەی هارونی تیایە.))

ئارامی تەشتێك لەزێر بوو کەدڵی پێغەمبەرانیان تیا دەشۆرد. خواوەند ئەوی

بەموسا بەخشی و لەوحەکانیان خستە ناوی. لەوحەکان وەك بیستومانە لەدوڕ و یاقوت و زەمورود بوو و پاشماوەی میراتەکە، داردەستەکەی موسا و وردە لەوحەکان بوو. سنوقەکە و ئەوەی لەناو سنوقەکەدا بوو، لەماڵی تالوت دۆزییانەوە و باوەڕیان بەپێغەمبەری شەمعون کرد و پاشایەتیان بەتالوت سپارد.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: فریشتەکان سنوقەکەیان لەنێوان ئاسمان و زەوی بەرز کردەوە و خەڵکان بینیان و دواتر لەماڵی تالوت دایاننا.

لەکوڕی زەید دەگێڕنەوە: فریشتەکان لەکاتی رۆژ سنوقەکیان هێنا و لای خەڵك دایاننا و نابەدڵ تەسلیمیان کرد و تورە شوێنەکەیان بەجێهێشت.

سەدی دەڵێت: مناڵەکانی ئیسرائیل لەگەڵ تالوت بەرێکەوتن، هەشتا هەزار کەس بوون. جالوت پیاوێکی بوێر و چوارشانە بوو، لەپێشی سوپاکەیەوە ڕێگەی دەبڕی، هاوەڵانی لێی نزیك نەدەکەوتنەوە مەگەر ئەو کاتەی شکستی بەدوژمن دەهێنا.

کاتێك ڕۆشتنەدەر، تالوت وتی:

((ان الله مبتليكم بنهر، فمن شرب منه فليس مني و من لم بطمعة فانه مني.

واتاکەی: خواوەند ئێوە بەجۆگەیەك تاقیدەکاتەوە، هەرکەس لێی بخواتەوە، لەمن نییە و هەرکەس لێی نەخواتەوە، لەمنە.))

روباری فەلەستین بوو. لەترسی جالوت لێیان خواردەوە. چوار هەزار کەس لەروبارەکە پەڕینەوە و حەفتا و شەش هەزار کەس گەڕانەوە. هەرکەس لەئاوەکەی خوارد، تینوو بوو و هەرکەس نەیخوارد، تێراو. خواوەند دەفەرمێت:

((فلما جاوزه هوو الذين آمنو امعه، قالوا لا طاقة لنا بجالوت و جنوده، قال الذين يظنون انهم ملاقو الله كم من فئة قليلة غلبت فئة كثيرة باذن الله و الله مع الصابرين.

واتاکەی: کاتێك ئەو لەگەڵ ئەو کەسانەی باوەڕیان پێی بوو، لەرووبار پەڕییەوە، وتیان: ئەمڕۆ بەرگەی تالوت و سوپاکەی ئەو ناگرین، ئەوانەی باوەڕدار بوون کە دەڕۆنە پێشگای پەروەردگار، وتیان: زۆر جار دەستەیەکی کەم بەسەر دەستەیەکی فراوان زاڵبووە و خوا پشتیوانی خۆڕاگرانە.))

دوبارە سێ هەزار و شەشسەد و هەشتا و چەند کەس گەڕانەوە و سێسەد و نۆزدە کەس وەك شەڕکەرانی ئەو مانەوە.

لەووەهب کوڕی مونەبە دەگێڕنەوە: عیلی راهێنەری شەموئیل دو کوڕی هەبوو کە دیاردەیەکی تازەیان لەقوربانی کردن هێنایە ئاراوە. رەسم بوو قوربانیان بەدوو

قولاپەوە هەڵدەواسی و هەرچی لێ دەمایەوە، بەشی کاهین بوو. دوو کوڕەکەی ئەو قولاپەکانیان خست. هەروەها کاتێك ژنەکان لەقودس نوێژیان دەخوێند، ڕێگەیان لێدەگرتن. کاتێك شەموئیل لەماڵی کاهین خەوتبوو، دەنگێکی بیست کەدەیوت: شەموئیل!

ئەو ڕۆشتە لای عیلی و وتی: ئامادەم، بانگی منت کرد؟

وتی: نا، بانگی تۆم نەکرد، بڕۆ بخەوە.

دوبارە دەنگی بیست کەدەیوت: شەموئیل.

بەخێرایی ڕۆشتە لای کاهین و وتی: ئامادەم، بۆ چ کارێك بانگت کردووم؟

وتی: بانگم نەکردویت، بڕۆ بخەوە و ئەگەر بانگیان کردیت، لەشوێنەکەی خۆتەوە بڵێ، ئامادەم، فەرمان بدە تا ئەنجامی بدەم.

شەموئیل ڕۆشت و خەوت. دوبارە دەنگەکەی بیست، دەیوت: شەموئیل.

وتی: ئامادەم، فەرمان بدە تا ئەنجامی بدەم.

دەنگ وتی: بڕۆ لای عیلی و بڵێ خۆشەویستی باوکایەتی ڕێگر بوو لەوەی کوڕەکانت لەدروست کردنی دیاردەی تازە لەقوربانی کردن و سەرپێچی کردن لەفەرمانەکانی من دوور بخەیتەوە، من کاهینی لەتۆ و مناڵەکانت دەستێنمەوە و تۆ و دوو کوڕەکەت لەناو دەبەم.

بەرەبەیان عیلی پرسیاری کرد و شەموئیل داستانەکەی بۆ گێڕایەوە. عیلی ترسا. دژومێنك لەدەوروبەرەوە هات و کاهین وتی تا دوو کوڕەکەی لەگەڵ خەڵکان ببەن بۆ ئەوەی شەڕ لەگەڵ دوژمنان بکەن. ئەوان ڕازی بوون و سنوقی پەیمانیان لەگەڵ خۆیان برد کەداردەستەکەی موسا و پاشماوەی لەوحەکانی تیا بوو تا بەهاوکاری سنوقەکە سەرکەوتن بەدەست بێنن. کاتێك خۆیان بۆ شەڕ ئامادە کرد، عیلی چاوەڕوانی هەواڵ بوو. پیاوێك هات و ئەو لەسەر کورسی دانیشتبوو، وتی: دوو کوڕەکەت کوژران و خەڵکان رایان کرد.

عیلی وتی: سنوقەکە چی بەسەرهات؟

وتی: دوژمن بردی.

دەڵێت: عیلی هەناسەیەکی هەڵکێشا و لەسەر کورسییەکەی بەپشتا کەوت و مرد. ئەوانەی سنوقەکەیان گرتبوو، بردیان بۆ ماڵی خواکانی خۆیان و لەژێر

بتەکەیان دایاننا. بتەکە لەسەر سنوقەکە بوو. بەڵام لەبەرەبەیان بتەکە لەژێر سنوقەکە بوو. دوبارە بتەکەیان خستە سەر سنوقەکە و دو قاچی بتەکەیان بەبزمار بەسنوقەکەوە داکوتی. بۆ رۆژی دواتر دەست و پێی بتەکە قرتا بوو و بتەکەی خۆی کەوتبوە ژێر سنوقەکە. بەیەکیان وت: مەگەر نازان کەس ناتوانێت رووبەروی خواوەندی مناڵەکانی ئیسرائیل ببێتەوە، سنوقەکە بۆماڵی خواکانی ئەوان بگەرێننەوە.

سنوقەکەیان هێنایەدەر و لەسووچێکی گوندەکە فڕیاندا، خەڵکی ئەو ناوچەی سنوقەکە لەوێ بوو، ئازارێکیان لەملی خۆیاندا هەست پێکرد و وتیان: ئەمە چییە؟

کچێك لە منالەکانی ئیسرائیل، کە لەوێ دەژیا، وتی: تا ئەو کاتەی ئەم سنوقە لەم گوندەدا بێت، ناخۆشی نابینین.

وتیان: درۆ دەکەیت.

وتی: نیشانی راستی وتارەکەم ئەمەیە: دوو مانگای گوێرەکەدار بێنن کەهیچ کات تەوقتان نەکردبێتە ملیان. سنوقەکەیان بخەنەسەر و گوێرەکەکان هەڵبگرن و مانگاکان سنوقەکە ببەن. کاتێك لەسەرزەمینی ئێوە بگاتە سەرزەمینی منالەکانی ئیسرائیل ، تەوقەکەی دەشکێنێت و بۆ لای گوێرەکەکانی دەگەرێتەوە. ئەم کارەیان کرد و کاتێك مانگاکان گەیشتنە سەرزەمینی منالەکانی ئیسرائیل ، تەوقەکەیان شکاند وبۆ لای گوێرەکەکان گەڕانەوە. سنوقەکە لەوێرانەیەکی منالەکانی ئیسرائیل دانرا و منالەکانی ئیسرائیل بەرەو لای رایان کرد. هەرکەس لێی نزیك کەوتەوە، مرد جگە لەدوپیاو کەرێگەیان پێدرا سنوقەکە بۆ ماڵی دایکیان ببەن کەبێوەژن بوو. سنوقەکە لەماڵی ئەو ژنەدا بوو تا تالوت پاشایەتی گرتەدەست.

کاروباری منالەکانی ئیسرائیل لەلایەن شەموئیلەوە ساماندرابوو، بەڵام وتیان: پاشایەك بۆ ئێمە دیاری بکە تا لەرێگەی خوادا شەڕ بکات.

شەموئیل وتی: خوا شەڕی لەسەر ئێوە هەڵگرت.

وتیان: ئێمە لەخەڵکی دەوروبەری خۆمان دەترسین و دەبێت پاشایەکمان هەبێت تا پەنای بۆ ببەین.

خواوەند وەحی بۆ شەموئیل ناردەخوار: تالوت وەك پاشای منالەکانی ئیسرائیل دیاری بکە و رۆنی پیرۆز لە جەستەی بسوو. کەرەکانی باوکی تالوت ون ببوو و تالوتی لەگەڵ بەندەیەك بۆ دۆزینەوەی ئەوان رەوانە کرد. رۆشتنە لای شەموئیل و

پرسیاری کەرەکانیان لێکرد. شەموئیل بەتالوتی وت: خواوەند تۆی وەك پاشای منداڵەکانی ئیسرائیل هەڵبژارد.

تالوت وتی: من؟

شەموئیل وتی: بەڵێ.

تالوت وتی: مەگەر نازانی ئەوەی من ریسواترین ئەوەی منداڵەکانی ئیسرائیله؟

وتی: بۆ نا، دەزانم.

وتی: مەگەر نازانی هۆزەکەی من پەستترین هۆزی منداڵەکانی ئیسرائیله؟

وتی: بۆنا دەزانم.

وتی: نیشانەی پاشایەتی من چییه؟

وتی: کاتێك دەگەڕێیتەوە، باوکت کەرەکانی دۆزیوەتەوە و کاتێك دەگەیتە فلان شوێن، وەحی بۆ تۆ دێتەخوار.

دواتر بەرۆنی پیرۆز چەوری کرد و بە منداڵەکانی ئیسرائیلی وت:

((ان الله قد بعث لکم طالوت ملکا، قالوا انی یکون له الملك علینا و نحن احق بالملك منه و لم یوت سعة من المال، قال: ان الله اصطفاة علیکم فزاده بسطة فی العلم و الجسم.

واتاکەی: خواوەند تالوتی وەك پاشای ئێوە دەستنیشان کرد. وتیان: چۆن دەتوانێت ببێتە پاشای ئێمە، ئێمە بۆ پاشایەتی شیاوترین چوونکە سامانی زۆری نییە. وتی: خواوەندی ئەوی بەسەر ئێوەدا هەڵبژارد و زانست و جەستەیەکی گەورەی پێبەخشی.))

سەدی دەڵێت: کاتێك منداڵەکانی ئیسرائیل رووبەرووی جالوت و سوپاکەی بوونەوە، وتیان: خوایە خۆڕاگری بەئێمە ببەخشە. لەو رۆژدا باوکی داوود لەگەڵ سیانزە کوڕەکەی خۆی لەناو ریزی ئەو کەسانەدا بوو کە لەرووبار پەڕینەوە، داوود لەهەموو کوڕەکان کەم تەمەنتر بوو. رۆژێك داوود ڕۆشتە لای باوکی و وتی: بەقۆچەقانییەکەی خۆم دەتوانم، ئەوەی دەمەوێت، بیپێکم.

باوك وتی: کوڕم مژدە لێبێت چوونکە رۆژی تۆیان لەناو قۆچەقانییەکەت داناوە.

جارێکی دیکە هاتە لای باوکی و وتی: ڕۆشتمە کوێستان و شێرێکم بینی، سواری بووم و گوێچکەکانیم گرت و منی نەخستە خوار.

باوك وتی: کوڕم، مژدەت لێ بێت، خوا ئەم بەرەکەتەی پێبەخشیوی.

ڕۆژێکی دیکە ڕۆشتە لای باوکی و وتی: باوکە، لەناو کێوەکان بەرێگادا دەڕۆشتم و زیکری خوام دەکرد و کێوەکان لەگەڵ من ئەو کارەیان دەکرد.

باوك وتی: کوڕم، مژدەت لێ بێت، خواوەند ئەم بەرەکەتەی پێبەخشیوی.

داوود شوان بوو. باوکی ئەوی بۆ کۆکردنەوەی خۆراك بۆ خۆی وبراکانی ڕاسپاردبوو. پێغەمبەری منداڵەکانی ئیسرائیل شاخێکی هێنا، ڕۆنی تیا بوو لەگەڵ زرێیەکی ئاسنین. ئەوانەی دا بەتالووت و وتی: ئەو کەسەی جالوت دەکوژێت، ئەم شاخە دەخاتە سەر سەری و دەکوڵێت تا ڕۆنی لێبرژێت بەلاَم بەر روخساری ناکەوێت. لەسەری ئەودا هاوشێوەی تاجە و کاتێك زرێکە دەپۆشێت، بەئەندازەی خۆیەتی.

تالوت منداڵەکانی ئیسرائیل کۆکردەوە و بەشاخ و زرێکە ئەوانی تاقیکردەوە. کەس بەو شێوە نەبوو کە پێغەمبەر دەیوست. کاتێك کەس نەمایەوە، بەباوکی داوودی وت: ئایا کوڕێکت هەیە و نەهاتبێت؟

وتی: بەڵێ داوودی کوڕم ماوە کەخواردن بۆ ئێمە ئامادە دەکات.

کاتێك داوود هات، لەرێگە لای سێ بەرد تێپەڕی. قسەیان لەگەڵ کرد و وتیان: ئەی داوود ئێمە هەڵبگرە چوونکە بەئێمە جالوت دەکوژیت.

دەڵێت: داوود بەردەکانی هەڵگرت و خستیە ناو تورەکەکەی خۆی.

تالوت وتبووی: هەرکەس جالوت بکوژێت، کچەکەم دەکەمە هاوسەری و فەرمانی ئەو لەناو سنوری پاشایەتییەکەی خۆم رەوان دەکەم. کاتێك داوود هات و شاخەکەیان خستەسەر سەری، ڕۆن ڕژا و کاتێك زرێکەی پۆشی، بەئەندازەی خۆی بوو. ئەو پیاوێکی چوارشانە و بەهێز بوو. هەر کەس زرێکەی پۆشی، گەورە بەرچاو دەکەوت. کاتێك داوود زرێکەی پۆشی، لەبەر ئەودا تەسك دەهاتە بەرچاو.

دواتر ڕووبەرووی جالوت بوویەوە. جالوت لەهەموو خەڵکان گەورەتر و بوێرتر بەرچاو دەکەوت. کاتێك داوودی بینی، ترسی لێ نیشت و وتی: ئەی کوڕی گەنج بگەرێرەوە. چوونکە پێم خۆش نییە تۆ بکوژم.

داوود وتی: نا. من تۆ دەکوژم. بەردەکانی دەرهێنا وخستیە ناو قۆچەقانییەکەی. هەر بەردێك کەدەریدەهێنا، ناوێکی دەهێنایە سەرزمان، ئەمە بەناوی باوکم ئیبراهیم. ئەمە بەناوی باوکم ئیسحاق و ئەمە بەناوی باوکم ئیسرائیل.

قۆچەقانییەکەی سووڕاند و هەر سێ بەردەکە بوو بەیەك بەرد و هەڵیدا. بەرنێو چاوانی جالوت کەوت، سەری کون کرد و کوشتی. بەردەکان بەهەر کەسێك دەگەیشت، سەری کون دەکرد و دەیکوشت تا ئەوەی کەس لەبەرابەر ئەوان نەمایەوە و شکست لەناو سوپاکەی جالوت بڵاو بوویەوە. داوود جالوتی کوشت و کچی تالوتی کردە هاوسەری خۆی. خەڵك لەدەوری داوود کۆدەبونەوە و ئەویان خۆشدەویست. تالوت لەم بەسەرهاتە تووڕە بوو، ڕژدی بەداوود برد و مەبەستی کوشتنی ئەوی کرد. داوود لەمەبەستەکەی ئاگادار بوویەوە و مەشکەیەك شەرابی لەناو جێگەکەی خۆی دانا. تالوت ڕۆشتە جێگە خەوەکەی داوود و بەشمشێر لێیدا، شەراب فیچقەی کرد و یەك دڵۆپ شەراب کەوتە ناو دەمی و وتی: خواوەند لەداوود خۆش بێت چوونکە شەرابی دەخوارد.

دوای ئەوە داوود ڕۆشتە ماڵی تالوت. تالوت خەوتبوو، لەسەر سەر وخوارەوەی قاچەکان و لەراست و چەپی ئەو دو تیری دانا و ڕۆشت. کاتێك تالوت هەستا وتیرەکانی ناسییەوە، وتی: خوا لەداوود خۆش بێت، من بەسەر ئەودا زاڵبووم و کوشتم بەلاّم ئەو بەسەر مندا زاڵبوو و نەیکوشتم.

ڕۆژێك تالوت سوار ئەسپ بوو، داوودی بینی لەگەڵ خەڵکان بەرێگەدا دەڕوات. تالوت بەخۆی وت: ئەمڕۆ داوود دەکوژم.

کاتێك داوود دەترسا، کەس پێی نەدەگەیشت. تالوت بەدوای ئەودا رایکرد. داوود هەلاّت و ڕۆشتە ناو ئەشکەوتێك. خواوەند فەرمانی بەجارجاڵۆکەدا و دەرگای ئەشکەوتەکەی تەنی. کاتێك تالوت گەشتە دەروازەی ئەشکەوتەکە و داوی جاڵجاڵۆکەی بینی، وتی: ئەگەر دەڕۆشتە ناو ئەشکەوتەکە، داوی جارجاڵۆکەکەی دەدەڕاند. گەڕایەوە.

زاناکانی مناڵەکانی ئیسرائیل، تالوتیان بۆ کردووەکانی لەگەڵ داوود سەرکۆنە کرد. هەر کەس دەیویست رێگەی ئەو کارەی لێبگرێت، دەیکوشت. خواوەند ئەوی بۆ کوشتنی زاناکانی خەڵکەکەی هاندا. لەناو مناڵەکانی ئیسرائیل هیچ زانایەك نەمایەوە کەنەیکوژێت تا ئەوەی ژنێکیان هێنا کەناوی گەورەی خواوەندی دەزانی. فەرمانی کوشتنی ژنەکەی بەجەلاددا، بەلاّم جەلاد ئەوی نەکوشت و وتی: ئەگەری هەیە پێویستمان بەزانایی ئەو هەبێت. ئەوی ئازاد کرد.

دوای ئەوە، نییەتی تۆبە کردن لەدڵی تالوت گەشەی کرد. پەشیمان و گریا تا ئەوەی خەڵك بەزەییان پیاییدا هاتەوە. شەوانە دەڕۆشتە سەر گۆڕەکان و دەگریا. هاواری دەکرد: سوێندتان دەدەم بەخوا، هەرکەس دەزانێت ئایا من توانای تۆبە کردنم هەیە، یا نە، پێم بڵێت. کاتێك ئەم قسەی چەندین جار دووبار کردەوە، یەکێك لەناو گۆڕەکانەوە پێی وت، ئەی تالوت ئەوەندە بەس نەبوو ئێمەت کوشت، ئێستا دەتەوێت گۆڕەکانیشمان ئازار بدەیت؟ خەم و گریانی تالوت زیادی کرد.

جەلاد بەزەیی بەتالوتدا هاتەوە و قسەی لەگەڵ کرد. وتی: چیت بەسەر دێت؟

تالوت وتی: ئایا لەسەر زەوی زانایەك هەیە پێم بڵێت دەتوانم تۆبە بکەم یا نە؟

جەلاد وتی: دەزانی هاوشێوەی کێیت. هاوشێوەی ئەوپاشایەی شەوێك ڕۆشتە گوندێك و کەڵەشێر قوقاندی، قووقەی کەڵەشێری بەخراپە لێکدایەوە و فەرمانیدا هەموو کەڵەشێرەکانی گوندەکە بکوژن. کاتێك ویستی بخەوێت، وتی: کاتێك کەڵەشێر قووقاندی، خەبەرم بکەنەوە بۆ ئەوەی بەرێکەوین. پێیان وت: مەگەر کەڵەشێرێکت هێشتۆتەوە تا دەنگی قووقەی ببیستین؟ تۆیش کەسێکی زانات لەسەر زەوی نەهێشتۆتەوە.

خەم و گریانی تالوت زیادی کرد. کاتێك جەلاد پێداگری ئەوی بۆ تۆبە کردن بینی، وتی: ئەگەر تۆ بۆ لای زانایەك ببەم، ئایا دەیکوژیت؟

تالوت وتی: نە.

جەلاد بەڵێنی لێوەرگرت. دواتر وتی ژنی زانا لای ئەوە.

تالوت وتی: من بۆ لای ئەو ببە تا پرسیاری لێ بکەم.

ناوی گەورەی خوا تەنیا ئەندامانی یەك بنەماڵە دەیانزانی و کاتێك پیاوانیان لەناودەچوون، ژنان فێری دەبوون.

جەلاد بەتالوتی وت: ئەگەر بتبینێت، دەترسێت و لەهۆش خۆی دەچێت. کاتێك لەدەرگاکە نزیك کەوتنەوە، جەلاد تالوتی بەجێهێشت و خۆی ڕۆشتە لای ژنەکە، وتی: مەگەر تۆ زیاتر لەهەموو خەڵکان قەرزاری من نیت لەبەر ئەوەی تۆم لەکوشتن رزگار کرد و پەنامدایت؟

ژن وتی: بۆنا.

وتی: ئێستا نیازێکمان بەتۆ هەیە، تالوت هاتووە تا لەتۆ بپرسێت ئایا دەتوانێت تۆبە بکات یانە؟

ژن لەهۆش خۆی چوو، جەلاد پێی وت: تالوت مەبەستی کوشتنی تۆی نییە و دەیەوێت بپرسێت ئایا دەتوانێت تۆبە بکات یا نە؟

ژن وتی: سوێند بەخوا نازانم بەڵام ئایا شوێنی گۆڕی پێغەمبەرێك دەزانن؟

وتی: بەڵێ. گۆڕی یوشەع کوڕی نوون دەزانم.

ژن لەگەڵ ئەوان هات و پاڕایەوە. یوشەع لەگۆڕەکە هاتەدەر، تەپ و تۆزی لەخۆی تەکاند و کاتێك ئەو سێ کەسەی بینی، وتی: چیتان بەسەر دێت، مەگەر ڕۆژی پەسلانە؟

ژن وتی: نا بەڵام تالوت لەتۆ دەپرسێت ئایا ڕێگەی تۆبەی هەیە یا نە؟

یوشەع وتی: نا، مەگەر ئەوەی دەست لەپاشایەتی هەڵبگرێت و لەگەڵ منداڵەکانی خۆی بۆ شەڕ بڕوات. منداڵەکانی بەبەرچاوی خۆیەوە لەڕێگەی خوادا شەڕ بکەن تا کاتێك دەکوژرێن و کاتێك ئەوان کوژران، خۆی هێرش بەرێت تا دەکوژرێت، ئەگەری هەیە ئەمە تۆبەی ئەو بێت. ئەوسا مرد و کەوتەوە ناو گۆڕەکەی.

تالوت خەمبارتر لەپێشتر گەڕایەوە. دەترسا منداڵەکانی فەرمانەکانی جێبەجێ نەکەن. گریا تا ئەوکاتەی مژۆڵەکانی هەڵوەڕی و جەستەی لەڕ و لاواز بوو. سیانزە کوڕەکەی هاتنە لای و لەحاڵیان پرسی. داستانەکەی خۆی لەگەڵدا باس کردن و بەوانی وت چۆن خواوەند بەتۆبەکەی ڕازی دەبێت. داوای لێکردن هاوڕێ لەگەڵ ئەو بۆ شەڕ لەڕێگەی خوادا بڕۆن. لەگەڵ ئەوان بەڕێکەوت. کوڕەکانی بەبەر چاوی خۆیەوە هێرشیان برد تا کوژران. دوای ئەوان، تالوت خۆی هەڵمەتی برد و کوژرا. داوود بەپاشایەتی گەیشت و مانای وتاری خواوەند کەدەفەرمێت پاشایەتی و زانستی پێبەخشی ئەمەیە: پێغەمبەری شەمعون و پاشایەتی تالوتی هەبوو.

ناوی تالوت بەسریانی شاولە. ئەو کوڕی قەیس کوڕی ئەبیاس کوڕی زێرار کوڕی بەحرەت کوڕی ئەفیح کوڕی ئەییش کوڕی بنیامین کوڕی یەعقوب کوڕی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم بوو.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: ئەو پێغەمبەرەی لەگۆڕ هەستایەوە و شێوازی تۆبەکەی بەتالوت وت، ئەلیسەع کوڕی ئەختوبە.

بەگومانی شوێنکەوتەکانی تەورات، ماوەی پاشایەتی تالوت لەسەرەتاوە تا ئەو کاتەی لەگەڵ منداڵەکانی لەشەڕدا کوژرا، چل ساڵ درێژەی کێشا.